# داهێنراو

## لە ڕوانگەی زانستە شەرعیەکان دا

نووسینی

أحمد ملا فائق سعید






ناوی کتێب: داهێنراو لە ڕوانگەی زانستە شەرعیەکان دا

نوسینی: أحمد ملا فائق سعيد

ژمارەی لاپەڕە: ٥٢٤ لاپەڕە

قەبارەی لاپەڕە: ١٧ x ٢٤ سم

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی

(١٧٨٦)ی ساڵی ٢٠١٦ی زایینی پێدراوە





چاپی یەکەم

١٤٣٨ هـ






کتێبخانەی صلاح الدين

هەولێر | فلکەی شێخ محمود | باڵەخانەی سید بهاء الدين

٠٦٦٢٥٤٠٢٧٦



# البدعة

## في منظور العلوم الشرعية

تأليف

أحمد ملا فائق سعيد

مكتبة صلاح الدين
للنشر والتوزيع بأربيل

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أن محمدًا عَبدُه ورَسُوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النساء: ١].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١].

أما بعد: «**فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحدِيثِ كَلاَمُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ**»[1].

**وَبَعْد: لەو کاتەوەی کە خوای پەروەردگار ئادەمیزادی دروستکردووە لەژێر باری تاقیکردنەوەدایە، وە گرنگترین تاقیکردنەوەش پەیوەستبوونە بە ئایینەکەی و دەرنەچوونە لێی، وە گرنگترین پابەندبوون مافی خوا و ﷻ پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، کە ڕەنگدانەوەیە لە وشەی (الشهادتين) دا: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ» کە مافی پەروەردگارە و پابەندنەبوون پێوەی کەوتنە ناو بوارەکانی (شرك)ەوەیە و خاوەنەکەی لەسەر لێواری ترازانە لە ئیسلام، وەکوو خوای**

(١) أخرجه مسلم (٨٦٧)، والنسائي (١/ ٢٣٤)، وابن ماجه (٤٥)، وابن حبان في "صحيحه" (١٠)، وفي "صحيح ابن خزيمة" (١٧٨٥)، وأحمد (١٤٩٨٤)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٣١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٤)، والمروزي في "السنة" (٧٣)، والبيهقي (٣/ ٢١٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٣٥٣)، و "المشكاة" (١٤١).

پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ۝١٣﴾ [لقمان: ١٣]، وە برِگەی دووەم: «وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّد رَسُولَ اللهِّ» کە مافی پێغەمبەرەکەیەتی و پابەندنەبوون پێوەی کەوتنە ناو بوارەکانی (بدعة)وەیە، کە هۆکارە بۆ وەرنەگرتنی کارەکان، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»[(١)].

بە هۆکاری ئەم دوو تاوانە پێغەمبەر ﷺ تەنانەت پێش هاتنە خوارەوەی (وەحی) و پێغەمبەرایەتی، بەشداری هیچ جۆرە پەرستن و عیبادەتێکی نەکردووە لەسەر پاشماوەی ئایینی (إبراهیم) ﵇، لەبەرئەوەی بتپەرست بوون، وە حەج و نوێژ و ... پڕ لە داهێنراو و گۆڕانکاری بوو، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً﴾ [الأنفال: ٣٥]، وە لەدوای پێغەمبەرایەتیشی کاری پاراستنی ئەم دوو بوارە بووە، لە دژایەتیکردنی هاوبەش بڕیاردان و لادان لە ڕێڕەوی یاسا شەرعییەکان.

لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هەموو جۆرە بیروڕا و داهێنراوێك سەری هەڵداوە، بەڵام بە بوونی (ﷺ) کۆتاییان پێ هاتووە و نەماون، لە هەردوو بواری (عقیدة وعبادات) دا.

وەکوو سەرهەڵدانی داهێنانی عیبادەت لەوانەی دەچن بۆلای خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری (عیبادەتەکانی) دەکەن و پاشان هەر یەکەیان بڕیار دەدات بە داهێنانی عیبادەت بۆ خۆی: «جَاءَ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ... أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: «... فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[(٢)].

---

(١) رواه البخاري (٢٦٩٧)، ومسلم (١٧١٨) واللفظ له، وابن ماجه (١٤)، وأبو داود (٤٦٠٦)، وأحمد في "المسند" (٢٦٣٢٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٦، ٢٧)، والدارقطني في "سننه" (٤٥٣٤)، والبيهقي في "الكبرى" (٢٠٥٣٦)، وفي "صحيح الترغيب والترهيب" (٤٩).

(٢) رواه البخاري (٥٠٦٣)، ومسلم (١٤٠١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٣٠٥)، وابن حبان في "صحيحه" (١٤)، وأحمد في "المسند" (٦٤٧٧)، والدارمي في "السنن" (٢٢١٥)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٠٣٧٤)، والبزار في "مسنده" (٦٨٠٧)، والبيهقي في "الشعب" (٥٠٩٣)، والبغوي في "شرح السنة" (٩٦).

یەکێك دەڵێت: شەو ناخەوم، ئەوی تر دەڵێت: سەرتاپای ساڵ بەڕۆژوو دەبم و نایشکێنم، یەکێکی تر دەڵێت: ژن ناهێنم ... تا پێغەمبەر ﷺ بەرپەرچیان دەداتەوە و دەفەرموێت: (ئەوەی پەیوەست نەبێت بە سوننەتی منەوە لە من نییە)، بەم شێوەیە دەیانگێڕێتەوە بۆ ڕێڕەوی سوننەت.

وە لە بورای پەیوەستبوون بە فەرموودەوە؛ وەکوو ئەو کەسەی سەروسیمای عیبادەتی پێوە دیار بوو هات و ڕەخنەی توندی لە پێغەمبەر ﷺ گرت و وتی: «اعْدِلْ يَا مُحَمَّدُ فَإِنَّكَ لَمْ تَعْدِلْ»[(١)].

واتە: دادپەروەر بە ئەی (محمد) تۆ دادپەروەر نیت، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دا کە لە نەوەی ئەم پیاوە (خەواریج)ەکان درووست دەبن، یەکەم کاریان لەسەر قسەی باپیریان (ئەو پیاوەی کە ڕەخنەکەی گرت) کارنەکردن بوو بە فەرموودە و سوننەت، وە بەردەوام خەریکی عیبادەتیش بوون، بەڵام لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەیتوانی گەشە بکات و درووست بێت.

وە لە بواری (عقیدة) دا کەسانێك بابەتی قەزاوقەدەریان ورووژاند: «خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نَتَنَازَعُ فِي القَدَرِ ... فَقَالَ: أَبِهَذَا أُمِرْتُمْ أَمْ بِهَذَا أُرْسِلْتُ إِلَيْكُمْ؟ ... عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تَتَنَازَعُوا فِيهِ»[(٢)].

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار بوو پێیان و فەرمووی: ئا بەمە فەرمانم پێ کردوون یاخود بۆ ئەمە من نێردراوم؟ پەیمانتان لێ وەردەگرم کە نەگەڕێنەوە سەری، ئەمانەش بەم شێوەیە کۆتاییان پێدێت.

وە هەروەها لە قسەوتن بە هاوەڵان (الصحابة) ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «لَا تَسُبُّوا أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِي، ...»[(٣)].

واتە: قسە مەڵێن بە هاوەڵەکانم.

(١) رواه مسلم (١٠٦٣)، وابن ماجه (١٧٢) واللفظ له، والنسائي في "الكبرى" (٨٠٣٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٨١٩)، وأحمد (١١٦٢١)، والطبراني في "الأوسط" (٩٠٦٠)، والحاكم في "المستدرك" (٢٦٤٤)، والآجري في "الشريعة" (٣٦)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩٤٤)، وفي "مسند الحميدي" برقم (١٣٠٨).

(٢) رواه الترمذي (٢١٣٣) وحسنه الألباني، والبزار في "المسند" (١٠٠٦٣)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٤٤١)، وفي "مشكاة المصابيح" برقم (٩٨، ٩٩).

(٣) رواه البخاري (٣٦٧٣)، ومسلم (٢٥٤١)، وأبو داود (٤٦٥٨)، والترمذي (٣٨٦١)، والنسائي في "الكبرى" (٨٢٥٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٩٤)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٥)، والطبراني في "الصغير" (٩٨٢).

لەمانە و چەند بوارێکی تریش، بەڵام لە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ﷺ، هەموو ئەو بوارانە؛ فیرەق و تاقمە گومڕاکانی لەناو بازنەی ئیسلامدا لەسەر دروست بوو، هەر لە (خەواریج): کارنەکردن بە سوننەت و (ڕافیزە): قسەوتن بە هاوەڵان و (قەدەری)یەکان: باوەڕنەبوون و ڕەخنە گرتن لە قەدەر و (موعتەزیلە)کان: پێشخستن و کارکردن بە عەقڵ بەسەر قورئان و فەرموودەدا و (مورجیئە)کان: لە دەرکردنی کاروکردەوەکان لە ئیمان و (ئەشعەری)یەکان: باوەڕنەبوون بە سیفاتەکانی خوا و (تەسەوف): بە والآکردنی هەموو جۆرە داهێنانێکی عیبادەتی.

وە لەپاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ جێنشینانیشی وەکوو خۆی ئەرکی پاراستنی بەرنامەی ئەو دینەیان گرتە ئەستۆ.

هەر لە (أبو بكر الصديق) ﷺ کە بەرهەڵستی یەکەم داهێنراوی کرد بەناوی جیاکردنەوەی زەکات لە نوێژ و تا دەگاتە سەرکوتکردنی هەڵگەڕاوەکان، کە هەریەکەی بە جۆرێك لە ئیسلام هەڵدەگەڕانەوە.

وە سەردەمی (عمر بن الخطاب) ﷺ بە هەمان شێوەی پێش خۆی، بگرە لە تەمێکردنی (صبيغ العراقي) و بڕینی ئەو دارەی خەڵك نوێژیان لە ژێردا دەکرد بە هۆکاری ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتی خۆی نوێژی لە ژێردا کردبوو.

(دوڕڕە)کەی شایەتێك بوو بۆ سزادانی کەمترین لادان، وتە ناودارەکەی بەرامبەر (الحجر الأسود) کە وتی: ئەزانم بەردێکی نە سوود دەگەیەنیت نە زیان، بینیومە پێغەمبەر ﷺ ماچی کردووی بۆیە ماچت دەکەم؛ هەڵوێستێکی ئاشکرایە بۆ پاراستنی ئیسلام و نەهاتنە ناوەوەی داهێنراوەکان.

بە هەمان شێوەش (عثمان بن عفان) ﷺ لە سەرکوتکردنی سەرەتا کردنەوەی دەرگای دووبەرەکایەتی و جیاوازی لەسەر جۆری خوێندنەوەی قورئان، وە کۆکردنەوەی موسوڵمانان لەسەر یەك (مصحف) خوێندنەوە، وە بەرهەڵستی بیدعەی (الخروج ومفارقة الجماعة) دەرچوون و یاخیبوون و شۆڕشکردن لە دەسەڵات، ... تا گەیشتە ئەو ئاستەی خۆشی شەهید کرا لەو پێناوەدا.

وە خەلیفەی چوارەم (علي بن أبي طالب) ﷺ بەشی گەورەی بەرکەوت لە بەرهەڵستی بیدعەکاراندا، بەتایبەت خەواریجەکان، کە هەڵگەڕاوە بوون لە سوننەت و موسوڵمانان، کاریان بە سوننەت نەدەکرد و موسوڵمانانیشیان بە کەمترین پاساو بڕیاری "هەڵگەڕانەوە لە دین" دەدا بەسەریاندا، بەتایبەت گەر لەگەڵ خۆیاندا نەبوایە، بە ڕێگەی (تأویل) بۆ بەڵگەکان.

وە گومڕایی (ڕافیزە)کان لە زیادەڕەویکردن لە ئیمام و بنەماڵەیدا و بێبڕواکردنی باقی هاوەڵان، بە سەرکردایەتی (عبدالله بن سبأ) ی کۆنە جوولەکە و لایەنگرانی.

بەدوای ئەمانیشدا کۆی هاوەڵان یەکڕیز بوون و لە یەك خەندەقدا بوون بۆ بەزیندووڕاگرتنی سوننەت و بەربەرەکانێکردن لەگەڵ داهێنراو و بیدعەکاراندا و پاراستنی ئەم دینە، لە هەموو هاتنەناوەوەیەك لە بواری باوەڕی و کرداری (العقيدة والعمل)دا؛ یەك هەڵوێست و پشتی یەك بوون.

هەر لە (ابن مسعود وابن عمر وابن عباس وأبو هريرة ومعاذ وحذيفة وأبو درداء ...) ﷺ، تاوەکو یەك کەسیان مابوو؛ ڕێگەی سوننەت بەرپا بوو، وە داهێنراو لەناوبراو بوو، وە گەر لە دووری خۆیان بیانبیستایە، هەموویان بە یەك دەنگ خۆیانیان لێ بەری دەکرد، وەکوو (ابن عمر) ﷺ بە (قدرية)کانی ڕاگەیاند: «فَإِذَا لَقِيتَ أُولَئِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنِّي بَرِيءٌ مِنْهُمْ، وَأَنَّهُمْ بُرَآءُ مِنِّي»[(١)].

واتە: گەر بەوان گەیشتیت هەواڵیان بدەری من لەوان بەریم، ئەوانیش لە من بەرین.

بەم شێوەیە پارێزەری ئەم دینە بوون، بەڵام دوای هاوەڵان دەرگای داهێنراوەکان کرایەوە و هەموو جۆرە داهێنراوێك بەرپا بوو.

ئەمە وادەی خوایی یە لە سەردەمی پێغەمبەرەکەی دا ﷺ کە دەفەرموێت: «النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ، وَأَنَا أَمَنَةٌ لِأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا

---

(١) رواه مسلم (٨)، وأبو داود (٤٦٩٥)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص١٣٢، وفي "السنن الكبرى" (٢٠٨٧١)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٢٧)، والفريابي في "القدر" (٢١١)، وابن منده في "الإيمان" (١).




**يُوعَدُونَ، وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ»**[(١)].

**واتە: ئەستێرەکان نیشانەی ئەمانەت و مانەوەی ئاسمانن، گەر ڕۆیشتن؛ بەسەر ئاسماندا دێت ئەوەی وادەی بەسەردا دراوە، وە منیش نیشانەی سەلامەتی هاوەڵانمم، گەر ڕۆیشتم؛ دێت بەسەر هاوەڵانمدا ئەوەی وادەیان بەسەردا دراوە، وە هاوەڵانیشم نیشانەی سەلامەتی موسوڵمانانن، گەر ڕۆیشتن؛ دێت بەسەر موسوڵماناندا ئەو وادانەی بەسەریاندا دراوە.**

**گەرچی دەرگای بیدعەکان واڵا بوو و بڵاوبووەوە و تەشەنەی کرد؛ بەڵام لە بەرامبەر ئەمەشدا زانایانی بەرنامە پاك و پەیوەست بە ڕێڕەوی دینی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان لە سەنگەردا بوون بۆیان، بە نوسین و بەرپەرچدانەوە و دژایەتیکردنیان و ئاگادارکردنەوەی موسوڵمانان بەسەر نهێنییەکانیان و بەرنامە گوماناویەکانیاندا، تا ئەوان پەرەیان بسەندایە ئەمان زیاتر بەربەست و ڕێگرییان بۆ دروست دەکردن و بە بەشێك لە کۆشش بۆ دینیان هەژمار دەکرد.**

**وەکو** (يحيى بن يحيى) رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەڵێت: «الذَّبُّ عَنْ السُّنَّةِ أَفْضَلُ مِنْ الْجِهَاد»**[(٢)].

**واتە: پاراستنی سوننەت باشترە لە جیهاد.**

**بۆیە هەر لە سەردەمی** (عمر بن عبدالعزيز وحسن البصري وابن عون وابن مبارك وابن سيرين وأيوب السختياني والشعبي والأوزاعي وابن جبير وسعيد بن المسيب ...)، **تا دەگاتە چینی دوای ئەمان، هەر لە** (امام أحمد بن حنبل والشافعي والبخاري والزهري والبربهاري والمروزي واللالكائي والآجري ...).

**وە لە دوای ئەم چینەش دەست بە دەست** (ابن تيمية والشاطبي وابن القيم والشوكاني وابن الوزير ومحمد بن عبدالوهاب ...)، **تا زانایانی سەر ڕێڕەوی ئەهلی سوننەت لە** (ابن العثيمين وابن باز والألباني وصالح الفوزان وشيخ مقبل ...) **ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت، یەك بەرنامە**

---

(١) رواه مسلم (٢٥٣١)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٤٩)، وأحمد (١٩٥٦٦)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣١٨، والأجري في "الشريعة" (١١٥٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٦١).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ١٣)، "الرد على الأخنائي قاضي المالكية" لابن تيمية ص٥.

و یەك هەڵوێست بوون لە بەرامبەر بیدعە و بیدعەکاراندا، لە ناسینیان و پووچەڵکردنەوەی بەڵگەکانیان و دەرخستنی نهێنییەکانیان و چاوڕۆشنی موسوڵمانان لەسەر ڕێڕەوی سوننەت و ئاشناییان بەسەر بەرنامە و کار و ڕێی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان، ئەمە ڕێڕەوی گەیشتنی ئەم بەرنامەیەیە.

بەڵام ئەمڕۆ هەڵوێستی موسوڵمانان بۆ کارکردن لەسەر ئەم بەرنامەیە لە نێوان زیادەڕەوی و کەمڕەویدایە، بۆتە هۆکاری بەرەوپێشنەچوون و وەرنەگرتنی و سستی تیایدا، لەبەر ترازاندنی لە ڕێڕەوی زانستی حەقی خۆی، لە لایەك کەمتەرخەمی و ساردوسڕییەك و بێ خەمییەکی دینی تێدا بەدی دەکرێت، کە بۆتە هۆکاری بڵاوبوونەوە و پێڕاکێشان لەسەر بیدعەکان، بە هۆکاری هەستنەکردن بە لێپرسراوی دینی و پاساو هێنانەوە بە هەندێك قسە و بەڵگە گوماناوییەکان، وە بگرە ئەم کارانە لەژێر ناوی بانگەوازییەکی دینیدا بەدی دەکرێت، کە ئەمانە بۆ خۆیان خاوەن ئاستێکی کەمن لە شارەزایی زانستە شەرعییەکان و لاوازییان لە تێگەیشتنی دینی و نەزان بە بەرنامە و بنەمای پێشینە سالحەکان و بێئاگاییان لە ڕێگەی هیدایەت و پاشماوەی پڕ بەرەکەتیان.

لە بەرامبەریشدا زیادەڕەوییەکی بێ زانستی وورد، دوور لە خوێندنەوەی مەبەستە شەرعییەکان و تێڕوانین لە بەدیهێنانی ئەنجامی کارە دینییەکان و هەڵوێستی قورس و توند زۆر بە بێباکی لە بەرامبەری دەگیرێتە بەر، کە دەبێتە هۆکاری ئەوەندەی تر تۆراندن و دوورکەوتنەوە و غەریبکردنی بەرنامەکە، زۆربەی کاتیش ئەم هەڵوێستانە لە بەرامبەر کارێك دەگیرێتە بەر کە کارەکە بیدعە نییە، بەڵکوو یا تاوانە یا دونیاییە یا بابەتێکی خیلافی ناو زانایانە یا تێکەڵییەکی تێدایە، کە ئەمانە بۆ خۆیان بە یەکلاکراوەیی پێیان ناوترێت بیدعە، تا خاوەنەکانیان بیدعەکار نەبن.

لەگەڵ ئەمەشدا وەرگرتنی بەرنامەی سوننەت و لایەنگری بۆی بە شێوەی دروستی خۆی و بێزاندنی بیدعە و بیدعەکاران و تینویەتی بەرنامە و کار و ڕێڕەوی هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان، نیعمەت و پلەوپایەیەکی بەرزی خواییە ﷻ، دەیبەخشێت بەوەی ویستی لێیەتی، وەك (عبداللە بن مبارك) رحمه الله دەڵێت: «أَنَّ الْمَوْتَ كَرَامَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللهَ عَلَى السُّنَّةِ»[1].

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١١٦)، و "البدع" لابن وضاح (٢/ ١٥٩)، وفي "الوجيز في عقيدة السلف الصالح" لعبد الله بن عبد الحميد الأثري (٢/ ٢١١).

واته: مردن لەم ڕۆژەدا ڕێزدارییە بۆ موسوڵمان، گەر لەسەر سوننەت بگات بە خوا.

وە (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «أَهْلُ السُّنَّةِ، وَالْجَمَاعَةِ فِي الْإِسْلَامِ كَأَهْلِ الْإِسْلَامِ فِي أَهْلِ الْمِلَلِ»[(١)].

واته: ئەهلی سوننەت لەناو ئیسلامدا وەکوو ئیسلام وایە لەناو دینەکاندا. واتە ئەوەندە نامۆیە.

وە (سفيان الثوري) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «اسْتَوْصُوا بِأَهْلِ السُّنَّةِ خَيْرًا، فَإِنَّهُمْ غُرَبَاءُ»[(٢)].

واته: وەسیەتتان بۆ دەکەم لەگەڵ هەڵگرانی سوننەتدا باش بن، ئەوانە غەریب و نامۆن لەناو خەڵکدا.

دەبێت لەم سەردەمەدا بوترێت چی؟!

لەگەڵ ئەمانەشدا ئیسلام خۆی بڵند و کامڵ و خاوەن پایە و لەخۆگری هۆکارەکانی پاراستنە، وەك:

❁ هەر ئایینی ئیسلامە هەموو خێرەکانی بۆ خۆی کۆکردووەتەوە و کامڵە و ناتەواوی تێدا نییە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ [المائدة: ٣]، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ٦٤﴾ [مريم: ٦٤].

وە (عائشة) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا دایکی ئیمانداران دەڵێت: «مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا كَتَمَ شَيْئًا مِنَ الْوَحْيِ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللهِ الْفِرْيَةَ»[(٣)].

واتە: ئەوەی وا دەری ببڕێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی شاردووەتەوە لەوەی کە بۆی

(١) "الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح" لابن تيمية (١/ ٧١).

(٢) "الأمر بالاتباع والنهي عن الابتداع" للسيوطي ص٧٣، و "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٤٩)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٦/ ٦٤٨).

(٣) رواه البخاري (٧٥٣١)، وفي "خلق أفعال العباد" ص٨٩، ومسلم (١٧٧)، والنسائي في "الكبرى" (١١٠٨٢)، والدارمي في "الرد على الجهمية" (١١٦)، وابن خزيمة في "التوحيد" (٢/ ٥٥٠)، وابن منده في "الإيمان" (٧٦٣)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٩٢٣).

هاتووەتە خوارەوە؛ ئەوە گەورەترین درۆی بەرامبەر خوا کردووە، لەبەرئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ [المائدة: ٦٧].

۞ وە هیچ وادەیەك لە لایەن خواوە ﷻ نییە بۆ پاراستنی هیچ دینێك بێجگە لە ئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ [الحجر: ٩]، وە سوننەتیش لەژێر ئەم وادەیەدایە، لەبەر کاری ڕوونکردنەوە و کاملێ و تەواوبوونی قورئان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ﴾ [النحل: ٤٤].

۞ هەموو گەلێك دەشێت بە کۆی دەنگ گومڕاییان تووش بێت، وەکوو گاوور و جوولەکەکان، بەڵام موسوڵمانان پارێزراون لەمەدا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ قَدْ أَجَارَ أُمَّتِي أَنْ تَجْتَمِعَ عَلَى ضَلَالَةٍ»(١).

واتە: خوای پەروەردگار موسوڵمانانی پاراستووە لەوەی هەموویان کۆ ببنەوە لەسەر گومڕایی.

۞ وادەی تازەکاری و خستنەوە سەر ڕێڕەو بۆ ئیسلامە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا»(٢).

واتە: لە سەری هەموو سەدەیەکدا خوای پەروەردگار کەسێك دەنێرێت بۆ موسوڵمانان، بەرنامەی دینەکەیان بۆ تازە بکاتەوە.

۞ لێنەبڕینی کۆمەڵێکی خاوەن هیدایەت و بەرنامە پاك لە موسوڵمانان، متمانەیەکە تا ڕۆژی دوایی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ»(٣).

---

(١) رواه ابن أبي عاصم في "السنة" (٨٢)، وضياء الدين المقدسي في "الأحاديث المختارة" (٢٥٥٩)، وحسنه الألباني في "الصحيحة" (١٣٣١)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٧٨٦).

(٢) رواه أبو داود (٤٢٩١)، والطبراني في "الأوسط" (٦٥٢٧)، والحاكم في "المستدرك" (٨٥٩٢)، والداني في "السنن الواردة في الفتن" (٣٦٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٥٩٩)، وفي "المشكاة" (٢٤٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٨٧٤).

(٣) رواه البخاري (٧٣١١)، ومسلم (١٩٢٠)، والترمذي (٢٢٢٩)، وأحمد (١٦٩١٢)، والدارمي في "السنن" (٢٤٧٧)، =

واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە موسوڵمانان لەسەر حەقەکەن بە ڕوون و ئاشکرا تا ڕۆژی دوایی.

❁ لە هەمووی دڵخۆشتر؛ هیچ گەلێك نییە پاشماوەی پێغەمبەرەکەیان تیادا مابێتەوە لە گێڕانەوەی فەرموودە و کار و شیکاری تەواوی دینی، بێجگە لە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ نەبێت، کە هەر زیندووە لەناو گەلەکەیدا، وە ڕێڕەوی پڕ زانستی سەربەخۆ هەیە لەناو زانایاندا بۆ گواستنەوە و گەیاندنەوەی سەر پێغەمبەر ﷺ، کە زانستی (علوم الحديث)ە، بە (السند العلمي)یەوە، کە هیچ دینێك خاوەنی ئەم تیۆرتەسەلە زانستییە دەوڵەمەندە نییە.

وەکو (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا و (حسن البصري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێن: «الْإِسْلَامُ يَعْلُو وَلَا يُعْلَى عَلَيْهِ»[1].

واتە: ئیسلام بەرز و بڵندە و هیچ بەسەریدا بەرز نابێت.

ئەم نووسینەش هەوڵێکە بۆ زیاتر چاوڕۆشنی موسوڵمانان لەم بوارەدا، گەرچی بەدەر نییە لە هەڵە و کەم و کورتی، کە ئەمە بۆ خۆی سیمایەکی لێکجیانەبووەوەی ئادەمیزادە.

وەکو (ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لك غنمه، وعلى مؤلفه غرمه، ولك فائدته، وعليه عائدته، فلا تعجل بإنكار ما لم يتقدم لك أسباب معرفته ولا يحملنك شنآن مؤلفه وأصحابه على أن تحرم ما فيه من الفوائد»[2].

واتە: ئەی خوێنەر سوودمەندییەکەی بۆ تۆیە و باجەکەی لەسەر نووسەرە، پەلە مەکە لە دژایەتیکردنی بابەتێك کە لەمەوپێش هۆکاری فێربوونیت نەبووە، وە ڕقلێبوونی خاوەنەکەی و هاوشێوانی نەبێتە هۆکار لە بێبەشبوونی سوودەکانی.

---

= والحاكم في "المستدرك" (٨٣٨٩)، وسعيد بن منصور في "سننه" (٢٣٧٢).

(١) رواه البخاري في "صحيحه" معلقا (٢/ ٩٣)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٥٢٦٧)، وابن زنجوية في "الأموال" (٥٠٦)، وقال الألباني في "الإرواء" برقم (١٣٦٨): إسناده موقوف صحيح وحسن مرفوعاً، وفي "صحيح الجامع الصغير" برقم (٢٧٧٨).

(٢) "شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل" لابن القيم ص٦.

لە کۆتاییدا داواکارم شوێنی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت و ببێتە توێشووی دوارۆژ و مایەی هیدایەت و کاملّی بێت لە دونیا و دیندا، وە هۆکار بێت بۆ زیندووکردنەوە و پەیوەستبوونی زیاتر بۆ سوننەت، وە مراندنی بیدعەکان بێت، وە ئەم کارە بە تەنیا بۆ پەروەردگار بێت و وەرگیراو بێت.

وصلى الله وسلم على عبده ورسوله الصادق الأمين وعلى آله وأصحابه وأتباعه بإحسان إلى يوم الدين

سبحانك اللهم وبحمدك لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

✍

أحمد ملا فائق سعيد

٥ / شعبان / ١٤٣٧ هـ

١٤ / ٥ / ٢٠١٦ م - الجمعة

سلێمانی




# بابەتەکە لەمانە پێکهاتووە

## بەندی یەکەم

### بەشی یەکەم:

١. پێناسەی داهێنراو.

٢. بەڵگە قورئانییەکان لەسەر داهێنراو.

٣. بەڵگە فەرموودەییەکان لەسەر داهێنراو.

٤. وتەی هاوەڵان لەسەر داهێنراو.

٥. وتەی شوێنکەوتووان و زانایان لەسەر داهێنراو.

### بەشی دووەم:

هۆکاری دروستبوونی داهێنراوەکان و نیشانەگشتییەکانی خاوەنەکانیان.

أ- هۆکارە خۆییەکان.

ب- هۆکارە دەرەکییەکان.

### بەشی سێیەم:

بەرنامە و چۆنیەتی وەرگرتنی بەڵگەکان.

أ- بەرنامەی ئەهلی سوننەت.

ب- بەرنامەی بیدعەکاران.




## بەشی چوارەم:

شێوازی کارکردنیان لەگەڵ دەقەکانیان.

١. **هێنانەوەی بەڵگە هاوشێوەکان (المتشابه).**

٢. **بیروباوەڕیان پاشان بەڵگە (اعتقادهم ثم استدلالهم).**

٣. **پشتکردنە بەرنامەی هاوەڵان (هجر منهج السلف الصالح).**

٤. **کارنەکردن بە فەرموودەی (الآحاد).**

٥. **تێکدانی بنەمای تێڕوانین و کردنە بەڵگە (اضطراب أصول النظر والاستدلال).**

## بەشی پێنجەم:

مەترسیداریەتی داهێنراوەکان.

# بەندی دووەم

## بەشی یەکەم:

تێڕوانینێك لەسەر دابەشکردنی داهێنراو.

أ- **دابەشکردنی داهێنراو بۆ دوو جۆر (الحسنة والسيئة).**

ب- **دابەشکردنی بۆ پێنج یاسا شەرعییەکان (الأحكام التكليفية).**

ج- **داهێنراو یەك جۆرە ئەویش (حرام)ە.**

## بەشی دووەم:

جۆرەکانی داهێنراو.

١. **داهێنراوی تەواو (البدعة الحقيقية).**

٢. **داهێنراوی بۆ زیادکراو (البدعة الإضافية).**

**٣. داهێنراوی نەکردوو ( البدعة الترکیة ).**

**٤. بیدعەکاری بەناوی سودمەندییە ڕەچاوکراوە شەرعییەکان ( المصالح المرسلة ).**

## بەشی سێیەم:

**١. بنەما زانستییەکان لە ڕێگری بیدعەکاری ( القواعد الأصولیة والفقهیة علی منع الابتداع ).**

**٢. هەڵوێستی ئەهلی سوننەت لە بەرپەرچدانەوەی بیدعەکاراندا.**

**٣. یاسا بەرنامەییەکان لەکاتی بەرپەرچدانەوەیاندا.**

## بەشی چوارەم:

**١. حوکمی داهێنراوەکان ( حکم البدعة ).**

**٢. حوکمی بیدعەکاران ( حکم المبتدع ).**





# بەندی یەکەم

## بەشی یەکەم

## مانای داهێنراو (البدعة)

**پێناسەی (داهێنراو) له زمانەوانیدا (البدعة في اللغة):** لە زمانی عەرەبیدا وشەی (البدعة) واتای: (البدع، الاختراع، الانشاء، الأحداث، الخلق)ە، هەموو ئەمانە بە واتای دروستکراو، وە داهێنان دێت لە سەرەتاوە.

**هەروەك** (خليل الفراهيدي) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** البَدْعُ: إحداثُ شيءٍ لم يكن له من قبلُ خلقٌ ولا ذكرٌ ولا معرفةٌ. والله بديعُ السموات والأرض ابتدعهما، ولم يكونا قبل ذلك شيئاً يتوهّمها متوهّم، وبدع الخلق.

**والبِدْعُ:** الشيء الذي يكون أولاً في كل أمر، كما قال الله ﷻ: ﴿قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾، أي: لستُ بأوّل مُرْسَل.

**والبِدْعَةُ:** اسم ما ابتدع من الدين وغيره[1].

**واتە: دروستکردنی شتێك کە لەمەوپێش بوون و باس و زانیاری لەسەر نەبووبێت، شتێك سەرەتا بێت لە هەموو کارێکدا، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ [الأحقاف: ٩].

**واتە: ئەی (محمد) بڵێ من یەکەم کەس نیم نێردرابێتم، بەڵکوو پێغەمبەر و نێردراوی زۆر پێش من هەبوون.**

(١) "كتاب العين" (٢/ ٥٤).

هاتنی پێغەمبەر ﷺ بیدعە و داهێنراو و سەرەتایەكی بێ بوون نەبووە.

وە دەفەرموێت: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ [البَقَرَة : ١١٧].

واتە: خوای پەروەردگار داهێنەر و هێنەرەدی ئاسمانەكان و زەوییەكانە، بەبێ بوونی دروستكراو و شێوازێكی پێشوو.

واتە: سەرەتای دروستكردنی لای خوای پەروەردگارەوە بووە.

وە دەفەرموێت: ﴿ وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ ﴾ [الحَدِيد : ٢٧].

واتە: جۆرێك گۆشەگیری و پەرستنیان داهێنا، بەبێ ئەوەی هاوشێوە و جۆری ئەو پەرستنە پێشینەی هەبوو بێت.

لەم پێناسانەوە بۆمان دەردەكەوێت كە وشەی (بدعة) بە مانای شێوازێكی داهێنراو دێت، بەبێ ئەوەی هاوشێوە و جۆری پێشووی هەبووبێت، ئەم وشەیە بەكاردەهێنرێت بە گشتی بۆ هەموو جۆرێكی داهێنراو، دونیایی و دینی، چاك و خراپ، بەڵام وشەیەكی دینییە و زۆری بەكارهێنانی بۆ لایەنی زەم و خراپەیە لە دیندا[(١)]، بە جۆرێك كە وتیان (بدعة): واتە داهێنراوێكی خراپ و لادان لە دیندا.

كەواتە تەنانەت بە گوێرەی زمانەوانی؛ داهێنراو (بدعة) واتە: بێ بناغە و بێ سەرەتا و بێ سەرچاوە.

**پێناسەی (داهێنراو) لە مەبەستی شەرعدا (البدعة في الاصطلاح):** باشترین جۆری پێناسەی شەرعی بۆ (بدعة) لە ڕووە زانستییەكەیەوە كە زانایان زۆر كۆك بن لەسەری، پێناسەكەی ئیمامی (الشاطبي)یە رَحِمَهُ ٱللَّهُ ، كە لە كتێبی "الاعتصام" دا هێناویەتی و شی كردووەتەوە كە دەڵێت:

الْبِدْعَةُ: طَرِيقَةٌ فِي الدِّينِ مُخْتَرَعَةٌ، تُضَاهِي الشَّرْعِيَّةَ، يُقْصَدُ بِالسُّلُوكِ عَلَيْهَا مَا يُقْصَدُ بِالطَّرِيقَةِ الشَّرْعِيَّةِ[(٢)].

---

(١) "النهاية في غريب الحديث والأثر" لابن الأثير (١/ ١٠٧).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٥١).

واته: **داهێنراو**: ڕێگه‌یه‌كه له دیندا داهێنراوه، به هاوشێوه و شێوازی ڕێگا شه‌رعییه‌كان داڕێژراوه، مه‌به‌ستیش پێی په‌یوه‌ستبوون و ڕه‌چاوكردنیه‌تی به هاوشێوه‌ی كاره شه‌رعییه‌كان.

**شیكردنه‌وه‌ی پێناسه‌كه:**

**(طريقة)**: واته: شێواز و چۆنیه‌تییه‌ك دارشتن.

**(في الدين)**: واته: به‌ناوی دین و له دیندا، نه‌ك له دونیادا، مه‌به‌ست پێی پۆشینی به‌رگی دینییه، تا وه‌رگیرێت لای خه‌ڵكی.

**(مخترعة)**: واته: داهێنراوه به‌بێ هیچ بنه‌مایه‌كی دینی.

**(تضاهي الشرعية)**: واته: به هاوشێوه و ڕێوڕه‌سم و چۆنێتی كاره شه‌رعییه‌كان داڕێژراوه.

**(يقصد بالسلوك عليها ...)**: واته: مه‌به‌ست پێی كارپێكردن و په‌یوه‌ستبوونیه‌تی، وه‌كوو كاره شه‌رعییه‌كان.

## جیاوازی نێوان پێناسه‌ی زمانه‌وانی و شه‌رعی

١. داهێنراو له زمانه‌وانیدا گشتگیر ده‌رده‌كه‌وێت، داهێنراوی دینی و دونیایی ده‌گرێته‌وه.

٢. داهێنراو له شه‌رعدا تایبه‌تتره، ته‌نها داهێنراوی دینی ده‌گرێته‌وه و دونیایی ناگرێته‌وه، مه‌گه‌ر په‌یوه‌ست بكرێت به دینه‌وه.

٣. وشه‌ی داهێنراو له دیندا به‌كارده‌هێنرێت و مه‌به‌ست پێی زمانه‌وانییه، ده‌شێت كارێك داهێنراوی پێ بوترێت له زماندا، به‌ڵام پێی نه‌وترێت داهێنراو له شه‌رعدا، وه‌كوو هاندانی كارێك هه‌بێت له دیندا به كورتی، وه كاره‌كه‌ش نه‌یه‌ته دی تاوه‌كوو وه‌فاتی پێغه‌مبه‌ر ﷺ، به هۆكاری ڕێگرییه‌ك له سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا ﷺ، یاخود له‌به‌ر پێویستنه‌بوونی ئه‌و كاره له‌و سه‌رده‌مه‌دا، به‌ڵام له‌پاش سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌و كاره پێویست ده‌بێت و هیچ ڕێگرییه‌كی بۆ نابێت، وه‌كوو كۆكردنه‌وه‌ی قورئان و نوێژی (ته‌راویح) به كۆمه‌ڵ، ئه‌مانه گه‌رچی پێیان ده‌وترێت داهێنراو له زمانه‌وانیدا، به‌ڵام پێیان ناوترێت داهێنراو له‌ڕووی شه‌رعییه‌وه[1].

(١) بڕوانه "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لمحمد يسري ص٢٢.

**٤. لە ڕووی زانستی شەرعییەوە بەکارهێنانی وشەی (البدعة) ڕاستەخۆ و سەرەتا مەبەست پێی پێناسە شەرعییەکەیە، لەبەر مۆرکی دینی و زۆر بەکارهێنانی لەم ڕووەدا، نەك ڕووە زمانەوانییەکە، وە گەر مەبەست ڕووە زمانەوانەوانییەکە بێت؛ ئەوا پێویستی بە پاشگر و زیادە ڕوونکردنەوەیەك هەیە، هەروەك یاسا ئوصولێیەکە دەڵێت: «الْأَصْلُ فِي الْكَلَامِ الْحَقِيقَةُ»[١].**

**واتە: بناغە لە بەکارهێنانی قسەدا مەبەستە ڕاستەوخۆ بەکارهێنانە حەقیقییەکانە.**

**وە یاسای: «الْحَقِيقَةُ الْعُرْفِيَّةِ»[٢].**

**واتە: بەکارهێنانە باوەکان سەلماندنی ئەم باسەیە.**

**٥. پێناسە و دابەشکردنی داهێنراو لە ڕووە زمانەوانییەکەوە و سەپاندنی بەسەر پێناسە شەرعییەکەدا هەڵەیەکی زانستییە.**

  

(١) "الأشباه والنظائر" للسيوطي (١/ ٦٣).

(٢) "نثر الورود على مراقي السعود" للشنقيطي ص٨٧.

# بەڵگە قورئانییەکان لەسەر داهێنراو

# (الآيات القرآنية في ذم البدع)

گەرچی قورئانی پیرۆز کورت و پڕ مانا و لەخۆگرە بۆ هەموو باسێك، وە بە هیچ شێوەیەك باسە گەورە و گرنگەکان بەتایبەت لە خزمەتی دینی و پاراستنیدا پەراوێز ناخات، بەڵام جۆری داڕشتنی قورئان و تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی باسەکانی؛ دەکرێت خاوەن شارەزایی باش و تایبەتی بوێت، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾ [الإسراء : ٩].

واتە: قورئان ڕێ نیشاندەرە بۆ کاملترین کار و ڕێگا.

لەبەر ئەوە دەبینین کەسانێك بڕیار لەسەر داهێنراو دەدەن و پاڵپشتی دەبن، ئاستی تێگەیشتنی قورئان و شارەزایی دینییان زۆر نزمە، وە بگرە متمانەیان نییە کە لە قورئاندا ئەم باسە هەبێت.

لەبەر ئەوەی بەڵگەکانی قورئان لەسەر (بدعة) زیاتر بەڵگەیەکی گشتین، لە چوارچێوەی گوێڕایەڵی و لە فەرمان دەرنەچوون و یەکڕیز پاراستن و دووبەرەکایەتی نەنانەوە و دوورکەوتنەوە لە سوودمەندییە تایبەتییەکان و حەز و ئارەزووە ئادەمیزادییەکاندا خۆی دەبینێتەوە.

گەرچی ئایەتی زۆر هەیە چوارچێوەی ئەم باسە لەخۆ بگرێت، بەڵام ئەو ئایەتانەی کە زۆر ڕوون و ئاشکران و زانایان دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەم بابەتە دەیخەینە ڕوو:

**ئایەتی یەکەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ [آل عمران : ٧].

خوای پەروەردگار هەواڵمان پێ دەدات کە قورئان دوو بەشە: ئایەتە بنەما ماناداراکان: کە ئەمانە ناوەڕۆکی قورئانن، واتە داڕشتنەکانی زۆر ڕوون و ئاشکرا و مانا ڕوونن، هیچ شاراوە و نادیارییان تێدا نییە، وە ئایەتە لێکچووە هاوشێوەکانیشی تێدایە، کە ئاڵۆز و یەکلانەبووەوەن لای زۆری ئادەمیزاد یان هەندێکیان، گەر کەسێك ئەم لێکچوو و ئاڵۆزانە بگێڕێتەوە بۆ ئایەتە

بنەماکان؛ ئەوا لەسەر ڕێی ڕاست و دروستە، وە بە پێچەوانەشەوە پێچەوانەیە[(١)].

ئەم ئایەتە هەر لە سەرهەڵدانی بیدعەکارانەوە کراوەتە بەڵگە لەسەریان، لەو ڕووەوە بیدعەکاران بۆ شوێنکەوتە و ڕەواجی داهێنراوەکانیان پەنایان بردووەتە بەر ئەو بەڵگانەی کە ماناکانیان بە شێوەیەك لە شێوەکان شاراوەیە لای خەڵکی، ئەوانەش کە هەڵدەستن بەم کارە کەسانی گومڕا و لادەرن لەسەر ڕێگەی ڕاست و دروست و ئاشکرای ئەم دینە و خاوەنی ڕێگای جیاواز و بەڵگەکاری شێواو و پێچ و پەنای شێوە زانستییە دینییەکەن، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ ﴾ هەوڵدەری دوو کارن: فیتنەگێڕ و گومڕایی ناو موسوڵمانان و تێکدان و لادانی داڕشتنی بەڵگەکان، ئەمە ستەمە لە مافی خەڵکی، وە لە مافی خواشدا ﷻ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەڵامی پرسیارێکی (عائشة)ی خێزانیدا رضي الله عنها لەسەر ئەم ئایەتە فەرمووی: «فَإِذَا رَأَيْتِ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكِ الَّذِينَ سَمَّى اللهُ فَاحْذَرُوهُمْ»[(٢)]، وفي رواية: «فَإِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِيهِ، فَهُمُ الَّذِينَ عَنَى اللهُ عَزَّ وَجَلَّ، فَاحْذَرُوهُمْ»[(٣)].

واتە: ئەگەر بینیتان ئەو کەسانەی دوای ئایەتە لێکچووەکان (متشابهات) دەکەوتن؛ وە دەمەقاڵێ و دووبەرەکایەتییان لەسەر دەکرد؛ ئەوە ئەو کەسانەن کە خوای پەروەردگار ناویانی بردوون بە خراپەو مەبەستی پێیانە، ئاگاتان لێیان بێت و خۆتانیان لێ بپارێزن.

ئەمە ڕوونکردنەوەیەکی تەواوە، لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە نیشانەی گومڕایی و لادان (الزيغ) پێکدادانە (الجدال) لە قورئاندا، ئەوەش بەهۆی شوێنکەوتەی ئایەتە لێکچووەکانەوەیە (المتشابهات)[(٤)].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٢/ ٦).

(٢) رواه البخاري (٤٥٤٧)، ومسلم (٢٦٦٥)، وأبو داود (٤٥٩٨)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص١١٨، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٢١).

(٣) رواه والترمذي (٢٩٩٣)، وابن ماجه (٤٧)، وابن حبان (٧٦)، وأحمد في "المسند" (٢٤٢١٠)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٥١٦)، والآجري في "الشريعة" (٧٦٩)، وابن بطة في "الإبانة" (٧٧٥).

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٦٩ - ٧٠).

ئەم ئایەتە باس لەوە دەكات كە قورئان پێكهاتەیە لە دوو بەش:

جۆری **(المحكم)**: ئەو ئایەتانەی كە ماناكانی ڕوون و ئاشكرایە، بەهۆی جۆری داڕشتن و پێكهاتەی وشەكانییەوە هیچ جۆرە مانا و لێكدانەوەیەكی تر لەخۆ ناگرێت، وەكوو باسەكانی یەكتاپەرستی و عیبادات و حەڵاڵ و حەرامەكان، ڕەوشتی بەرز و خواناسی و باسەكانی ڕۆژی دوایی.

وە جۆری **(المتشابه)**: ئەو ئایەتانەیە كە شێوەی داڕشتنەكەی دەكرێت چەند جۆرێك مانا لەخۆ بگرێت، لە ڕووی داڕشتنەوە نەك لە ڕووی مەبەستی سەرەكی باسەكەوە، ئەوەش بەهۆی گەڕانەوە بۆ سەر جۆری باس و بنەماكان (المحكم)، لەو شێوەیەدا مانای ڕوون و ئاشكرا و یەكلابوونەوە و دڵنیایی بەدەست دێت[1].

بەتایبەت گەڕانەوە بۆ فەرموودەكان، وەك (عومەری كوڕی خەتتاب) ﷺ دەڵێت: «إِنَّهُ سَيَأْتِي أُنَاسٌ يَأْخُذُونَكُمْ بِشُبُهَاتِ الْقُرْآنِ، فَخُذُوهُمْ بِالسُّنَنِ، فَإِنَّ أَصْحَابَ السُّنَنِ أَعْلَمُ بِكِتَابِ اللهِ»[2].

واتە: خەڵكانێك دێن دووبەرەكایەتیتان لەگەڵ دەكەن بە ئایەتە لێكچووەكانی قورئان (المتشابهات)، ئێوە بە فەرموودەكان بیانگرن، خاوەنی ئاشنایی بە فەرموودەكان زاناترن بە قورئان.

قورئان كورت و پڕ مانا و هەمە لایەنەیە، بەڵام فەرموودە شیكردنەوە و یەكلابوونەوە و مەبەستی تایبەتی باسەكە دەگەیەنێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ [النحل: ٤٤].

واتە: كاری تۆ ئەی پێغەمبەر شیكردنەوەی ئەوەیە كە ناردوومانەتە خوارەوە بۆیان.

بۆیە هەر لە سەرەتای لادان و داهێنانەكانەوە ئەم جۆرە بەڵگە و داڕشتنانە گیراوەتە بەر، وەكوو (خەواریج)ەكان كە یەكەم كۆمەڵی گومڕا بوون، بەرنامەیان كاركردن بوو بە قورئان بەبێ

---

(١) بۆ زیاتر مانای (المحكم والمتشابه) بگەڕێرەوە بۆ تەفسیری "الطبري" (٣/ ١٧٠)، و "القرطبي" (٤/ ٩)، و "ابن كثير" (١/ ٣٤٥)، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٧٠).

(٢) رواه الدارمي في "السنن" (١١٩)، والآجري في "الشريعة" ص٥٢، وابن بطة في "الابانة" (٨٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١/ ١٢٣)، وابن عبدالبر في "الجامع" (١٩٢٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٠٢).

سوننەت، بەکارهێنانی هەڕەشەکان (وعيد) بە گشتی و بەبێ هۆکاری لێبووردن و موژدەکان (وعد)، بە هەڵگەڕانەوە و کافرکردنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، بە هۆکاری بەکارهێنانی ئەو ئایەتانەی کە بۆ بێبڕوایان هاتووە و دابەزاندنی بەسەر موسوڵماناندا[١].

هەموو کۆمەڵە گومڕاکان لە (الرافضة والمعتزلة والمرجئة ...)، باقی ئەوانەی پێیان دەوترێت بیدعەکاران (أهل البدع) لە پێناسەی زاناکانی ئەهلی سوننەدا، تا ئەمڕۆ بەڵگە و پاساوهێنانەوەیان بۆ کارەکانیان بەڵگە مانا هەمە لایەنەکانە (متشابهات).

هەروەك هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەی کردوومانە بە بەڵگە [آل عمران : ٧] لەسەر گاورەکانی (نەجران) بووە، کاتێك وتووێژیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکرد بە کۆمەڵێك (متشابهات)، بۆ سەلماندنی پێغەمبەر (عیسی) ﵇ کە خوایە یاخود کوڕی خوایە یاخود پێکهاتەی سێیەمی خوایە، ئەو ڕوون و ئاشکرایانەیان (المحكم) واز لێ دەهێنا کە بەندە و دروستکراو و پێغەمبەری خوایە، پاشان زانایانی پێشوو ئەم ئایەتەیان دەکردە بەڵگە بەسەر ئەو ڕووداوانەی کە خاوەنەکانیان بە هەمان شێوەی داڕشتن دەیگرتنەوە بە شێوەیەکی گشتی[٢].

نموونەی ئەمڕۆ بوو وەك بەکارهێنانی پێناسەی زاراوەیی (البدعة اللغوي) بۆ پێناسەی شەرعی، یاخود کارە دینییە گشتییەکان بۆ کارە تایبەتییەکان، وەکوو سڵاوات و لکاندنی بە بانگ و قامەتەوە، بە عیبادەتکردنی ئەو کارانەی کە عیبادەت نین، وەکوو لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ و ئیسراومیعراج و شەڕی بەدر و شەوی بەرات ... هتد.

یان بەکارهێنانی داهێنراوی دونیایی و لکاندنی بە داهێنراوی دینییەوە، وەکوو دەڵێن سەیارە و تەیارە و ... بیدعەیە.

(١) قول ابن عمر رضي الله عنهما في "الاعتصام" (٣/ ١٤٨).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٧٤).

**ئایەتی دووەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣﴾ [الأنعام: ١٥٣].

واتە: ئەوانەی پەروەردگار لە قورئاندا ڕوونی کردووەتەوە بۆ بەندەکانی، ڕێگەی ڕاست و دروستی خۆیەتی دەتگەیەنێتە ئەو، شوێنکەوتەی بن، بۆ ڕزگاربوون و سەرفرازیتان، دواکەوتەی ڕێ و ڕێچکە دژ و لادەرەکان بە ئەو مەبن، کە دەبێتە هۆکاری لادانتان لە ڕێی ڕاست و ڕۆشنی ئەو، ئەمە ئامۆژگاری پەروەردگارە بۆ ئێوە، تاوەکوو خواناس و ڕزگاربوو بن[١].

مەبەست لە ڕێگە لادەرەکان کە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ﴾ ئیمامی (المجاهد) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: داهێنراوەکان (البدع)ە[٢].

﴿صِرَٰطِي﴾: ڕێگەکەی بە تاك و خاوەنێتی ناو دەبات، واتە ڕێگەی من، بۆ دەربڕینی تاکە ڕێگەی ڕاستی گەیشتن بە پەروەردگار[٣].

ئەو ڕێگەیەش کە بانگی بۆ دەکات پەیوەست و پەیڕەویکردن و لانەدانی تەواوی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە ڕێ لادەر و پێچەوانەکانی؛ کەسانی خاوەن داهێنراوەکانن (وهم أهل البدع)، نەك ڕێگەی تاوانەکان (المعاصي)، بەڵکوو تاوان کەس نایکات بە ڕێگە تا لەسەری بڕۆن، لەبەر ڕوون و ئاشکرایی تاوانەکان، بەڵکوو ئەو ڕێگە لادەرانە تایبەتە بە داهێنراوەکانەوە، بۆ بەرامبەرکێیەتی و بەدینکردنیان لە ئاستی سوننەتدا[٤].

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٢٨٠.

(٢) "تفسير القرطبي" (٧/ ١٢٤)، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٧٩)، والدارمي في "السنن" (١/ ٦٨)، وابن جرير الطبري في "جامع البيان عن تأويل آي القرآن" (٨/ ٨٨)، وأبو شامة في "الباعث على إنكار البدع والحوادث" (٥٣).

(٣) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٢٨٠.

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٧٦).

بۆ زیاتر ڕوونبوونی ئەم بابەتە (عبدالله ی کوڕی مەسعود) ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خەتێکی ڕاستی بۆ کێشاین و فەرمووی: «هَذَا سَبِيلُ اللهِ»، واتە: ئەمە ڕێگەی خوایە، پاشان چەند خەتێکی تری لای ڕاست و چەپی ئەو خەتە کێشا و فەرمووی: «هَذِهِ سُبُلٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ»، واتە: ئەمە ڕێگە گومڕاکانە، لەسەر هەموو ڕێگەکان شەیتان (خراپەکارێك) بانگەوازی بۆ دەکات، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ [الأنعام : ١٥٣]، (بەکری کوڕی عەلاء) رحمه الله دەڵێت: مەبەست بە شەیتانی ئادەمیزاد؛ خاوەن داهێنەرە (هي البدع)[1].

جا ئەگەر ئەو ڕێ لادەرانە لە بواری بیروڕای بەرنامەیی (العقائد) بێت، یان پەرستن (العبادات)، هیچ جیاوازییەکی نییە، هەمووی لە چوارچێوەی دیندایە، هەروەك دروستبوونی ئەو هەموو تاقم و کۆمەڵانەی کە لە مێژوودا دروست بوون لە هەردوو بوارەکەدا، وەك (الخوارج، والرافضة، والمعتزلة، والتصوف، والمرجئة)، وەکوو پرسیار کرا لە (ابن مسعود) ﷺ: «مَا الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ؟»، واتە: ڕێگای ڕاست کامەیە؟ فەرمووی: «تَرَكَنَا مُحَمَّدٌ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَدْنَاهُ وَطَرَفُهُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَنْ يَمِينِهِ جَوَادٌّ، وَعَنْ يَسَارِهِ جَوَادٌّ، وَعَلَيْهَا رِجَالٌ يَدْعُونَ مَنْ مَرَّ بِهِمْ هَلُمَّ لَكَ هَلُمَّ لَكَ فَمَنْ أَخَذَ مِنْهُمْ فِي تِلْكَ الطُّرُقِ انْتَهَتْ بِهِ إِلَى النَّارِ، وَمَنِ اسْتَقَامَ عَلَى الطَّرِيقِ الْأَعْظَمِ انْتَهَى بِهِ إِلَى الْجَنَّةِ، ثُمَّ تَلَا ابْنُ مَسْعُودٍ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣﴾ [الأنعام : ١٥٣]».[2]

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (٤١٤٢)، والنسائي في "الكبرى" (١١١٠٩)، والدارمي في "السنن" (٢٠٨)، وابن بطة في "الإبانة" (١٠٥)، وابن نصر في "السنة" (١٤)، والحاكم في "المستدرك" (٢/ ٣١٨)، بۆ زیاتر بگەڕێرەوە سەر "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٧٧)، وە شێخ (مشهور) دەڵێت: إسناده صحيح، وە هەروەها (أحمد شاكر) لە "المسند" دا (١/ ٤٦٥)، وە شێخ (ئەلبانی) لە "السنة" لأبي عاصم (١٧) دەڵێت: إسناده حسن.

(٢) رواه الطبراني في "الكبير" (١٠٤٥٤)، وابن وضاح في "البدع والنهي عنها" (٧٧)، والبيهقي في "شعب الإيمان" (١٤٨٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرتاکەی بەجێی هێشتین و کۆتاییەکەی لە بەهەشت دایە، لەملاو لەولایدا بانگەواز هەیە بۆ لادان، ئەوەی وەڵامیان بداتەوە دەکەوێتە ئاگرەوە، ئەوەی خۆڕاگر بێت و بمێنێتەوە؛ دەگاتە بەهەشت، پاشان ئەو ئایەتەی کردە بەڵگە.

مەبەستی (ابن مسعود) ﷺ هەموو بوارەکانی ئایین بوو، لێدەرنەچوون و پەیوەستبوونی تەواو بە هەموو لایەنە دینییەکان.

ئەم ئایەتە هەموو لایەنە داهێنراوەکان دەگرێتەوە، بەبێ تایبەتمەندکردنی هەندێك بە هەندێك[1].

**ئایەتی سێیەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ١٥٩﴾ [الأنعام: ١٥٩].

واتە: خوای پەروەردگار هەواڵ دەدات لەم ئایەتەدا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە ئەو بەرییە لەوانەی دوورکەوتوونەتەوە لە دینە حەقەکەی، وە بوونەتە چەندەها تاقم و کۆمەڵانێك، پێغەمبەر ﷺ لەوان نییەو ئەوانیش لە پێغەمبەر ﷺ نین[2].

گەر ئەمانە جوولەکەو گاوورەکان بن کە لە دینی (إبراهیم الحنیف) ﷺ جیابوونەوە و ناویان لە خۆیان نا، یاخود خاوەن داهێنراوەکان بن لەناو موسوڵمانانلدا، کەسانی شوێنکەوتەی (متشابهات) بن، هەموویان دەرچوو و ڕێ لێونبووی ئایینی پاك و بێگەردی (إبراهیم ومحمد)ن، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ دِينٗا قِيَمٗا مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٦١﴾ [الأنعام: ١٦١][3].

خوای پەروەردگار پێغەمبەر (محمد)ی ﷺ بەری کردووە لێیان[4]، وە هەواڵی پێ داوە بەم ئایەتە، کە لەدوای خۆی لە گەلەکەیدا داهێنراوێکی زۆر دروست دەبێت[5].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٨٠).

(٢) (٣) "تفسیر الطبري" (٥/ ١٣٩).

(٤) "تفسیر ابن کثیر" (٣/ ٤٣٠)، و"تفسیر القرطبي" (٧/ ١٣٥).

(٥) "تفسیر الطبري" (٥/ ١٤٠).

وە فەرمانی پێ کردووە کە بەرائەتی خۆی بنوێنێ لەوانەی کە داهێنەرن و دووبەرەکایەتی لەناو ئایینەکەیدا دروست دەکەن، بەوەی کە دەفەرموێت: ﴿لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ﴾، وە هەڕەشەشیان لێ دەکات کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ [1].

بێبەری بوون لە پێغەمبەرەوە ﷺ، وە سزا و تۆڵە لە خوای پەروەردگارەوە، دڵنەواییەکە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ[2].

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بێبەرییە و هیچ پەیوەندییەکی نامێنێ بە خاوەن داهێنراوەکانەوە، کۆی هەموو تاقمە جیابووەوەکانە، هەر لە (خەوارج، ڕافیزە، موعتەزیلە، مورجیئە، قەدەری، ئەشعەری، ماتۆریدی، ...هتد)، و بە (سۆفی و دەروێش و هەموو جۆرە کۆمەڵە تازەکانی ئەم سەردەمە و دوای ئەمانیش)، بە شێوەیەکی گشتی کۆبەرنامەییان پێوە دیارە لە پەیڕەونەبوون و شوێنەکەوتنی سوننەتەکان و دژایەتی فەرموودە، تەنانەت بێئاگابوون و نەناسین و دووری تەواویان لە زانستی تایبەت بە ناسینی فەرموودە (علوم الحديث) و کوێری تەواویان لە پلەی فەرموودەکاندا، وە بگرە تەنانەت بەرنامەدارشتن بۆ دەربازبوون لە فەرموودە، لەژێر ناونیشانی بەناو زانستی (خبر الآحاد) و (ظني ودلالة) بەڵگە گوماناوییەکان، یا لەگەڵ عەقڵ و عیلمدا نەگونجاندن.

وە پێشووەکانیان (خەوارج و ڕافیزە و موعتەزیلە) بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکوو هەموویان کۆدەنگن لە حوکمدان بە تەکفیرکردن و بە هەڵگەڕاوەبوون و فاسقبوون بە لایەنی هەرەکەمیان بە (عدالة) سەیرنەکردنی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە زانایان و ئەڵقەی گەیاندنی ئەم دینەن، لەگەڵ ئەو هەموو دەقانە لە وەسف و سەنا (التزكية) کردنیان، خوا لێیان ڕازییە و ئەوانیش لە خوا ڕازین، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ﴾ [البَيِّنَة : ٨].

هەر ئەوە ئەهلی سوننەتە بەرنامە و کاریان پێهەڵگری هاوەڵان و تابعین و گرنگیدانیانە بە فەرموودە و زانستەکەی (علوم الحديث)، وە پەیوەستبوونی تەواویان بە پاشماوە و (آثار)ی قسە و

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٢٨٢.

(٢) "تفسير القرطبي" (٧/ ١٣٥).

فەتوای هاوەڵان و تابعین، بۆ یەکلابوونەوە و شیکردنەوەی هەموو جیاوازییەك لـە بۆچوونی دینیدا و ڕەچاوکردنی خوێندنەوەی ڕاوبۆچوون و ئیجتیهادەکانیان لـەپێش هەموو کەس و مەزهەبێکەوەیە لـەبەر پێشینەییەتیان لـەم دینەدا.

ئەمانە هەمووی نیشانەیەکی زۆر دیاری جیاکەرەوەی نێوان ئەهلی سوننەت و فیرەقەکانە، کە هەموو بەرنامە و کۆمەڵێك یەکلا دەکاتەوە لـە پەیوەندی نەبوونیان بە بەرنامە و زانایانی ئەم (منهج)ە، وە لـەخۆگرتنیان بە شێوازی دوورەپەرێزی و بە سەرچاوەنەگرتن و قسە و توانج لـە پێشینی ئەم ئوممەتە، بەتایبەت لـە زانایانی هەڵگر و بانگەوازی ئەم (منهج)ە، بە درێژایی مێژوو بەرنامە و کاری فیرەقەکانە.

وەك ئیمامی (القرطبي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ لـە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: **وَقَدْ قَالَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ الْعَارِفِينَ: هَذِهِ الْفِرْقَةُ الَّتِي زَادَتْ فِي فِرَقِ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هُمْ قَوْمٌ يُعَادُونَ الْعُلَمَاءَ وَيُبْغِضُونَ الْفُقَهَاءَ، وَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ قَطُّ فِي الْأُمَمِ السَّالِفَةِ**[(١)].

واتە: هەندێك لـە زانایانی شارەزا دەڵێن: ئەو تاقمەی گەلی موسوڵمان لـە گاوورو جوولـەکە زیاتر دەکات، کە دەبنە حەفتا و سێ تاقم، کەسانێکن لـە گەلی (محمد) ﷺ کە دژایەتی زانایان و ڕقلێبوونی شەرعناسان دەکەن، بە هیچ شێوەیەك لـە گەلانی پێشوودا نەبوون.

بەڵکوو ئەوان قەشە و عابیدەکانیان سیفاتێکی خوایەتییان پێ دابوون، لـە گۆڕین و گوێڕایەڵێکردنیان، تەنانەت لـە گۆڕینی دیندا، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ ﴾ [التوبة: ٣١].

(أبو هريرة) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: **﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ﴾ هُمْ أَهْلُ الْبِدَعِ وَأَهْلُ الشُّبَهَاتِ وَأَهْلُ الضَّلَالَةِ مِنْ هَذِهِ الأمة**[(٢)].

واتـە: ئەوانەی جیاوازی و دووبەرەکایەتی دروست دەکەن؛ کـەسانی بیدعەکـارانن، خاوەن

---

(١) "تفسير القرطبي" (٧/ ١٢٧).

(٢) "تفسير الطبري" (٥/ ١٣٩)، و "المصنف" لابن أبي شيبة، وابن أبي حاتم (٨١٥١)، و "تفسير ابن كثير" (٣/ ٤٢٠).

گومڕاییەکانن لەم ئوممەتەدا.

(قاضي اسماعيل) و (ابن كثير) ڕەحمەتی خوایان لێبێت دەڵێن: ظَاهِرُ الْقُرْآنِ يَدُلُّ عَلَى أَنَّ كُلَّ مَنِ ابْتَدَعَ فِي الدِّينِ بِدْعَةً مِنَ الْخَوَارِجِ وَغَيْرِهِمْ؛ فَهُوَ دَاخِلٌ فِي هَذِهِ الْآيَةِ؛ لِأَنَّهُمْ إِذَا ابْتَدَعُوا تَجَادَلُوا وَتَخَاصَمُوا وَتَفَرَّقُوا وَكَانُوا شِيَعًا[1].

**واتە: ڕووکەشی قورئان بەڵگەیە لەسەر هەموو کەسێك کە داهێنراوێك لە ئاییندا دابهێنێت، هەر لە (خەواریج)ەکانەوە تا کەسانی تر، ئەم ئایەتە هەموویان لەخۆ دەگرێت، لەبەرئەوەی گەر داهێنراویان دروست کرد؛ ئەوا دەمەقاڵێ و وتی وتی دروست دەکەن لە دیندا و پاشان دووبەرەکایەتی ئەنجام دەدەن.**

**وەکوو ئیمامی (عەلی)** ﷺ **دەڵێت:** «وَاللهِ مَا فَرَّقُوهُ وَلَكِنْ فَارَقُوهُ»[2].

**واتە: سوێند بە خوا جیاوازییان لە دیندا دروست نەکردووە، بەڵکوو لێی جیا بوونەتەوە.**

**وە جۆرێك گێڕاندنەوە لە خوێندنەوەی ئایەتەکە ئەمە دەسەلمێنێت، وەکوو خوێندنەوەی ئیمامی (عەلی و قەتادە) بەم جۆرە:** «إِنَّ الَّذِينَ فَارَقُوا دِينَهُمْ»[3].

**واتە: ئەوانەی لە دینەکەیان جیابوونەوە.**

**ئایەتی چوارەم: خوای گەورە** ﷻ **دەفەرموێت:** ﴿قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ ٦٥﴾ [الأنعام: ٦٥].

**واتە: ئەی (محمد) پێیان ڕابگەیەنە کە خوای پەروەردگار باڵادەستە لە ناردنی سزا بەسەرتاندا، لە سەرەوە و لە خوارەوە و بەرگی پارچەپارچە و دووبەرەکایەتیتان بەسەردا بپۆشێ و تاڵاو و سەختییەکانی یەکتری بچێژن**[4].

(١) "تفسير ابن كثير" (٣/ ٤٢٠)، و"الاعتصام" للشاطبي (١/ ٨٥).

(٢) "تفسير القرطبي" (٧/ ١٤٩)، و "اللباب في علوم الكتاب" لسراج الدين الحنبلي (٨/ ٥٣٠).

(٣) "تفسير الطبري" (٥/ ١٣٧).

(٤) "تفسير الطبري" (٥/ ٢٨٨)، "تفسير ابن كثير" (٣/ ٣٠٥)، و"تفسير القرطبي" (٧/ ١٢).

**مەبەست لە ئایەتەکە:** ﴿أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا﴾**: بەرگی پارچە پارچەبوونتان بەسەردا بپۆشێ.**

**(عبدالله ی کوڕی عەباس)** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا **دەڵێت:** «**يَعْنِي بِالشِّيَعِ الْأَهْوَاءَ الْمُخْتَلِفَةَ**»[(١)].

**واتە: بە پارچە پارچەبوون و هەواو ئارەزووە جیاوازەکانە.**

**وە (مجاهد)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** «**مَا كَانَ مِنْكُمْ مِنَ التَّفَرُّقِ وَالِاخْتِلَافِ**»[(٢)].

**واتە: بەوانەی لە ئێوەدا ڕوو دەدات لە دووبەرەکایەتی و جیاوازییەکاندا.**

**ئەم ئایەتە هێمایە بۆ دروستبوونی جیاوازی و داهێنراوەکان لەدوای ئەم ڕاستە ڕێگە و کۆدەنگبوون لەسەری، لە بنەڕەتدا داهێنراو هۆکاری ناکۆکی و پەرتبوونە، هەروەك (سوننەت) هۆکاری کۆدەنگی و یەکڕیزی دینە، (ابن تیمیة)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** «**الْبِدْعَةُ مَقْرُوْنَةٌ بِالْفِرْقَةِ كَمَا أَنَّ السُّنَّةَ مَقْرُوْنَةٌ بِالْجَمَاعَةِ**»[(٣)].

**واتە: داهێنراو پەیوەستە بە دووبەرەکایەتی و پەرتبوونەوە، هەروەك چۆن شوێنکەوتەی سوننەت پەیوەستە بە یەکڕیزییەوە.**

**وەك (مجاهد)** رَحِمَهُ اللَّهُ **لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا:** ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ ١١٨ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ﴾ [هُود: ١١٨ – ١١٩] **واتە: بەردەوام جیاوازی لە نێوانتاندا دەبێت، بێجگە لەوانەی بەزەیی خوا گرتوونیەتییەوە. دەڵێت:** « ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ﴾ [هُود: ١١٨]: أَهْلُ الْبَاطِلِ، **واتە: ئەوانەی جیاوازییان تیادایە کەسانی ئەهلی بەتاڵن،** ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ﴾ [هُود: ١١٩]: أَهْلُ الْحَقِّ لَيْسَ فِيهِمُ اخْتِلَافٌ» **واتە: خاوەن حەقەکان جیاوازی لە نێوانیاندا نییە**[(٤)].

**وە (عكرمة)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** «**هُمْ أَهْلُ الْسُّنَّةِ**»[(٥)]. **واتە: ئەهلی بەزەیی ئەهلی سوننەتن.**

---

(١) "تفسير الطبري" (٥/ ٢٨٨)، و"الاعتصام" للشاطبي (١/ ٨٦)، وابن أبي حاتم (٧٤١٢).

(٢) "تفسير الطبري" (٥/ ٢٨٨)، و"الاعتصام" للشاطبي (١/ ٨٦)، وابن أبي حاتم (٧٤١٢).

(٣) "الاستقامة" لابن تيمية (١/ ٤٢).

(٤) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (١٧٥٣)، و"الاعتصام" للشاطبي (١/ ٨٧).

(٥) "السنن" لسعيد بن منصور (١١٠٦)، و "جامع البيان" لابن جرير (١٨٧١٣).

وە (مالك بن أنس) ﵀ دەڵێت: «أَهْلُ رَحْمَةِ اللهِ لَا يَخْتَلِفُونَ»[١]. واتە: خاوەن بەزەییەکان جیاوازییان تێدا نییە.

**ئایەتی پێنجەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرمویت: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ [النور: ٦٣].

واتە: با خۆپارێز بن لە جێبەجێنەکردن و پێچەوانەکاری ڕێگە و بەرنامە و سوننەت و شەریعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێوەری وتە و کارەکانیان بە پێوەری وتە و کاری ئەو بێت، گونجان لەگەڵیدا وەردەگیرێت و پێچەوانەکەی دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا گەر هەرکەسێك بێت، گەر وانەبێت ئەوا سزای دڵی دەدرێت بەسەریدا، لە بێبڕوایی و دووڕوویی و بیدعە و داهێنەرییەتی، یاخود سزای دونیایی لە کوشتن و بەندکردن[٢]، لە ئەنجامدا زیاتر گومڕا و سەرلێشێواویان دەکات، بە هۆکاری پێچەوانەکاری پێغەمبەرەوە ﷺ[٣].

ئەم ئایەتە هەڕەشەیەکی بێسنووری تەواوە بۆ کەسانی خاوەن داهێنراوەکان لە وەرنەگرتن و سزادانیان.

کەسێك پرسیار لە ئیمام (مالیك) ﵀ دەکات و دەڵێت: دەمەوێت پۆشینی ئیحرام و (تلبية) لای گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتەکەیدا بکەم، ئەویش فەرمووی: ئەم کارە نەکەی، لە (میقات ذا الحلیفة) بیکە، ئەترسم تووشی فیتنە و کۆتایی بە سزا و وەرنەگرتن بیت، وتی: چ سزایەك، کە من چەند میلێك زیاد دەکەم لە سنووری خۆی؟ ئیمام (مالیك) فەرمووی: «وَأَيُّ فِتْنَةٍ أَعْظَمُ مِنْ أَنْ تَرَى أَنَّكَ سَبَقْتَ إِلَى فَضِيلَةٍ قَصَّرَ عَنْهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟! إِنِّي سَمِعْتُ اللهَ يَقُولُ: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ [النور: ٦٣]»[٤].

---

(١) "السنن" لسعيد بن منصور (١١٠٤)، و "الشريعة" للآجري (٤٦٠)، و"الاعتصام" للشاطبي (١/ ٨٣).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٦/ ١٠١).

(٣) "أضواء البيان" للشنقيطي (٦/ ١٧٣).

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٢٧، ٣٦٧)، و"أحكام القرآن" لابن العربي (٣/ ١٤١٢)، و "الإبانة" لابن بطة (٩٨)، و "السنن الكبرى" للبيهقي (٢٣٦).

واتە: چ سزایەك لەوە گەورەترە كە دەرکت بە چاكەیەك كردبێت پێغەمبەری خوا ﷺ نەیكردبێت؟ پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ [النور: ٦٣].

واتە: ئاگادار بن ئەوانەی فەرمانی ئەو ﷺ دەشكێنن كەوا تووشی بەڵایەك و سزایەكی سەخت ببنەوە.

(سەعیدی كوڕی موسەییب) رضي الله عنه پیاوێكی بینی لە دوای بانگی بەیانی زیاد لە دوو ڕكات دەكات (بەبێ هۆ)، فەرمانی بە نەكردنی دا، پیاوەكە وتی: ئەوە خوای گەورە سزام دەدات لەسەر نوێژ؟ فەرمووی: «لَا، وَلَكِنْ يُعَذِّبُكَ عَلَى خِلَافِ السُّنَّةِ»[(١)].

واتە: نەخێر، بەڵكوو سزات دەدات لەسەر پێچەوانەی سوننەت.

بە هەمان شێوە ئەم كار و وەڵامە لە ئیمامی (عومەر)ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە لەسەر ڕێگرتن لە نوێژی دوای عەسر[(٢)].

(سهل بن عبدالله التستري) دەڵێت: كُلُّ فِعْلٍ يَفْعَلُهُ الْعَبْدُ بِغَيْرِ اقْتِدَاءٍ: طَاعَةً كَانَ أَوْ مَعْصِيَةً، فَهُوَ عَيْشُ النَّفْسِ يَعْنِي: بِاتِّبَاعِ الْهَوَى، وَكُلُّ فِعْلٍ يَفْعَلُهُ الْعَبْدُ بِالِاقْتِدَاءِ؛ فَهُوَ عِتَابٌ عَلَى النَّفْسِ يَعْنِي لِأَنَّهُ لَا هَوَى لَهُ فِيهِ[(٣)].

واتە: هەر كارێك بەبێ شوێنكەوتەی قورئان و فەرمووده بكرێت؛ خاوەنەكەی شوێنكەوتەی حەز و ئارەزووەكانی نەفسی خۆیەتی، وە هەر كارێك بە شوێنكەوتەی سوننەت بكرێت؛ لەناوبردنی هەوا و ئارەزووە نەفسییەكانیەتی.

---

(١) رواه البيهقي في "السنن الكبرى" (٢/ ٦٥٤) برقم (٤١٣١)، و "معرفة السنن والآثار" (٥٢٦٠)، وعبدالرزاق في "مصنفه" (٣/ ٥٢) برقم (٤٧٥٥)، وفي "إرواء الغليل" للألباني (٢/ ٢٣٦) بسند صحيح.

(٢) "الحوادث والبدع" للطرطوشي ص١٤٣، "الفقية والمتفقه" للخطيب البغدادي (١/ ١٤٧).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٢٦)، و"الرسالة القشيرية" للقشيري ص١٥.

**ئایەتی شەشەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ [المائدة : ٣].

واتە: ئەمڕۆ ئایینەکەم بۆ کامڵ کردوون، وە هەموو نیعمەتەکانیشم بۆ تەواو کردوون و ڕازیم بە ئایینی ئیسلام بۆتان.

(ابن عباس) رضي الله عنهما دەڵێت: خوای پەروەردگار هەواڵ دەدات بە پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران، کە ئایینی ئیسلام و باوەڕی بۆ تەواو کردوون و پێویستیان بە هیچ زیادەیەك نییە، وە بە هەموو شێوەیەك پێی ڕازییە و ناتەواوی ناکات، پێویستیان بە ئاین و پێغەمبەرێکی تر نییە، ئەمە گەورەترین بەخشندەیی خۆیەتی بۆ سەر ئەم گەلە[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا لَا يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلَّا هَالِكٌ»[2].

واتە: بەجێم هێشتوون لەسەر ڕووناکییەك، شەوی وەکوو ڕۆژی وایە، لەدوای من کەسی لەسەر گومڕا نابێت، بێجگە لە تیاچوو نەبێت.

وە هەروەها دەفەرموێت: «إِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٍ يُقَرِّبُكُمْ إِلَى الْجَنَّةِ إِلَّا قَدْ أَمَرْتُكُمْ بِهِ وَلَيْسَ شَيْءٌ يُقَرِّبُكُمْ إِلَى النَّارِ إِلَّا قَدْ نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ»[3].

واتە: بە دڵنیاییەوە کارێك نەماوە نزیکتان بخاتەوە لە بەهەشت فەرمانم پێ کردوون، وە هیچ کارێکیش نەماوە نزیکتان بخاتەوە لە ئاگر هەر ڕێگریم لێ کردوون.

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٣/ ٣٢).

(٢) رواه ابن ماجه (٤٣) وقال (شعيب الأرنؤوط): حديث صحيح، وصححه (الألباني) في "صحيح وضعيف سنن ابن ماجه" برقم (٤٣)، وأحمد (١٧١٢٤)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٤٧، ٤٨، ٤٩)، والطبراني في "الكبير" (٦١٩)، والحاكم في "المستدرك" (٣٣١)، وفي "الصحيحة" برقم (٩٣٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٤٣٦٩)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٥٩).

(٣) البغوي في "شرح السنة" (٤١١١)، والألباني في "مشكاة المصابيح" برقم (٥٣٠٠)، وفي "الصحيحة" (٢٨٦٦).

**(مالیکی کوڕی ئەنەس)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** مَنْ أَحْدَثَ فِي هَذِهِ الْأُمَّةِ شَيْئًا لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ سَلَفُهَا؛ فَقَدْ زَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَانَ الرِّسَالَةَ؛ لِأَنَّ اللهَ يَقُولُ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ [المائدة: ٣]، فَمَا لَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ دِينًا؛ فَلَا يَكُونُ الْيَوْمَ دِينًا[١].

**واتە: هەر کارێك لەم ئوممەتەدا بکرێت کە پێشینان نەیانکردبێت؛ ئەوا خاوەنەکەی وای دەردەبڕێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ خیانەتی لەم دینە کردووە بە نەگەیاندنی، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ [المائدة: ٣]، **کەواتە ئەوەی ئەوڕۆژە دین نەبووبێت؛ ئەمڕۆ دین نییە.**

**مەبەست لەم بەڵگەیە ئەوەیە کە دین لای خواوە** ﷻ **کامڵ و تەواو بووە و پێویستی بە هیچ کەسێك و هیچ کارێك نییە بۆی زیاد و کەم بکرێت، بیدعەکاریش بە بیدعەکەی وای دەگەیەنێت کە دین پێویستی بەو کارانە هەیە کە تێیدا باس نەکراوە و ئەم بۆی داهێناوە، ئەمە بەرپەرچدانەوەی ئەم ئایەتەیە کە گەورەترین پلە و قەدری ئیسلام دەگەیەنێت.**

**ئایەتی حەوتەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ [الشورى: ٢١].

**واتە: ئایا خواکانیان یاسا و پابەندبوونی تازەیان بۆ داهێناون لە ئاییندا، کە خوای پەروەردگار ڕێگەی پێ نەداون[٢].**

**یاسا داڕشتن مافی خوایە، گەر یەکێك یاسا دابڕێژێت مانای ئەم دوو کارە دەگەیەنێت:**

**یەکەم: هاوبەشی خوایە لە یاساداناندا.**

**دووەم: دەبێت خوا ڕێگەی پێدابێت.**

**لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەمانە بوونی نییە، کەواتە بیدعەکاران نە هاوبەشن نە ڕێگە پێدراون.**

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٣٦٨).

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٧٥٧، و "زاد المسير في علم التفسير" لابن الجوزي (٤/ ٦٣).

به هیچ شێوەیەك خوای پەروەردگار موڵەتی کەسی نەداوە بە ناوی دینەکەیەوە کار و کردەوەیەکی زۆر بەدین بکات، لەبەر ئەوەی یاسا دارێژ (المشَرِّع) بۆ بەندەکانی هەر ئەوە، وەکوو دەفەرمویێت: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ [الأعراف : ٥٤].

واتە: هەموو دروستکراوەکان هەر ئەو دروستی کردوون، هەر فەرمانی ئەویش بەسەریاندا جێبەجێ دەکرێت.

تەنانەت پێغەمبەران (علیهم السلام) یاسا دارێژ (المشَرِّع) نین و کاریان تەنها گەیاندنە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ﴾ [المائدة : ٩٩]. وە دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَـٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾﴾ [الرعد : ٤٠]. وە دەفەرموێت: ﴿فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾﴾ [النحل : ٣٥]. وە دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَـٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٢﴾﴾ [التغابن : ١٢]. وە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾﴾ [النجم : ٣ - ٤]. وە دەفەرموێت: ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ﴾ [هود : ١١٢].

گەر پێغەمبەران (علیهم السلام) مافی دارِشتنی یاسا و بەرنامەیان پێ نەدرابێت؛ دەبێت چ کەسێك ئەو مافە بە خۆی یاخود کەسێکی تر بدات؟! بە ناوی ویست و ئیرادەی خوا و دینەکەیەوە ڕێگە دارێژ بێت! ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾﴾ [البقرة : ١٦٩]. بەناوی خواوە بڕیار بدەن و لەگەڵ ئەوەشدا نایزانن.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ ﴾ [الحجرات : ١٦].

واتە: ئەی (محمد) بڵێ ئێوە خوا فێری دینەکەتان دەکەن؟!

وە دەفەرموێت: ﴿قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ﴾ [البقرة : ١٤٠].

واتە: ئەی (محمد) بڵێ ئەوە ئێوە زانان بەسەر دینەکەیدا، یاخود خوای گەورە ﷻ خۆی؟!

پلەو پایەیەکمان نییە بۆ بەندەکان بێجگە لە بەندایەتی تەواو نەبێت، گەر لە هەر ئاستێکی بەرزدا بێت دەبێت زیاتر بەندایەتی بکات و ملکەچ و جێبەجێکاری بەرنامەکە بێت.

ئەمە بەرپەرچی گاوورو جوولەکەکان دەداتەوە لە بەرزکردنەوەی پلەی پێغەمبەرەکەیان تا ئەوەی کە دەڵێن بەشێکە لە خوا، یان کوڕی خوایە، وە قەشەکانیان جێگری پێغەمبەرەکەیانن، لەو وەصفانەدا بۆیان هەیە هەموو گۆڕانکارییەك لە دیندا دروست بکەن، وە بەرپەرچە بۆ (شیعە و تەصەوف) کە پێشەواکانیان (الأئمة) بە بێتاوان (معصوم)دادەنێن، وە پلەی (ولاية الفقيه) و (علم الباطن)یان دەدەنێ بۆ گەڕانەوەی گۆڕانکاری دینی بۆیان (المرجعية).

لەگەڵ ئەوەشدا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ٢٦﴾ [الكهف : ٢٦].

واتە: یەك بوون (هیچ کەس) بەشدار و هاوبەشی یاسای پەروەردگار ناکات.

  

# بەڵگە فەرموودەییەکان لەسەر داهێنراو

## (الأحاديث النبوية في ذم البدع)

ئاشکرایە کە فەرموودە شیکەرەوەی قورئانە، بۆیە زۆرتر بەڵگە لەخۆ دەگرێت، لەبەر جۆری کاری پێغەمبەر ﷺ، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ [النحل : ٤٤]، وە کاری شیتەڵکاری قورئان و کردنەوەی گرێ و یەکلابوونەوەی دەقەکانە، تاوەکوو هیچ گۆشەیەکی ئایین بە شاراوەیی نەمێنێتەوە، وە بەڵگەش بە کەس نەمێنێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾ [النساء : ١٦٥].

واتە: تاوەکوو دوای پێغەمبەران بەڵگە بۆ کەس نەمێنێت.

وە دەفەرموێت: ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾ [الأنفال : ٤٢].

واتە: تاوەکوو مانەوە و تیاچوونتان بە ڕوونی و بە ئاشکرایی بێت.

### فەرموودەی یەکەم: هەموو داهێنراوێك گومڕاییە و لە ئاگردایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «... وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»[١]. وفي لفظ: «فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ يَرَى بَعْدِي اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»[٢].

---

(١) رواه مسلم (٢٦٠٦)، وابن ماجه (٤٦)، والنسائي في "الكبرى" (١٧٩٩) واللفظ له، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٧٨٥)، وأحمد في "المسند" (١٧١٤٥)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٢١)، وابن بطة في "الإبانة" (١٧١)، والآجري في "الشريعة" (٨٤)، وابن وضاح في "البدع" (٥٧)، وأبونعيم في "الحلية" (٣/ ١٨٩)، والبيهقي في "سنن الكبرى" (٥٨٠٠)، و "الشعب" (٤٤٥٢)، وفي "أحكام الجنائز" للألباني ص١٨، و "الإرواء" (٦٠٨)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٣٥٣).

(٢) رواه ابن ماجه (٤٢) وقال (شعيب الأرنؤوط): حديث صحيح بطرقه وشواهده، وأبو داود (٤٦٠٧) واللفظ له، والترمذي=

واتە: ئەوەی دوای من بژی جیاوازییەکی زۆر دەبینێت، پەیوەست بن بە سوننەتی من و جێنشینانی کاملّدینی دوای من، ئاگاداری کارە تازە و داهێنراوەکان بن، هەموو تازە داهێنانێك داهێنراوە (لە دیندا)، وە هەموو داهێنراوێك گومڕاییە.

وە دەفەرموێت: «... كُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ»[1].

واتە: هەموو داهێنراوێك گومڕاییە، وە لە ئاگردایە.

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەکی زۆربەی وتارەکانی دەکردەوە، بەردەوام ئامۆژگاری بە پەیوەستبوون بە قورئان و سوننەت و دوورکەوتنەوە و دژایەتیکردنی داهێنراوە دینییەکان لە وتارەکانیدا دەکرد.

گەر گرنگییەکی زۆر بە خزمەت بۆ دینەکە نەبوایە پێداگری لەسەر نەدەکرد.

گەیاندنی هەموو دین و هۆکاری پاراستنەکانی کاری پێغەمبەرایەتی (محمد)ە ﷺ، لەبەر ئەوە پێشەکی هەموو وتارەکانی بووە.

## فەرموودەی دووەم: داهێنراو هۆکاری ڕەدکردنەوەیە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»[2].

---

= (٣٤٢٧)، وأحمد (١٧١٤٤)، والبيهقي في "الكبرى" (٢٠٣٣٨)، وفي "الشعب" (٧١١٠)، والدارمي (٩٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٥٤)، والآجري في "الشريعة" (٨٦)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٢١)، والحاكم في "المستدرك" (٣٢٩) وقال (الذهبي): صحيح ليس له علة، وفي "مشكاة المصابيح" (١٦٥) وصححه، وفي "الصحيحة" (٢٧٣٥، ٣٠٠٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٥٤٩)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٥٠).

(١) تعليق (شعيب الأرنؤوط) في "المسند": وفي الرواية الموقوفة عند البيهقي واللالكائي زيادة: "كل ضلالة في النار"، وهي في بعض طرق جابر.

وفي "حجة النبي ﷺ" للألباني ص١٤، و "أحكام الجنائز" ص٣٠، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" تحت حديث رقم (٤٩): زاد النسائي (١/ ٢٣٤) وابن خزيمة في "صحيحه" (١٧٨٥) وغيرهما: "وكل ضلالة في النار"، وإسنادها صحيح، وفي "الإرواء" برقم (٦٠٧).

(٢) رواه البخاري (٢٦٩٧)، ومسلم (١٧١٨) واللفظ له، وأبو داود (٤٦٠٦)، وابن ماجه (١٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٦، ٢٧)، وأحمد في "المسند" (٢٦٣٢٩)، والدارقطني (٤٥٣٤)، والبيهقي في "الكبرى" (٢٠٥٣٦)، وفي "صحيح الترغيب والترهيب" (٤٩).

وَحَدِيْثُ: «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»[١].

وَفِيْ لَفْظٍ: «مَنْ صَنَعَ أَمْرًا عَلَى غَيْرِ أَمْرِنَا فَهُوَ رَدٌّ»[٢].

**واتە: هەرکەسێك فەرمانێك دابهێنێت کە لەسەر فەرمانی ئێمە نەبێت؛ ڕەت دەکرێتەوە.**

**زانایان ئەم فەرموودەیە بە یەك لەسەر سێی بنەمای ئیسلام دادەنێن، لە هەمەلایەن وەرگرتن و پڕ مانایەتیدا.**

(ابن حجر العسقلاني) رَحِمَهُ اللهُ **دەڵێت**: وَهَذَا الْحَدِيثُ مَعْدُودٌ مِنْ أُصُولِ الْإِسْلَامِ وَقَاعِدَةٌ مِنْ قَوَاعِدِهِ ... قَالَ النَّوَوِيُّ هَذَا الحَدِيث مِمَّا يَنْبَغِي أَنْ يُعْتَنَى بِحِفْظِهِ وَاسْتِعْمَالِهِ فِي إِبْطَالِ الْمُنْكَرَاتِ ... وَقَالَ الطَّرْقِيُّ هَذَا الْحَدِيثُ يَصْلُحُ أَنْ يُسَمَّى نِصْفَ أَدِلَّةِ الشَّرْعِ ... وَفِيهِ رَدُّ الْمُحْدَثَاتِ وَأَنَّ النَّهْيَ يَقْتَضِي الْفَسَادَ[٣].

**واتە: ئەم فەرموودەیە بە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام هەژمار دەکرێت و بنەڕەتێکە لە بنەڕەتە یاساییەکانی.**

**وە ئیمامی (النووي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: پێویستە ئەم فەرموودەیە لەبەر بکرێت و جێبەجێ بکرێت بەسەر هەموو کارێکی بێ بناغە و بەتاڵدا.**

**وە (الطرقي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: دەشێت ئەم فەرموودەیە پێکهاتەی نیوەی بەڵگە شەرعییەکان بێت.**

**ئەم دوو فەرموودەیە دەکرێتە بەڵگە بۆ بەشی دووەمی مەرجەکانی کارە عیبادەتییە دینییەکان، کە (المتابعة)یە، لەپاش (الإخلاص)، واتە شوێنکەوتەی تەواوی دەقەکانی ئیسلام لە هەموو**

---

(١) رواه مسلم (١٧١٨)، والبخاري ( بَابُ إِذَا اجْتَهَدَ العَامِلُ أَوِ الحَاكِمُ، فَأَخْطَأَ خِلاَفَ الرَّسُولِ مِنْ غَيْرِ عِلْمٍ، فَحُكْمُهُ مَرْدُودٌ )، وفي "خلق أفعال العباد" ص٦٢، و "مختصر صحيح البخاري" (٣٣٩)، وأحمد في "المسند" (٢٥٤٧٢)، والدارقطني (٤٥٣٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٥٢)، وفي "الإرواء" (٨٨)، و "صحيح الجامع الصغير" (٦٣٩٨) .

(٢) رواه أبو داود (٤٦٠٦) واللفظ له، والبيهقي في "الكبرى" (٢١١٩٦)، وأحمد في "المسند" (٢٤٤٥٠)، وفي "صحيح الجامع الصغير" (٦٣٦٩)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٤٩).

(٣) "فتح الباري" لابن حجر (٥/ ٣٠٢ – ٣٠٣).

کارێکی دینیدا، تاوەکوو وەربگیرێت.

ئەم فەرموودەیە دەبێتە تەرازوو و کێشانەی هەموو کارێکی دینی لە دونیادا پێش تەرازوو و کێشانەکەی ڕۆژی دوایی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ﴾ [الحَدِيد: ٢٥].

دارشتنی بەرنامە و یاسا مافی خوای پەروەردگارە و زەوتکردنی خۆکردن بە خوایەتییە لەو بوارەدا بەسەر بەندەکانییەوە، وە لەلایەکی ترەوە هەرکەسێك چەندە پلەوپایەی ئیمانی و زانستی دینی هەبێت؛ بۆی نییە سنووری بەڵگەکان ببەزێنێت.

## فەرموودەی سێیەم: بیدعەکاران دەرچوون لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

عَنْ حُذَيْفَةَ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ شَرٌّ؟ قَالَ: «نَعَمْ، قَوْمٌ يَسْتَنُّونَ بِغَيْرِ سُنَّتِي، وَيَهْتَدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي ...»[١]. وَفِيْ لَفْظِ الْبُخَارِي: «قَوْمٌ يَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيٍ ...»[٢].

واتە: (حوزەیفە) ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دوای ئەم خێرە (ئیسلامە پاك و بێگەردە) شەڕ ئەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ، کەسانێك دێن شوێنکەوتەی ڕێگە و سوننەتەکانی من نابن.

مەرجی مانەوەی دینداریيەکی پڕخێر و ڕاست و دروست؛ لانەدانە لەسەر شوێنکەوتەیی سوننەت، گەر لادان و ویست و ئارەزووەکانی خەڵکی بە دینداری کرا؛ ئەوا هەموو جۆرە شەڕێك لە دونیا و دینی ئەو خەڵکەدا ڕوو دەدات، بە بەرنامە و پەیڕەوکردنی سەرچاوەکە کە قورئان و فەرموودەیە ون دەبێت، هەرکەسێك دێت ئارەزوو و ویستەکانی خۆی تێکەڵ دەکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ مِمَّا أَخْشَى عَلَيْكُمْ شَهَوَاتِ الْغَيِّ فِي بُطُونِكُمْ وَفُرُوجِكُمْ وَمُضِلَّاتِ الْهَوَى»[٣].

---

(١) رواه البخاري (٧٠٨٤)، ومسلم (١٨٤٧) واللفظ له، والبيهقي في "الكبرى" (١٦٧٩٥)، وفي "صحيح الترغيب والترهيب" (٥٦، ٥٧)، وابن وضاح في "البدع" (٧٩)، وفي "الأجوبة النافعة" للألباني ص١١٢.

(٢) "مختصر صحيح البخاري" (٢٦٤٦)، ورواه البغوي في "شرح السنة" (٤٢٢٢).

(٣) رواه أحمد في "المسند" (١٩٧٧٣)، وقال (شعيب الأرنؤوط): رجاله ثقات رجال الصحيح غير أنه منقطع، ورواه البزار في =

واتە: ئەوەی بترسم لێتان حەز و خۆشییەکانی ناوسك و شەهوەتتانە، لەگەڵ هەوا و ئارەزووە گومڕاکانتان.

«مُضِلَّاتِ الْهَوَى»: مەبەست بەمەیە لە فەرموودەکەدا: لادان لە سوننەت، کەوتنە ناو گومڕاییەوەیە.

وشەی «مضِلاَت» بەرامبەر «الْهِداية، السُّنَّة»یە، دوو وشەی دژبەیەکن، لە یەك کاتدا لە کەسێکدا کۆ نابێتەوە؛ هەر یەکێکیان ئەویتریان دەردەکات.

وەکوو یاسایەکمان هەیە دەڵێت: «مَمْنُوعٌ اجْتِمَاعُ النَّقِيضَيْنِ» واتە: نەگونجاوە کۆبوونەوەی دوو دژبەیەك.

## فەرموودەی چوارەم: داهێنراو هۆکارە بۆ بێبەشکردنی خاوەنەکەی لە حەوزی پێغەمبەر ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الحَوْضِ، وَلَيُرْفَعَنَّ مَعِي رِجَالٌ مِنْكُمْ ثُمَّ لَيُخْتَلَجُنَّ دُونِي، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أَصْحَابِي، فَيُقَالُ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ»[(١)]. وَفِي لَفْظِ مُسْلِمٍ: «إِنِّي لَكُمْ فَرَطٌ عَلَى الْحَوْضِ، فَإِيَّايَ لَا يَأْتِيَنَّ أَحَدُكُمْ فَيُذَبُّ عَنِّي كَمَا يُذَبُّ الْبَعِيرُ الضَّالُّ، فَأَقُولُ: فِيمَ هَذَا؟ فَيُقَالُ: إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، فَأَقُولُ: سُحْقًا»[(٢)].

واتە: من پێشتان ئەکەوم بۆ سەر (حوض)، کەسانێك لە ئێوە بەرەو لای من دێن، پاشان ڕێگرییان لێ دەکەن، دەڵێم: ئەی پەروەردگار هاوەڵانم، پێم دەڵێن: تۆ نازانیت دوای تۆ چییان

= "مسنده" (٣٨٤٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٣٢)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (٥/ ٢٨)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" برقم (٥٢، ٢١٤٣).

(١) رواه البخاري (٦٥٧٦) واللفظ له، ومسلم (٢٢٩٧)، وابن ماجه (٣٠٥٧)، وأحمد (٣٦٣٩)، والطبراني في "الكبير" (٦٦١)، وابن أبي شيبة في "مصنفه" (٣٧١٧٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٧٣٦) و (٧٦٢)، وأبو يعلى (٥١٩٩).

(٢) رواه مسلم (٢٢٩٥).

**داهێنا، منیش دەڵێم: تیا بچن، لە سزای داهێنراوەکانیاندا ئەم دوعایەیان لێ دەکات.**

(ابن عبدالبر) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** كُلُّ مَنْ أَحْدَثَ فِي الدِّينِ فَهُوَ مِنَ الْمَطْرُودِينَ عَنِ الْحَوْضِ[1].

**واتە: هەرکەسێك داهێنراو لە دیندا دروست بکات؛ دەرکراوە لەسەر حەوزی پێغەمبەری خوا** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

**ئیمامی** (الشاطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت: کۆمەڵێك لە زانایان دەڵێن: کەسانی خاوەن داهێنراوەکانن کە لە حەوزی پێغەمبەر** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **دەردەکرێن**[2].

**وە لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەری خوا** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **ئاماژە بۆ سوننەت و کارەکانی خۆی دەکات، دەفەرموێت:** «... وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي»[3].

**واتە: مینبەرەکەم لەسەر حەوزەکەمە.**

**بەو مانایەی گەر پەیوەست نەبن بە ڕێگە و سوننەتی خاوەن مینبەرەکە و ئەو شێوە کارانەی کە لەوێدا ئەنجام دراوە؛ شایستەی دەرکردنن لەسەر حەوزی خاوەن مینبەر.**

**وشەی** «مَا أَحْدَثُوا»**: هەموو جۆرە داهێنراوێك لە گەورە و بچووك دەگرێتەوە، لە بواری بیروباوەڕ** (عقائد)**دا بێت یاخود پەرستنەکان** (عبادات).

**ئیمامی** (النووي) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** وَالثَّالِثُ أَنَّ الْمُرَادَ بِهِ أَصْحَابُ الْمَعَاصِي وَالْكَبَائِرِ الَّذِينَ مَاتُوا عَلَى التَّوْحِيدِ وَأَصْحَابِ الْبِدَعِ الَّذِينَ لَمْ يَخْرُجُوا بِبِدْعَتِهِمْ عَنِ الْإِسْلَامِ[4].

**واتە: ڕای سێیەم: مەبەست بەو فەرموودە تاوانباران و ئەو خاوەن داهێنراوانەن کە لە ئیسلام دەریان ناکات، بەڵکوو بێبەش دەکرێن لە حەوزی پێغەمبەر** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

---

(١) "شرح النووي على مسلم" (٣/ ١٣٧).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٠٦).

(٣) رواه البخاري (١١٩٦)، ومسلم (١٣٩١)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٧٥٠)، وأحمد في "المسند" (٧٢٢٣)، والطبراني في "الأوسط" (٦٤٤٤)، وعبدالرزاق في "مصنفه" (٥٢٤٣)، وفي "صحيح الجامع الصغير" برقم (٥٥٨٧).

(٤) "شرح النووي على مسلم" (٣/ ١٣٧).

**فەرموودەی پێنجەم: داهێنراو هۆکاری تیاچوونە.**

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «فَإِنَّ لِكُلِّ عَابِدٍ شِرَّةً، وَلِكُلِّ شِرَّةٍ فَتْرَةً، فَإِمَّا إِلَى سُنَّةٍ، وَإِمَّا إِلَى بِدْعَةٍ، فَمَنْ كَانَتْ فَتْرَتُهُ إِلَى سُنَّةٍ، فَقَدِ اهْتَدَى، وَمَنْ كَانَتْ فَتْرَتُهُ إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ فَقَدْ هَلَكَ»[١].

واتە: بۆ هەموو خاوەن (کارێك) و عیبادەتێك هەوڵ و توانا و گوڕێکی هەیە، وە هەموو توانایەك سستی بەدوایدا دێت، جا ئەو هەوڵ و توانایە لەسەر ڕێگەی سوننەت بێت خاوەنەکەی هیدایەتدراوە، وە بە پێچەوانەوە تیاچووە.

هەوڵ و تێکۆشانەکان گەر بۆ شوێنکەوتەی سوننەت و زیندووبوونەوەی بێت ڕێگەی کاملێ هیدایەت و دینداریيە، بە پێچەوانەوە تیاچوون و لەدەستدانە.

**فەرموودەی شەشەم: بیدعەکار دژی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.**

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «وَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[٢].

واتە: ئەو کەسەی لابدات لە سوننەتی من لە من نییە.

ئەمە لە کاتێکدا کە کۆمەڵێك هاتن پرسیاریان لە عیبادەتی پێغەمبەر ﷺ کرد و بە کەمیان زانی و هەریەکەیان بڕیاریاندا بە جۆرێك لە عیبادەت و گۆشەگیر و پەیوەست بن پێوەی.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەڵامیاندا کاتێك ویستیان ئەو کارانە بکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە، وە واز لەو کارانە بێنن کە کردوویەتی (وەك ژنهێنان و ...)، پێغەمبەریش ﷺ ئەم فەرموودەیەی فەرموو.

---

(١) رواه أحمد (٦٤٧٧)، وقال (أحمد شاكر): إسناده صحيح، وابن حبان في "صحيحه" (١١)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٢٨٥)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (٨/ ١١٨)، ونقله الألباني في "أصل صفة صلاة" (٢/ ٥١٨) وحكم عنه بأنه: إسناده صحيح على شرطهما، وفي "صحيح الجامع الصغير" (٢١٥٢)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٥٥).

(٢) رواه البخاري (٥٠٦٣)، ومسلم (١٤٠١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٣٠٥)، وأحمد (١٣٥٣٤)، والدارمي (٢٢١٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٩٧)، وابن حبان في "صحيحه" (١٤)، والطبراني في "الكبير" (٢١٨٦)، وفي "المشكاة" (١/ ٥٢)، و "الإرواء" (١٧٨٢)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٣٣٦)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (١٩١٨).

**داهێنراو لەم دوو حاڵەتە بەدەر نییە:**

**یەکەم:** نەکردنی کارە سوننەتەکان.

**دووەم:** کردنی کارە داهێنراوەکان.

وە بگرە هەموو داهێنراوێك سوننەتێك لەناو دەبات و دەیمرێنێت.

(أبي إدريس الخولاني) و (حسان بن عطية) ڕەحمەتی خوایان لێبێت دەڵێن: مَا أَحْدَثَتْ أُمَّةٌ فِي دِينِهَا بِدْعَةً؛ إِلَّا رَفَعَ اللهُ بِهَا عَنْهُمْ سُنَّةً[١].

واتە: هەر گەلێك لە دینەکەیاندا داهێنراو (بدعة)یەك دروست بکەن؛ ئیلا خوای گەورە سوننەتێکیان لەناودا هەڵدەگرێت.

وە هەندێك لە پێشینان (السلف) دەڵێن: لَا يُحْدِثُ رَجُلٌ فِي الْإِسْلَامِ بِدْعَةً؛ إِلَّا تَرَكَ مِنَ السُّنَّةِ مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْهَا[٢].

واتە: هەر کەسێك داهێنراو (بدعة)یەك لە ئیسلامدا دروست بکات؛ ئیلا لەوە باشتر وازیان لە سوننەت هێناوە.

## فەرموودەی حەوتەم: بیدعەکار تاوانی شوێنکەوتوانی لە ئەستۆ دەگرێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى، كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ، كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا»[٣].

---

(١) "البدع" لابن وضاح (٨٧، ٩٠)، ورواه الدارمي في "السنن" (٩٩)، واللالكائي في "السنة" (١/ ٩٣)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٢٨)، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٥٣).

(٢) "البدع" لابن وضاح (٩٢)، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٥٣).

(٣) رواه مسلم (٢٦٧٤) (١٦)، وأبو داود (٤٦٠٩)، والترمذي (٢٦٧٤)، وابن ماجه (٢٠٦)، وابن حبان (١١٢)، وأحمد (٩١٦٠)، وأبو يعلى (٦٤٨٩)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٩)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٢٣٠، واللالكائي (٦)، والدارمي (٥١٣) ، وابن أبي عاصم في "السنة" (١١٣)، ومالك في "الموطأ" (١/ ٢١٨).

وَحَدِيْثُ: «مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ»(١).

واتە: هەرکەسێك بانگخواز بێت بۆ ڕێگەی هیدایەت (کارێکی چاکە بکات)، پاداشتی خۆی هەیە و ئەوانەشی کە شوێنکەوتە و چاولێکەرین، بەبێ کەمبوونەوەی پاداشتیان، وە بانگخواز و داهێنەری کارێکی خراپ و (گومڕا بێت) تاوانبارە، وە تاوانی ئەوانەشی کە شوێنکەوتەین، بەبێ کەمبوونەوەی تاوانی ئەوان.

دوو ڕێگەی زۆر ڕوون و ئاشکرا، ڕێگەی سوننەت و بەڵگەکان، ڕێگەی داهێنراو و گومڕایی، کارکردن لەسەر ڕێگەی داهێنراوەکان گومڕابوون و کەڵەکەبوونی تاوان نەبێت هیچ زیاد ناکات.

ئەگەرچی فەرموودە بە دەق و مانا و لەخۆگری ئەم بابەتە زۆرە؛ بەڵام ئەوەندە بەسە بۆ سەلماندنی زانستی، تا ببێتە هۆکاری دڵنیابوون و وشیاری ئیمانی لە پەنابردنە بەر داهێنراو و پاساوهێنانەوە بۆی، وە مراندنی ڕۆحی پەیوەستبوونی سوننەت.



(١) رواه مسلم (١٠١٧)، والنسائي في "الكبرى" (٢٣٤٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٣٠٨)، وأحمد (١٩١٧٤)، والطبراني في "الكبير" (٢٣٧٢)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٤٣)، والبيهقي في "السنن" (٤/ ١٧٥)، وفي "السنن الصغير" (١٢٤٧)، وفي "الشُّعَب" (٣٣١٩)، والبغوي في "شرح السنة" (١٦٦١)، وابن أبي شيبة في "مصنفه" (٩٨٠٣).

# وتەی هاوەڵان ﵃ لەسەر داهێنراو
# (أقوال الصحابة ﵃ في ذم البدع)

هاوەڵان و شوێنکەوتووانی زۆرتر خاوەنی شیکردنەوەن لەسەر ئەم باسە، لەبەر پێشبینی و سەرهەڵدانی و بێئاگابوونی خەڵکی لەسەری، لەلایەکی ترەوە دەرکەوتن و ئاشنابوونی تاکە ڕێگەی حەق بە موسوڵمانان بۆ زیاتر شوێنکەوتەیی و لانەدان، بۆیە دەبینین زۆرتر ڕوونکردنەوەیان خستۆتە سەر خاڵە هەستیارەکان و وریاکارییەکی تەواویان بەخشیوە بە خاوەن حەق، تا زیاتر بەرچاوڕۆشن و زاناتر بن بەسەر وردەکارییەکاندا.

## ١. ئەبوبەکری صدیق ﵁:

لە وتاری بوون بە خەلیفەییدا فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا مُتَّبِعٌ وَلَسْتُ بِمُبْتَدِعٍ، فَإِنْ أَحْسَنْتُ؛ فَأَعِينُونِي، وَإِنْ زِغْتُ؛ فَقَوِّمُونِي»[(١)].

واتە: ئەی خەڵکینە من شوێنکەوتەی قورئان و سوننەتم، نەك خاوەن داهێنەر و بیدعە بم، گەر کارەکانم پێکای؛ ئەوا پشتیوانم بن، وە گەر لامدا ڕاستم بکەنەوە.

گەر یەکەم وتار و یەکەم کاری خەلیفەیەکی وەکوو (ئەبوبەرکری صدیق) ﵁ خۆبەریکردن بێت لە هەموو جۆرەکانی داهێنراو (بدعة)و بە زیندووڕاگرتنی شوێنکەوتەیی بێت لە گەرماوگەرمی سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و دینداری دا؛ دەبێت بۆ دوای ئەو و ئەم سەردەمە بەتایبەت چ پێویست و گرنگییەکی ئایینی هەبێت بۆ موسوڵمانان.

تەنانەت یەکێك لە وتە دیار و بڵاوەکانی لەدوای وەڵامی پرسیارە دینییەکانەوە دەیفەرموو: «إِنِّي سَأَقُولُ فِيهَا بِرَأْيِي، فَإِنْ كَانَ صَوَابًا فَمِنَ اللهِ، وَإِنْ كَانَ خَطَأً فَمِنِّي وَمِنَ الشَّيْطَانِ»[(٢)].

---

(١) رواه مالك في "الموطأ" (١/ ١٦١)، وفي "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٣/ ١٣٦)، و "الخطب والمواعظ" لأبي عبيد (١١٩)، و "الرواة عن مالك" للرشيد العطار (٦٣٨)، وفي "الصواعق المحرقة" (١/ ٣٧)، و "تأريخ الخلفاء" (١/ ٥٩).

(٢) رواه الدارمي (٣٠١٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٢٢٦٣)، وفي "الشعب" (٢٠٨٢)، و "معرفة السنن والآثار" =

واتە: گەر پێکام ئەوە لای خواوەیە، وە گەر هەڵە بوو ئەوە لە من و لە شەیتانەوەیە.

## ٢. عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه:

ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه فەرمووی: «اتَّقُوا الرَّأْيَ فِي دِينِكُمْ»، قَالَ سُحْنُونُ: «يَعْنِي الْبِدَعَ»(١).

واتە: خۆپارێز بن لە بیروڕا لە ئایینەکەتان دا. (سحنون) دەڵێت: مەبەست پێی بیدعەو داهێنراوەکانە.

بۆ زیاتر شیکردنەوەی دەفەرموێت: «إِيَّاكُمْ وَأَصْحَابَ الرَّأْيِ؛ فَإِنَّهُمْ أَعْدَاءُ السُّنَنِ أَعْيَتْهُمُ الْأَحَادِيثُ أَنْ يَحْفَظُوهَا فَقَالُوا بِالرَّأْيِ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا»(٢).

واتە: ئاگاداری خاوەن بیروڕاکان بن، ئەوان دوژمنانی سوننەتن، توانای لەبەرکردنی فەرموودەکانیان نییە، بە ڕاکانی خۆیان قسە دەکەن، گومڕاو گومڕاکارن.

لە وتارێك دا فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاسُ، قَدْ سُنَّتْ لَكُمُ السُّنَنُ، وَفُرِضَتْ لَكُمُ الْفَرَائِضُ، وَتُرِكْتُمْ عَلَى الْوَاضِحَةِ، إِلَّا أَنْ تَضِلُّوا بِالنَّاسِ يَمِينًا وَشِمَالًا»(٣).

واتە: ئەی خەڵکینە سوننەتەکانتان بۆ دانراوە، وە فەرزەکانتان بۆ داڕێژراوە، بەجێهێڵراون لەسەر ڕوون و ئاشکرایی، خەڵکی گومڕا مەکەن بەلای ڕاست و چەپ دا.

لادان لە شوێنکەوتنی دەقەکان کەوتنە ناو گومڕایی و داهێنراوەکانەوەیە.

وە دەفـەرموێت: «أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَا عُذْرَ لِأَحَدٍ بَعْدَ السُّنَّةِ فِي ضَلَالَةٍ رَكِبَهَا حَسِبَهَا هُدًى، وَلَا

= (١٢٥٣٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٨/ ٣٣٨)، والشاطبي في "الاعتصام" (١/ ١٣٩)، وابن عبدالبر في "جامع بيان" (١٥٦١)، وابن حجر في "فتح الباري" (١٣/ ٢٧١)، وابن أبي شيبة في" مصنفه" (١٠١٥٢).

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٣٤)، وابن عبدالبر في "جامع بيان العلم وفضله" (٢٠٠٢)، وفي "المدخل إلى السنن الكبرى" للبيهقي (٢١٠).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٣٥)، ورواه ابن عبدالبر في "الجامع" (٢٠٠٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٠١)، والدارمي في "سننه" (١٢١)، والدارقطني (٤٢٨٠)، وفي "فتح الباري" لابن حجر (١٣/ ٢٨٩).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٢٦)، ورواه مالك في "الموطأ" (٥/ ١٢٠٣)، والحاكم في "المستدرك" (٤٥١٣)، وابن عبدالبر في "جامع بيان العلم وفضله" (٢٣٣١).

فِي هُدًى تَرَكَهُ حَسِبَهُ ضَلَالَةً، فَقَدْ بُيِّنَتِ الْأُمُورُ، وَثَبَتَتِ الْحُجَّةُ، وَانْقَطَعَ الْعُذْرُ»[(١)].

واتە: ئەی خەڵکینە پاساو بۆ کەس نییە لەدوای سوننەت، شوێنکەوتەی گومڕایی بێت و بە سوننەت و هیدایەتی بزانێت، یاخود پشت لە سوننەتێك بکات و بە گومڕایی بزانێت، بە تەواوی کارەکان ڕوون و ئاشکران، بەڵگەکاریان بۆ کراوە و هیچ پاساو و بیانوویەك نەماوە.

## ٣. عبدالله ی کوڕی مەسعود (ابن مسعود) رضي الله عنه:

(عبدالله ی کوڕی مەسعود) رضي الله عنه دەفەرموێت: «اتَّبِعُوا آثَارَنَا، وَلَا تَبْتَدِعُوا؛ فَقَدْ كُفِيتُمْ»[(٢)].

واتە: شوێنکەوتەی پاشماوە و کارەکانمان بن، خاوەنی داهێنراو مەبن، ئیتر بەستانە، لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: «... وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»: هەموو داهێنراوێك گومڕاییە.

وە دەفەرموێت: «... فَعَلَيْكُمْ بِالْعِلْمِ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّبَدُّعَ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّنَطُّعَ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّعَمُّقَ، وَعَلَيْكُمْ بِالْعَتِيقِ»[(٣)].

واتە: پەیوەست بن بە زانستەوە (قورئان و سوننەت)، ئاگاداری داهێنراو و زیادەڕەوی و ڕۆچوونەکان بن، پەیوەست بن بە ڕابردووی کۆنەوە، مەبەست پێی (شوێنکەوتەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و هاوەڵانییەتی رضي الله عنهم).

وە دەفەرموێت: «الِاقْتِصَادُ فِي السُّنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الِاجْتِهَادِ فِي الْبِدْعَةِ»[(٤)].

---

(١) "الإبانة الكبرى" لإبن بطة (١٦٢)، و"الفقيه والمتفقه" لخطيب البغدادي (١/ ٣٨٣).

(٢) رواه أحمد في "الزهد" (١٦٢)، والوكيع في "الزهد" (٣١٥)، وابن نصر في "السنة" (٧٨)، والطبراني (٨٧٧٠)، والدارمي (٢٠٥)، والبيهقي في "الشعب" (٢/ ٤٠٧)، قال (الهيثمي) في "مجمع الزوائد": رواه الطبراني في "الكبير" (٨٧٧٠) ورجاله رجال الصحيح، وفي "البدع" لابن وضاح (١٤)، وفي "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٠٧).

(٣) رواه عبدالرزاق في "المصنف" (٢٠٤٥٦)، والدارمي في "السنن" (١٤٥)، والطبراني في "الكبير" (٨٨٤٥)، وابن وضاح في "البدع" (٦٠)، وابن بطة (١٦٨)، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٠٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٣١٧)، والهيثمي في "مجمع الزوائد" (١/ ١٢٦).

(٤) رواه الحاكم في "المستدرك" (٣٥٢) وقال: صحيح على شرطهما. ووافقه الذهبي، والدارمي في "السنن" (١/ ٧٢)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤)، وفي "ذم الكلام وأهله" للهروي (٣/ ٧٢)، وابن وضاح في "البدع" ص١١، وابن عبدالبر في "جامع بيان العلم وفضله" (٢٣٣٤)، وقال الهيثمي في "مجمع الزوائد" (١/ ١٨٨): رجاله ثقات، وأبو فرج في "تلبيس إبليس" (٨)، وابن بطة في "الإبانة" (١/ ١٢٨).

واتە: مانەوە و دەرنەچوون لەسەر سوننەت خێرترە لە هەوڵ و زۆری داهێنراو (بدعة).

وە دەفەرموێت: «إِنَّهَا سَتَكُونُ أُمُورٌ مُشْتَبِهَةٌ، فَعَلَيْكُمْ بِالتُّؤَدَةِ، فَإِنَّ الرَّجُلَ يَكُونُ تَابِعًا فِي الْخَيْرِ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَكُونَ رَأْسًا فِي الضَّلَالَةِ»(١).

واتە: ئەگەر پیاوێك شوێنکەوتەی خێر (سوننەت) بێت؛ چاکترە لەوەی سەر (رأس) بێت لە گومڕایی (بدعة)دا.

## ٤. عبدالله ی کوڕی عومەر (ابن عمر) رضي الله عنهما :

(عبدالله ی کوڕی عومەر) رضي الله عنهما دەفەرموێت: «خَيْرُ الدِّينِ دِينُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا اتَّبِعُوا وَلَا تَبْتَدِعوا فَإِنَّكُمْ لَنْ تَضِلُّوا مَا اتَّبَعْتُمُ الْأَثَرَ إِنْ تَتَّبِعُونَا فَقَدْ سَبَقْنَاكُمْ سَبْقًا بَعِيدًا وَإِنْ تُخَالِفُونَا فَقَدْ ضَلَلْتُمْ ضَلَالًا كَبِيرًا، مَا أَحْدَثَتْ أُمَّةٌ فِي دِينِهَا بِدْعَةً إِلَّا رَفَعَ اللهُ عَنْهُمْ سُنَّةَ هُدًى، ثُمَّ لَا تَعُودُ فِيهِمْ أَبَدًا وَلَأَنْ أَرَى فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ نَارًا تَشْتَعِلُ فِيهِ احْتِرَاقًا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَرَى بِدْعَةً لَيْسَ فِيهِ لَهَا مُغَيِّرٌ»(٢).

واتە: باشترین ئایین ئایینی (محمد)ە ﷺ، وە خراپترین کردار داهێنراوەکانە، شوێنکەوتە بن و داهێنەر مەبن، بە هیچ شێوەیەك گومڕا نابن تا شوێنکەوتەی سوننەت بن، گەر شوێنکەوتەمان بن پێشکەوتنێکی زۆر بەدەست دەهێنن، وە گەر پێچەوانەمان بکەن گومڕاییەکی گەورەتان بەسەر دێت، هەر گەلێك داهێنراو لە دیندا دروست بکات، ئەوا خوای گەورە لە بری ئەوە سوننەتە ڕێپیشاندەرەکان هەڵدەگرێت، ئەگەر لە گۆشەیەکی مزگەوتەکەدا ئاگرێکی گڕگرتوو ببینم پێم خۆشترە تاوەکوو داهێنراو (بدعة)یەك ببینم گۆڕانکاری نەبێت.

وە دەفەرموێت: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ وَإِنْ رَآهَا النَّاس حَسَنَةً»(٣).

---

(١) رواه ابن بطة في "الإبانة" (١٧٧)، وابن وضاح في "البدع" (٢٣١).

(٢) أخرجه محمد بن نصر المروزي في "السنة" (٨١).

(٣) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢٠٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨/ ٤)، وفي "ذم الكلام وأهله" للهروي (٢٧٦)، وفي "المدخل إلى السنن الكبرى" للبيهقي (١٩١)، وفي "شرح الأربعين النووية" لعبدالمحسن العباد (٢٦/ ١٣)، وفي =

واتە: هەموو داهێنراوێك گومڕاییە یەگەر هەموو خەڵکیش بە باشی بزانن.

## ٥. عبدالله ی کوڕی عەبباس (ابن عباس) رضي الله عنهما :

(عبدالله ی کوڕی عباس) رضي الله عنهما دەفەرمویت: «عَلَيْكُمْ بِالِاسْتِقَامَةِ وَالْأَثَرِ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّبَدُّعَ»[١].

واتە: پەیوەست بن بە مانەوە و شوێنکەوتەی سوننەت، ئاگاداری داهێنراو بن.

وە دەفەرمویت: «مَا يَأْتِي عَلَى النَّاسِ مِنْ عَامٍ، إِلَّا أَحْدَثُوا فِيهِ بِدْعَةً، وَأَمَاتُوا فِيهِ سُنَّةً، حَتَّى تَحْيَا الْبِدْعَةُ، وَتَمُوتَ السُّنَنُ»[٢].

واتە: هەر ساڵێك دێت بەسەر خەڵکیدا ئیلا داهێنراو (بدعة)یەك دروست دەکەن و سوننەتێك دەمرێنن، تا وای لێدێت داهێنراوەکان زیندوو دەبن و سوونەتەکان دەمرن.

پیاوێك داوای ئامۆژگاری لە (عبدالله ی کوڕی عباس) رضي الله عنهما کرد، ئەویش فەرمووی: «عَلَيْكَ بِالِاسْتِقَامَةِ وَاتَّبِعِ الْأَثَرَ الْأَوَّلَ وَلَا تَبْتَدِعْ»[٣].

واتە: هەوڵی مانەوە و پەیڕەوکاری سوننەت بدە، شوێنکەوتەی فەرمانەکانی سەرەتا بە، داهێنەر و (مبتدع) مەبە.

---

= "شرح سنن أبي داود" لعبدالمحسن العباد (٥١٥/١٣)، وفي "أحكام الجنائز" للألباني ص٢٠٠، و "الصحيحة" (٦/ ٥٢٧)، وفي "طبقات الحنابلة" لأبي يعلى (١/ ٦٩).

(١) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢٠٥)، وابن وضاح في "البدع" (٦١)، وفي "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٧٣)، و"الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٣٤)، الدارمي في "سننه" (١٤٦)، وابن نصر في "السنة" ص٢٩، وذكره البغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٤)، وفي كتاب "الأعياد وأثرها على المسلمين" لسليمان بن سالم السحيمي ص٢٢٠، وفي "إعلام الموقعين" (٤/ ١١٥).

(٢) رواه الطبراني في "الكبير" (١٠٦١٠)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٢٥)، وابن وضاح في "البدع" (٦١)، و"الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٣٤)، الدارمي في "سننه" (١٤٦)، وابن نصر في "السنة" ص٢٩، وذكره البغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٤)، وفي كتاب "الأعياد وأثرها على المسلمين" لسليمان بن سالم السحيمي ص٢٢٠، وفي "إعلام الموقعين" (٤/ ١١٥)، واللالكائي في "السنة" (١٢٥).

(٣) "ذم الكلام وأهله" للهروي (٣٣٤)، وفي "الفقيه والمتفقه" لخطيب البغدادي (١/ ٤٣٦)، وبلفظ: "عليكم بالاستقامة ..." رواه ابن وضاح في "البدع" (٦١)، والمروزي في "السنة" (٨٣)، والدارمي في "السنن" (١٤٦)، والبغوي (١/ ١٤٠).

### ٦. عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنهما :

(عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص) رضي الله عنهما دەفەرموێت: «مَا ابْتُدِعَتْ بِدْعَةٌ إِلَّا ازْدَادَتْ مُضِيًّا، وَلَا نُزِعَتْ سُنَّةٌ إِلَّا ازْدَادَتْ هَرَبًا»(١).

واتە: هەر داهێنراوێك دادەهێنرێت زیاتر بەردەوامی پێ دەدرێت، وە هەر سوننەتێك لادەبرێت زیاتر دەڕوا و نامێنێت.

### ٧. حوزەیفەی کوڕی یەمان رضي الله عنه :

(حوزەیفەی کوڕی یەمان) رضي الله عنه دەفەرموێت: «يَا مَعْشَرَ الْقُرَّاءِ اسْتَقِيمُوا فَقَدْ سَبَقْتُمْ سَبْقًا بَعِيدًا، فَإِنْ أَخَذْتُمْ يَمِينًا وَشِمَالًا، لَقَدْ ضَلَلْتُمْ ضَلاَلًا بَعِيدًا»(٢).

واتە: ئەی کەسانی قورئانخوێن و شارەزا بمێننەوە و پەیوەست بن بە دیندارییەکەتانەوە، ئەوا پێشکەوتنێکی زۆر بەدەست دێنن، وە ئەگەر ڕاست و چەپ لادەن؛ گومڕاییەکی دوورتان تووش دەبێت.

وە دەفەرموێت: «كُلُّ عِبَادَةٍ لَمْ يَتَعَبَّدْهَا أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَا تَعَبَّدُوهَا فَإِنَّ الْأَوَّلَ لَمْ يَدَعْ لِلْآخِرِ مَقَالًا، فَاتَّقُوا اللهَ يَا مَعْشَرَ الْقُرَّاءِ، وَخُذُوا بِطَرِيقِ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ»(٣).

واتە: هەر جۆرە عیبادەتێك هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نەیانکردبێت مەیکەن، سەرەتاکان هیچیان بۆ دوای خۆیان نەهێشتووەتەوە، لە خوا بترسن شارەزایان، ڕێگەی پێشووانی خۆتان بگرنە بەر.

---

(١) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢٢٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨/ ٧)، وابن وضاح في "البدع" (٩١)، وفي "الوجيز في عقيدة السلف" الصالح لعبد الله بن عبد الحميد الأثري (٢/ ٢٠٥).

(٢) رواه البخاري (٧٢٨٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٩٦)، وابن وضاح في "البدع" (١٣)، وابن نصر في "السنة" (٩٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٢٨٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٤)، وفي"الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٢٦)، و "ذم الكلام وأهله" للهروي (٣/ ١١٧)، وفي "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعد بن ناصر الغامدي (١/ ١٧٣).

(٣) "الحوادث والبدع" للطرطوشي ص١٤٩، وفي"الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٣٠)، و "اتباع لا ابتداع" لحسام الدين بن موسى بن عفانة ص٧٢، و "تفسير المنار" (٧/ ١٦٠)، و "التوسل وأنواعه وأحكامه" للألباني ص٢٨، و "حجة النبي ﷺ" ص١٠٠.

## ٨. مەعازی کوڕی جەبەل رضي الله عنه :

(مەعازی کوڕی جەبەل) رضي الله عنه دەفەرموێت: «أَيُّهَا النَّاسُ، عَلَيْكُمْ بِالْعِلْمِ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، أَلَا وَإِنَّ رَفْعَهُ ذَهَابُ أَهْلِيهِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْبِدَعَ، وَالتَّبَدُّعَ، وَالتَّنَطُّعَ، وَعَلَيْكُمْ بِأَمْرِكُمُ الْعَتِيقِ»[(١)].

واته: ئەی خەڵکینە، هەوڵی زانست بدەن پێش هەڵگرتنی، هەڵگرتنی نەمانی خاوەنەکانیەتی، خۆتان بپارێزن لە داهێنراوەکان و داهێنان و زیادەڕەوی، پەیوەست بن بە فەرمانە کۆنەکەوە.

«أَمْرِكُمُ الْعَتِيقِ»: واته: قورئان و سوننەت.

## ٩. ئوبەی کوڕی کەعب رضي الله عنه :

(ئوبەی کوڕی کەعب) رضي الله عنه دەفەرموێت: «عَلَيْكُمْ بِالسَّبِيلِ وَالسُّنَّةِ، ... فإن اقتصاداً في سبيل وَسُنَّةً خَيْرٌ مِنِ اجْتِهَادٍ فِي خِلَافِ سَبِيلٍ وَسُنَّةٍ، ...»[(٢)].

واته: پەیوەست بن بە ڕێگەی مەنهەج و سوننەتەوە، ...دەرنەچوون لە ڕێگە و سوننەت زۆر باشترە لە هەوڵی زۆری پێچەوانەی ئەو ڕێگە و سوننەتە.

ئەمە پێوانەیەکی تەواوی هاوەڵانە بۆ (دەرنەچوون) لەسەر مەنهەج و دڵنیایی و ڕازیبوون بە سوننەت و لانەدان لەسەری.



---

(١) رواه ابن وضاح في "البدع" (٦٢)، وفي "شرح لامية ابن تيمية" (١٢/١٩)، وفي "الوجيز في عقيدة السلف الصالح" لعبدالله بن عبدالحميد الأثري (٢٠٣/٢)، وفي "المدخل إلى السنن الكبرى" للبيهقي (٣٨٨) قول (ابن مسعود) رضي الله عنه بنحوه، وفي "مفتاح الجنة" للسيوطي ص٥٠.

(٢) رواه الإمام عبدالله بن المبارك في "الزهد" باب: لزوم السنة (٢١/٢)، وأحمد في "الزهد" (١٠٩٣)، وأبو داود في "الزهد" (١٨٩)، واللالكائي في "أصول اعتقاد أهل السنة" (٥٩/١)، وابن بطة في "الإبانة الكبرى" (٣٥٩/١)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٠٨/١)، وابن القيم في "إغاثة اللهفان" (١٣٢/١)، وأبو نعيم في "الحلية" عند ترجمة أُبي رضي الله عنه (٢٥٣/١)، وفي"الاعتصام" للشاطبي (١٣٤/١)، و "الاستقامة" لابن تيمية (٢٥٤/١)، و "صفة الصفوة" لابن الجوزي (١٨٠/١).

# وتەی شوێنکەوتووان و زانایان لەسەر داهێنراو

## (أقوال التابعين والعلماء في ذم البدع)

### ١. حەسەنی بەصری و ئەیوبی سەختیانی رحمهما الله:

(الحسن البصري) رَحِمَهُ اللهُ دەفەرموێت: «صَاحِبُ الْبِدْعَةِ لَا يَزْدَادُ اجْتِهَادًا، صِيَامًا وَصَلَاةً، إِلَّا ازْدَادَ مِنَ اللهِ بُعْدًا»[(١)].

وە (أيوب السختياني) رَحِمَهُ اللهُ دەفەرموێت: «مَا ازْدَادَ صَاحِبُ بِدْعَةٍ اجْتِهَادًا إِلَّا ازْدَادَ مِنَ اللهِ بُعْدًا»[(٢)].

واتە: بیدعەكار هەرچەندە عیبادەت زیاد بكات لە ڕۆژوو و نوێژ؛ تا بێت زیاتر لە خوا دوور دەكەوێتەوە، بە پێچەوانەی عیبادەتە شەرعییەكانەوە، وەكوو سزایەك ئەم پێچەوانە مامەڵەیەی لەگەڵدا دەكرێت.

مەرجی نزیكبوونەوە و ڕەزامەندی پەروەردگار پەیوەستە بە گرتنەبەری ڕێگای خۆی، وە (حەسەنی بەصری) رَحِمَهُ اللهُ شوێنی ڕێگاكەشی دیاری دەكات لە فەرموودەیەكیدا، دەفەرموێت: «سُنَّتُكُمْ وَاللهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ بَيْنَهُمَا: بَيْنَ الْغَالِي وَالْجَافِي، فَاصْبِرُوا عَلَيْهَا رَحِمَكُمُ اللهُ، فَإِنَّ أَهْلَ السُّنَّةِ كَانُوا أَقَلَّ النَّاسِ فِيمَا مَضَى، وَهُمْ أَقَلُّ النَّاسِ فِيمَا بَقِيَ ...»[(٣)].

واتە: سوێند بە خوای بێ هاوتا، سوننەت لە نێوان زیادەڕەوی و كەمڕەویدایە، ئارام بگرن لەسەری، كەسانی خاوەن سوننەت كەم بوون لە پێشوودا، كەمیش دەبن لە داهاتوودا.

---

(١) (٢) رواه ابن وضاح في "البدع والنهي عنها" (٦٧)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٩)، وذكره ابن الجوزي عنه في "صفة الصفوة" (٣/ ٢٩٥)، والشاطبي في "الاعتصام" (١/ ١٣٨)، وفي "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٧٥)، وابن الجوزي في "تلبيس إبليس" (١٨)، والسيوطي في "الإتباع" (٨١)، وابن بطة في "الإبانة الصغرى" ص١٣٤.

(٣) رواه الدارمي في "السنن" (٢٢٢)، والسيوطي في "مفتاح الجنة" ص٦٠، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣/ ٢٨٢)، وابن القيم في "إغاثة اللهفان" (١/ ٧٠)، وفي "شرح العقيدة الطحاوية" لأبي العز الحنفي ص٢٧٦، وفي "تعظيم قدر الصلاة" لمحمد بن نصر المروزي (٧٤٣).

## ٢. عومەری کوڕی عبدالعزیز رضي الله عنه:

(عومەری کوڕی عبدالعزیز) رضي الله عنه لە وەڵامی نامەیەکدا فەرمووی: «أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللهِّ، وَالِاقْتِصَادِ فِي أَمْرِهِ، وَاتِّبَاعِ سُنَّةِ نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَتَرْكِ مَا أَحْدَثَ الْمُحْدِثُونَ ...، فَعَلَيْكَ بِلُزُومِ السُّنَّةِ ...، ثُمَّ اعْلَمْ أَنَّهُ لَمْ يَبْتَدِعِ النَّاسُ بِدْعَةً إِلَّا قَدْ مَضَى قَبْلَهَا مَا هُوَ دَلِيلٌ عَلَيْهَا أَوْ عِبْرَةٌ فِيهَا، فَإِنَّ السُّنَّةَ إِنَّمَا سَنَّهَا مَنْ قَدْ عَلِمَ مَا فِي خِلَافِهَا مِنْ الْخَطَإِ وَالزَّلَلِ وَالْحُمْقِ وَالتَّعَمُّقِ، فَارْضَ لِنَفْسِكَ مَا رَضِيَ بِهِ الْقَوْمُ لِأَنْفُسِهِمْ، فَإِنَّهُمْ عَلَى عِلْمٍ وَقَفُوا، وَبِبَصَرٍ نَافِذٍ كَفُّوا، وَهُمْ عَلَى كَشْفِ الْأُمُورِ كَانُوا أَقْوَى، وَبِفَضْلِ مَا كَانُوا فِيهِ أَوْلَى،...»[١].

واتە: ئامۆژگاریتان دەکەم بە خواپەرستی، وە مانەوە و دەرنەچوون لە فەرمانەکانی و شوێنکەوتەی سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە وازهێنان لە دروستکراوەکان...، پەیوەست بن بە سوننەتەوە، پاشان بزانن هەرکەسێك داهێنراو (بدعة)یەکی دروست کردبێت، ئیلا لە پێش خۆیدا بەڵگەیەکی خۆی هەیە لەسەری، سوننەت کەسێك دایهێناوە کە زانا بووە بەسەر پێچەوانەکەی و بەرامبەرەکەیدا کە هەڵەو لادان و نەزانین و زیادەڕەوییە، ڕازی بە بەوەی هاوەڵان و پێشووەکان بۆ خۆیان ڕازی بوون، ئەوان بە شارەزایی و زانینەوە وەستاون و تێنەپەڕیون، بە چاوکراوەیی تەواوەوە دەستهەڵگر بوون، ئەوان لە دەرککردن بە دەرکەوتنی کارەکان بەهێز بوون، بە هۆکاری کار و کردەوەکانیانەوە پێشەنگن.

ڕەحمەتی خوای لێبێت کە دەرکی کردووە بە خاڵێکی زۆر گرنگ ئەویش: «فَإِنَّ السُّنَّةَ إِنَّمَا سَنَّهَا ...»، سوننەت کەسێك دایناوە کە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ، زانا و شارەزا بووە، لە بەرامبەری ئەو سوننەتانەدا کۆمەڵە کارێك هەیە، ئەو کارە خزمەت و سوودی ئەو شوێنی سوننەتە ناکات، بۆیە داینەناوە، کە پێی دەوترێت داهێنراو (بدعة).

---

(١) رواه أبو داود في "سننه" (٤٦١٢) باب لزوم السنة، وصححه الألباني، والفريابي في "القدر" (٤٤٦)، وفي "ذم الكلام وأهله" للهروي (٥/ ٢٣)، والشاطبي في "الاعتصام" (١/ ٦٧) وقال محققه (مشهور حسن): اسناده صحيح، وابن وضاح في "البدع" (٧٤)، والآجري في "الشريعة" (٥٢٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/ ٣٣٨)، وابن بطة في "الإبانة" (١٦٣)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٥٣٩).

لە وتارەكەی كاتی بوون بە خەلیفەییدا فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاسُ، أَلا إِنِّي لَسْتُ بِمُبْتَدِعٍ وَلَكِنِّي مُتَّبِعٌ»(١).

واتە: ئەی خەڵكینە من داهێنەری (بدعة) نیم، بەڵكوو شوێنكەوتەی سوننەتم.

وە لە ئاستی سوننەتدا دەفەرموێت: «سَنَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ... لَيْسَ لِأَحَدٍ تَغْيِيرُهَا وَلَا تَبْدِيلُهَا وَلَا النَّظَرُ فِي شَيْءٍ خَالَفَهُ، مَنْ عَمِلَ بِهَا مُهْتَدٍ، وَمَنِ انْتَصَرَ بِهَا مَنْصُورٌ، وَمَنْ خَالَفَهَا اتَّبَعَ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ، ...»(٢).

واتە: سوننەتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ كەس بۆی نییە گۆڕینی و دەسكاری كردنی، وە تێڕوانینی ئەو شتانەی كە پێچەوانەیەتی، هەركەس كاری پێ بكات هیدایەت دراوە، وە سەرخەری بێت سەركەوتووە، وە دژایەتی و پێچەوانەیەتیكردنی؛ شوێنكەوتەی ڕێگەی ئیمانداران و ساڵحان نییە.

وە جارێكیان فەرمووی: «وَاللهِ لَوْلَا أَنْ أُنْعِشَ سُنَّةً وَأُمِيتَ بِدْعَةً لَمَا سَرَّنِي أَنْ أَعِيشَ فِي الدُّنْيَا فَوَاقًا وَلَوَدِدْتُ أَنِّي كُلَّمَا أَنْعَشْتُ سُنَّةً أَمَتُّ بِدْعَةً أَنَّ عُضْوًا مِنْ أَعْضَائِي سَقَطَ مَعَهَا»(٣).

واتە: ئەگەر سوننەتێك زیندوو نەكەمەوە و داهێنراو (بدعة)یەك نەمرێنم لە ژیانمدا؛ حەز ناكەم ساتێك لە ژیاندا بژیم، وە بە ئاواتەوەم لەگەڵ زیندووكردنەوەی هەموو سوننەتێكدا و مراندنی هەموو بیدعەیەك دا پارچەیەك لە لاشەم بەخشیبێت.

---

(١) رواه ابن سعد في "الطبقات" (٥/ ٣٤٠)، وابن عبد الحكم في "سيرة عمر" ص٤٠، والفسوي في "المعرفة والتاريخ" (١/ ٥٧٤-٥٧٥)، وابن كثير في "البداية والنهاية" (٥/ ٢٢٢)، وابن الجوزي في "سيرة عمر" ص٥٦، وابن عساكر في "تاريخ مدينة دمشق" (٥/ ٧٥)، والآجري في "أخبار أبي حفص" ص٦٣، والشاطبي في "الاعتصام" (١/ ١٤٣).

(٢) رواه عبد الله بن أحمد في "السنة" (١/ ٣٥٧)، والآجري في "الشريعة" (ص٤٨، ٦٥، ٣٠٧)، وأبو نعيم في "الحلية" ضمن ترجمة مالك (٦/ ٣٢٤)، و واللالكائي في "أصول اعتقاد أهل السنة" (١/ ٩٤)، وابن بطة في "الإبانة الكبرى" (١/ ٣٥٢)، والشاطبي في "الاعتصام" (١/ ١٤٥)، وذكره ابن كثير في "البداية والنهاية" من رواية الخطيب البغدادي (٩/ ٢٢٥)، وذكره الذهبي في "سير أعلام النبلاء" من قول مالك (٨/ ٩٨)، وعزاه إلى عمر بن عبد العزيز أيضاً ابن أبي زيد في "الجامع" ص١١٧، وابن رجب في "جماع العلوم والحكم" ص٢٥٠، والقاضي عياض في "ترتيب المدارك" (١/ ١٧٢).

(٣) "السنة" للمروزي (١/ ٣١) برقم (٩٢).

### ٣. سوفیانی (الثوري) رحمه الله:

(سوفیانی الثوري) رحمه الله دەفەرموێت: «الْبِدْعَةُ أَحَبُّ إِلَى إِبْلِيسَ مِنَ الْمَعْصِيَةِ، الْمَعْصِيَةُ يُتَابُ مِنْهَا، وَالْبِدْعَةُ لَا يُتَابُ مِنْهَا»(١).

واتە: داهێنراوەکان (البدعة) خۆشەویستترە لای ئیبلیس تا تاوانەکان، تاوان تەوبە و گەڕانەوەی لەسەر دەکرێت، بەڵام داهێنراو تەوبەی لەسەر ناکرێت.

وەك لە گێڕانەوەیەك دا لە ئیمامی (الأوزاعي)یەوە رحمه الله دەفەرموێت: «قَالَ إِبْلِيسُ لِأَوْلِيَائِهِ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَأْتُونَ بَنِي آدَمَ؟ فَقَالُوا: مِنْ كُلِّ شَيْءٍ. قَالَ: فَهَلْ تَأْتُونَهُمْ مِنْ قِبَلِ الِاسْتِغْفَارِ؟ فَقَالُوا: هَيْهَاتَ، ذَاكَ شَيْءٌ قُرِنَ بِالتَّوْحِيدِ. قَالَ: لَأَبُثَّنَّ فِيهِمْ شَيْئًا لَا يَسْتَغْفِرُونَ اللهَ مِنْهُ. قَالَ: فَبَثَّ فِيهِمُ الْأَهْوَاءَ»(٢).

واتە: ئیبلیس بە کاربەدەستە گەورەکانی خۆی وت: لە چ لایەکەوە دەڕۆن بۆ ئادەمیزاد؟ وتیان: لە هەموو لایەکەوە، وتی: لە تەوبە و لێخۆشبوونەوە بۆیان دەڕۆن؟ وتیان: ئەوە شتێکە گێڕدراوە بە یەکتاپەرستی خواوە (لە وتنیدا لێیان وەردەگیرێت)، وتی: کارێکیان تێدا بڵاو دەکەمەوە کە داوای لێخۆشبوونی لێ نەکەن، ئەوکات دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی داهێنراو و هەواو ئارەزووەکانیان.

دەبینیت ئیبلیس و شەیتانەکانیش کار لەسەر دروستبوون و بڵاوبوونەوەی داهێنراوەکان دەکەن بە هەموو جۆرێك، لەبەر پەیوەستنەبوون و شوێننەکەوتنی سوننەت، بێگومان ئادەمیزاد هەرکاتێك کارەکانی بەرگی دین و عیبادەتی بەسەردا پۆشی؛ دەبێتە هۆکاری بەردەوامی و مانەوە لەسەری و خۆی بە هەڵە و تاوانبار و گومڕا نازانێت، ئەوکات ئیتر پشت لە تەوبە و لێخۆشبوون دەکات، چۆن تەوبە لەسەر شتێك دەکات کە وابزانێت عیبادەتە ؟!

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية (٧/ ٢٦)، وفي "ذم الكلام وأهله" للهروي (٥/ ١٢١)، و "حقيقة السنة والبدعة" للسيوطي ص٨١، و "تلبيس إبليس" ص١٥، و "ذم الكلام" ص٢١٧، وفي "أصول الاعتقاد" (٦/ ٩)، و "شرح السنة" للبغوي (١/ ٢١٦)، وانظر "مجموع الفتاوى" (١٠/ ٩)، وفي "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٢٩١)، وفي "تفسير القرطبي" (٧/ ١٤١)، و "البدعة وأثرها في محنة المسلمين" لأبي إسحاق الحويني (١/ ٥).

(٢) رواه الدارمي في "السنن" (٣١٦)، والبيهقي في "الشعب" (٩٠٠٨)، وفي "ذم الكلام وأهله" للهروي (٩٤١).

هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَّ احتَجَزَ التَّوْبَةَ، عَنْ صَاحِبِ كُلِّ بِدْعَةٍ»[(١)].

واتە: خوای پەروەردگار ڕێی گرتووە لە تەوبە و گەڕانەوەی هەموو خاوەن داهێنراوێك.

بەو مانایەی کە تەوبەی لەسەر ناکات، لەبەر ئەوەی کە گومان دەبات لەسەر هیدایەتە، نەك وەکوو ئەوەی کە دەڵێت: تەوبە وەرناگیرێت بە گشتی لە خاوەن داهێنراوەکان، ئەوە هەڵەیەکی زۆر نارێکە، چونکە دەبینین زۆر لەوانەی لەسەر ڕێگەی داهێنراو (بدعة)کان بوون کاتێك گومڕاییەکەیان بۆ ڕوون بووەتەوە تەوبەیان کردووە و لێیان وەرگیراوە، ئەمانە لە ژمارە نایەن[(٢)].

## ٤. مالیکی کوڕی ئەنەس رَحِمَهُ اللهُ :

ئیمامی (مالیکی کوڕی ئەنەس) رَحِمَهُ اللهُ دەفەرموێت: «مَنِ ابْتَدَعَ فِي الْإِسْلَامِ بِدْعَةً يَرَاهَا حَسَنَةً، زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَانَ الرِّسَالَةَ ، لِأَنَّ اللهَّ يَقُولُ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ [المائدة: ٣]، فَمَا لَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ دِينًا، فَلَا يَكُونُ الْيَوْمَ دِينًا»[(٣)].

واتە: هەرکەسێك داهێنراو (بدعة)یەك لە ئیسلامدا دابهێنێت و بە چاکی بزانێ؛ ئەوا بەم کارەی وای دەردەبڕێت کە (محمد) ﷺ خیانەتی لە پەیامەکەی خوا کردووە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار هەواڵی پێداوە بە تەواوکردنی دینەکەی، کە دەفەرموێت: ئەمڕۆ هەموو دینم بۆ تەواو کردوون، کەواتە ئەوەی لەو ڕۆژەدا دین نەبوو بێت، ئەوا لەم ڕۆژەشدا دین نییە.

وە دەفەرموێت: «لَنْ يَأْتِيَ آخِرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ بِأَهْدَى مِمَّا كَانَ عَلَيْهِ أَوَّلُهَا»[(٤)].

واتە: خەڵکانی کۆتایی ئەم ئوممەتە کار و هیدایەتیان بەدەست ناهێنن لە کار و هیدایەتی پێشووانی ئەم ئوممەتە باشتر بێت.

---

(١) رواه الطبراني في "الأوسط" (٤٢٠٢)، والبيهقي في "شعب الإيمان" (٩٠١١)، وفي "مسند إسحاق بن راهويه" (٣٩٨)، وصححه الألباني في "سلسلة الأحاديث الصحيحة" برقم (١٦٢٠).

(٢) "مجموع فتاوى" لابن تيمية (١١/ ٣٧٣).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٦٥)، وفي "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٧٨)، و "شرح الأربعين النووية" لعطية بن سالم (١٣/ ١٠)، و "تهذيب الفروق" (٤/ ٢٢٥).

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ١١٨)، وفي "الذكر الجماعي بين الاتباع والابتداع" لمحمد بن عبد الرحمن الخميس ص١٠٤، و "المدخل" لابن الحاج (٤/ ٢٥٢)، و "آثار ابن باديس" (٣/ ٨٤).

هیچ کەسانێك ناگەنە کاملّی دینی سەدەی یەکەمی ئیسلام، لە هیچ ڕوویەکی دینیدا، هیچ کار و خێرێکیان نەهێشتووەتەوە تا ئەوانەی دوای خۆیان پڕی بکەنەوە.

وە دەفەرموێت: «أَتَرَى النَّاسَ الْيَوْمَ كَانُوا أَرْغَبَ فِي الْخَيْرِ مِمَّنْ مَضَى؟»[1].

واتە: ئایا خەڵکانی ئەم سەردەمە ویستی خێریان زیاترە تا پێشووەکان؟

وە دەفەرموێت: «السُّنَّةُ سَفِينَةُ نُوحٍ مَنْ رَكِبَهَا نَجَا وَمَنْ تَخَلَّفَ عَنْهَا غَرِقَ»[2].

واتە: شوێنکەوتەی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکوو بەلەمەکەی (نوح) ﷺ وایە لە کاتی تۆفانەکەیدا، ئەوەی سەرکەوتوو بێت ڕزگاری بووە، ئەوەی دواکەوتوو بێت و سەرنەکەوتبێت؛ تیاچووە و نوقم بووە.

وە ئیمامی (الزهري) ﷺ دەفەرموێت: «كَانَ مَنْ مَضَى مِنْ عُلَمَائِنَا يَقُولُونَ: الِاعْتِصَامُ بْالسُّنَّةِ نَجَاةٌ»[3].

واتە: لە زۆری زانایانی خاوەن عیلم و زانستم بیستووە وتوویانە: پشتبەستن بە ڕێی سوننەت مایەی ڕزگاربوونە.

### ٥. أحمدی کوڕی حنبل ﷺ :

ئیمامی (أحمد) ﷺ دەفەرموێت: «أُصُولُ السُّنَّةِ عندَنَا التَّمَسُّكُ بِمَا كَانَ عَليهِ أَصحَابُ رَسُولِ الله وَالإِقتِدَاءُ بِهِم، وَتَركُ البِدَعِ وَكُلُّ بِدعَةٍ ضَلالةٌ»[4].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٧٥)، وفي "الموافقات" (٣/ ٤٩٧).

(٢) "ذم الكلام وأهله" للهروي (٥/ ٨١)، و"مفتاح الجنة في الاعتصام بالسنة" للسيوطي ص٧٦، وانظر "مجموع الفتاوى" (٤/ ٥٧)، وفي "تأريخ بغداد" لخطيب البغدادي (٨/ ٣٠٧)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (١٤/ ٩).

(٣) رواه الدارمي في "السنن" (٩٧)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٣٦٩)، والبيهقي في "المدخل إلى السنن الكبرى" (٨٦٠)، وفي "ذم الكلام وأهله" للهروي (٣/ ١٣٧)، و "شرح أصول الاعتقاد" للالكائي (٤/ ٢٠)، و"مفتاح الجنة في الاعتصام بالسنة" للسيوطي ص٥٣، والدينوري في "المجالسة" (٣٦٣).

(٤) رواه أحمد في "أصول السنة" ص١٤، واللالكائي "شرح أصول الاعتقاد" للالكائي (٣١٧)، وفي "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٣٧٥)، و "البدع وأثرها في انحراف التصور الإسلامي" لصالح سعد السحيمي (٤٩/ ٦٧)، و "ذم التأويل" لابن قدامة المقدسي ص٣٢، وانظر "مجموع فتاوى" لابن تيمية (٤/ ١٠٢).





واته: بنەمای بەرنامەی ئەهلی سوننەت لای ئێمە پەیوەستبوونە بەو بەرنامەیەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەری بوون، وە شوێنکەوتەی سوننەت و نەکردنی داهێنراو (بدعة)کان، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە.

### ٦. ئیمامی شافعی رحمه الله :

ئیمامی (الشافعي) رحمه الله دەفەرموێت: «لَأَنْ يَلْقَى اللهَّ الْعَبْدُ بِكُلِّ ذَنْبٍ مَا خَلَا الشِّرْكَ بِاللهَّ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَلْقَاهُ بِشَيْءٍ مِنَ الْأَهْوَاءِ»[(١)].

واته: ئەگەر کەسێك هەموو تاوانێکی بەسەر بێت جگە لە هاوبەشدانان بۆ خوا؛ زۆر باشترە لەوەی بەو هەوا و ئارەزووە داهێنراوانەوە بگاتەوە بە خوای خۆی.

لەبەرئەوەی تاوان مافی خۆیی و خەڵکی لەناو دەبات، بەڵام داهێنراو تێکەڵکردنی دینە بە حەز و ئارەزووەکان، کە دژایەتی مافی خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ.

مافی خوا لەپێشترە تا مافی خەڵکی، وە لەلایەکی ترەوە ئەوە زیان و زەرەری ئایینە بۆ گشتی، بەڵام تاوان زیانی تایبەتییە، وە پاراستنی دین ئەمانەتێکی خوای گەورەیە لە گەردنی ئادەمیزاددا.

### ٧. عبدالله ی کوڕی موبارەك رحمه الله :

(عبدالله ی کوڕی موبارەك) رحمه الله دەفەرموێت: «اعْلَمْ أَيْ أَخِي أَنَّ الْمَوْتَ كَرَامَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللهَّ عَلَى السُّنَّةِ، فَإِنَّا للهِّ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، فَإِلَى اللهَّ نَشْكُو وَحْشَتَنَا، وَذَهَابَ الْإِخْوَانِ، وَقِلَّةَ الْأَعْوَانِ، وَظُهُورَ الْبِدَعِ. وَإِلَى اللهَّ نَشْكُو عَظِيمَ مَا حَلَّ بِهَذِهِ الْأُمَّةِ مِنْ ذَهَابِ الْعُلَمَاءِ وَأَهْلِ السُّنَّةِ وَظُهُورِ الْبِدَعِ»[(٢)].

---

(١) رواه البيهقي في "الاعتقاد" ص٢٣٩، وفي "حلية الأولياء" لأبي نعيم (٩/ ١١١)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٧)، وفي "البداية والنهاية" لابن كثير (١٠/ ٢٥٤)، و"الاعتصام" للشاطبي (٢/٨٤٦)، وفي "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٨/ ٢٤٠)، والخبر في "آداب الشافعي ومناقبه" ص ١٨٢ و١٨٧، و" تأريخ ابن عساكر" (٤/ ٤٠٥/ ١)، وذكره البيهقي في "مناقب الشافعي" (١/ ٤٥٣ - ٤٥٤)، وفي "حقيقة السنة والبدعة" للسيوطي ص٨٣.

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١١٦)، و "البدع" لابن وضاح (٩٠)، وفي "الوجيز في عقيدة السلف الصالح" لعبد الله بن عبد الحميد الأثري (٢/ ٢١١).

واتە: بزانە ئەمڕۆ مردن ڕێزلێنانە بۆ هەموو موسوڵمانێك كە بە خوای گەورە بگات لەسەر سوننەت.

## ٨. حەسان ی كوڕی عطیة رَحِمَهُ اللَّهُ :

(حەسسانی كوڕی عطیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمویت: «مَا ابْتَدَعَ قَوْمٌ بِدْعَةً فِي دِينِهِمْ إِلَّا نَزَعَ اللهُ مِنْ سُنَّتِهِمْ مِثْلَهَا ثُمَّ لَا يُعِيدُهَا إِلَيْهِمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: هەر گەلێك لە دینەكەیدا داهێنراوێك دروست بكات، بە گوێرەی ئەوە سوننەت لە ناویاندا هەڵدەگیرێت.

ئەمە سزایەكی خواییە لەسەر لادانی كاری ئەو پێغەمبەرەی ﷺ كە هەڵی بژاردووە و پێ ڕازییە و فەرمانی داوە بە گوێڕایەڵیكردنی، تەنانەت پێش خۆی باسی كردووە و دەفەرموێت: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ [النِّسَاءِ : ٨٠].

واتە: هەركەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بكات؛ گوێڕایەڵی خوای كردووە.

## ٩. سەعیدی كوڕی جوبێر رَحِمَهُ اللَّهُ :

(سەعیدی كوڕی جوبێر) و پێشووە صالحەكان ڕەحمەتی خوایان لێبێت فەرموویانە: «لَا يُقْبَلُ قَوْلٌ إِلَّا بِعَمَلٍ، وَلَا يُقْبَلُ عَمَلٌ إِلَّا بِقَوْلٍ، وَلَا يُقْبَلُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ إِلَّا بِنِيَّةٍ، وَلَا يُقْبَلُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ وَنِيَّةٌ إِلَّا بِنِيَّةٍ مُوَافِقَةٍ لِلسُّنَّةِ»[٢].

واتە: قسە بەبێ كردەوە وەرناگیرێت، وە كردەوە بەبێ قسە وەرناگیرێت، وە كردەوە و قسە وەرناگیرێت بەبێ نیەت، وە قسە و كردەوە و نیەت وەرناگیرێت بەبێ شوێنكەوتەی سوننەت.

---

(١) رواه الدارمي في "السنن" (٩٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٧٣)، وفي "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٠)، و "البدع" لابن وضاح (٨٧)، وفي "سلسلة الأحاديث الصحيحة" للألباني (١٤/ ٤٥٧)، و "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٣٧٥)، و "شرح أصول اعتقاد أهل السنة" (١/ ٩٣).

(٢) أخرجه أبو نعيم في "الحلية" (٧/ ٣٢)، واللالكائي في "أصول اعتقاد أهل السنة" عن الحسن (١/ ٥٧)، وروى أبو نعيم عن الأوزاعي قريباً منه. انظر "الحلية" (٦/ ١٤٣)، وفي "الاعتصام" للشاطبي عن سفيان (١/ ١١٣)، وروى الأجري في "الشريعة" (٢/ ٦٣٨)، وابن حجر في "التلخيص الحبير" (١/ ٤٠٠).

لە قورئاندا کردەوەکان پابەند کراوە بە وشەی: ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ەوە، واتە: کردەوە صاڵحەکان، چاك و پوخت کراوەکان، وە بە دڵنیاییەوە کردەوەی صاڵح ئەو کردەوەیەیە کە فەرمانی ئایەت یان فەرموودەی لەسەر بێت، نەك حەز و ئارەزووی ئادەمیزاد، بۆیە گەر کردەوەیەك خوا و پێغەمبەرەکەی بە چاکی نەزانن؛ ئەوا هیچ چاکییەکی تێدا نییە.

 

# به‌شی دووه‌م

# هۆکاری دروستبوونی داهێنراوه‌کان

# و

# نیشانه گشتییه‌کانی خاوه‌نه‌کانیان

هه‌موو کارێك به هۆکاره‌کانییه‌وه په‌یوه‌سته، بگره نهێنییه‌کانیه‌تی که شاراوه‌یه لای زۆرینه، به ئاشنابوونی و ده‌رکه‌وتنی بچووکبوونه‌وه و نه‌مانیه‌تی، ده‌بینین زانایان ئاسووده‌ترین که‌سانن، له‌به‌ر زانیاری ووردیان به‌سه‌ر هۆکاره‌کاندا، ته‌مه‌ن و تواناکانیان به هه‌ده‌ر نه‌چووه و پارێزراوترین که‌سن له دونیا و دیندا، به‌رده‌وام خاوه‌نی متمانه و ئاشنای ڕێگای ڕاست و دروست بوون بۆ هه‌موو بابه‌تێك، به‌تایبه‌ت زانایانی هه‌ڵگری به‌رنامه‌ی ئه‌هلی سوننه و شوێنکه‌وته‌ی قورئان و فه‌رمووده، به مه‌رجی په‌یوه‌ستبوون و لانه‌دان، به تێگه‌یشتن و شێواز و چۆنێتی وه‌رگرتنی پێشووانی صاڵحه‌وه، له هاوه‌ڵان و دوو چینه شوێنکه‌وته‌که‌ی دوایان.

زانایان له‌سه‌ر هۆکاره‌کانی دروستبوونی سه‌رجه‌م داهێنراوه‌کان شیکردنه‌وه و ڕاوبۆچوونی زۆریان هه‌یه بۆ زیاتر هۆکاری تێگه‌یشتن و دڵنیابوون له ڕێگه هه‌ڵه‌کان، وه ناسینی ڕێگه‌ی حه‌ق و خاوه‌نه‌کانیان.

زۆربه‌ی زانایان بۆچوونه‌کان په‌یوه‌ست ده‌که‌ن به هۆکاره خۆییه‌کان (ذاتي)ه‌وه، واته هۆکاره که‌سایه‌تییه تایبه‌تییه‌کانن، گه‌ر بێت و گۆڕانکارییان تێدا ئه‌نجام بدرێت به بوونی چاره‌سه‌ر و لابردنی ڕێگره‌کان؛ ئه‌و ئه‌نجامه‌ی نه‌ده‌بوو.

که‌واته هۆکاره خۆییه‌کان له‌پێشتره بۆ شیکردنه‌وه، بۆ زیاتر دڵنیابوون له ئاستی که‌سایه‌تی زانستی که‌سه‌که و بیرخستنه‌وه‌ی خاوه‌نه‌که‌ی، له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئاده‌میزاد خۆی بۆ خۆی ئاشنایه‌تییه‌کی ته‌واوی به‌سه‌ر خۆیدا هه‌یه، گه‌ر بیه‌وێت و پاساوه‌کانی وه‌لاوه بنێت! وه‌کوو خوای گه‌وره له‌م ئایه‌ته‌دا ئاماژه به‌مه ده‌کات و ده‌فه‌رموێت: ﴿بَلِ ٱلۡإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ بَصِيرَةٞ ﴿١٤﴾ وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾﴾ [القيامة : ١٤ – ١٥].

واتە: بە دڵنیایی ئادەمیزاد بەسەر خۆیدا چاوکراوە و ئاشنایە، گەر پاساو و دژایەتیش بکات[١].

**هۆکارەکان بریتین لە دوو بەش:**

**یەکەم:** هۆکارە خۆیی یەکان.

**دووەم:** هۆکارە دەرەکییەکان.

## یەکەم : هۆکارە خۆییەکان

### ١. نەزانین (الجهل):

ئادەمیزاد سەرەتای بوونی نەزانینە، وە کۆتایی تەمەنیشی نەزانینە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا﴾ [النَّحل: ٧٨]، وە دەفەرموێت: ﴿لِكَيۡ لَا يَعۡلَمَ بَعۡدَ عِلۡمٖ شَيۡـًٔا﴾ [النَّحل: ٧٠].

واتە: کاتێك لەدایك دەبن هیچ شتێك نازانن، وە دەفەرموێت: تاوەکوو هیچ شتێك نەزانن لەوەی کە زانیوتانە.

وە هەوڵدان بۆ زانست و زانیاری دونیایی یاخود دینی ئەستەم و زۆر کەمە، بۆیە یەکجار زانایان ژمارەیان زۆر کەمەو ڕەها نەزانن، ئەمەش هۆکاری سروشتی ئادەمیزادە، هەوڵدان بۆ بژێوی و مانەوەی ژیانی لەپێشترە تاوەکوو کامڵبوونی زانستی و ژیری.

لەبەرئەوە دەبێت ئەم بوونە لە بازنەی ڕەهایی زۆری نەزانیدا خۆی ببینێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ٧٢﴾ [الأحزاب: ٧٢].

واتە: بە دڵنیاییەوە ئادەمیزاد زۆر ستەمکار و زۆر نەزانە.

نەزانین هۆکاری هەموو ئازار و نشوستییەکانی ژیانە، (ابن القیم) ﵀ دەفەرموێت: «الْجَهْل بِالطَّرِيقِ وآفاتها وَالْمَقْصُود يُوجب التَّعَب الْكثير مَعَ الْفَائِدَة»[٢].

واتە: نەزانین بە ڕێگە و ڕێگرەکان و مەبەستەکان؛ هۆکاری هیلاکییەکی زۆرە لەگەڵ سوودێکدا.

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٤٠١).

(٢) "الفوائد" لابن القيم ص١٧١.

ئەم هۆکارە لە هەموو بوارەکاندا ڕەنگدانەوەی هەیە، وەکوو لە مافی خواشدا ﷻ کە یەکخواپەرستییە (التوحید)، شەریك و هاوبەشدانان بە هەموو جۆرەکانییەوە لەناو ئادەمیزاددا هۆکاری نەزانینە بەسەر خوایەتی و ماف و سیفەتە تەواو و کاملّەکانی ئەودا، خوای گەورە دەفەرمویّت: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾ [الأنعام: ٩١]، [الحج: ٧٤]، [الزمر: ٦٧].

واتە: مافی گەورەیی و بەها و بەقەدری تەواوی پەروەردگاریان نەدەزانی.

ئەمە ستەمکردنە لە مافی خوادا، لەبەر نەزانین و بیّ مەعریفەییان پیّی.

وە نەزانینیش بە ئاست و پلەوپایەی پێغەمبەردا ﷺ هۆکاری ستەمکردنە لە مافی پێغەمبەرەکەی ﷺ، بە هوّکاری شوێننەکەوتنی تەواوی و فەرمان جێبەجێنەکردنی و لادان لە ڕێگەکەی، بە پەنابردنە بەر (بدعة) و داهێنراوەکان.

وە ستەمکردنیش لە مافەکانی خەڵك بە کردنی قەدەغەکراوەکان؛ هەمان هۆکاری نەزانین و تێنەگەیشتنی سوودمەندی فەرمانەکانی و زیانی قەدەغە کراوەکانە (الأوامر والنواهي)، بۆیە هەموو تاوانێك هۆکارەکەی نەزانینە، خوای گەورە دەفەرمویّت: ﴿مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٖ﴾ [الأنعام: ٥٤]، ﴿يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ﴾ [النساء: ١٧]، ﴿عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ﴾ [النحل: ١١٩].

وە هەروەها نەزانین و بیّ زانستی تەواو؛ بووە هۆکاری دروستبوونی ئەو هەموو کۆمەڵ و گروپە جیاوازجیاوازانە لەناو بازنەی ئیسلامدا، وە بەلاڕێبردنی دەقی ئایەت و فەرموودەکان لە ڕاستە ڕێی مانا و زانستی دروستی خۆی.

کەواتە نەزانین هۆکاری گۆڕانکارییە گەورەکانە، تاوەکوو لە بریتی (توحید)؛ (شرك) بێت و لە بریتی (سوننەت)؛ (بدعة) بێت و لە بریتی (طاعة)؛ (معصية) بێت و لە بریتی (الجماعة)؛ (التفرقة) بێت.

لەبەر ئەوەی دڵنیاین (بدعة) و داهێنراوێك لەسەر دەستی کەسێکی خاوەن زانست و ڕۆچوو لە بوارە زانستییە شەرعییەکاندا دروست نابێت، بەڵکوو لەسەر دەستی کەسانی نەزان و

پێنەگەیشتوو لە بەڵگە شەرعییەکاندا دروست دەبێت[١]، ژیاننامە و خاوەنی هەموو گرووپ و تاقم و کۆمەڵەکانی ناو ئیسلام باشترین بەڵگەیە، هەر لە (الخوارج، الرافضة، المعتزلة، الأشاعرة، ...) تاوەکوو ئەم گرووپە تازانەیش کە لە جیهانی ئیسلامیدا بوونیان هەیە.

(حەسەنی بەسری) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموێت: «الْعَامِلُ عَلَى غَيْرِ عِلْمٍ كَالسَّائِرِ عَلَى غَيْرِ طَرِيقٍ، وَالْعَامِلُ عَلَى غَيْرِ عِلْمٍ مَا يُفْسِدُ أَكْثَرَ مِمَّا يُصْلِحُ»[٢].

واتە: کارکردن بەبێ زانستی شەرعی وەکوو رێکردن و رۆیشتنە بەبێ بوونی رێگا، ئەم کەسانە لەسەر دەستیان شێواوی و هەڵە و خراپە زۆرتر دروست دەبێت تا رێککردنەوە و چاکە.

تاڵاوی دەستی نەزانەکانە جیهانی ئیسلامی گرتووەتەوە و دووبەرەکایەتی و ئاژاوەی لە نێوان موسوڵمانانداندا چاندووە.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموێت: «فَمَنْ دَعَا إِلَى الْعِلْمِ دُونَ الْعَمَلِ الْمَأْمُورِ بِهِ كَانَ مُضِلًّا وَمَنْ دَعَا إِلَى الْعَمَلِ دُونَ الْعِلْمِ كَانَ مُضِلًّا وَأَضَلُّ مِنْهُمَا مَنْ سَلَكَ فِي الْعِلْمِ طَرِيقَ أَهْلِ الْبِدَعِ ...»[٣].

واتە: هەرکەسێك زانستی هەبێت و کاری پێ نەکات گومڕایە، وە کارکردن بەبێ زانستی شەرعی گومڕاییە، وە لە هەردووکیان گومڕاتر کەسێکە کە هەڵگری زانستی ئایینی بێت و بەرنامەی خاوەن داهێنراو و هەوا و ئارەزووکارانی گرتبێتە بەر.

وە ئاشکراشە زانایان کێن و بەکێ دەوترێت زانا، ئەوانەن کە زانستی تەواویان بەسەر قورئان و فەرموودەکان و بەرنامەی ئەهلی سوننە و زانستە شەرعییەکاندا هەیە، لە ڕوانگەی هاوەڵان و تابعین و زانایانی خاوەن بوارەکانەوە.

خاوەن داهێنراوەکان (أهل البدع) خاوەنی هیچ تایبەتمەندییەك نین لەم بوارە زانستییە شەرعییانەدا، بۆیە بە بچووك و بێ توانا ناو دەبرێن.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٨٠١): «الْبِدَعَ لَا تَقَعُ مِنْ رَاسِخٍ فِي الْعِلْمِ».

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٨٢).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٢٧).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُلْتَمَسَ الْعِلْمُ عِنْدَ الْأَصَاغِرِ»[(١)].

واتە: نیشانەیەکی پێش هاتنی قیامەت ئەوەیە کە هەوڵی بەدەستهێنانی زانست لای بچووکەکان دەستەبەر دەکرێت.

(عبدالله ی کوڕی موبارەك) رحمه الله دەفەرموێت: «الْأَصَاغِرُ مِنْ أَهْلِ الْبِدَعِ»[(٢)].

واتە: بیٚ قەدر و بچووکەکان بیدعەکارانن.

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەفەرموێت: «لِأَنَّ أَهْلَ الْبِدَعِ أَصَاغِرُ فِي الْعِلْمِ، وَلِأَجْلِ ذَلِكَ صَارُوا أَهْلَ بِدَعٍ»[(٣)].

واتە: لە زانستدا بچووکن، بۆیە کەسانی خاوەن (بدعة) و داهێنراون.

(ابن تيمية) رحمه الله دەفەرموێت: «وَإِذَا تَدَبَّرَ الْعَاقِلُ وَجَدَ الطَّوَائِفَ كُلَّهَا كُلَّمَا كَانَتْ الطَّائِفَةُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ أَقْرَبَ كَانَتْ بِالْقُرْآنِ وَالْحَدِيثِ أَعْرَفَ وَأَعْظَمَ عِنَايَةً وَإِذَا كَانَتْ عَنْ اللَّهِ وَعَنْ رَسُولِهِ أَبْعَدَ كَانَتْ عَنْهُمَا أَنْأَى...»[(٤)].

واتە: گەر خاوەن هۆش و ژیر تێڕوانین بکات، دەبینێت لە هەموو کۆمەڵە و پارچەکان هەر کۆمەڵێك لە خوای گەورە ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ نزیك بێت؛ لە قورئان و فەرموودەوە نزیکە و شارەزایی زۆرە و گرنگی زیاتری پیٚ دەدات، چەندە لە خوای گەورە ﷻ و پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ دوور بێت؛ ئەوەندە لە هەردووکیانەوە دوورە.

---

(١) رواه ابن المبارك في "الزهد" (٦١)، والطبراني في "الكبير" (٩٠٨)، وفي "شرح أصول اعتقاد" (١/ ٩٥)، و "السنن الواردة في الفتن" للداني (٤٣٥)، و "جامع بيان العلم وفضله" (١٠٥١)، و "شرح أصول السنة" للالكائي (١/ ٢٣٠)، وصححه الألباني في "الصحيحة" برقم (٦٩٥)، وفي "صحيح الجامع الصغير وزيادته" (٢٢٠٧).

(٢) رواه الطبراني في "الأوسط" (٨١٤٠)، والهيثمي في "مجمع الزوائد" (٥٦٨)، وفي "شرح أصول اعتقاد" للالكائي (١/ ٩٥)، و "ذم الكلام" ص٢٩٥، و "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبد البر (١/ ٦١٢)، و "الفقيه والمتفقه" للبغدادي (٢/ ١٥٥)، و "الزهد" لابن مبارك ص٣١، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢/ ٣٠٩).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٨٢).

(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٩٥)، (١١/ ٢٧).

**ئەم نەزانینە دەکرێت بە سێ بەشەوە[١]:**

**١. نەزانین بەسەر گرنگی زانستە شەرعییەکاندا:** بە شێوازێك هەروەك ئەو زانستانە موڵکی کەسانێکی لەمەوپێش بووبن و بۆ سەردەمی خۆیان بووە، بەتایبەت نەزانین بەسەر زمانی قورئاندا کە عەرەبییە، بۆیە تەنانەت زۆریان کەسانی بێجگە لە عەرەب بوون هەستاون بە دانانی یاسا و بۆچوونێکی تایبەت، تا وای لێهاتووە گروپی لەسەر دروست بووە.

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەفەرموێت: «إِذَا اسْتَقْرَيْتَ أَهْلَ الْبِدَعِ مِنَ الْمُتَكَلِّمِينَ، أَوْ أَكْثَرَهُمْ وَجَدْتَهُمْ مِنْ أَبْنَاءِ سَبَايَا الْأُمَمِ، وَمَنْ لَيْسَ لَهُ أَصَالَةٌ فِي اللِّسَانِ الْعَرَبِيِّ»[٢].

واتە: گەر بەدواداچوون بەسەر زۆری کەسانی گومڕا و خاوەنی داهێنەری قسە فەلسەفییە کەلامییەکان بکەیت کە مایەی گومڕایی خەڵك بوون و فێرەقیان لەسەر دروست بووە؛ دەبینین زۆریان لەو گەلانە بوون کە تازە هاتوونەتە ناو ئیسلامەوە، هیچ بناغەیەکیان نییە لە شارەزابوونی زمانی عەرەبیدا.

بگرە لە بەرنامەی (تصوف)دا فێر بوون و سەرقاڵ بوون بە زانستە شەرعییەکانەوە، کە ڕێگرە لە گەیشتن بە یەقین و ڕاستییەکانی ڕێی (تصوف)، وەك (أبو یزید البسطامي) دەڵێت: «أَشَدُّ الْمُحْجُوبِينَ عَنِ اللهِ، ثَلَاثَةٌ: ... الْعَالِمُ بِعِلْمِهِ»[٣].

واتە: هۆکارە سەرەکییەکانی نەگەیشتن بە خوا سیانە: ... زانا بەهۆی زانستەکەیەوە.

وە (جنید البغدادي) رحمه الله دەڵێت: «الْمُرِيدُ الصَّادِقُ غَنِيٌّ عَنْ عِلْمِ الْعُلَمَاءِ»[٤].

واتە: موریدی ڕاستگۆی تەواو پێویستی بە زانستی زانایان نییە.

تەنانەت گەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە کتێبەکانیان سوتاندووە، یان دفنیان کردووە و لە ئاودا نوقمیان کردووە، هەروەك (أبي فرج الجوزي) لە زۆریانەوە دەیگێڕێتەوە، وەکوو: (أحمد بن أبي الحواري والشبلي...)[٥].

---

(١) "أسباب الوقوع في البدع" لسعدون بن سعد بن العتيبي ص١٤٩ (رسالة الماجستير).

(٢) "الاعتصام" (٢/ ٦٨٣).

(٣) رواه أبو نعيم في "الحلية" (١٠/ ٣٦)، وفي "صفة الصفوة" لابن الجوزي (٢/ ٣٠٥)، و "تراجم الصوفية" للمناوي (٢/ ٢٤٧)، و "مظاهر الانحرافات العقدية عند الصوفية" (١/ ٩٧).

(٤) "طبقات الشعراني" (١/ ٨٤)، و "الرسالة القشيرية" (٢/ ٣٥٤).

(٥) "تلبيس إبليس" ص٣٦٥.

لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»[(١)].

واتە: گەر خوای پەروەردگار ویستی خێری بە کەسێك بێت؛ شارەزای دەکات لە دینبدا.

وە دەفەرموێت: «مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا، سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ»[(٢)].

واتە: کەسێك ڕێگەیەك بگرێت بە مەبەستی فێربوونی زانستی شەرعی؛ خوای پەروەردگار ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.

**٢. نەزانین بەسەر جۆری زانستی ڕاست و دروستدا:** لە بریتی ڕووکردنە زانستە شەرعییەکان وەکوو: (علوم القرآن، علوم الحديث، أصول الفقه، التوحيد، ... إلخ) ڕووکردنە بەناو زانستی فەلسەفی و (منطق وعلم الكلام) و ئەو جۆرانەدا کە خاوەنەکانیان لە شوێن و گەل و ئایینێکدا بوون کە لەدەرەوەی ئیسلامە، وەکوو فەلسەفەی یۆنانی و ڕۆمانییە هەسارە پەرستەکان، یان فەلسەفەی شەرقی بوزایی و زەردەشتی و هیندۆسی و نیشتۆییەکان ... هتد.

ئەمانە لە کۆتاییدا لەدایکبوونی تاڵی فیرەقەکانی وەکوو (المعتزلة، القدرية، المرجئة، الأشاعرة، الماتوريدية، ... إلخ)کانی لێ کەوتەوە، کە جیهانی ئیسلامی بە خۆیەوە سەرقاڵ کرد و بووە مایەی لەناوبردنی زانایانی ئەهلی سوننە و کزبوونی، وە بگرە وەستانی گرنگیدان بە زانستە شەرعییەکان، وە هاتنەدی ئیسلامێکی پڕ گومان لە بیروباوەڕ (عقيدة)دا و هەڵپەساردن و نەمانی بەها دینییەکان، بە هۆکاری گومان دروستکردن لە بواری باوەڕبوون بە قەدەر و غەیبییەکان، وە نەمانی پێشبڕکێی کاروکردەوەی دینی لە (عمل وجهاد وطاعة) بۆ جەدەلێکی کەلامی بێ ڕۆح بە ناوی (معرفة)ی دڵی و زانست بەسە بۆ دینداری، تاوەکوو تەنانەت دەسەڵاتی خەلافەتی سیاسی ئیسلامیش نەما.

---

(١) رواه البخاري (٧١، ٧٣١٢)، ومسلم (١٧٥)، والترمذي (٢٦٤٥)، والنسائي في "الكبرى" (٥٨٠٨)، وابن ماجه (٢٢٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٨٩)، وأحمد (٢٧٩٠)، والدارمي في "السنن" (٢٣١)، والطبراني في "الكبير" (٨٧٥٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣١)، والبيهقي في "الشعب" (٩٣٢٣).

(٢) رواه البخاري (١١) بَابٌ: العِلْمُ قَبْلَ القَوْلِ وَالعَمَلِ، ومسلم (٣٨) واللفظ له، والترمذي (٢٦٤٦)، وابن ماجه (٢٢٣)، وأحمد (٧٤٢٧)، والدارمي في "السنن" (٣٥٦)، والحاكم في "المستدرك" (٣٠٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣١)، والبيهقي في "الشعب" (١٥٧٤).

وە لەم سەردەمەشدا زانستی شەرعی تویَکلّە، بەلّکوو ناوەڕۆك بابەتە فیکری و سیاسی و عەقلانییەکانە، تاوەکوو دۆوستبوونی ئیسلامێکی سیاسی دووربوو لە هەلّگری هیچ پێوەر و زانستێکی شەرعی تەواو، ونبوو لە هەموو حەقیقەتێکی دینی، لە (منهج أهل السنة)ی ڕاست و دروست، وە گەر تاقی بکرێنەوە لە بوارە شەرعییەکاندا دەرناچن، کۆتاییەکەی توانەوەیە لە دەسەلات و خەلّکی ئەم سەردەمەدا، وە پاشەکشەیەکی هێواش و دابڕان لە پەیوەستبوونی ئایینی و چوونەوە ڕیزی خەلّکی گشتی، وە بانگەوازخواز و شارەزا لە دین و ڕێنیشاندەر جیا ناکرێتەوە لە خەلّکی گشتی، هەمووی بە هۆکاری نەگرتنی ڕێگە ڕاست و دروستەکەی خۆیەتی، لە کاتێکدا تەنانەت بۆ چوونە مالّیشەوە خوای گەورە فەرمانمان پێ دەدات کە لە ڕێگەی خۆیەوە بچینە ژوورەوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِنۡ أَبۡوَٰبِهَا﴾ [البَقَرَة: ١٨٩].

وە پێغەمبەری خواش ﷺ پەنای گرتووە بە پەروەردگار لە بەناو زانستی بێ سوود و دەفەرموێت: «اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ»[1].

ئەمانە ئەم یاسایەیان بەسەردا جێبەجێ دەبێت کە دەلّێت: «فَاقِدُ الشَّيْءِ لَا يُعْطِيهِ».

واتە: ئەوەی لەدەستی چووە هیچی پێ نییە ببەخشێت.

بیدعە، شیرك، فەرموودەی (ضعیف) و (موضوع)، مەزهەبیەت لە (فقه)دا، بە عەقلّ تەفسیرکردن و بێئاگا لە یاسا گشتی و مەبەستە شەرعییەکان ... بەرنامەی دیندارییەکەیەتی.

**٣. نەناسینی هەلّگران و خاوەنی ڕاستەقینەی عیلم و زانست:** ئەم هۆکارە سەرەکییە بۆ هەلّگرتنی هەموو ئەو بەرنامە و ڕێگە هەلّە و لادەرانەی کە لە ڕێگەی ڕاستەوە خاوەنی دەترازێنێت، بۆیە ئامۆژگاری زانایان و خواناسانی ئەم دینە دوورکەوتنەوە و تێکەلّنەبوونە لەو کەسانەی بەرنامە و شێوازێکی داهێنراویان بەناوی زانستەوە دروستکردووە لە دیندا و بانگەوازی بۆ دەکەن، دوور لە شێواز و چۆنێتی زانایان و پێشووانی ناوداری ڕاستەقینەی سەرەتایی ئەم دینە.

---

(١) رواه مسلم (٢٧٢٢)، وأبو داود (١٥٤٨)، والترمذي (٣٤٨٢)، والنسائي في "الكبرى" (٧٨١٨)، وابن ماجه (٢٥٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٨٢)، وأحمد (٨٤٨٨)، والطبراني في "الكبير" (٥٠٨٥)، والحاكم في "المستدرك" (٣٥٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١١٨٢)، والبيهقي في "الشعب" (١٦٤٣)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣٥٩).

وەکوو (سوفیانی الثوري) و (حەسەنی بەصری) رحمهما الله دەفەرموون: «ابْنَ آدَمَ دِينَكَ دِينَكَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمُكَ وَدَمُكَ ...»[١].

واتە: ئەی ئادەمیزاد دینەکەت دینەکەت، ئەوە گۆشت و خوێنی تۆیە.

بزانە لـە کێی وەردەگریت، وەری بگرە لـەو کەسانەی کە لـەسەر بەرنامەکە ماونەتەوە (واتە: دەرنەچوو لـە قورئان و فەرموودە)، وەری مەگرە لـەوانەی لایان داوە لـێی.

(محمد ی کوڕی سیرین) رحمه الله دەفەرموێت: «إِنَّ هَذَا الْعِلْمَ دِينٌ، فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ»[٢].

واتە: فێربوونی زانست دینە، بزانن دینەکەتان لـە کێ وەردەگرن.

(عبدالله ی کوڕی مەسعود) رضي الله عنه دەفەرموێت: «لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا أَتَاهُمُ الْعِلْمُ مِنْ قِبَلِ أَكَابِرِهِمْ فَإِذَا أَتَاهُمْ مِنْ قِبَلِ أَصَاغِرِهِمْ هَلَكُوا»[٣].

واتە: خەڵکی بەردەوام لـەسەر خێرن؛ تاوەکوو زانست لـە گەورەکانیانەوە وەرگرن، گەر زانستیان لـە بچووکەکانیانەوە بۆ هات ئەوە تیاچوون، گەورەکان واتا زانا ناودار و خاوەن بەرنامە پاکەکان، بچووکەکانیش کەسانی نەبوون لـە خاوەن پێگەیەکی زانستی لـە زانا ناودار و بەرنامە زانستییە شەرعییەکانەوە.

---

(١) رواه أحمد في الزهد (١٦٢٧)، والبيهقي في "حلية الأولياء" (٢/ ١٤٣)، وفي "صفة النفاق وذم المنافقين" للفريابي (٤٩)، وفي "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (٦/ ١١٦)، و "ربيع الأبرار ونصوص الأخيار" للزمخشري (٢/ ٢٤٧).

(٢) أخرجه مسلم في المقدمة، بَابُ: في أَنَّ الْإِسْنَادَ مِنَ الدِّينِ وَأَنَّ الرِّوَايَةَ لا تَكُونُ إلا عَنِ الثِّقَاتِ، والدارمي في "السنن" (٤٣٨)، وفي "الكفاية في علم الرواية" لخطيب البغدادي ص١٢١، والألباني في "المشكاة" (٢٧٣).

(٣) أخرجه ابن المبارك في "الزهد والرقائق" (٨١٥)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٨٩)، وفي "جامع معمر بن راشد" (٢٠٤٤٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٤٩)، والقرطبي في "جامع بيان العلم وفضله" (١٠٥٨)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٣١٧)، وابن حجر في "فتح الباري" (١٣/ ٢٩١)، والهيثمي في "مجمع الزوائد" (٥٦٩).

وەکوو ئیمامی (البربهاري) رحمه الله دەڵێت: «وَاعْلَمْ رَحِمَكَ الله أَنَّ الْعِلْمَ لَيْسَ بِكَثْرَةِ الرِّوَايَةِ وَالْكُتُبِ، إِنَّمَا الْعَالِمُ مَن اتَّبَعَ الْعِلْمَ وَالسُّنَنَ، وَإِنْ كَانَ قَلِيلُ الْعِلْمِ وَالْكُتُبِ، وَمَنْ خَالَفَ الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ فَهُوَ صَاحِبُ بِدْعَة، وَإِنْ كَانَ كَثِير الْعِلْم وَالْكُتُب»[1].

واته: بزانە ڕەحمەتی خوات لێبێت، زانست بە زۆری ڕیوایەت و کتێب نییە، بەڵکوو زانا ئەو کەسەیە کە شوێنکەوتەی بەڵگە شەرعییەکان و سوننەتەکان بێت، گەر ڕێژەی زانست و کتێبیشی کەم بێت، ئەوەی پێچەوانەی قورئان و فەرموودە بێت ئەوە خاوەن بیدعەیە، ئەگەر خاوەنی زۆری زانست و کتێبیش بێت.

کۆی ئامۆژگاری گشت هاوەڵان و تابعین و زانایانی خاوەن مەنهەج نزیك نەبوونەوە و تێکەڵنەبوون و وەرنەگرتنی هیچ جۆرە شتێکی دینییە لە خاوەن بیدعە و بەرنامەی هەڵە و گومڕاییەکان، تاوەکوو نەبێتە هۆکاری بەلاڕێبردن و سەرلێشێواوی دینی خاوەنەکەی.

### پوختەی بابەتەکە:

گەر پلە و سوود و گرنگی زانست و چاوکراوەیی لە بەرنامەی ئەهلی سوننەت نەزانێت، وە ئاشنایی و چاوڕۆشنی هیچ زانستێکی شەرعی لا نەبێت، وە زانایانی ئەهلی خۆی و تایبەت بەو بوارەی دەست نەکەوێت؛ دەبێت ڕزگاربوون لەکوێ بێت؟! وە متمانە لە نەکەوتنە ناو گومڕایی و هەموو جۆرێکی بیدعە و داهێنراوەکان ئەستەم و سەختە.

### ئەو هۆکارانەی تر کە لەژێر نەزانیندا کۆ دەبنەوە لەسەر داهێنەر (المبتدع):

١- نەزانین بەسەر هۆکارە زانستییەکانی تێگەیشتندا، وەکوو: (العام، الخاص، المطلق، المقيد، الناسخ، المنسوخ، ...إلخ) واتە: بەڵگە گشتی و تایبەتییەکان و ڕەها و پەیوەستەکان و سڕەر و سڕاوەکان، ئەم بابەتانە وردەکارییەکی زۆر لەخۆ دەگرێت.

٢- بێئاگایی بە مەبەستە سەرەکییەکان و یاسا گشتییەکاندا، کە لەژێر ناونیشانی (مقاصد الشريعة، الضروريات، الحاجيات، التحسينات، القواعد الكلية، ...إلخ) خۆی دەبینێتەوە، کە هەریەکەیان بابەتێکی سەربەخۆ و یاسایین.

---

(١) "شرح السنة" للبربهاري ص٩٩.

٣- نەناسینی پلەی سوننەت لە پێگەی دینیدا.

٤- نەزانینی پلەکانی فەرموودە و جیاکردنەوەیان لە یەکتری، بەتایبەت زانستی فەرموودەناسی (علوم الحديث).

٥- زاڵنەبوون و بێ مەعریفەیی لە زمانی عەرەبیدا، بەتایبەت شێوازی داڕشتن و سەلیقەی زمانی ڕەسەنی عەرەبی؛ بە شێواز و عورفی سەردەمی هاوەڵان و چۆنێتی بەلاغی قورئان و فەرموودە.

## ٢. شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزووەکان:

هەوا و ئارەزووەکان بریتین لە لادانی حەق بۆ ویستەکانی نەفس، گەر ببێتە هۆکاری هەر ئازار و ڕێگرییەك بۆ موسوڵمانان و دینەکەیان بەبێ بیرکردنەوە لە دەرهاویشتەکانی، ئەمە گەرچی لە خۆشییەکانی جەستەیی لە دونیادا هەیە؛ لە بیروهۆش و عەقڵییەکانیشدا هەیە، کە پێی دەوترێت (الْشَّهَوَاتُ وَالْشُّبُهَاتُ)، هەردووکیان مایەی گومڕایی و سەرلێشێواوییە لە دونیا و دیندا[(١)].

شوێنکەوتنی حەزەکانی ئادەمیزاد بناغەی هەموو شەڕێك و لادانێکە لە ڕێگەی ڕاستی خوایی، چ کێشە و ئازار و دووبەرەکایەتی و وێرانەیەك نییە لە دونیادا کە هەوا و ئارەزووەکان هۆکار و پاڵپشت نەبێت بۆی ؟! تەنانەت مێژوو شایەتحاڵێکی ئاشکرایە، گەر پیاچوونەوەی بکەین هەر لە دروستبوونی (خەوارج و موعتەزیلەو شیعەو مەزاهیبەکان ...) هەر ململانێیەکی خوێناوی کە ڕووی داوە تا ئەم سەردەمە هەمووی لەسەر دەستی گومڕا و نەفسییە نەخۆشەکاندا بووە، کە تینووی دەرکەوتن و سەرکردەیەتی و ناوداریبوون بوون بەسەر خەڵك و هەموو دیندا و بەرگێکی حەقیان بۆ ئەم کارانەیان پۆشیوە، تەنانەت گومانەکەی ئیبلیس لەمەدا هاتە دی و ڕاست دەرچوو و هەمووی شوێنکەوتەی بوون، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ صَدَّقَ عَلَيۡهِمۡ إِبۡلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢٠﴾ [سَبَإ : ٢٠].

واتە: ئیبلیس لە گومانەکەیدا ڕاستی کرد کە شوێنکەوتەی دەبن، بێجگە لە تاقمێکی ئیماندار نەبێت.

(١) بۆ زیاتر بڕوانە سەر کتێبی "ذم الهوی" لأبي الفرج الجوزية ص٣٥ بەدواوە.

ئەو هەموو فیرەق و تاقم و مەزهەب و ئەحزابانەی لەناو بازنەی ئیسلامدا دروست بوون بە هۆکاری هەوا و ئارەزووی ئادەمییەکانەوە نەبێت چ شتێك هۆکارە؟!

(عبدالله ی کوڕی عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەفەرموێت: «مَا ذَكَرَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ الْهَوَى فِي مَوْضِعٍ مِنْ كِتَابِهِ إلا ذَمَّهُ»[(١)].

واتە: خوای پەروەردگار باسی هەوا و ئارەزووی نەکردووە لە قورئاندا بێجگە لە شێوەی خراپەو زەم نەبێت.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾ [النجم: ٢٣].

وە دەفەرموێت: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ [الجاثية: ٢٣].

وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [ص: ٢٦].

هەمووی باسی شوێنکەوتەی ئارەزووەکانە، تا ڕادەی کردن بە خوا بەسەر خۆیانەوە، تا بوونەتە هۆکاری هەموو گومان و گومڕاییەکان لە ڕێگە ڕاستە خواییەکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «ثَلَاثٌ مُهْلِكَاتٌ: شُحٌّ مُطَاعٌ، وَهَوًى مُتَّبَعٌ، وَإِعْجَابُ الْمَرْءِ بِنَفْسِهِ»[(٢)].

واتە: سێ شت مایەی تیاچوونە: بەگوێکردنی ڕەزیلی نەفس، شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزوو، سەرسامبوون بە نەفسی خۆت.

شوێنکەوتەی (الشهوات) و ئارەزووەکانی دونیا و شوێنکەوتەی گومڕایی (الشبهات) و لێتێکچووەکانی دینی هەموو ئەمانە هۆکارێکن بۆ تێکدانی دونیا و ئاخیرەتی ئادەمیزاد، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بە مایەی ترسی سەر موسوڵمانانی زانیوە، بۆیە ئاگاداری کردوونەتەوە و

---

(١) "ذم الهوى" لأبي الفرج الجوزية ص١٢، و "الموافقات" للشاطبي (٢/ ٢٩١)، وفي "نضرة النعيم في مكارم أخلاق الرسول الكريم" (٩/ ٣٧٦٤)، وفي "الأمثال لابن سلام" للهروي ص٢٢٤،

(٢) رواه البزار في "مسنده" (٧٢٩٣)، والطبراني في "الأوسط" (٥٤٥٢)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ١٦٠)، والبيهقي في "الشعب" (٧٣١)، وصححه الألباني في "الصحيحة" برقم (١٨٠٢)، وفي "صحيح الجامع الصغير" (٣٠٤٥).

دەفەرموێت: «إِنَّ مِمَّا أَخْشَى عَلَيْكُمْ شَهَوَاتِ الْغَيِّ فِي بُطُونِكُمْ وَفُرُوجِكُمْ وَمُضِلَّاتِ الْفِتَنِ»[(١)].

واتە: ئەوەی بترسم لەسەرتان حەز و ئارەزووەکانی ناوسك و عەورەتتانە و ئەو گومڕاییانەی کە دووبەرەکایەتی لێ دەوەشێتەوە.

کەواتە داهێنراوەکان (بدعة) هەمووی گومڕایی و (شبهات)ی ناو دینە، کە هەر خاوەن ئارەزوویەك هەستاوە ڕێگە و بەرنامەیەکی بۆ خۆی تاشیوە و دروست کردووە و بانگەوازی بۆ دەکات، بە ناوی مەزهەب و تەریقەت و حیزب و تاقمێکەوە، بەبێ هیچ بنەمایەکی ئایینی؛ بە بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە.

کاتێکیش زانایان بۆچوون و بەرنامەکانیان شی دەکەنەوە؛ دەبینین بە گشتی پێچەوانەی یاسا و دارشتنەکانی ئیسلامە، دەبێت ئەمانە داهێنراو و گومڕایی نەبێت لە شێوازی عیبادەت و بانگەوازی و کۆششکردن و پەروەردەکردندا؛ چی گومڕاییەکانی ناو دین بێت ؟!

هەر بۆیە پێشووە صاڵحەکان خاوەن داهێنراو و بۆچوونە جیاوازەکانی دژ بە سوننەتیان ناوبردووە بە خاوەن هەوا و ئارەزووەکان (أهل الأهواء)، لەبەر پێشخستنی ئارەزووەکانیان بەسەر بەڵگەکاندا، وە بگرە بەڵگەکان بە پاشگریان دادەنا و خوێندنەوەی دووەمیان بۆ دەکرد، وە گومانباشی تەواویان لەسەر ویست و حەزەکانیان بوو، بە یاسای جێگیری و حەقی بێبەرامبەریان دەزانی.

ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەفەرموێت: «سُمِّيَ أَهْلُ الْبِدَعِ أَهْلَ الْأَهْوَاءِ لِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ فَلَمْ يَأْخُذُوا الْأَدِلَّةَ الشَّرْعِيَّةَ مَأْخَذَ الِافْتِقَارِ إِلَيْهَا، وَالتَّعْوِيلِ عَلَيْهَا، حَتَّى يَصْدُرُوا عَنْهَا، بَلْ قَدَّمُوا أَهْوَاءَهُمْ، وَاعْتَمَدُوا عَلَى آرَائِهِمْ، ثُمَّ جَعَلُوا الْأَدِلَّةَ الشَّرْعِيَّةَ مَنْظُورًا فِيهَا مِنْ وَرَاءِ ذَلِكَ»[(٢)].

واتە: بیدعەچییەکان بۆیە ناوبراون بە خاوەن هەوا و ئارەزووە چییەکان لەبەر شوێنکەوتەییان بۆی، وە بەڵگە شەرعییەکانیان بەشێوەی سەرچاوەی پێویست و گەڕانەوە بۆ سەری و بنەمای

(١) رواه البزار في "مسنده" (٣٨٤٤)، وأحمد (١٩٧٧٢) وقال محققه (شعيب الأرنؤوط): رجاله ثقات رجال الشيخين، والدولابي في "الكنى والأسماء" (١/ ١٥٤)، والطبراني في "الصغير" (٥١١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٣٢)، والبيهقي في "الزهد الكبير" (٣٧٢) و (٣٧٣)، وفي "اعتلال القلوب" للخرائطي (٨٨).

(٢) "الاعتصام" (٢/ ٦٨٣).

لێدەرچوون وەرنەگرتووە، بەڵکوو پێشخەری ئارەزوو و بۆچوونەکانیانن، پاشان خوێندنەوەیان بۆ بەڵگەکان کردووە.

خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١﴾ [الحجرات: ١].

واتە: ئەی ئیمانداران پێش مەکەون بەسەر فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوادا ﷺ، لە خوا بترسن، خوای پەروەردگار بیسەر و زانایە.

(ابن كثير) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «هَذِهِ آدَابٌ، أَدَّبَ اللهُ بِهَا عِبَادَهُ الْمُؤْمِنِينَ فِيهَا يُعَامِلُونَ بِهِ الرَّسُولَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ التَّوْقِيرِ وَالِاحْتِرَامِ وَالتَّبْجِيلِ وَالْإِعْظَامِ، ... لَا تُسْرِعُوا فِي الْأَشْيَاءِ بَيْنَ يَدَيْهِ، أَيْ: قَبْلَهُ، بَلْ كُونُوا تَبَعًا لَهُ فِي جَمِيعِ الْأُمُورِ»[1].

واتە: ئەمانە ئادابانێکن کە خوای پەروەردگار بەندە ئیماندارەکانی پێ فێر دەکات، تاوەکوو چۆن کردار لەگەڵ پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن، لە ڕێز و شکۆمەندی و بەهاراگرتنی، کە پێشی نەکەون لە هیچ شتێکدا، بەڵکوو شوێنکەوتەی بن.

(سفيان الثوري) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: « ﴿لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ بِقَوْلٍ وَلَا فِعْلٍ»[2].

واتە: پێشی خوا و پێغەمبەرەکەی نەکەون؛ بە هیچ قسە و کردارێك.

کەواتە هەموو جۆرە داهێنراوەکان (بدعة) خۆ پێشخستنە بەسەر قورئان و فەرموودەدا.

(ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموێت: «أَنَّ الْهَوَى مَا خَالَطَ شَيْئًا إِلا أَفْسَدَهُ، فَإِنْ وَقَعَ فِي الْعِلْمِ أَخْرَجَهُ إِلَى الْبِدْعَةِ وَالْضَّلَالَةِ وَصَارَ صَاحِبُهُ مِنْ جُمْلَةِ أَهْلِ الأَهْوَاءِ، وَإِنْ وَقَعَ فِي الْزُّهْدِ أَخْرَجَ صَاحِبَهُ إِلَى الْرِّيَاءِ وَمُخَالَفَةِ الْسُّنَّةِ، وَإِنْ وَقَعَ فِي الْحُكْمِ أَخْرَجَ صَاحِبَهُ إِلَى الْظُّلْمِ وَصَدَّهُ عَنِ الْحَقِّ»[3].

واتە: هەوا و ئارەزوو تێکەڵی هەر شتێك بێت تێکی دەدات، گەر تێکەڵی زانست بکرێت خاوەنەکەی بەرەو داهێنراو و گومڕایی دەبات، گەر تێکەڵی عیبادەت و دوورکەوتنەوە لە دونیا

---

(١) (٢) "تفسير القرآن العظيم" (٧/ ٣٦٤).

(٣) "روضة المحبين ونزهة المشتاقين" ص٤٧٤.

بکرێت خاوەنەکەی بەرەو ڕیبا دەیات، گەر تێکەڵی دەسەڵات و یاسا بکرێت خاوەنەکەی بەرەو ستەم و لادان لـە حەق دەبات.

واتە هەوێنی هەموو خراپەیەك و تێکدانێکە.

**ئەو هۆکارانەی کە لە ژێر هەواو ئارەزوودا کۆ دەبنەوە لەسەر داهێنەر (المبتدع):**

**١-** خۆشەویستی و حەزلێبوونی سەرکردەییەتی و دەرکەوتن بەسەر خەڵکدا (حب الرئاسة).

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «أَنَّ الْإِنْسَانَ قَدْ يَخْفَى عَلَيْهِ كَثِيرٌ مِنْ أَحْوَالِ نَفْسِهِ فَلَا يَشْعُرُ بِهَا أَنَّ كَثِيرًا مِنْ النَّاسِ يَكُونُ فِي نَفْسِهِ حُبُّ الرِّيَاسَةِ كَامِنٌ لَا يَشْعُرُ بِهِ ... وَلِهَذَا سُمِّيَتْ هَذِهِ "الشَّهْوَةُ الْخَفِيَّةُ"»[١].

واتە: دەشێت شاراوە بێت لای زۆری خەڵکی لە ناخیدا خۆشەویستی دەرکەوتن و سەرکردایەتی تێدا بێت و هەستی پیّ نەکات، لەبەر ئەوە ناوبراوە بە (حەزە شاراوەکان).

(سفيان الثوري) ﷺ دەڵێت: «مَا رَأَيتُ الزُّهدَ فِي شَيْءٍ أَقلَّ مِنْهُ فِي الرِّئَاسَةِ تَرَى الرَّجُلَ يَزْهَدُ فِي المَطْعَمِ، وَالمَشْرَبِ، وَالمَالِ، وَالثِّيَابِ فَإِنْ نُوزِعَ الرِّئَاسَةَ حَامَى عَلَيْهَا، وَعَادَى»[٢].

واتە: نەمبینیوە لە هیچ شتێکدا زوهد و خۆپاراستن کەمتر بێت بێجگە لە حەزلێکردنی خۆدەرخستن نەبێت، کەسێك زوهد لە ماڵ و خواردن و ... هەموویدا دەکات، بەڵام گەیشتە سەر (الرئاسة) شۆڕەت و ناوداری هەوڵ و دژایەتی بۆ دەکات.

لەبەر ئەوە وتراوە: «آخر ما يخرج من رؤوس الصديقين حب الرياسة»[٣].

واتە: کۆتا شت کە لە سەری خواناسە ساڵحەکان دەردەچێت خۆشەویستی دەرکەوتن و سەرکردایەتییە.

**٢-** بانگەوازیکردن بۆ ڕێگە و بۆچوون و چۆنیەتییەکی تازەگەر و سەردەمیانە (ادعاء التجديد والعصرية).

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٦/٣٤٦).

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٦/٣٤٦).

(٣) "مختصر منهاج القاصدين" لابن عبدالبر ص٢٠٩.

ئەم دوو هۆکارەش بەرهەمی تاڵی بوونی هەوا و ئارەزوو و نەفسی هەوا و ئارەزووکارانە، بۆ هێنانە دی ویست و ئارەزووەکانیان لە دەرکەوتن و ناوبانگ (شوهرەت) و سەرکردایەتی بەسەر بەندەکانی خواوە ﷻ.

## ٣. دەمارگیری (التعصب):

دەمارگیری هۆکارێکی تری خۆییە، کە خاوەنەکەی هەموو ڕێگا و دەرگایەکی گوێگرتن و تێگەیشتنی لەسەر خۆی داخستووە و نایەوێت تێبگات و تەنانەت بەر گوێشی بکەوێت، خۆ بە نەمانی ئەم هۆکارە؛ تێگەیشتن دەکرێتەوە لە بەردەمیدا.

حەق و بەتاڵ هەیە، بەڵگەو زانستەکانیش شەرم و شاراوەییان تێدا نییە و گەیشتن بە ئامانج کارێکی مسۆگەرە، گەر خاوەنەکەی داواکار و تینوو بێت.

بۆیە دەمارگیری؛ مانەوە و بەردەوامبوونە لەسەر یەك ڕا، گەر بەتاڵیش بێت و بەرامبەریش لەسەر حەق بێت، وە پێشخستنیەتی بەسەر دەقەکاندا، بە جێگیرکردنی لە شوێنی بەڵگە و زۆرە ملێیەك لە گونجاندنیدا، کە خاوەنەکەی هەست بە ڕاکردن و خۆدزینەوە و بێ دڵنیاییەك لە حەق دەکات، بێگومانیش ڕێگەی ڕاست وەکوو ئیمامی (اللالكائي) ﷺ دەڵێت: «مَنْ سَلَكَ طَرِيقَ الْأَخْيَارِ فَمِنَ الْمَيْلِ بَعِيدٌ؛ لِأَنَّ مَا يَتَدَيَّنُ بِهِ شَرْعٌ مَقْبُولٌ، وَأَثَرٌ مَنْقُولٌ، أَوْ حِكَايَةٌ عَنْ إِمَامٍ مَقْبُولٍ، ... وَأَمَّا مَنْ سَلَكَ بِنَفْسِهِ مَسْلَكَ الِاتِّبَاعِ فَالْهَوَى وَالْإِحَادَةُ عَنْهُ بَعِيدَةٌ، وَمِنَ الْعَصَبِيَّةِ سَلِيمٌ، وَعَلَى طَرِيقِ الْحَقِّ مُسْتَقِيمٌ»[1].

واتە: ئەوەی ڕێگەی دەقەکانی گرتبێتە بەر لە لادان سەلامەتە، لەبەر ئەوەی کەسێك دینداری پێ دەکرێت کە دەقێکی شەرعی (قورئان و فەرموودە)ی قبوڵکردووە، یاخود ڕیوایەت و فەتوای (چوار خەلیفەو هاوەڵان)، یا بۆچوون و ڕای زانایەکی ناوداری وەرگرتووە، ئەوەی ڕێگەی شوێنکەوتەی دینداری گرتبێتە بەر؛ لە هەوا و ئارەزوو و لادان دوورە و لە دەمارگیری پارێزراوە و لەسەر ڕێگەی ڕاست و دروستە.

(ابن تيمية) ﷺ دەفەرموێت: «فَدِينُ الْمُسْلِمِينَ مَبْنِيٌّ عَلَى اتِّبَاعِ كِتَابِ اللهِ وَسُنَّةِ نَبِيِّهِ وَمَا اتَّفَقَتْ عَلَيْهِ الْأُمَّةُ فَهَذِهِ الثَّلَاثَةُ هِيَ أُصُولٌ مَعْصُومَةٌ وَمَا تَنَازَعَتْ فِيهِ الْأُمَّةُ رَدُّوهُ إِلَى اللهِ

---

(١) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (١/ ٣٠).

وَالرَّسُولِ. وَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يُنَصِّبَ لِلْأُمَّةِ شَخْصًا يَدْعُو إلَى طَرِيقَتِهِ وَيُوَالِي وَيُعَادِي عَلَيْهَا غَيْرَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا يُنَصِّبَ لَهُمْ كَلَامًا يُوَالِي عَلَيْهِ وَيُعَادِي غَيْرَ كَلَامِ اللهِ وَرَسُولِهِ وَمَا اجْتَمَعَتْ عَلَيْهِ الْأُمَّةُ بَلْ هَذَا مِنْ فِعْلِ أَهْلِ الْبِدَعِ الَّذِينَ يُنَصِّبُونَ لَهُمْ شَخْصًا أَوْ كَلَامًا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْأُمَّةِ يُوَالُونَ بِهِ عَلَى ذَلِكَ الْكَلَامِ أَوْ تِلْكَ النِّسْبَةِ وَيُعَادُونَ»[١].

واته: دینی موسوڵمانان بنیات نراوە لەسەر شوێنکەوتەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئەوەی کۆدەنگی هاوەڵان و زانایانی لەسەرە، ئەم سیانە بنەمایەکی پارێزراو و دوور لە هەڵەن، ئەوەشی کە کێشەی لەسەرە لەناو موسوڵماناندا دەگەڕێتەوە بۆ قورئان و فەرموودە، وە کەس بۆی نییە کەسێك بکاتە پێشەنگی ئەم ئوممەتە و بانگەواز بۆ ڕێگەکەی بکات و پشتگیری و دژایەتی لەسەر دروست بکات، ئەمانە بۆ بێجگە لە پێغەمبەر ﷺ کۆدەنگی زانایان ناکرێت، بەڵکوو کردنی کاری کەسانی بیدعەکارانن، ئەوانەی کەسێك یاخود قسە و بەرنامەیەك دادەنێن بەهۆیەوە دووبەرەکایەتی و جیاوازی دەنێنەوە لەناو موسوڵماناندا و بنچینەی (الولاء والبراء) لەسەر بنیاد دەنێن.

ئەم کردارانە گەر لەسەر ناوە بەرێزە دینییە کانیش بێت بە نەفامی و جاهیلیەت ناو دەبرێت، لە کاتێکدا ئیسلام بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەوە هاتووە.

هەروەك دوو منداڵی کۆچەری و (مەدینەیی) پشتیوانی (الأنصار والمهاجرين) پێکداهاتن و هەریەکە هاواری کرد: «يَا لَلْمُهَاجِرِينَ»، «يَا لَلْأَنْصَارِ»، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە و فەرمووی: «مَا هَذَا دَعْوَى أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ»[٢].

واته: ئەمە چییە ئەم بانگەوازی و بانگکردنەی ئەهلی جاهیلیەت؟!

ئەم دوو ناوە کاتێك بەکارهێنرا بۆ پشتیوانی هەریەکە لە خۆی، گەر حەق و ناحەق بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەردەمی نەفامی ناوی برد، چ جای ناوی دونیایی و چین و توێژ و کەسانی بێ بنەما.

---

(١) "درء التعارض العقل والنقل" (١/ ٢٧٢)، و "مجموع الفتاوى" (٢٠/ ١٦٤).

(٢) رواه البخاري (٤/ ١٨٣) بَابُ مَا يُنْهَى مِنْ دَعْوَةِ الجَاهِلِيَّةِ، ومسلم (٢٥٨٤)، وأحمد في "المسند" (١٤).

وە گەر پێوانەیەك دابنێین بۆ ناسینەوەی خاوەنی مەنهەج و بەرنامەی حەق و ڕاست و دروست و لا نەدراو لە كەسانی تر؛ ئەوا پێوانەی زانای ئەهلی سوننە ئیمامی (أبو بكر بن عياش)ە رَحِمَهُ اللَّهُ كە پرسیاری لێ دەكرێت سونني تەواو كێیە؟ فەرمووی: «الَّذِي إِذا ذكرت الْأَهْوَاء لم يغْضب لشيءٍ مِنْهَا»[1].

واتە: ئەو كەسەیە كە گەر باسی خاوەن هەوا و ئارەزوو و بیدعەكاران كرا؛ لایەنگری و دەمارگیری بۆ هیچیان نەبێت.

**دەمارگیری و لایەنگری بۆ دوو بابەتە:**

**١- كەسایەتی:** جا گەر كەسێك یا چین و تاقم و كۆمەڵێكی دیاریكراو بێت لە ئادەمیزادەكان.

**٢- قسەو بیروڕا و بەرنامەیەك و جۆرە زانستێكی دیاریكراو بێت.**

گەر پیاچوونەوەیەكی مێژوو بكەین؛ دەبینین ئەم دوو هۆكارە و زیادەڕەوی تیایدا مایەی هەموو بەلا و ئازار و گومڕاییەكی ئادەمیزاد بووە لەسەر زەویدا.

گاوور و جوولەكەكان زیادەڕەوییان دەكرد لە پێغەمبەرەكانیاندا، تا دەیانوت: بەشێكن لە خوا یا كوڕی خوان، وەكوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾ [التوبة : ٣٠]، وە دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ﴾ [المائدة : ٧٣]، وە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾ [التوبة : ٣٠].

تەنانەت زیادەڕەوییان لە قەشە و عابیدەكانیاندا دەكرد، بە شێوازێك وەكوو خوا لایان پیرۆز (مقدس) بوون، فەرمانەكانیان لێ وەردەگرتن، دەسەڵاتی ڕەهایان هەبوو لە دونیا و دیندا، ئەوان بڕیاریان لەسەر دانانی مەلیك و دەستوور بۆ خەڵك دادەنا، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة : ٣١].

بەبێ ڕەچاوكردنی هیچ فەرمانێكی خوایی و پەیوەستبوون بە یاساكانی تەورات و ئینجیلەوە، بەڵكوو تەنانەت گەیشتە ئەوەش كە دەستێوەردان و گۆڕانكاری تێدا ئەنجام بدەن.

---

(١) "الاستقامة" لابن تيمية (١/ ٢٥٥).

وە لە ڕۆژهەلاتی دونیاشدا ناودارەکانیان وەکوو: (بوزا و کۆنفۆشیۆس و نیشتۆ و زەرادەشت و ...هتد) زیادەڕەوییەکیان لەگەڵدا کردن، تا بوونە خوایەك بەسەر خەڵکەوە و پەیکەریشیان بۆ تاشین و پەرستیانن، هەروەکوو خوای پەروەردگاری بوونەوەر چۆن دەپەرسترێت.

هەروەکوو جیهانی ئیسلامی بوو بە دوو بەشەوە لەسەر زیادەڕەویکردن لە هەندێك هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەکوو ئیمامی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب و بنەماڵەی ئەهل و بەیت) بۆ سوننە و شیعە.

لەسەر بنەمای زیادەڕەویکردن و دەمارگیری بۆیان، بە شێوەیەك تەنانەت وتیان: ئیمامی (عەلی) و کوڕەکانی و تا دوانزە کەس لە نەوەکانی (معصوم)ن وەکوو پێغەمبەران و قابیلی هیچ هەڵە و ناتەواوییەك نین، دەبێت ئەوان بەڕێوەبردنی دین و حوکمڕانی دونیایان بەدەست بێت.

زیادەڕەوی گەیشتە ئەو ڕادەیەی وتیان (وەحی)یان بۆ دێت وەکوو چۆن بۆ پێغەمبەران هاتووە، پلەی دەسکاریکردن و گۆڕانکاریکردن لە دیندا بە دەستیانەوەیە بەناوی (ویلایەتی فەقیهـ)وە، وە زانستی شاراوە (علم الباطن)یان هەیە، کە پێغەمبەر و هیچ کەس نەیان بووە.

کوێر بوون و نەزانانە بەوەوە نەوەستان، بەڵکوو لە ئیمامێکی زیندوو و ناسراوەوە باوەڕیان گۆڕین بۆ سەر ئیمامێکی ونبوو لە سردابی سامەڕا دەبێت جێگری هەبێت، جێگرەکانیشی هەمان پلە و ئیمتیازاتێکی پێ بدرێت لە بەڕێوەبردنی دینی و دونیاییدا، تا دەرکەوتنی ئیمامی زەمان، بەم شێوەیە خەڵکی داماویان کردە بەندکار و گوێڕایەڵ و بێ دەسەلات، وەکوو جەنازە لە بەردەم شۆڕەرەکەیدا.

صۆفییەکانیش بە هەمان شێوەی ئەمان بە گەورە و پیرۆزکردن (تعظيم وتقديس)ی چەند پیاوانێکی پێشوو، تا گۆڕەکانیان پەرسترا و پاشان هەمان پلە بەناوی (ویلایەت)ەوە درا بە شێخی تەریقەتەکانیان، کە زانستی شاراوە (علم الباطن)یان هەیە و تەنانەت شەرع (قورئان و فەرموودە) زانستێکی ڕووکەشی بێ ناوەڕۆك (علم الظاهر)ە، بەڵکوو ئەولیاکانیان عیلمی غەیب و بەڕێوەبردنی کەونیان لە دەستدایە، بەناوی (أقطاب الأربعة)[1]، وە دەبێت هەموو داواکاری و نزاو پاڵپشتییەکان لەوان داوابکرێت، بەڕێوەبەری دونیا و بەرزەخ و قیامەتی موریدەکانیەتی.

(١) (القطب) کۆیەکەی (الأقطاب)ە: بەو ناودارانە دەوترێت لە بیری سۆفی دا کە توانای یارمەتی و گۆڕانکارییان هەیە لە =

تا ئەو ڕادەیەی پلەی وەلییەکان لە پێغەمبەران بەرزترە، لەبەرئەوەی پێغەمبەران زانستێکی ڕووکەش (علم الظاهر)یان هەیە، وە تەنانەت (خاتم الأولياء)یان هەیە، وەکوو چۆن (خاتم الأنبياء) هەیە.

وەك (ابن العربي) دەڵێت:

مَقَـامُ الـنُّبُـوَّةِ فِي بَـرْزَخٍ        فُوَيْقَ الرَّسُولِ وَدُونَ الْوَلِيِّ![1].

واتە: پلەی (نبوة) "ئەو پێغەمبەرەیە کە شوێنکەوتەی پێغەمبەری پێش خۆیەتی" لە بەرزەخدا کەمێك لەسەر (رسول) "ئەو پێغەمبەرەیە کە بەرنامەی سەربەخۆی پێیە" و لە خوار وەلییەتیەوەیە.

لەبەرئەوەی (وەلی) ڕاستەوخۆ لە خواوە شتەکانی وەردەگرێت، بەڵام پێغەمبەران بە ڕێگەی (جبريل)ەوە وەری دەگرن.

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «وَمَنْ ادَّعَى أَنَّ مِنْ الْأَوْلِيَاءِ الَّذِينَ بَلَغَتْهُمْ رِسَالَةُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ لَهُ طَرِيقٌ إلَى اللهِ لَا يَحْتَاجُ فِيهِ إلَى مُحَمَّدٍ فَهَذَا كَافِرٌ مُلْحِدٌ ... إنَّ مُحَمَّدًا بُعِثَ بِعِلْمِ الظَّاهِرِ دُونَ عِلْمِ الْبَاطِنِ ... أَنَّ " الْوِلَايَةَ " أَفْضَلُ مِنْ " النُّبُوَّةِ "»[2].

واتە: بیبڕوا دەبێت ئەو کەسەی باوەڕی وابێت کە وەلییەك لە وەلییەکانی خوا پێویستی بە شەرعی (ﷺ) نەبێت، یاخود بڵێت (ﷺ) زانستی ڕووکەشی پێیە، ئاگای لە ناوەڕۆك نییە، یا پلەی وەلییەتی لە پێغەمبەر ﷺ بەرزترە.

---

= دروستکراوەکاندا بەتایبەت ئادەمیزاد، بۆیە دروستە هاواری لێ بکەیت و داوای لێ بکەیت و بۆت جێبەجێ دەکات، لەمانە چوار (قطب)ی ناودارن، وەك: (عبدالقادر الجيلاني، السهروردي، البدوي، الرفاعي)، بێجگە لەمانیش (الْأَوْتَاد، النُّجَبَاء) هەیە بۆ بەڕێوەبردنی مەخلوقات بێجگە لە خوا. بۆ زیاتر بگەڕێرەوە سەر "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٧/ ٩٦).

(١) "الفتوحات المكية" لابن العربي الحلاج ص٢٥٣، وفي "شرح العقيدة الطحاوية" ص٥٠٥، و "لوامع الأنوار البهية" للسفاريني (٢/ ٣٠١)، وانظر "طبقات الشعراني" (١/ ٦٨)، وفي "النكت على كتاب ابن الصلاح" لابن حجر العسقلاني (١/ ٤٥)، و "الزهر النضر في حال الخضر" لابن حجر العسقلاني (١/ ٢٥)، و "درء التعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١٠/ ٢٠٤)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢/ ٢٢١).

(٢) "الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان" لابن تيمية ص٩٤، و "مجموع الفتاوى" (١١/ ٢٢٥).

ته‌نانه‌ت به‌ ئه‌ندازه‌یه‌ك گه‌یشته‌ ئه‌وه‌ی هه‌ندێك له‌ زیاده‌ڕه‌وی و ده‌مارگیریدا كه‌وتنه‌ ده‌ره‌وه‌ی ئیسلام و موسوڵمانان، وه‌كوو دینێكی سه‌ربه‌خۆ و ناسراو و خاوه‌ن به‌رنامه‌ و كاری جیاواز له‌ ئیسلام، بگره‌ شوێنی قبوولێش نییه‌ لایه‌نگرانی موسوڵمان بن و بچنه‌ ئیسلامه‌وه‌؛ كه‌ خۆیان له‌ بنه‌ڕه‌تدا له‌ناو ئیسلامدا بوون، وه‌كوو (یه‌زیدی)یه‌كان كه‌ شوێنكه‌وته‌ی زانای ناوداری ئه‌هلی سوننه‌ بوون به‌ناوی (عدی كوڕی مسافر) و جێگره‌كه‌یه‌وه‌ (شێخ حسن)، به‌ بۆنه‌ی دژایه‌تیكردنی شیعه‌كانه‌وه‌ (شێخ حسن)یان كوشت و زیاده‌ڕه‌وییان كرد له‌ (یه‌زیدی كوڕی مه‌عاویه‌)دا، تا وتیان پێغه‌مبه‌ره‌ و به‌و هۆكاره‌ گۆڕه‌كه‌ی (شێخ عدی و حسن) حه‌جی به‌ ده‌وردا ده‌كه‌ن و ئاوی زه‌مزه‌م و عه‌ره‌فه‌شیان بۆ دروست كردووه‌، ته‌نانه‌ت (شيخ الإسلام ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ نامه‌یه‌كیان بۆ ده‌نێرێت به‌ ناوی "الرسالة العدوية" ، ڕێنموونییان ده‌كات له‌سه‌ر ڕێگاكه‌ی شێخ (عدی)، وه‌ به‌ زانا و خواناسێكی ئه‌هلی سوننه‌ ناوی ده‌بات و ده‌ڵێت: «وَفِيكُمْ مِنْ أَوْلِيَاءِ اللَّهِ الْمُتَّقِينَ مَنْ لَهُ لِسَانُ صِدْقٍ فِي الْعَالَمِينَ ... " أَبِي الْحَسَنِ عَلِيِّ بْنِ أَحْمَد بْنِ يُوسُفَ الْقُرَشِيِّ الهكاري " وَبَعْدَهُ الشَّيْخُ الْعَارِفُ الْقُدْوَةُ عَدِيُّ بْنُ مُسَافِرٍ الْأُمَوِيُّ " وَمَنْ سَلَكَ سَبِيلَهُمَا فِيهِمْ مِنْ الْفَضْلِ وَالدِّينِ وَالصَّلَاحِ وَالِاتِّبَاعِ لِلسُّنَّةِ ...»[(١)].

واته‌: له‌ ئێوه‌دا خواناسان و ئه‌ولیای خوا هه‌یه‌، كه‌ خاوه‌نی زمانپاك و ڕاست بوون له‌ناو خه‌ڵكیدا، وه‌كوو: (ئه‌بوالحسن هه‌كاری و شێخ عدی مسافر)و ئه‌وانه‌ی شوێنكه‌وته‌ی ئه‌م دوانه‌ن و خاوه‌ن دین و چاكه‌ و شوێنكه‌وته‌ی سوننه‌تن.

وه‌ هه‌روه‌ها وه‌كوو (هاواری و كاكه‌یی و درووزی و عه‌له‌وی)یه‌كان، ئه‌مانه‌ و چه‌نده‌های تر نموونه‌یه‌كن له‌سه‌ر هه‌مان زیاده‌ڕه‌وی و ده‌مارگیری له‌سه‌ر بیروڕا و به‌رنامه‌یه‌كی به‌ناو دینی.

وه‌كوو (خه‌وارج)ه‌كان گرنگیدانی ته‌واو به‌ لایه‌نی هه‌ڕه‌شه‌ و ترسه‌كان (الوعيد والخوف)ی قورئان به‌بێ خوێندنه‌وه‌ی لایه‌نی موژده‌ و لێبوردن (الرجاء والوعد)ه‌كان، تاوه‌كوو به‌ كه‌مترین تاوان خوێندنه‌وه‌ی كوفر و كوشتنیان بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی ده‌كرد، وه‌ زیاده‌ڕه‌ویكردن به‌ لایه‌نی قورئان و ده‌رچوون له‌ سوننه‌ت و ئه‌هله‌كه‌ی، تاوه‌كوو به‌ هیچ شێوه‌یه‌ك كاریان به‌ فه‌رمووده‌ نه‌ده‌كرد،

---

(١) "مجموع الفتاوى" (٣/ ٣٧٧)، "المنتقى من منهاج الاعتدال" للذهبي بتحقق: محب الدين الخطيب ص٢٩١ الهامش للمحقق.

بەڵکوو هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ کە هەڵگری سوننەتەکە بوون بە هەڵگەڕاوە و دەرچوو لە دینیان دادەنان.

وە (موعتەزیلە)کانیش بە زیادەڕەوییان لە عەقڵ بە بەڵگەکردن و زۆر تێکەڵبوون بە فەلسەفە و توێژینەوە عەقڵییەکان؛ گەیشتنە ئەو ڕادەیەی کە عەقڵ لەپێش فەرموودەی قورئان و سوننەتەوە دەکرێتە بەڵگە و ئەو بابەتانەی پێچەوانەی عەقڵە لە ئیسلامدا دەبێت بە گومانەوە سەیری بکرێت و بەدوای تەئویل و گونجاندندا بگەڕێین بۆی، تا گەیشتە ئەو ئاستەی ئیسلامێکی تاشراو بە بەرنامە و یاسا و ڕێسای خۆیان بەدەستەوە ما، کە ئەتوانین بڵێین هەموو شتێکیان پێبوو بەس ئیسلامیان پێ نەبوو.

وە هەروەها بەدوای ئەماندا (قەدەری و مورجیئە و ئەشعەری و ماتۆریدی)یەکان، بە هەمان کاری زیادەڕەوی و دەمارگیری و لەقاڵبدانی ئیسلام؛ هەریەکەیان لە بوار و شێوەیەکدا بوون.

تا لەدایکبوونی کێشمەکێشمی مەزاهیبە فیقهییەکان و پشتگیری خەلیفەکان و تێکەڵکردنی بە دەسەڵاتەوە، تا ئەو ڕادەیەی چوار میحرابی نوێژ هەبوو لە حەرەمی (مەککە)دا بۆ نوێژخوێنانی هەر چوار مەزهەبەکان، کە لە سەردەمی شا (عبدالعزیز بن سعود)دا کۆتایی پێ هات.

ئەمانە هەمووی نموونەی ڕوون و ئاشکران، گەر لایەنگری و دەمارگیری و زیادەڕەوی نەبوونایە؛ ئەمانە دروست نەدەبوون و لادان و گۆڕانکاری ڕووی نەدەدا.

کەواتە هۆکاری سەرەکی بوونی داهێنراوەکان ئەم هۆکارە خۆییانەن، کە بە بنەبڕکردنی هۆکارەکان نەمانی داهێنراوەکانە، بەو مانایەی پەروەردەکردن لەسەر بەڵگە و چاوڕۆشنکردنەوە لەسەر زانستە شەرعییەکان تاکە ڕێگەی گەڕانەوەیە بۆ بنچینەکە.

**ئەو هۆکارانەی تر کە لە ژێر کاریگەری دەمارگیریدا کۆ دەبنەوە لەسەر داهێنەر (المبتدع):**

١- **(الغلو)**: زیادەڕەوی و دەرچوون لە سنووری حەق، وە شکاندنەوەی بە لایەکدا بۆ ویستەکانی خۆی.

٢- **(الجدال)**: زۆر وتن و هێنان و بردن و کێشمەکێشمی نا پێویست، دەبێتە هۆکاری خاوەن بیروڕا لەسەری.

٣- **(التفرق والإختلاف)**: چەند بەرەکایەتی و جیاوازی کارێکی زۆر لەبارە بۆ جێگیربوون و مانەوەی بە زیندووڕاگرتنی هەموو جۆرەکانی (بیدعە) و داهێنراو.

## دووەم : هۆکاره دەرەکییەکان

هۆکاره دەرەکییەکان کەش و دۆخێکی کاریگەرن بۆ دروستبوون و مانەوەی داهێنراوەکان، وە پاڵنەر و بزوێنەرێکی تایبەتین، خۆ گەر هۆکاره خۆییەکانیشی لەپشت بێت ئەوا دەبێتە هۆکاری مانەوە و درێژەپێدانی و ئەوکات ئەستەمە هەڵکەندنی و دژایەتیکردنی، لەو هۆکارانەش:

### ١. کۆمەڵگایەکی پڕ له لادراوی و گومڕایی:

گەورەبوون لە کۆمەڵگایەکی دوور لە بنەمای زانستی و ڕاست و دروستی بەرنامەی ئیسلام؛ کاریگەرە بۆ هەڵگرتنی کار و بیروبۆچوونەکانی دەوروبەر، وە گەر لە بەرامبەریشدا حەق و ڕاستییەکەش نەبێت؛ ئەوا منداڵی لەسەر پیر دەبێت و دەبێت بە دینێك کە لادان لێی گومڕایی و دەرچوونە لە دین.

لەبەر ئەوە هەموو وەڵامی بیروڕاکانی سەردەمی پێغەمبەران لە ئاستی بانگەوازی تازەی حەق و ڕاست و دروستی پێغەمبەران دەیان وت: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ٢٣﴾ [الزخرف : ٢٣].

واتە: ئێمە باووباپیرانمان لەسەر ئەم ڕێگایە بینیوەتەوە، ئێمەش بەردەوامین لەسەر ڕێگە و پاشماوەی ئەوان.

وە لەلایەکی تریشەوە گەشەکردن لەناو کۆمەڵگەیەکی پڕ لە داهێنراو و لادان و پاشان وەرگرتنی پێچەوانەکانی ئەوان؛ توانینی مانەوە و جێبەجێکردنی زۆر قورس و گرانە.

وەکوو (ابن القیم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «فإنه مدني بالطبع، لا يمكنه أن يعيش وحده بل لا يعيش إلا معهم، وله ولهم لذات ومطالب متضادة ومتعارضة، لا يمكن الجمع بينها بل إذا حصل منها شيء فات منها أشياء، فهو يريد منهم أن يوافقوه على مطالبه وإرادته وهم يريدون منه ذلك فإن وافقهم حصل له من الألم والمشقة بحسب ما فاته من إرادته وإن لم يوافقهم آذوه وعذبوه وسعوا في تعطيل مراداته كما لم يوافقهم على مراداتهم، فيحصل له من الألم والتعذيب بحسب ذلك فهو في ألم ومشقة وعناء وافقهم أو خالفهم، ولا سيما إذا كانت موافقتهم على أمور يعلم أنها عقائد

باطلة وإرادات فاسدة وأعمال تضره في عواقبها، ففي موافقتهم أعظم الألم وفي مخالفتهم حصول الألم، فالعقل والدين والمروءة والعلم تأمره باحتمال أخف الألمين تخلصا من أشدهما»[1].

واتە: ئادەمیزاد سروشتی شارستانیەتە، ناتوانێت بە تەنیا بژی، لەبەر ویست و پێداویستیەکانی ژیانی، گەرچی ویستەکان زۆریان پێچەوانە و دژیەکن و کۆنابنەوە لەگەڵ یەکدا، ئەم دەیەوێت بێنە سەر ویست و کارەکانی، ئەوانیش بە هەمان شێوە، گەر ئەم بچێتە سەر کار و بۆچوونەکانی ئەوان؛ تووشی ئازار و مەینەتییەکی زۆر دەبێت لە بەرامبەر ویستەکانی ئەم، وە گەر نەگونجێت لەگەڵیاندا؛ ئەوا ئازار و سزای دەدەن، وە بەربەست دەبن لە هێنانەدی مەبەستەکانی ئەم، بەمەش بە گوێرەی خۆی مەینەتی و ئازاری بۆ دەبێت، کەواتە بە گونجاندن و دژایەتیکردن هەر لە ئازار و زەحمەتدایە، بەتایبەت گەر نەگونجاندنەکە لە بواری بیروڕا و کاروکردەوەیەکی هەڵەدا بێت، بەڵام عەقڵ و دین و کەسایەتی و زانست فەرمانی پێ دەکات کە کەمترین ئازار هەڵبژێرێت تا لە ئازاری گەورەتر ڕزگاری بێت.

کەواتە ئادەمیزاد کوڕی شوێنی گەشەیەتی (الإنسان ابن بیئته) و هەڵکەوتەی ئەو جۆرە بارودۆخ و کۆمەڵگایەیە و شێوازێکی ڕەنگدانەوەیەتی، ئەگەرچی خۆی هەڵی نەبژاردووە و پێشی ڕازی نییە، بەڵام تەواوی کەسایەتی ڕاست و بەرنامەدار لەوەدایە گەر کۆمەڵگا و دەورووبەرەکەی لەسەر بیروباوەڕی گومڕا و خورافیات و داهێنراو بوون؛ ڕادەستیان نەبێت و بێباك بێت لێیان، سوننەت و حەقەکە وەربگرێت و پێشەوا و پێشینەیەکی صاڵح بێت بۆ چواردەوری.

هەروەك لە سەرەتای ئیسلامدا پەیمان لە تازە موسوڵمانەکان وەردەگیرا کە کۆچ بکەن بۆ شوێنگەی موسوڵمانان، وەکوو لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: «ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ»[2].

---

(١) "شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل" لابن القيم ص٢٤٦.

(٢) رواه مسلم (١٧٣١)، وأبو داود (٢٦١٢)، والترمذي (١٦١٧)، وابن ماجه (٢٨٥٨)، والنسائي في "الكبرى" (٨٦٢٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٧٣٩)، وأحمد في "المسند" (٢٢٩٧٨)، والدارمي في "السنن" (٢٤٨٦)، وفي "المشكاة" (٣٩٢٩)، و"الإرواء" (١٢٤٧)، و"صحيح الجامع الصغير" (١٠٧٨).

له‌به‌ر نه‌توانینه‌وه له‌ناو كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی وێراندا، وه دووركه‌وتنه‌وه و دروستبوون له‌ناو كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی ڕۆشنبیردا.

ئیمامی (یونس بن عبد الأعلى) رَحِمَهُ ٱللَّهُ ده‌ڵێت: «إِنِّي لَأَعُدُّهَا مِنْ نِعْمَةِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنِّي لَمْ أَنْشَأْ بِالْكُوفَةِ»[1].

واته: به یه‌كێك له نیعمه‌ته‌كانی خوای داده‌نێم كه له كووفه‌دا گه‌وره نه‌بووم، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی پڕ بوو له بیدعه‌ی ڕافیزه‌گه‌رێتی.

## چه‌ند نموونه‌یه‌ك له‌سه‌ر كاریگه‌ری گه‌شه‌كردن له چوارده‌ورێكی پڕ له بیدعه و داهێنراودا

**١- (أبو الحسن الأشعري)** رَحِمَهُ ٱللَّهُ: خاوه‌نی مه‌زهه‌بی (ئه‌شعه‌ری)یه، ئێستا به گشتی جیهانی ئیسلامی له‌سه‌ر بۆچوونه عه‌قیده‌ییه‌كانی ئه‌وه، یه‌كێكه له ڕێگه هه‌ڵه‌كانی لادراو له ئه‌هلی سوننه‌ت له بابه‌ته‌كانی (الأسماء والصفات، القضاء والقدر، الإيمان، ...إلخ)دا.

ئه‌م پیاوه له بنه‌ماڵه و باوكێكی به‌رنامه پاكی په‌یوه‌ستبوو به فه‌رمووده و سوننه‌ته‌وه گه‌وره بووه، پاش مردنی باوكی كه‌سێك به ناوی (أبو علي الجبائي المعتزلي) دایكی ده‌خوازێت و (أبو الحسن الأشعري)ش ژیان لای ئه‌م پیاوه ده‌باته سه‌ر، كه یه‌كێكه له ناوداره‌كانی بۆچوونی (المعتزلة)، كه به گومڕاترین كۆمه‌ڵ داده‌نرێن له (عقيدة أهل السنة)دا، بۆیه كاریگه‌ری ئه‌وی له‌سه‌ر ده‌بێت و ده‌بێت به هه‌ڵگری ئه‌م به‌رنامه گومڕایه تاوه‌كوو كۆتایی ته‌مه‌نی، پاشان ده‌ركی پێ ده‌كات و ده‌یه‌وێت ڕزگاری بێت و بگه‌ڕێته‌وه سه‌ر به‌رنامه‌ی زانایانی (أهل الحديث والسنة) و ڕه‌چاوی ڕێڕه‌وی ئیمام (أحمد بن حنبل) بكات[2].

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٦/ ٣٨٨)، و "مسند ابن الجعد" (١٣٣١)، وفي "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (٣٢/ ٥٣١).

(٢) سه‌یری "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٧٢) بكه.

بەڵام بەهۆی کاریگەری ئەم پەروەردەیەوە ناتوانێت وەکوو خۆی ڕێڕەو و بەرنامەکەی بگۆڕێت، لەم قۆناغەی دووەمیدا بەرنامە و (مذهب الأشعري) لەدایك دەبێت، کە دەتوانین بڵێین حەفتا لە سەدی بەرنامەی (موعتەزیلە)کانە، ئێستا جیهانی ئیسلامی و زانایانی (أهل السنة) پێوەی گیرۆدەن و زانکۆکانی جیهانی ئیسلامی لە خوێندنە ئایینییەکاندا کردوویانە بە بەرنامە (منهج)ی ساڵانە.

پاش ئەم قۆناغە و بە ماوەیەکی کەم پێش مردنی پەرتووکی "الإبانة في أصول الديانة" دەنوسێت و پەشیمانبوونەوەیەکی زۆر لە قۆناغی دووەم دەردەبڕێت و بە تەواوی تیایدا بانگەوازی ڕێڕەو و بەرنامەی ئیمام (أحمد بن حنبل) ﵀ دەکات و دەیەوێت هەڵگری ڕێگاکەی بێت، لێرەشدا هێشتا زانایان هەر ڕەخنە و لادانیان لەسەر تۆمار کردووە.

٢- **(أبو حامد الغزالي)** ﵀: ناسراو بە (ئیمامی غەزالی)، خاوەنی کتێبی "إحياء علوم الدين".

سەرەتای شارەزایی دینیی لە ڕێگەی (فەلسەفە و منطق و علم الكلام)ەوە دەستی پێکرد، پاشان بۆی ڕوون بووەوە کە ئەمە ڕێگەیەکی پڕ هەڵە و گومڕاییە وازی لێهێنا و نامیلکەیەکی لەسەر ئەم گۆڕانکارییەی نووسی بە ناوی: ڕزگاربوو لە گومڕایی "المنقذ من الضلال" و "تهافت الفلاسفة".

پاشان ڕووی کردە تەسەوف و عیبادەت، بەڵام کاردانەوەی ڕابردووی لەسەر بوو، بۆیە بەرگی فەلسەفەی بەسەر تەسەوفدا بڕی و تەسەوفێکی فەلسەفی دروست بوو، کە سەلامەت نەبوو لە بۆچوونە (باطني)یەکان و خەیاڵە فەلسەفییەکان، وە پەرتووکێکی لەم قۆناغەدا بە ناوی "إحياء علوم الدين" نووسیوە.

بەڵام لێرەدا بە پەنابردنە بەر کەشف و دەرکە سۆفییەکان بە بەرگێکی تێکەڵ بە فەلسەفە و ناوەڕۆك (باطني)یەکانەوە دەیەوێت هەموو علوم و زانستەکان بسەلمێنێت، دوور لە قورئان و فەرموودە بوونە سەرچاوەی سەرەکی، ئەم هۆکارە بووە هۆی ئەوەی (أبو فرج الجوزي) ﵀ هەستێت بە نوسینی کتێبی "منهاج القاصدين" وەکوو بەدیلێك بۆ چارەسەرکردن و

دووركەوتنەوەى خەڵك لە كتێبى "إحياء علوم الدين" لەبەر ئەو هەموو پڕبوونەی بە فەرموودەی (ضعيف وموضوع) و لادان و تێکدانەی کە لەخۆی گرتووە، بەڵام بە لەخۆگرتنی هەمان بابەتەکانی "إحياء علوم الدين".

وەك (ابن العربي المالكي) رحمه الله دەڵێت: «شَيْخُنَا أَبُو حَامِدٍ دَخَلَ فِي بَطْنِ الْفَلَاسِفَةِ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْهُمْ فَمَا قَدَرَ»[١].

واتە: مامۆستامان (أبو حامد الغزالي) چووە ناوەڕۆکی فەلسەفەوە، پاشان ویستی دەربچێت بەڵام نەیتوانی.

وە (ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «وَأَبُو حَامِدٍ يَمِيلُ إِلَى الْفَلْسَفَةِ لَكِنَّهُ أَظْهَرَهَا فِي قَالَبِ التَّصَوُّفِ وَالْعِبَارَاتِ الْإِسْلَامِيَّةِ»[٢].

واتە: (أبو حامد الغزالي) مەیلی بەلای فەلسەفەوە بوو، بەڵام لە قاڵب و چوارچێوەی تەسەوف و دارِشتنە ئیسلامییەکاندا دەیدایەوە.

کەواتە نەیتوانی خزمەتی ناوەڕۆکی ئیسلامی بکات، بەڵکوو بە پێچەوانەوە بوو، وەکوو (ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «كَلَامُ الْغَزَالِي يَنْفَعُ الْفَلْسَفِيُ وَيَضُرُّ الْمُسْلِمْ»[٣].

واتە: قسەکانی (غەزالی) سوودی بە ئەهلی فەلسەفە دەگەیاند و زەرەری لە موسوڵمانان دەدا.

واتە بەرگی حەقی دەکردە بەر هەڵەکان و موسوڵمانانی چەواشە دەکرد.

بۆیە لە کۆتایی تەمەنیدا هەست بەمانە دەکات و دەگەڕێتەوە و مردنی دێت بەسەردا و ئەو سەرقاڵە بە (صحيح البخاري)یەوە، وە دەشڵێن پەشیمان بووەتەوە لە هەموو نووسینە پێشووەکانی، بۆ ئەمە (ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «وهو في آخر عمره اشتغل بالبخاري ومات على ذلك ولهذا قيل إنه رجع عن هذه الكتب ...»[٤].

---

(١) "الرد على المنطقيين" لابن تيمية (٤٨٣).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ١٦٤).

(٣) "النبوات" لابن تيمية (١/ ١٥٩).

(٤) "الرد على الشاذلي في حزبيه، وما صنفه في آداب الطريق" لابن تيمية ص٤١.

**بەڵام بە داخەوە وەکوو (أبو الحسن الأشعري) کتێبەکانی (غەزالی)ش سەرچاوەیەکی بەناوبانگن لە جیهانی ئیسلامیدا، وە بەتایبەت تەسەوف و ئەوانەی لە چواردەوری مەشرەبی تەسەوف دان و هەڵگر و دانەوەی بۆچوونەکانی پێش مردنی (غەزالی)ن، خۆ ئەگەر (غەزالی) لە ناوچەیەکی وەکوو (حیجاز) و ئەهلی فەرموودەدا گەشەی بکردایە و پێبگەیشتایە؛ ئەوا بەم حاڵە نەدەچوو، خوای پەروەردگار بیبەخشێت،** والله أعلم.

**٣- (أبو علي الحسين بن عبد الله بن الحسن بن علي بن سينا): ناسراو بە** (ابن سينا).

(ابن سينا) **باوکی یەکێك بووە لە بانگەوازخوازانی** (ئیسماعیلییە شیعەکان) **و لە دەسەڵاتی** (القرامطة)**کان لە میصر.**

(ابن القيم) رحمه الله **دەڵێت:** «**وكان ابن سينا، كما أخبر عن نفسه قال: أنا وأبي من أهل دعوة الحاكم، فكان من القرامطة الباطنية، الذين لا يؤمنون بمبدأ ولا معاد، ولا رب خالق، ولا رسول مبعوث جاء من عند الله تعالى**»[(١)].

**واتە:** (ابن سينا) **یەکێکە لە گرووپە قەرمیتییە شیعەکان (بە ڕووکەش موسوڵمانن و لە ناخیشەوە بێبڕوان)[(٢)] کە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە و ڕۆژی دوایی و خوای داهێنەر و پێغەمبەرێکی نێردراو لە لایەن خواوە نەبووە.**

**تەنانەت کاریگەری پاشماوەی بیروباوەڕ و ئایینەکانی ڕابردووی گەلانی تازە موسوڵمان؛ بووەتە هۆکاری وەرنەگرتنی ئیسلام بە شێوەی دروستی خۆی.**

**وەکوو (تورکیا)ی ئێستا کە دەوڵەتی قەیسەرە کۆنەکانی ئەورووپای ئەو سەردەمە لەسەر ئایینی گاوورەکان بوون، کە پڕ بوو لە ڕەهبانییەت و عیبادەتی گۆشەگیری و پاکبوونەوەی نەفس جۆری دینداریيان بوو.**

---

(١) "إغاثة اللهفان من مصايد الشيطان" لابن القيم (٢/ ٢٦٦).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣٥/ ١٤١)، و "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٣/ ٥٠٦).

کاتێك ئیسلامیان پێگەیشت هەمان جۆر کاردانەوەی دینییان لەگەڵ ئیسلامدا کرد، تاوەکوو ئیسلامێك بە بەرگی تەسەوفەوە لەدایك بوو، بۆیە هەموو سوڵتانەکانی (عوسمانی) لەسەر بنەما و ڕێچکەی تەسەوف بوون.

هەروەك (ئێران) لەسەر ئایینی زەردەشتی ڕۆژ و ئاگرپەرست بوون، بەرنامەی ئایینیان ئیباحیەت و هەسارە پەرستی بوو، زۆر لە بنەمای ئایینە ئاسمانییەکانەوە دوور بوو.

کاتێك ئیسلامیان پێگەیشت ئایینێکیان بە شێوەی بنەمای ڕابردووی خۆیان داتاشی، کە هەموو ئەو بابەتانەی خۆیان بە بەرگێکی دینی کرد، تاوەکوو ئیسلامێکی شیعەگەرییان پێ دروست کرد.

ئەمانە و چەندەهای تر نمونەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکران، کە هەموو ڕێگەیەکی پڕ بیدعە و گومڕایی کاریگەری ڕابردوو و جۆری خەڵکەکانە.

### ٢. کاریگەری دەسەڵات:

هەر زوو وتراوە «النَّاسُ عَلَى دِينِ مُلُوكِهِمْ»[(١)].

واتە: خەڵکان لەسەر ئایینی پاشاکانیانن.

دەسەڵات و هێز و ئابووری و هەموو هۆکارەکانی لەبەردەستدایە بۆ ڕاپێچکردنی خەڵکی، تا دەقی پێوە دەگرن پاشان دەبێت بە خووڕەوشتیان.

هەروەك جوولەکەکان، کە هۆکاری ژێردەستەیی و چەوسانەوە و زۆرە ملێی دەسەڵاتی (فیرعەون) وای لێ کردبوون ڕەوشتیان گرتبوو بە بێگوێیی و نەچوونە ژێر فەرمانەکانەوە، کاتێك شوێنکەوتەی پێغەمبەر (موسا) ﷺ یش بوون بە هەمان شێوە لە ڕقی جێبەجێنەکردن نەچوونە ژێر بار و یاخیبوون لە فەرمانەکان ڕەوشتیان بوو، دژایەتی هەموو جۆرە فەرمانێکیان دەکرد بە حەق و ناحەق.

لە قورئانیشدا زۆری هۆکاری وەرنەگرتن و بەربەست لە ئاستی گوێڕایەڵینەکردنی پێغەمبەراندا دەگێڕێتەوە بۆ گوێڕایەڵی دەسەڵات، کە بە ناوی (الملأ)ەوە باسی دەسەڵات دەکات.

---

(١) "موسوعة الفرق المنتسبة للإسلام" (٢/٢١٦)، و "الذكر الجماعي بين الاتباع والابتداع" لمحمد بن عبد الرحمن الخميس ص١٣، و "فتح الباري" لابن حجر (٧/١٥١).

بۆ گەلی (نوح) عليه السلام دەفەرموێت: ﴿فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ ٢٧﴾ [هود: ٢٧].

وە بۆ گەلی (هود) عليه السلام دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٖ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٦٦﴾ [الأعراف: ٦٦].

وە بۆ گەلی (صالح) عليه السلام و دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ٧٥ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ٧٦﴾ [الأعراف: ٧٥، ٧٦].

وە بە گشتی دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ٦٧﴾ [الأحزاب: ٦٧].

وە بۆ (فیرعەون) دەفەرموێت: ﴿فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ٥٤﴾ [الزخرف: ٥٤].

وە (ابن كثير) رحمه الله دەڵێت: «الْمَلَأُ هُمَ: السَّادَةُ وَالْكُبَرَاءُ مِنَ الْكَافِرِينَ»[(١)].

واتە: وشەی (الملأ) کە لە ئایەتەکاندا هاتووە مەبەستی گەورە و دەسەڵاتدارە بێبڕواکانن.

ئیمامی (الصنعاني) رحمه الله دەڵێت: «فإنَّ هذه منكراتٌ أسَّسَها مَن بيده السيفُ والسِّنان، ... فإنَّ هذه القِبابَ والمشاهدَ التي صارت أعظمَ ذريعة إلى الشرك والإلحاد، وأكبرَ وسيلة إلى هدم الإسلام وخراب بنيانه، غالبُ، بل كلُّ مَن يَعمُرُها هم الملوكُ والسلاطينُ والرؤساء والولاةُ ...»[(٢)].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٤/ ٢٧٤).

(٢) "تطهير الاعتقاد عن أدران الإلحاد" ص٨٢.

واته: ئەم خراپە و شتە هەڵانە کەسانێك بنیادیان ناوە کە خاوەن دەسەڵات بوون، ... ئەو قوببە و مەزارانە زۆریان پاشا و دەسەڵاتداران کردوویانەتەوە.

وە (عبدالله ی کوڕی موبارەك) ﷀ دەڵێت:

وَهَلْ أَفْسَدَ الدِّينَ إِلَّا الْمُلُوكُ    وَأَحْبَارُ سُوءٍ وَرُهْبَانُهَا؟[١]

واته: کێیە تێکدەری ئایین بێجگە لە دەسەڵاتداران و بەناو زانا و عابیدەکان نەبێت؟!

ئیمامی (الذهبي) ﷀ دەڵێت: «فَلَقَدْ جَرَى عَلَى الإسلاَمِ فِي المائَةِ الرَّابِعَةِ بلاَءٌ شَدِيدٌ بِالدَّوْلَةِ العُبَيْدِيَّةِ بِالمَغْرِبِ، وَبَالدَّوْلَةِ البُويْهِيَّةِ بِالمَشْرِقِ، وَبَالأَعرَابِ القرامطة»[٢].

واته: لە سەدەی چوارەمدا بەڵایەکی گەورە بەسەر ئیسلامدا هات، بەهۆی دەوڵەتی (عوبەیدی)یەکانەوە لە (مەغریب) و دەوڵەتی (بوەیهی)یەکان لە ڕۆژهەڵات، وە هەروەها (قەرامیتەکان)یش.

## نموونەیەك لەو دەسەڵاتانە

١- **(مأمون): خەلیفەی عەباسی.**

بە هۆکاری نەزانین و بێئاگایی و پەروەردە نەبوونی زۆری خەلیفەکان لەسەر زانستە شەرعیەکان؛ گومڕایان و بیدعەکاران بە هەلیان قۆستووەتەوە تا لێیان نزیك ببنەوە و بەکاریان بێنن بۆ مەبەست و خواستەکانی خۆیان، یەکێك لەوانە (مأمون) بووە.

کۆمەڵێك لێی کۆ دەبنەوە لەوانە (بشر المريسي وأحمد بن أبي دؤاد ...) تاوەکوو کاریگەر دەبن لەسەری، تا دەیخەنە ناو بیروبۆچوون و بەرنامە فەلسەفییەکەی (موعتەزیلە)و بۆچوونی شیعەکانەوە.

---

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" ص١٧١.

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٢/ ٢٨٩).

وەکوو (ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «تَوَلَّى الْمَأْمُونُ الْخِلَافَةَ ... وَقَدْ كَانَ فِيهِ تَشَيُّعٌ وَاعْتِزَالٌ، وَجَهْلٌ بِالسُّنَّةِ الصَّحِيحَةِ»[١].

(مەئمون) هەڵگری بۆچوونی شیعەیە (لە پێشخستنی ئیمامی عەلی بەسەر ئەبو بەکر و عومەر)دا و بۆچوونی (موعتەزیلە)ەکانی هەبوو لە بیرۆکەی (قورئانی مەخلوق)دا و نەزانینی تەواو بەسەر (سوننەت و فەرموودەی صحیح)دا.

ئەمە بووە هۆکاری گەورەترین بەڵاو نەهامەتی بەسەر جیهانی ئیسلامی و بەتایبەت زانایان و ناودارانی ئیسلام، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی چەندەها زانا کوژران و دەرگای تاقیکردنەوەی کردەوە بەسەر قازی و فەقیهەکان و فەرموودەناسەکاندا، تەنانەت بەسەر کاربەدەست و گەورەپیاوانی سەربازی و ئیمام و بانگبێژی مزگەوتەکاندا، ئەوەی دانی نەنایە بەوەی (قورئان مەخلوقە) نان بڕاو و دوورخستنەوە دەیگرتەوە، وە شایەتییان لێ وەرنەدەگیرا و بگرە ڕێگەی دەرس و فەتواشیان لێ دەگیرا، وە تەنانەت ڕێگری کرا لە زانایانی فیقهی و فەرموودە لە مزگەوتەکاندا، بێجگە لە هەڵگری بەرنامەی خۆیان نەبێت، وەکوو (عبدالعزيز الكناني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «قد منع الفقهاء والمحدثون والمذكرون والداعون من القعود في الجامعين ببغداد»[٢].

تەنانەت گەیشتە ئەو ڕادەیەی دیلەکانی ژێر دەستی گاوورەکان تاقی دەکرانەوە بەو وشەیە، کە ئەوەی هەڵگری بیروڕایان نەبوایە ئازاد نەدەکرا.

ئەوەی خۆڕاگر بوو بەرامبەریان ئیمام (أحمد ى کوڕی حەنبەل) بوو رَحِمَهُ اللَّهُ، کە بیست و هەشت مانگ بە سزادانێکی زۆرەوە لە بەندیخانەدا بوو، هەر لە سەردەمی (مأمون، المعتصم، الواثق)دا، تا سەردەمی (المتوكل) کە ئیمامی لە بەندیخانە ڕزگار کرد و لەسەر دەستیدا کۆتایی بەو بەڵاو فیتنەیە هێنرا[٣].

(١) "البداية والنهاية" (١٠/ ٢٧٥) دار الفكر.

(٢) "الحيدة والاعتذار في الرد على من قال بخلق القرآن" ص٢٢.

(٣) "البداية والنهاية" لابن كثير (١٠/ ٢٧٢) دار الفكر، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٠/ ٢٩٠)، و "الكامل في التأريخ" لإبن الأثير (٤/ ٢٢٢)، و "شذرات الذهب في أخبار من ذهب" لأبو الفلاح عبدالحي بن أحمد الحنبلي (٢/ ٣٩).

پاش هاتنی (موعتەزیلە) و ئەم سەردەمە حوکمانەیان؛ دەرگای فیرەق و کۆمەڵانێکی تر کرایەوە لە بابەتە غەیبییەکاندا، وەکوو (القضاء والقدر، الإيمان والكفر، الأسماء والصفات، ...)، کە (القدرية والجبرية والأشاعرة والماتريدية والمرجئة ...) ئەمانە فیرەق بوون، لەسەر ئەو بابەتانە تەشەنەیان کرد و دروست بوون و ئێستەش پانتاییەکی زۆر لە نوسین و سەرچاوەکان ئەم بابەتانە لەخۆ دەگرن، وە تێکەڵ بە هەموو جۆرە نووسینە دینییەکان بوو، وە کاریگەریشی لەسەر دروست کردن، لە زانستە شەرعییەکانی وەکوو (أصول الفقه وعلوم الحديث وعقائد)، بگرە زۆری زانایانی ئەهلی سوننە بە بێئاگایی کەوتنە ناو ئەو بۆچوونانەوە و بەسەریاندا ساغ بووەوە، ئێستاش بۆ پاڵفتەکردنی ئەو بابەتانە لە سەرچاوەکاندا ئەستەمە و بەدواداچوونێکی زۆری دەوێت.

جیهانی ئیسلامی بەشێوەیەك تێکەڵ بووە لەگەڵ ئەو فیکرە و بۆچوونانەدا لە نوسین و بەرنامەی زانستی شەرعی و خوێندنی لە زانکۆ و کۆلێژە دینییەکاندا کە ڕزگاربوون لێیان زۆر ئەستەم و دوورە.

**٢- دەسەڵاتدارانی (الرافضة)ی شیعە: لە سەدەی چواری کۆچیدا.**

دەوڵەتی (فاطمي)یەکان و (ئیسماعیلی)یەکان لە (مەغریب و میصر) و (بوەیهی)یەکان لە (عێراق) نزیکەی سێ سەدە درێژەی خایاند، حاکمە ناودارەکانیان لە (المهدي، القائم، الحاكم، المنصور، المعز، العاضد) لەم سەدانەدا گومڕاییەکی زۆر لەسەر دەستیاندا بڵاو بووەوە، لە قسەوتن بە (صەحابە) ﭫ لەسەر مینبەر و لە بانگدا، تەنانەت بەسەر دەرگای مزگەوتەکاندا لەعنەتیان دەنووسی لەسەر خەلیفەکان بێجگە لە ئیمامی (عەلی) ﭬ، وە گۆڕ هەڵبەستن و مزگەوت بەسەرەوە کردنەوە، تا وای لێهات گۆڕی خەیاڵی زۆر دروست کرا، یەکێك لەوانە (عضد الدولة) لە سەردەمی خۆیدا گۆڕێکی لە (نەجەف) بە ناوی گۆڕی ئیمامی (عەلی)یەوە دروست کرد و مزگەوتی بەسەرەوە کردەوە، وەکوو ئیمامی (الذهبي) ﭰ باسی دەکات و دەڵێت: «عَضُدُ الدَّوْلَة ... وَكَانَ شِيْعِيّاً جَلِداً، أظهرَ بِالنَّجفِ قَبْراً زَعَمَ أَنَّهُ قَبْرُ الإِمَامِ عَلِيٍّ، وَبنَى عَلَيْهِ المَشْهَدَ، وَأَقَامَ شعَارَ الرَّفْضِ، وَمأْتمَ عَاشُورَاءَ، وَالاعتزَالَ، وَأَنْشَأَ بِبَغْدَادَ البيمَارِستَانَ العَضُدِيَّ»[1].

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٢/ ٢٨٨).

بەڵکوو هەموو ئەو گۆڕانەی ئەمڕۆ ناویان هەیە بووە بە هێما و ڕەمزی (شیعە) و بگرە (سوننە)ش دەستکردی ئەوان بوو لە گۆڕی ئیمامی (حوسەین) ﵁ لە (کەربەلا) و تەنانەت لە (میصر) و (ئێران)یش بەناوی (سيدة زينب ونفيسة، مشهد العسقلاني، ...) کە بەناوی (مشاهد)ەوە گۆڕی صەحابە و خواناسە ناودارەکان دروست کرا و جیهانی ئیسلامی گێڕایەوە سەردەمی هاوەڵ (شريك) بۆ خوا بڕیاردان و هەمان کاری بتپەرستانی سەردەمی نەفامی، تەنانەت جیاوازی نەما لە نێوان موسوڵمان و گاوور و جوولەکە و بتپەرستاندا.

وە (ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «وَلَمْ يَكُنْ فِي الْعُصُورِ الْمُفَضَّلَةِ " مَشَاهِدُ " عَلَى الْقُبُورِ وَإِنَّمَا ظَهَرَ ذَلِكَ وَكَثُرَ فِي دَوْلَةِ بَنِي بويه؛ ... فَبَنَوْا الْمَشَاهِدَ الْمَكْذُوبَةَ " كَمَشْهَدِ عَلِيٍّ " - رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - وَأَمْثَالِهِ»[1].

واتە: لە سەردەمە بەرێزەکانی ئیسلامدا (هاوەڵان و تابعین و شوێنکەوتەیان) هیچ گۆڕێك هەڵنەبەسترابوو، ئەمە کاتێك زۆر بوو کە دەوڵەتی (بوەیهی)یەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ... زۆر گۆڕی درۆینەیان دروست کرد، لەوانە گۆڕی ئیمامی (عەلی) و هاوشێوەکانی.

پاشان دروستبوونی بۆنەکانی وەکوو (عاشورا) بۆ ئیمامی (حوسەین) و لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ و (فاطمة)ی کچی و (غدير خم) سەری ساڵی کۆچی و لەدایکبوونی ئیمامەکانی شیعە و ...هتد.

وە سەرەتای گەیشتنی (بۆچونی شیعە) بووە بۆ (شام) و (میصر) و (مەغریب) و (حیجاز) و لەدایکبوونی گرووپە گومڕاکان بووە، وەکوو (دروزی و عەلەوی و نوسەیری و صۆفی و دەروێش) و تەریقەتەکانیان، وە (مەهدەوی و تیجانی و شازلی)یەکان لە سەرووی قارەی (ئەفریقا)، وە هۆکاری مانەوەی گاوورەکان و پەرەسەندنیان لە جیهانی ئیسلامیدا.

وە کۆتایی ئەم سەردەمانە هات بە زەمینە خۆشکردن بۆ دروستبوونی دەسەڵاتی عوسمانی لەسەر بنەما و ڕێڕەوی تەصەوف.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٧/ ١٦٧).

**هەروەك لە مێژووی ئێراندا ناوداری (شیعە) بە ناوی (ابن المطهر الحلي) لەدایکبووی ساڵی (٦٤٨ - ٧٢٦)ی کۆچی، خۆی نزیك کردەوە لە (خدا بندە) کە ناوی (جایتو) بوو، نەوەی شەشەمی (جەنگیزخان)ی خوێنڕێژ بوو، پاشای خوراسان و ئێران بوو، لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە بوو، وە موسوڵمان بوو، بە هۆکارێکەوە (ابن المطهر) لێی نزیك بووەوە تا وردە وردە کاریگەری لەسەر دروست کرد بۆ ڕاکێشانی سەرمەزهەبی دوانزە ئیمامی شیعە، کتێبێکی بۆ نووسی بە ناوی "منهاج الكرامة في معرفة الإمامة" تا وای لێکرد ناوی ئیمامەکان لەسەر سکەی وڵات بنوسێت، تا ئەو ئاستەی قازی و کاربەدەستەکان بگۆڕێت بۆ شیعەکان، تا ئەو کاتە ئێران و خوراسان ئەهلی سوننە بوون، شیعە زۆر کەمینە و بە شێوەیەکی سەرەتا بووە.**

**بەم شێوەیە ئەمە یەکەم بەردی بناغەی بە شیعەکردنی ئێران بوو، کە ئەمە لە ساڵی (٧٠٧)ی کۆچیدا ڕوویدا، پاش سێسەد ساڵی ئەم کارە (شا ئیسماعیلی صەفەوی) بە فەرمی ئێرانی ڕاگەیاند لەسەر مەزهەبی شیعە و بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی سوننی ڕاوەستا و جیا بووەوە و جەنگا، بەم شێوازە تا ئێستا ئێران هەرکاتێك دەسەڵاتی شیعەگەری بوویێت زیاتر پەلی خەڵکەکەی ڕاکێشاوە بۆ بەشیعەکردن.**

**ئەمەش یەکێکە لە هەرە کاریگەرییەکانی دەسەڵات لەسەر گۆڕین و گومڕایی[(١)].**

**هۆکاری ئەو سەردەم و دەسەڵاتانە؛ جیهانی ئیسلامی بەرەو پڕ لە جۆرەکانی لادانی عەقیدەی شێوازە عیبادەتییەکان و شێواندنی شێوازی زانستی شەرعی برد.**

**بووە ئیسلامێکی پڕ لە (شرك وبدعة وتقليد المذاهب وحديث الضعيف والموضوع ...) و بەرەو هەڵدێرانی برد.**

**وە بووە هۆکاری تێڕوانین و دانەوەی دین بە شێوەیەکی عەقلانی ڕووت و پڕ لە ویست و ئارەزووەکانی ئادەمیزاد[(٢)].**

---

(١) "المنتقى من منهاج الإعتدال" للذهبي، بتحقيق: محي الدين الخطيب ص٢٠، ئەم کتێبە کورتکراوەی "منهاج الإعتدال"ی (ابن تيمية) یە بۆ بەرپەرچدانەوەی نوسراوەکەی (ابن المطهر الحلي) کە "منهاج الكرامة" یە نوسیبووی.

(٢) بۆ ڕووداوەکانی باسی سەدەی سێهەمی کۆچی بڕوانە: "البداية والنهاية" لابن كثير (٦/ ١/ ٢٤٧)، و "الخطط المقريزية" للمقريزي (٤/ ١٩١)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٥/ ١٥٢)، و "منهاج السنة النبوي" لابن تيمية (٦/ ٣٧٠).

## ٣. ڕازاندنەوەی داهێنراوەکان:

لە سروشتی ئادەمیزاددا کاریگەری ڕاکێشان هەیە بۆ دەرخستنی ڕووی جوانی و بریقەدار و پەلکێشانی هەموو ڕاستییەکان بەلای خۆیدا و لەبەرکردنی هەموو بەرگێکی حەق و بەدیهێنانی دڵنیایی زیاتر بۆ خۆیی و بەرامبەری.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾﴾ [المؤمنون: ٥٣].

واتە: هەموو گرووپ و کۆمەڵەکان خۆیان بە کامەران دەزانن بەوەی لایانە و پێیانە.

ئەم ڕازاندنەوەیە کاریگەری دەبێت لای کەسانی سەرەتا و عەقڵ لاواز و ناشارەزا لە دیندا، بەتایبەت گەر تا ڕێژەیەك حەق لەخۆ بگرێت، وە بێگومان هیچ داهێنراو و ڕێگەیەك نییە هەندێك لە حەق لەخۆ نەگرێت، ئەوەش هۆکاری ڕاگرتنی خاوەنەکانیەتی.

وە تەنانەت هەرچی تاوانە لە دونیادا بەرگی حەقیان لەبەر کردووە، بەناوی ئازادی و پێشکەوتن و ماف و هونەر، وە (ئیبلیس) بۆ ڕازاندنەوەی فەرمانشکاندنەکەی خوای پەروەردگار؛ وتی: ﴿هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾﴾ [طه: ١٢٠]. هەواڵت بدەمێ کامە درەختی ئەبەدی و مانەوەیە؟ لەگەڵ ئەوەشدا هۆکاری دەرکردن بوو لە بەهەشت.

وەکوو جوولەکەکان بە خۆیان دەڵێن: ﴿نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ﴾ [المائدة: ١٨]. ئێمە کوڕان و خۆشەویستانی خواین، «شَعْبُ الله الْمُخْتَار» گەلی هەڵبژێردراوی خواین، تەنانەت فیرەقەکانی ناو ئیسلامیش (شیعە)کان خۆیان بە لایەنگر و پشتیوانی ئەهل و بەیتی پێغەمبەر و شوێنکەوتەی لایەنگرانی ئیمامی (عەلی) و بنەماڵەکەی دادەنێن و بە خۆیان دەڵێن «مُؤْمنِين وَأَوْلِيَاءُ الله»، وە (خەوارج)ەکان بە خۆیان دەوت «مُؤْمنِين» و شوێنەکەیان ناونابوو «دَارُ الْهِجْرَة»، بەو مانایەی بێجگە لەوان بێبڕوان و لانەیان «دَارُ الْكُفْر»ە.

وە (موعتەزیلە) و (قەدەری)یەکان کە گروپە عەقڵییە فەلسەفییە گومڕاکان بوون؛ بە باوەڕنەبوون بە ناو و سیفاتەکانی خوا دەیانوت «الْتَّوحِيد» و بە باوەڕنەبوون بە قەدەر دەیانوت «الْعَدْلُ» دادپەروەری، وە یاخیبوون و هەڵگەڕانەوە لە دەسەڵاتی ئیسلامییان لەژێر ناونیشانی «الْأَمْرَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيَ عَنِ الْمُنْكَرِ»دا ئەنجام دەدا.

**یاخود بیروبۆچوون و مەزهەبەکانیان دەخستە پاڵ ناوداران، وەکوو سۆفییەکان خۆیان دەبەنەوە سەر ڕێگای (حەسەنی بەصری) و ئەهلی (صفة)ی مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە دەروێشەکان (طریقة)ەکانیان دەبەنەوە سەر (ئەبو بەکری صدیق) و (ئوەیسی قەرەنی) و بە دەنگی بەرز زیکر و سڵاوات و گێڕانی مەولودنامە بە خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ و کۆڕی زیکر ناو دەبەن، وە گۆڕە هەڵبەستراو و مزگەوت بەسەرەوە کراوەکان بە مەزارگە پیرۆزەکان ناو دەبەن، بگرە وەزارەتی تایبەت دانراوە بۆ بەڕێوەبردنیان، وەکوو موشریکەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بتەکانیان و پەرستنیان بە نزیکبوونەوە لە خوا و تکاکار ناو دەبرد و دەیانوت: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ [يونس: ١٨]، وە دەیانوت: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾ [الزمر: ٣].**

**لەگەڵ ڕازاندنەوەی داهێنراو و گومڕاییەکانیان لەژێر بەرگ و پەردەی حەق و خێردا؛ زۆرجار هۆکاری دووەمیش دەگرنە بەر، ئەویش بە ناشرینکردن و توانج و لەقەبنانێك لە حەق و هەڵگری ڕێگە ڕاستەکە، تا زیاتر خەڵکان دوور بن لە بیستنی ڕاستییەکان.**

**کەواتە بۆمان دەرکەوت کە بیدعەکار کەسێکی نەخۆشە بە نەزانین و شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکانییەتی و دەمارگیرە بۆی، وە چواردەوریشی یارمەتیدەرن بۆ زیاتر قووڵبوونەوە و مانەوە لەو لادان و لێشێواندنانەدا، وە گەر زانا و قوتابخانەی زانستە شەرعییەکان و زانای (محقق) بوونی هەبوایە؛ ئەوا ئەو واقع حاڵەی موسوڵمانانی ئێستا وا نەدەبوو.**

  

# بەشی سێیەم

# بەرنامە و چۆنێتی وەرگرتنی بەڵگەكان

# (منهج التلقي والاستدلال)

هەموو ڕێگە و بەرنامەیەك دەبێت خاوەنی شێواز و چۆنێتی بەڵگە و بیركردنەوە و دارِشتنی تایبەتی خۆی بێت، بۆیە پێویستە تیشك بخرێتە سەر ئەو شێواز و چۆنیەتییانە و هەڵسەنگاندنیان بۆ بكرێت، تا زیاتر هەڵە و گومڕاییەكان دەركەون.

بیدعەكارانیش سەرچاوە و چۆنێتی بەڵگەهێنانەوەی تایبەتییان هەیە، ئاشنابوون بۆ كەسی شارەزا بە ڕێگەكانیان هۆكاری هیدایەتە بۆ حەقەكە و كۆتایی پێهاتنیانە.

چەندەها كەس گومڕا بوون و كەوتنە ناو ئەو هەموو بیدعە و گومڕاییانەوە و بوونە پاڵپشت و بانگەوازكار بۆ داهێنراوەكان، بە هۆكاری نەزانین و بێئاگاییان لە شێوازی ئەم ڕێگە هەڵانە و ئاشنا نەبوونیان بە وردەكارییەكانی ڕێگەی زانستی شەرعییە حەقەكە.

وە چەندەها داهێنراو و هاوبەشپەیداكردن بۆ خوا دروست دەكرێت، بیدعەكاران پەیتا پەیتا لەسەر داهێنراوەكانیان سوور دەبن و هەر ڕۆژ و ساڵێك كارێكی تازە دادەهێنن و ڕەواجی پێ دەدەن، هیچ بەربەستێكیش نابینی لەبەردەمیاندا، تاوەكوو دەبێت بە دین و خەڵكی لەسەر پیر دەبێت و پێچەوانەی ئەمانە دەبێتە نامۆ لە دیندا، لە كۆتاییشدا ئەوەی كە بەس دینی حەقە لەناو خەڵكیدا ون دەبێت.

بۆ زیاتر ئاشناكردنی دیندار لە ڕێگەو بۆچوونە گومڕاكانیان لەسەر ڕێگە ڕاستەكە؛ پێویستە سەرەتا ڕێگەی ڕاست و ڕوونی بەرنامەی حەقی ئەهلی سوننەت ئاشكرا بكەین، تاوەكوو هەڵسەنگاندن بكرێت لەسەری و دەرك بكرێت بە خاڵە گومڕاكان و زیاتر یارمەتیدەری دڵنیایی و چاوڕۆشنی موسوڵمانان بێت.

# أ- بەرنامەی ئەهلی سوننەت
# له چۆنێتی وەرگرتنی بەڵگەکان
# (منهج التلقي والاستدلال عند أهل السنة)

## ١. به گەوره و بەها ڕاگرتنی دەقه شەرعییەکان (تعظيم النصوص الشرعية):

بناغه لـه دینی ئیسلامدا خۆڕادەست و ملکەچبوون و پەیوەستبوونه به ئیسلامەوه، به شێوەی جێبەجێکردنی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوه لـه قەدەغەکراوەکان و وەستان لـه ئاستی سنوورەکانی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ ﴾ [الزمر: ٥٤].

واته: بگەڕێنەوه بۆلای خوا و خۆتان تەسلیمی ئەو بکەن.

وه بۆ جێبەجێکردنی هەموو فەرمانەکان پێویسته بلێین دەبیستین و گوێڕایەڵ دەبین، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥١﴾ [النور: ٥١].

خوای پەروەردگار ڕازی نابێت به هیچ بیروبۆچوون و ڕایەك که پێش فەرمانەکانی ئەو بخرێت.

وەکوو دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ۝١﴾ [الحجرات: ١].

(عبدالله ی کوڕی عباس) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەربارەی ئەم ئایەته دەفەرموێت: واته: «لَا تَقُولُوا خِلَافَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ»[١].

دەقه شەرعییەکان بەهای گەورەی ئیسلامن، سنووری سوورن، (معصومية) و بێگەردی لـه هەڵەو پارێزراوی و پێشینەیه و بناغەیه، وه لـه ئاستیدا هیچ جۆره بۆچوون و (اجتهاد)ێك قبووڵ نییه و بەڵگەی یەکلاکەرەوه و دڵنیاییه (دلالة قطعية)، که پێویستی به هیچ نییه.

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٣٦٤)، و "تفسير الطبري" (٢٢/ ٢٧٢).

جا ئەگەر قورئان بێت یاخود فەرموودە، بە مەرجێك پلەی (صحيح) بێت، هەردووکیان هاوڕێی یەکن.

## ٢. پشتبەستن بە فەرموودەی دروست (الاعتصام على السنة الصحيحة):

فەرموودە دەوری شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تەواو دەدات بە قورئان، لەبەر ئەوەی خاوەنی فەرموودە خاوەنی یەکەم و بۆدابەزیو و گەیاندنی بووە، لەبەرئەوە (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «الْبَيَانُ التَّامُّ هُوَ مَا بَيَّنَهُ الرَّسُولُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؛ فَإِنَّهُ أَعْلَمُ الْخُلْقِ بِالْحَقِّ وَأَنْصَحُ الْخَلْقِ لِلْخَلْقِ، وَأَفْصَحُ الْخَلْقِ فِي بَيَانِ الْحَقِّ»[(١)].

واتە: ڕوونکردنەوەی تەواو ڕوونکردنەوەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەو زاناترین کەسە بەسەر حەقدا و دڵسۆزترین کەسە بۆ موسوڵمانان، وە خاوەنی ڕەوانبێژی تەواوە بۆ حەقەکە.

گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی خواییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ [الحشر: ٧].

واتە: ئەوەی فەرمانی پێغەمبەرە جێبەجێی بکەن و وەری بگرن، وە ئەوەی قەدەغەکراوەکانیشە کۆتایی پێ بێنن، لەبەر ئەوەی فەرمان بە چاکە دەکات و ڕێگرە لە خراپە[(٢)].

وە فەرموودە لە ڕیزی قورئاندایە، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤﴾ [النجم: ٣ - ٤].

واتە: هیچ قسەیەك لە ئارەزوو و مەبەستەکانی خۆیەوە ناکات، بەڵکوو ئەوەی دەیڵێت فەرمانی پێ دەکرێت بە تەواوی و بێ زیاد و کەم[(٣)].

وە کاری پێغەمبەر ﷺ گەیاندن و شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تەواو بووە و لە ئەستۆیدا بووە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ۝٤٤﴾ [النحل: ٤٤].

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٣٥٢).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٢٨).

(٣) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٤٤٦).

واتە: قورئانمان بۆ ناردوویت تا شی بکەیتەوە لەسەر زانینت بە ماناکانیدا و شیکردنەوەی لێکچووەکانی[١].

خۆدانەپاڵ سوننەت و گرنگیدان و توێژینەوە لە زانستەکەیدا (علوم الحديث) زیاتر هێمای پابەندبوونی هەڵگری بەرنامە و پەیوەستبوونیەتی، وە بە سەرچاوەی دووەم و ڕێگەی سەرەکی تێگەیشتنی قورئان و پەیوەستی بێ جیابووەوە لێی دادەنرێت و قورئان کورتە (مجمل)ی بابەتەکانە و سوننەتیش شیکەرەوە (مفصل) و ڕوونکەرەوەی تەواویەتی، وەکوو ئیمامی (البربهاري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَإِنَّ الْقُرْآنَ إِلَى الْسُّنَّةِ أَحْوَج مِن الْسُّنَّةِ إِلَى الْقُرْآنِ»[٢].

واتە: ئەوەندەی قورئان پێویستی بە سوننەتە ئەوەندە سوننەت پێویستی بە قورئان نییە.

قورئان بەبێ سوننەت نابێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللهِ وَسُنَّتِي، وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ»[٣].

واتە: دوو شتم لە دوای خۆم بۆ جێهێشتوون، پەیوەست بن پێوەیان گومڕا نابن: فەرموودەی خوا و سوننەتی منە، لێی جیا مەبنەوە تا دەگەن بە من لەسەر حەوز.

فەرموودە پارێزراوە وەکوو قورئان لەبەر ئەوەی وەحییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ [الحجر: ٩].

مادام لە قورئاندا فەرمان دراوە بە گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ و شیکردنەوە و گەیاندنی لە لایەنی ئەوەوە؛ ئەوا دەبێت ئەو وادە پاراستنەش فەرموودە بگرێتەوە بۆ تەواوبوون و کامڵبوونی مانای قورئان.

(ابن حزم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فصح بذلك أن كلامه صلى الله عليه وسلم كله محفوظ بحفظ الله عز وجل مضمون لنا أنه لا يضيع منه شيء إذ ما حفظ الله تعالى فهو باليقين لا سبيل إلى أن

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٤/ ٥٨٠).

(٢) "شرح السنة" للبربهاري ص٨٠.

(٣) رواه الحاكم في "المستدرك" (٣١٩)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٢٩٣٧)، وفي "المشكاة" (١٨٦)، و "الصحيحة" برقم (١٧٦١).

يضيع منه شيء فهو منقول إلينا كله»[١].

واتە: بە گوێرەی ئەم ئایەتە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ پارێزراوە هەمووی، بە پاراستنی خوا ﷻ، وە وادەی نەفەوتاندنی و لەدەستنەدانی تەواوی پێ دراوە، هەمووشی پێمان گەیەندراوە.

ئیمامی (الشوكاني) رحمه الله دەڵێت: «اعْلَمْ أَنَّهُ قَدِ اتَّفَقَ مَنْ يُعْتَدُّ بِهِ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ عَلَى أَنَّ السُّنَّةَ الْمُطَهَّرَةَ مُسْتَقِلَّةٌ بِتَشْرِيعِ الْأَحْكَامِ وَأَنَّهَا كَالْقُرْآنِ فِي تَحْلِيلِ الْحَلَالِ وَتَحْرِيمِ الْحَرَامِ»[٢].

واتە: کۆدەنگی ئەوانەی کە بە زانایان دادەنرێن ئەوەیە کە سوننەتی بێگەرد (فەرموودە) بەڵگەی سەربەخۆی تەواوە لە دارشتنی یاسا شەرعییەکاندا، وەکوو قورئانە لە بریاری حەڵاڵ و حەرامدا.

(حسان بن عطية) رحمه الله دەڵێت: «كَانَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ يَنْزِلُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالسُّنَّةِ كَمَا يَنْزِلُ عَلَيْهِ بِالْقُرْآنِ، وَيُعَلِّمُهُ إِيَّاهَا كَمَا يُعَلِّمُهُ الْقُرْآنَ»[٣].

واتە: جبريل عليه السلام سوننەتی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەهێنایە خوارەوە وەکوو چۆن قورئانی بۆ دەهێنا، وە فێری دەکرد وەکوو چۆن قورئانی فێر دەکرد.

### ٣. شێوازی تێگەیشتنی ڕاستی دەقەکان (صحة فهم النصوص):

بە ڕاست و دروستی تێگەیشتن لە دەقەکان هۆکارێکی سەرەکییە بۆ پێکاندنی بەڵگەکان.

بەم ڕێگایە لە مەبەستی خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ تێدەگەیت، هەموو گومڕاییەکان لە بەرهەمی هەڵە تێگەیشتنی دەقەکانەوە دروست بووە.

(ابن القيم) رحمه الله دەفەرموێت: «صِحَّةُ الْفَهْمِ وَحُسْنُ الْقَصْدِ مِنْ أَعْظَمِ نِعَمِ اللهِ الَّتِي أَنْعَمَ بِهَا عَلَى عَبْدِهِ، بَلْ مَا أُعْطِيَ عَبْدٌ عَطَاءً بَعْدَ الْإِسْلَامِ أَفْضَلُ وَلَا أَجَلُّ مِنْهُمَا، بَلْ هُمَا سَاقَا الْإِسْلَامِ، وَقِيَامُهُ عَلَيْهِمَا، وَبِهِمَا يَأْمَنُ الْعَبْدُ طَرِيقَ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ الَّذِينَ فَسَدَ قَصْدُهُمْ وَطَرِيقُ الضَّالِّينَ

---

(١) "الأحكام في أصول الأحكام" لابن حزم (١/ ٩٨).

(٢) "إرشاد الفحول إلي تحقيق الحق من علم الأصول" للشوكاني (١/ ٩٦).

(٣) رواه أبو داود في "المراسيل" (٥٣٦)، والدارمي في "سننه" (٦٠٨)، والمروزي في "السنة" (١٠٢)، والخطيب في "الكفاية" (١٢)، وعزاه الحافظ في "الفتح" (١٣/ ٢٩١) إلى البيهقي، قال: بسند صحيح.

الَّذِينَ فَسَدَتْ فُهُومُهُمْ، وَيَصِيرُ مِنْ الْمُنْعَمِ عَلَيْهِمْ الَّذِينَ حَسُنَتْ أَفْهَامُهُمْ وَقُصُودُهُمْ، وَهُمْ أَهْلُ الصِّرَاطِ الْمُسْتَقِيمِ الَّذِينَ أُمِرْنَا أَنْ نَسْأَلَ اللهَّ أَنْ يَهْدِيَنَا صِرَاطَهُمْ فِي كُلِّ صَلَاةٍ»[1].

واته: ڕاستی تێگەیشتن و نیەتپاکی بۆ گەیشتن بە حەقەکان گەورەترین بەهرەی خواییە بەسەر بەندەکانییەوە، بەڵکوو بەندەیەك پاش موسوڵمانبوونی نیعمەتێك نییە چاکتر و بەنرختر بێت لە (تێگەیشتنی ڕاست و نیەت پاکی) بێجگە لەم دوانە پێی درابێت، بەڵکوو هەردوو قاچی ڕاوەستانی ئیسلامە، بەم دوانە موسوڵمان سەلامەت دەبێت لە ڕێگەی جوولەکە نەفرەتلێکراوەکان، ئەوانەی کە نیەتپیس بوون لە دیندا، وە ڕێگەی گاوورە گومڕاکان، ئەوانەی کە تێگەیشتنیان هەڵە بوو لە دیندا.

بەم دوو ڕێگایە دەچیتە سەر ڕێگەی ئەوانەی کە تێگەیشتنی ڕاستیان هەبوو لەگەڵ نیەتپاکی بۆ دین، ئەوانەی خاوەنی ڕێگەی ڕاستن، ئەو ڕێگایەی کە لە هەموو نوێژێکدا داوای گەیشتنەسەری دەکەیت.

## لەو بنەما زانستییانەی کە پێویستە پشتی پێ ببەسترێت بۆ شێوازی تەواوی تێگەیشتن لە دەقە شەرعییەکان

**أ. پشتبەستن بە جۆری تێگەیشتنی هاوەڵان ﵃ (الاعتماد على منهج فهم الصحابة ﵃):**

هاوەڵان ﵃ ئەوانەن کە ڕاستەوخۆ دینیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرتووە، وە شایەتحاڵی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان بوون، زانا بوون بەسەر شێواز و مەبەستەکانی پێغەمبەر ﷺ و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی و ئەنجامدانی کارە دینییەکانی و جۆری گفتوگۆیدا، ڕاستەوخۆ بە بینین و بیستن و شارەزای لێوەرگرتنی حاڵیان بووە.

هاوەڵان پلەوپایە و ڕێز و قەدری تایبەتییان پێ دراوە بە ئایەتە قورئانییەکان و تەزکییەی تایبەت کراون، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾ [التوبة: ١٠٠]، ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ

---

(١) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (١/ ٦٩).

وَرِضۡوَٰنٗا﴾ [الفتح: ٢٩]، وە دەفەرموێت: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ﴾ [آل عمران: ١١٠].

ئەم ئایەتانە هەمووی موژدەی لێخۆشبوون و ڕازیبوون و وەسف و سەنایەکی پڕ لە ئیمانی کاملیان دەکات.

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلَا نَصِيفَهُ»[١].

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، گەر یەکێکتان بەهێندەی شاخی ئوحود ئاڵتوون ببەخشێتەوە ناگەن بە لەپی دەستی هاوەڵانم، بەڵکوو ناگەن بە نیوەی دەستیشیان.

(ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «وكل من له لسان صدق من مشهور بعلم أو دين معترف بأن خير هذه الأمة هم الصحابة»[٢].

واتە: ئەوەی خاوەن زمانی ڕاست و دروستە لە ناودارانی زانست و دین؛ دان دەنێن بەوەی کە چاکترین کەسانی ئەم ئوممەتە هاوەڵانی بەڕێزن.

(ابن القيم) ﷺ دەڵێت: «أَفْقَهِ الْأُمَّةِ، وَأَبَرِّ الْأُمَّةِ قُلُوبًا، وَأَعْمَقِهِمْ عِلْمًا، وَأَقَلِّهِمْ تَكَلُّفًا، وَأَصَحِّهِمْ قُصُودًا، وَأَكْمَلِهِمْ فِطْرَةً، وَأَتَمِّهِمْ إِدْرَاكًا، وَأَصْفَاهُمْ أَذْهَانًا، الَّذِي شَاهَدُوا التَّنْزِيلَ، وَعَرَفُوا التَّأْوِيلَ، وَفَهِمُوا مَقَاصِدَ الرَّسُولِ»[٣].

واتە: هاوەڵان شارەزاترین کەسی ئەم ئوممەتەن و خاوەنی خێرترین دڵن، وە قووڵترین شارەزایی و کەمترین قورساییان هەبووە لە وەڵامدا و خاوەن مەبەست و کاملترین فیترەت و تەواوترین بۆچوون و مێشك و زیهنێکی پاکن، ئامادەی هاتنەخوارەوەی قورئان و شارەزای مانا و مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوون، گەڕانەوە بۆ هاوەڵان لە ڕووی زانست و دیندا یەکلاکەرەوەیە بۆ دوای خۆیان.

---

(١) رواه البخاري (٣٦٧٣)، ومسلم (٢٥٤٠)، والترمذي (٣٨٦١)، وابن ماجه (١٦١)،والنسائي في "الكبرى" (٨٢٥٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٩٤)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٥)، والطبراني في "الصغير" (٩٨٢).

(٢) "شرح العقيدة الأصفهانية" لابن تيمية ص١٨٠.

(٣) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (١/ ٦٣)، و "مختصر الصواعق المرسلة" (٢/ ٣٤٥).

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «مَنْ فَسَّرَ الْقُرْآنَ أَوْ الْحدِيثَ وَتَأَوَّلَهُ عَلَى غَيْرِ التَّفْسِيرِ الْمعْرُوفِ عَنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ فَهُوَ مُفْتَرٍ عَلَى اللهِ مُلْحِدٌ فِي آيَاتِ اللهِ مُحَرِّفٌ لِلْكَلِمِ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَهَذَا فَتْحٌ لِبَابِ الزَّنْدَقَةِ وَالْإِلْحَادِ وَهُوَ مَعْلُومُ الْبُطْلَانِ بِالِاضْطِرَارِ مِنْ دِينِ الْإِسْلَامِ»[1].

واتە: ئەوەی تەفسیری قورئان و فەرموودە بکات بەبێ ئەو شێوازەی کە لەناو هاوەڵان و شوێنکەوتووانی (التابعين)دا بووە، ئەوە هەڵبەستراو و بێبڕواییە بەرامبەر خوا ﷻ و گۆڕینی وشەکانە لە شوێنی خۆیدا، ئەمە بۆخۆی کردنەوەی دەرگای دڕایەتی و بێبڕواییە، ڕوون و ئاشکرایە ئەم شێوازە بەتاڵ و بێبنەمایە لە دینی ئیسلامدا، گەڕانەوە بۆ چۆنێتی و شیکردنەوە و شێوازی وەرگرتن و جێبەجێکردنی هاوەڵان و شوێنکەوتوانی لە هەموو بوارەکانی دینداریدا بەرنامە و مەنهەجی ئەهلی سوننەیە و متمانەی گومڕانەبوون و بە هەڵەدا نەچوونە.

**ب. شارەزایی بەسەر زمانی عەرەبیدا:**

زمانی عەرەبی هەڵبژێردراوە لەناو زمانەکاندا بۆ گەیاندنی کۆتا و کۆکەرەوەی هەموو ئایینەکان، زمانحاڵی قورئان و فەرموودە و هەڵگرانیەتی، وە مەبەست بە قورئان و فەرموودە ڕێنیشاندەر و هیدایەتە، کەواتە دەبێت زۆر ڕوون و ئاشکرا بێت و شاراوەیی تێدا نەبێت، ئەمەش بەبێ تێگەیشتن نابێت، وە ئەمەش دەبێت لەسەر شێواز و ڕێوشوێنی جۆری ئاخاوتن و گفتوگۆ و ڕاهاتوویی و عادەتی ئەهلەکەی و بەکارهێنانیان لە عورف و ڕەوانبێژی تەواویاندا بێت، لەبەرئەوەی هەموو خاوەن زمانەکان ئاشنای تەواون بە ناوەڕۆك و ڕاست و دروستی بەکارهێنانی زمانەکەیان.

بۆ تێگەیشتن لە شێوازی ڕاستی قورئان و فەرموودە، پێویستە ئاشنایی باش و تەواو هەبێت بەسەر زمانی عەرەبیدا و جۆری بەکارهێنانی سەردەمی هاوەڵان و عەرەبی ڕەسەندا، بۆیە کاملترین کەس لەم بوارەدا زاناترین کەسە بەسەر قورئان و سوننەتدا و ڕۆچووترینیان ئاشنایی دەبێت بەسەر تێگەیشتن و دارشتن و وشەکاندا، ماناکانی قورئان و فەرموودە لێکچووی تەواوی زمانی عەرەبە، هەروەك چۆن وشە و پێکهاتەکان هەمان شێوازی عەرەبن، لەبەرئەوە لای خاوەن زمان و کەسانی خۆی زۆر ڕوون و ئاشکرایە و شاراوەرو نادیاری تێدا نییە، بۆیە گومڕایی و لادانی دینی لە کەسانێکەوە ڕوو دەدات کە عەرەب نەبن و ئەم زانایی و شارەزاییەیان بەسەر زمانەکەدا نەبێت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" (١٣/ ٢٤٣).

وەکوو (حەسەنی بەصری) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «أَهْلَكَتْهُمُ الْعُجْمَةُ، يَتَأَوَّلُونَ عَلَى غَيْرِ تَأْوِيلِهِ»[(١)].

واتە: عەرەبنەبوونیان و شارەزانەبوونیان بەسەر زمانی عەرەبیدا (ئەعجەمیەت) گومڕای کردوون، تەفسیر و شیتەڵی قورئان دەکەن بەبێ چۆنێتی خۆی.

ئیمامی (شافعی) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «مَا جَهِلَ النَّاسُ، وَلاَ اخْتَلَفُوا إِلَّا لِتَرْكِهِم لِسَانَ العَرَبِ»[(٢)].

واتە: خەڵکی تووشی نەزانین و جیاوازی و دووبەرەکایەتی نەبوون بێجگە لە هۆکاری دوورکەوتنەوە و شارەزانەبوونیان نەبێت بەسەر زمانی عەرەبیدا.

وە دەڵێت: «لِسَانُ الْعَرَبِ أَوْسَعُ الْأَلْسِنَةِ مَذْهَبًا، وَأَكْثَرُهَا أَلْفَاظًا، وَلَا نَعْلَمُهُ يُحِيطُ بِجَمِيعِ عِلْمِهِ إِنْسَانٌ غَيْرُ نَبِيٍّ. وَلَكِنَّهُ لَا يَذْهَبُ مِنْهُ شَيْءٌ عَلَى عَامَّتِهِ حَتَّى لَا يَكُونَ مَوْجُودًا فِيهَا مَنْ يَعْرِفُهُ»[(٣)].

واتە: زمانی عەرەبی لەڕووی لەهجەوە فراوانترین زمانە، خاوەنی زۆرترین وشەیە، نابینین کەسێك شارەزایی تەواوی بەسەریدا بشکێت بێجگە لە پێغەمبەرێك نەبێت، بەڵام شتێك شاراوە نابێت تاوەکوو بڵێین کەس نایزانێت.

کەواتە بەم شێوەیە ئەوەی کە دەیەوێت تێڕوانین لە قورئان و فەرموودەدا بکات پێویستە شارەزای ئەو زمانە بێت کە پێی وتراوە، نابێت گومانی باش بە خۆی ببات لەم بوارەدا، تاوەکوو زانا و شارەزایان شایەتی لەسەر کەسایەتی نەدەن کە شیاوی ئەم بوارەیە، وە سەربەخۆ نەچێتە بابەتە ئاڵۆزەکانەوە بەبێ پرس و ڕای کەسانی تایبەتی خۆی، گەر بەم شێوەیە بێت ئەوا بە ئیزنی خوا گونجاوی ئەو شێوەیەیە کە پێغەمبەری خوای ﷺ لەسەر بووە لەگەڵ هاوەڵانی، واتە:

١. نابێت هیچ شتێك دەربارەی دین بڵێت تاوەکوو شارەزایانی عەرەب نەبێت، یاخود وەکوو عەرەب نەبێت لەڕووی زانایی و شارەزایی بەسەر زماندا وەکوو ئیمامەکان.

---

(١) رواه البخاري في "التاريخ الكبير" (٥/ ٩٣) برقم (٢٥٩)، وفي "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٨١٠)، و "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (١٠/ ١٢٢)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر العسقلاني (٣/ ٤٣٠).

(٢) "صون المنطق" للسيوطي ص١٦٥، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٨/ ٢٦٨)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٥/ ١٤٦).

(٣) "الرسالة" للشافعي ص٤٢، و "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٨١٠).

**٢.** لە تێنەگەیشتنی ئالۆزییەکانی قورئان و فەرموودە دەبێت سەربەخۆ نەبێت، ئەشێت ئیمام بێت بەڵام بابەت لای شاراوە بێت هەندێ کات، هاوەڵان عەرەبی تەواو بوون هەندێ تایبەتییان لا شاراوە بووە، چ جای لای بێجگە لەوان(١).

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَمَنْ لَمْ يَعْرِفْ لُغَةَ الصَّحَابَةِ الَّتِي كَانُوا يَتَخَاطَبُونَ بِهَا وَيُخَاطِبُهُمْ بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَادَتَهُمْ فِي الْكَلَامِ وَإِلَّا حَرَّفَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ فَإِنَّ كَثِيرًا مِنْ النَّاسِ يَنْشَأُ عَلَى اصْطِلَاحِ قَوْمِهِ وَعَادَتِهِمْ فِي الْأَلْفَاظِ ثُمَّ يَجِدُ تِلْكَ الْأَلْفَاظَ فِي كَلَامِ اللهِ أَوْ رَسُولِهِ أَوْ الصَّحَابَةِ فَيَظُنُّ أَنَّ مُرَادَ اللهِ أَوْ رَسُولِهِ أَوْ الصَّحَابَةِ بِتِلْكَ الْأَلْفَاظِ مَا يُرِيدُهُ بِذَلِكَ أَهْلُ عَادَتِهِ وَاصْطِلَاحِهِ وَيَكُونُ مُرَادُ اللهِ وَرَسُولِهِ وَالصَّحَابَةِ خِلَافَ ذَلِكَ. وَهَذَا وَاقِعٌ لِطَوَائِفَ مِنْ النَّاسِ مِنْ أَهْلِ الْكَلَامِ وَالْفِقْهِ وَالنَّحْوِ وَالْعَامَّةِ وَغَيْرِهِمْ وَآخَرُونَ يَتَعَمَّدُونَ وَضْعَ أَلْفَاظِ الْأَنْبِيَاءِ وَأَتْبَاعِهِمْ عَلَى مَعَانِي أُخَرَ مُخَالِفَةٍ لِمَعَانِيهِمْ ثُمَّ يَنْطِقُونَ بِتِلْكَ الْأَلْفَاظِ مُرِيدِينَ بِهَا مَا يَعْنُونَهُ هُمْ وَيَقُولُونَ: إنَّا مُوَافِقُونَ لِلْأَنْبِيَاءِ»(٢).

واتە: ئەوەی شێوازی زمانی هاوەڵان نەزانێت کە چۆن قسەیان پێ دەکرد، وە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵ پێ دەکردن بە شێوەی بەکارهێنانیان لە قسەکردندا؛ بێگومان دەکەوێتە گۆڕینی قسەکان لە شوێنی خۆیدا، زۆری خەڵك قسەکردنیان گەشە دەکات لەسەر شێوازی بەکارهێنانی قەومەکەی و ڕاهاتنیان لە جۆری وشەدا، پاشان دوایی دەبینین ئەو جۆرە قسە و وشانە لە فەرموودەی خوا و پێغەمبەرەکەیدا یاخود هاوەڵاندا؛ گومان بەوە دەبەن کە ئەوە مەبەستی خوا و پێغەمبەر و هاوەڵانە لەو قسەکردن و وشانەدا، بەو شێوەیەی ئەمان لە عادەت و بەکارهێناندا بەکاری دەهێنن، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێچەوانەی مەبەستەکانی خوا و پێغەمبەرەوەیە ﷺ، ئەمە ڕووی داوە لە خەڵکانێکدا کە کەسانی (فەلسەفە و ئەهلی کەلام)ن، وە لە فەقیهەکانیشدا، وە لە ئەهلی زمان (نحو)دا، وە لە گشت خەڵکیدا، کەسانی تر دێن بە ئەنقەست وشە و قسەی پێغەمبەران و شوێنکەوتووانی لەسەر مانای جیاواز و پێچەوانەی ئەوان دادەنێن، پاشان بەو شێوەیە

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٨٠٤ - ٨١٥).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١/ ٢٤٣)، و "قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة" لابن تيمية ص١٦٤.

قسە و مانای پێ بەکاردێنن کە خۆیان مەبەستیانە و دەڵێن ئێمە پێکاومانە و گونجاوین لەگەڵ پێغەمبەراندا.

وە دەڵێت: «فَمَعْرِفَةُ الْعَرَبِيَّةِ الَّتِي خُوطِبْنَا بِهَا مِمَّا يُعِينُ عَلَى أَنْ نَفْقَهَ مُرَادَ اللهِ وَرَسُولِهِ بِكَلَامِهِ، وَكَذَلِكَ مَعْرِفَةُ دَلَالَةِ الْأَلْفَاظِ عَلَى الْمَعَانِي؛ فَإِنَّ عَامَّةَ ضَلَالِ أَهْلِ الْبِدَعِ كَانَ بِهَذَا السَّبَبِ؛ فَإِنَّهُمْ صَارُوا يَحْمِلُونَ كَلَامَ اللهِ وَرَسُولِهِ عَلَى مَا يَدَّعُونَ أَنَّهُ دَالٌّ عَلَيْهِ وَلَا يَكُونُ الْأَمْرُ كَذَلِكَ»[(١)].

واتە: زانینی زمانی عەرەبی کە زمانحاڵی قورئان و فەرموودەیە، یارمەتیدەرە تا لە مەبەستەکانی خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ تێبگەین لە ئەنجامی قسەکان، وە هەروەها زانینی شێوازی وشەکان لەسەر ماناکانی، زۆربەی گومڕایانی بیدعەکار ئەمە هۆکاری گومڕاییان بووە، فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەریان دەدا بەسەر جۆرێك شێواز و دەربڕیندا کە بەو شێوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەی خۆی و دروست وا نەبوو.

یەکێك لەو نمونانە وشەی (البدعة) لە فەرموودەکاندا بە مەبەستی داهێنان دێت لە دیندا، نەك لە کارە دونیاییەکاندا، لەبەرئەوە داهێنراوەکانی ناو دین گومڕایین، کەواتە هەر وشەیەکی (البدعة) هات لە فەرموودەو وتەی هاوەڵاندا مەبەستی لە داهێنراوی دینییە.

کەواتە بەڵگە شەرعییەکان ڕووە زمانەوانییەکە تایبەت دەکەن «دلائل الشرع تخصص اللغة وتقيدها وتوضحها»[(٢)].

وەك (ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «فَالنَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ بَيَّنَ الْمُرَادَ بِهَذِهِ الْأَلْفَاظِ بَيَانًا لَا يُحْتَاجُ مَعَهُ إلَى الِاسْتِدْلَالِ عَلَى ذَلِكَ بِالِاشْتِقَاقِ وَشَوَاهِدِ اسْتِعْمَالِ الْعَرَبِ وَنَحْوِ ذَلِكَ؛ فَلِهَذَا يَجِبُ الرُّجُوعُ فِي مُسَمَّيَاتِ هَذِهِ الْأَسْمَاءِ إلَى بَيَانِ اللهِ وَرَسُولِهِ فَإِنَّهُ شَافٍ كَافٍ»[(٣)].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردووەتەوە مەبەست بەو وشە و زاراوانە بەشێوەیەك کە پێویستی بە بەڵگە و داڕێژراو و نموونە لە بەکارهاتنەکانی عەرەب و هاوشێوەکانیدا نییە، کەواتە

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ١١٦).

(٢) "منهج التلقي والاستلال بين أهل السنة والمبتدعة" لأحمد بن عبدالرحمن الصويان ص٥٥.

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ٢٨٧).

پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ناونراو و پێناسەی ئەو ناوانە بۆ ڕوونکردنەوە و بەکارهێنانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی، ئەوە تەواو و بەسە تیایدا.

بەڵام بیدعەکاران جۆری زاراوە و پێناسەی تایبەتیان دادەنا و دارشتنە شەرعییەکانیان پەل دەکێشایە سەری، وەکوو: (خبر الآحاد، المجاز، الظني الدلالة، الإمامة، الشمولية والعصرية، الجماعة والدعوة، ...إلخ)، هۆکارە سەرەکییەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خاوەنی ئەم گومڕاییانە زۆریان عەرەبی ڕەسەن نەبوون، وە بێئاگابوون لە ووردەکاری زمانەکە و جۆری بەکارهێنانە شەرعییەکە، ئەمەش بە هۆکاری فراوانبوونی سنووری ئیسلامی و هاتنەناوەوەی ئەم دینە لە گەل و قەومێك کە پێشتر لەسەر ئایین و بۆچوون و چۆنێتییەکی جیاواز بوون، ئەم هەنگاوانە هەڵهێنرا بۆ زیاتر گونجاندن لەگەڵ دینی تازەدا.

وەکوو (هیشامی کوڕی عوروە) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: «إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَمْ يَزَلْ أَمْرُهُمْ مُعْتَدِلًا حَتَّى نَشَأَ فِيهِمْ مُوَلَّدُونَ أَبْنَاءُ سَبَايَا الْأُمَمِ، فَأَخَذُوا فِيهِمْ بِالرَّأْيِ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا»[١].

واتە: بەنی ئیسرائیل بەردەوام لەسەر ڕێوشوێنی دینیی خۆیان بوون، تا ئەوکاتەی نەوەی کۆیلەی گەلانیان تێکەڵ بوو، ئەو کاتە بیروڕایان وەرگرتن و گومڕا بوون و خەڵکیشیان گومڕا کرد.

(فریابی) دەڵێت: «كَانَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ إِذَا رَأَى هَؤُلَاءِ النَّبْطَ يَكْتُبُونَ الْعِلْمَ تَغَيَّرَ وَجْهُهُ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ! أَرَاكَ إِذَا رَأَيْتَ هَؤُلَاءِ يَكْتُبُونَ الْعِلْمَ يَشْتَدُّ عَلَيْكَ. قَالَ: كَانَ الْعِلْمُ فِي الْعَرَبِ وَفِي سَادَاتِ النَّاسِ، وَإِذَا خَرَجَ عَنْهُمْ وَصَارَ إِلَى هَؤُلَاءِ النَّبْطِ وَالسَّفَلَةِ غُيِّرَ الدِّينُ»[٢].

واتە: کاتێك (سوفیانی سەوری) دەیبینی کۆیلە و خەڵکانی بێجگە لە عەرەب خەریکی نووسینی زانستی شەرعی بوون دەم و چاوی تێك دەچوو، پێم وت: بۆ تێك دەچیت؟ وتی: کاتی

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٨٤٨)، و "ذم الكلام وأهله" للهروي (١/ ٧٤)، و "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (٢٠٣١)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٧/ ٥٩٣).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٨٣)، و "البدع" للطرطوشي ص٥٥.

خۆی ئەم عیلم و زانستە (زانستی دینی) لە عەرەب و کەسە ناودارەکانی عەرەبدا بوو، کاتێك لەمانەوە دەرچوو و کەوتە دەست ئەمانە دین گۆڕدرا.

تەنانەت سەرانی گومڕاکارانی وەك (بشر المريسي) سەری (معتزلة) و دەمڕاستی و قازی گەورەی دەسەڵات سەردەمی (مأمون) بوو، کاتێك (عبدالعزيز الكناني) موناقەشەی لەبەردەم (مأمون) لەگەڵ کرد و هیچی پێ نەما زانای پایەبەرز (عبدالعزيز الكناني) هۆکاری گومڕاییەکەی (بشر)ی بە (مأمون) وت کە: «بشر رجل من أبناء الأعاجم يتأول كتاب الله على غير ما عناه الله عز وجل ويحرفه عن مواضعه ويبدل معانيه، ويقول ما تنكره العرب ولا تتعارفه في كلامها ولغاتها»[1].

واتە: (بشر) پیاوێکی عەرەب نییە، مانای قورئان دەگۆڕێت لەو شێوەیەی کە خوا مەبەستیەتی بۆ ئەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێت، تەنانەت زمانی عەرەبیش و عەرەبیش ئەو مەبەستەیان پێ نەبووە.

**ج. کۆکردنەوەی هەموو جۆر و ووردەکارییەکی دەقەکانی بابەتەکە:**

دەقەکانی قورئان و فەرموودە شێوەیەکی تەواوکاری یەکتریان هەیە، گونجاندن و لێکچوون کاریانە، نەك جیاوازی و پێچەوانەیی، هەتا هەموو چەمکەکانی دەقەکان لەو بارەیەوە کۆنەکرێتەوە مانای تەواو و حەقیێدان سەرناگرێت، وە ئەبێتە هۆکاری کارکردن بە هەندێك و پەراوێزکردنی هەندێکی تر، وە داواکاریش لە موسوڵمان کارکردنە بە هەموو دەقەکان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ [البَقَرَة : ٨٥].

ئیمام (أحمدی کوڕی حەنبەل) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «الْحَدِيثُ إِذَا لَمْ تَجْمَعْ طُرُقَهُ لَمْ تَفْهَمْهُ، وَالْحَدِيثُ يُفَسِّرُ بَعْضُهُ بَعْضًا»[2].

واتە: فەرموودە گەر هەموو ڕێگەکانی کۆ نەکەیتەوە لێی تێناگەیت، فەرموودە هەندێکی شیکەرەوەی هەندێکی ترە.

---

(١) "الحيدة والاعتذار في الرد على من قال بخلق القرآن" ص٦٠.

(٢) "الجامع لأخلاق الراوي" للخطيب البغدادي (٢/ ٢١٢).

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «إِذَا مَيَّزَ الْعَالِمُ بَيْنَ مَا قَالَهُ الرَّسُولُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا لَمْ يَقُلْهُ فَإِنَّهُ يَحْتَاجُ أَنْ يَفْهَمَ مُرَادَهُ وَيَفْقَهَ مَا قَالَهُ وَيَجْمَعَ بَيْنَ الْأَحَادِيثِ وَيَضُمَّ كُلَّ شَكْلٍ إِلَى شَكْلِهِ فَيَجْمَعُ بَيْنَ مَا جَمَعَ اللهُ بَيْنَهُ وَرَسُولُهُ وَيُفَرِّقُ بَيْنَ مَا فَرَّقَ اللهُ بَيْنَهُ وَرَسُولُهُ. فَهَذَا هُوَ الْعِلْمُ الَّذِي يَنْتَفِعُ بِهِ الْمُسْلِمُونَ وَيَجِبُ تَلَقِّيهِ وَقَبُولُهُ وَبِهِ سَادَ أَئِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ كَالْأَرْبَعَةِ وَغَيْرِهِمْ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ أَجْمَعِينَ»[١].

واتە: گەر زانا بۆی جیاکرایەوە ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی لەوەی کە نەیوتووە؛ ئەوکاتە پێویستی بە تێگەیشتنی مەبەستەکانی و شارەزابوونی وتەکانی هەیە، بە کۆکردنەوەی فەرموودەکان و خڕکردنەوەی هەموو هاوشێوەکان، تا ئەو کاتەی بتوانێت ئەوانە کۆبکاتەوە کە خوا و جل جلاله پێغەمبەرەکەی ﷺ کۆیان کردووەتەوە، وە ئەوانە جیا بکاتەوە کە خوا و پێغەمبەرەکەی جیایان کردوونەتەوە، ئەمە ئەو زانستەیە کە موسوڵمانان سوودی لێ دەبینن، پێویستە وەربگیرێت و شوێنی قبوڵ بێت، بەم ڕێگەیە زانایان ناودار بوون، وەکوو چوار ئیمامی مەزهەبەکان خوایان لێ ڕازی بێت.

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «وَمَدَارُ الْغَلَطِ فِي هَذَا الْفَصْلِ إِنَّمَا هُوَ عَلَى حَرْفٍ وَاحِدٍ، وَهُوَ الْجَهْلُ بِمَقَاصِدِ الشَّرْعِ، وَعَدَمِ ضَمِّ أَطْرَافِهِ بَعْضِهَا بِبَعْضٍ؛ فَإِنَّ مَأْخَذَ الْأَدِلَّةِ عِنْدَ الْأَئِمَّةِ الرَّاسِخِينَ إِنَّمَا هُوَ عَلَى أَنْ تُؤْخَذَ الشَّرِيعَةُ كَالصُّورَةِ الْوَاحِدَةِ بِحَسْبِ مَا ثَبَتَ مِنْ كُلِّيَّاتِهَا وَجُزْئِيَّاتِهَا الْمُرَتَّبَةِ عَلَيْهَا، وَعَامِّهَا الْمُرَتَّبِ عَلَى خَاصِّهَا»[٢].

واتە: هۆکاری سەرەکی هەڵە لەم بابەتەدا لەسەر دەربڕینی یەك وشەیە، ئەویش نەزانینە بەسەر مەبەستە سەرەکییەکانی شەرعدا، وە کۆنەکردنەوەی هەندێکی بۆ لای هەندێکی تری، وە شێوازی وەرگرتنی بەڵگەکان لای زانایانی ڕۆچوو لە بواری زانستدا ئەوەیە کە یاساکانی ئیسلام وەربگریت لەسەر یەك شێوەی تەواو، بە گوێرەی ئەو شێوەی یاسا گشتییە ووردەکان لەسەر یەك ڕێکبخات، وە یاسا کۆنەکان لەسەر تایبەتەکان بنیاد بنێت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٧/ ٣١٦).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣١١).

(ابن حجر) ﵀ دەڵێت: «وَأَنَّ الْمُتَعَيَّنَ عَلَى مَنْ يَتَكَلَّمُ عَلَى الْأَحَادِيثِ أَنْ يَجْمَعَ طُرُقَهَا ثُمَّ يَجْمَعَ أَلْفَاظَ الْمُتُونِ إِذَا صَحَّتِ الطُّرُقُ وَيَشْرَحَهَا عَلَى أَنَّهُ حَدِيثٌ وَاحِدٌ فَإِنَّ الْحَدِيثَ أَوْلَى مَا فُسِّرَ بِالْحَدِيثِ»[1].

واتە: پێویستە ئەوەی قسە لەسەر فەرموودەکان دەکات؛ ڕێگەکانی کۆ بکاتەوە، پاشان هەموو جۆرە وشە و دەقی فەرموودەکان، گەر هەموو ڕێگەکانی (صحيح) بێت؛ ئەوکاتە لە مانادا وەکوو یەك فەرموودەی لێدێت، وە فەرموودە لەپێشترە بە فەرموودە شی بکرێتەوە.

ئیمامی (شافعی) ﵀ دەڵێت: «إِنَّ الْقُرْآنَ نَزَلَ بِلِسَانِ الْعَرَبِ وَإِنَّهُ عَرَبِيٌّ وَإِنَّهُ لَا عُجْمَةَ فِيهِ، فَبِمَعْنَى أَنَّهُ أُنْزِلَ عَلَى لسان معهود العرب فِي أَلْفَاظِهَا الْخَاصَّةِ وَأَسَالِيب مَعَانِيهَا، وَأَنَّهَا فِيمَا فُطِرَتْ عَلَيْهِ مِنْ لِسَانِهَا تُخَاطِبُ بِالْعَامِّ يُرَادُ بِهِ ظَاهِرُهُ، وَبِالْعَامِّ يُرَادُ بِهِ الْعَامُّ فِي وَجْهٍ وَالْخَاصُّ فِي وَجْهٍ، وَبِالْعَامِّ يُرَادُ بِهِ الْخَاصُّ، وَالظَّاهِرُ يُرَادُ بِهِ غَيْرُ الظَّاهِرِ، وَكُلُّ ذَلِكَ يُعْرَفُ مِنْ أَوَّلِ الْكَلَامِ أَوْ وَسَطِهِ أَوْ آخِرِهِ، وَتَتَكَلَّمُ بِالْكَلَامِ يُنْبِئُ أَوَّلُهُ عَنْ آخِرِهِ، أَوْ آخِرُهُ عَنْ أَوَّلِهِ، وَتَتَكَلَّمُ بِالشَّيْءِ يُعْرَفُ بِالْمَعْنَى كَمَا يُعْرَفُ بِالْإِشَارَةِ، وَتُسَمِّي الشَّيْءَ الْوَاحِدَ بِأَسْمَاءَ كَثِيرَةٍ، وَالْأَشْيَاءَ الْكَثِيرَةَ بِاسْمٍ وَاحِدٍ، وَكُلُّ هَذَا مَعْرُوفٌ عِنْدَهَا لَا تَرْتَابُ فِي شَيْءٍ مِنْهُ هِيَ وَلَا مَنْ تَعَلَّقَ بِعِلْمِ كلامها.

فَإِذَا كَانَ كَذَلِكَ، فَالْقُرْآنُ فِي مَعَانِيهِ وَأَسَالِيبِهِ عَلَى هَذَا التَّرْتِيبِ، فَكَمَا أَنَّ لِسَانَ بَعْضِ الْأَعَاجِمِ لَا يُمْكِنُ أَنْ يُفْهَمَ مِنْ جِهَةِ لِسَانِ الْعَرَبِ، كَذَلِكَ لَا يُمْكِنُ أَنْ يُفْهَمَ لِسَانُ الْعَرَبِ مِنْ جِهَةِ فَهْمِ لِسَانِ الْعَجَمِ، لِاخْتِلَافِ الْأَوْضَاعِ وَالْأَسَالِيبِ»[2].

واتە: قورئان لەسەر شێوەی داڕێژراوی عەرەب دابەزیوە لە وشە تایبەتییەکانی و شێوازی ماناکانی، بەو چۆنێتییەی کە زمانی لەسەر دروست بووە، وەکوو قسە بۆکردن بە شێوەی گشتی، لەگەڵ ئەوەشدا مەبەست پێی ڕووکەشە گشتییەکەیە نەك هەموو تاك بگرێتەوە و شێوەی وتاری گشتییە و مەبەست پێی دوو ڕووە: ڕووە گشتییەکەی لە لایەك و لە لایەکی ترەوە ڕوویەکی

(١) "فتح الباري" (١/ ٤٧٥).

(٢) "الموافقات" للشاطبي (٢/ ١٠٣)، و "الرسالة" للشافعي ص٥١.

تایبەت، وە قسە بە شێوەی گشتی مەست پێی بەس تایبەتە، وە بە شێوەی دەرەکی ڕووکەش، لەگەڵ ئەوەشدا مەبەست پێی ئەو ڕووکەشە دارشتنە نییە، هەموو ئەمانە بە ڕێگەی سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی قسە دارێژراوەکان دەزانرێت، وە باسێك دەکات سەرەتاکەی هەواڵی کۆتاییەکەیەتی، یاخود کۆتاییەکەی هەواڵی سەرەتاکەیەتی و قسە لەسەر شتێك دەکات بە مانا دەزانرێت وەکوو بە هێما دەزانرێت، وە ناوی شتێك بە چەندەها ناو دەبات، وە چەند شتێکی زۆر ناو دەبات بە یەك ناو، هەموو بابەتەکانی دیاریکراوە و شاراوەیی تێدا نییە، وە هەروەها وشەکانیشی و ئەوەی پەیوەندییان پێوەیەتی.

قورئانیش لە ڕووی مانا و شێوەی دارشتنییەوە بەم شێوازە دانانە دانراوە، چۆن هەندێك لە زمانی بێجگە لە عەرەب لەسەر چۆنێتی زمانی عەرەب تێناگەیەنرێت، هەروەها زمانی عەرەبیش لەسەر چۆنێتی زمانی بێجگە عەرەب تێناگەیەنرێت، لەبەر جیاوازی دانان و شێوازیان.

گەر دەقی قورئان و فەرموودە شارەزا و زانا نەبیت؛ بەم شێوەیە لێی تێناگەیت، وە قسەکردن لەسەری گومڕاییە و بەر ئەو فەرموودەیە دەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَّ لاَ يَقْبِضُ العِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ العِبَادِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ العِلْمَ بِقَبْضِ العُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا، فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا»[1].

واتە: خوای پەروەردگار زانست کۆ ناکاتەوە بە کۆکردنەوە لەناو بەندەکانیدا، بەڵکوو زانست کۆ دەکاتەوە بە مردنی زانایان، تا کاتێك زانا نامێنێت و خەڵکی سەرکردەی نەزان بۆ خۆیان دادەنێن، پرسیاریان لێ دەکرێت و فەتوا بە بێ زانست دەدەن، گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن.

لەبەرئەوەی ئاشنای زمانی عەرەبی نین، تا بچنەوە سەری لە قورئان و فەرموودەدا، گەر وا بوو؛ دەگەڕێنەوە سەر عەجەمیەتییان، یاخود لایەنە عەقڵییەکەیان، دوور لە بەڵگە، وە گومڕا دەبن لەسەر ڕێگاکە[2].

---

(١) رواه البخاري (١٠٠)، ومسلم (٢٦٧٣)، والترمذي (٢٦٥٢)، وابن ماجه (٥٢)، والنسائي في "الكبرى" (٥٨٧٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٥٧١)، وأحمد في "المسند" (٦٥١١)، والدارمي في "السنن" (٢٤٥)، والطبراني في "الكبير" (٤٥٩)، والبيهقي في "الشعب" (١٥٤١)، وابن وضاح في "البدع" (٢٣٣)، والبغوي في "شرح السنة" (١٤٧).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٣٦٣).

**د. ناسینی مەبەستە یاساییەکانی ئیسلام (معرفة مقاصد التشريع):**

مەبەستە یاساییەکانی ئیسلام ئەو مەبەستانەیە کە یاساکانی ئیسلامی لەسەر دارێژراوە، بۆ هێنانەدی سوودمەندی بەندەکانی خوا[1].

دەرککردن بە وردەکاری یاساکان و گرنگیدان بە یاسا گشتییەکان و خوێندنەوەیان لە بازنەی (مقاصد) مەبەستە شەرعییەکان و بەستنەوەیان بە چەندەها هاوشێوە یاسایی خۆیانەوە لە ڕووی هۆکار و حوکمەکانەوە (العلل والأحكام)، بە ڕەچاوکردنی سوودمەندی و زەرەرەکانەوە (مصالح ومفاسد) کە لە شەرعدا مەبەستە؛ هۆکارێکی سەرەکییە بۆ تەواو تێگەیشتن لە ڕاست و دروستی یاساکانی ئیسلام، ئەگەر بەم شێوەیە لە یاساکان بگەین ئەوا دوورەپەرێز دەبین لە لادانەکان، وەکوو ڕووکەشخوێندنەوەی دەقەکان بە شێوەیەکی ساکاری، یاخود وشکبوونەوە بە حەرفیەتی دەقەکان، یا خوێندنەوە بۆ کردنی شێوەکاری دارشتنی زمان دوور لە پێناسە شەرعییەکانی، وە یاخود پچڕاندنی دەقەکان و پابەندبوون بە بابەتە وردەکانەوە.

ئەمانە هەمووی لەناوبردنی پلە و هێزی کامڵی یاساکانی ئیسلامە، لە نەخوێندنەوەی قووڵ بۆ بابەتەکان و وردنەبوونەوە لە دارشتن و شێواندنی پەیوەندییە یاساییەکان لە ڕووی تەواوکاری یەکتری و بەدوادانەچوونی پێش و پاش و ناوەڕۆکی دەقەکان.

بۆ ناسینی پلە یەکی داواکاری یاساکان زانایان ناویان ناوە (الضروريات)، وە بۆ پلە دووی تەواوکەری فەرمان و یاساکە بە شێوازی تەواو ناونراوە (الحاجيات)، وە بۆ ڕازاندنەوە و پێبەخشینی کامڵی فەرمانەکە ناونراوە (التحسينيات)، ڕێگەی (الإستقراء) خوێندنەوە و بەدواداچوون، ئەمەش بە شوێنکەوتنی دەقە شەرعییەکان و حوکمەکانی و هۆکاری حوکمەکانی کە زانستێکی هاوشێوەی یاساکانمان بۆ بەدەست دەهێنێت تا بتوانین لەو ڕووەوە بگەینە مەبەستە شەرعییەکان.

وەك ئیمامی (الشاطبي) ﷬ دەڵێت: «الضَّرُورِيَّاتُ، وَالْحَاجِيَّاتُ، وَالتَّحْسِينَاتُ، ...أَنَّ هَذِهِ الْقَوَاعِدَ الثَّلَاثَ لَا يَرْتَابُ فِي ثُبُوتِهَا شَرْعًا أَحَدٌ مِمَّنْ يَنْتَمِي إِلَى الِاجْتِهَادِ مِنْ أَهْلِ الشَّرْعِ، وَأَنَّ

---

(١) "مقاصد الشريعة الإسلامية" لمحمد سعد ص٣٣.

اعْتِبَارَهَا مَقْصُودٌ لِلشَّارِعِ،... وَدَلِيلُ ذَلِكَ اسْتِقْرَاءُ الشَّرِيعَةِ، وَالنَّظَرُ فِي أَدِلَّتِهَا الْكُلِّيَّةِ وَالْجُزْئِيَّةِ، وَمَا انْطَوَتْ عَلَيْهِ مِنْ هَذِهِ الْأُمُورِ الْعَامَّةِ عَلَى حَدِّ الِاسْتِقْرَاءِ الْمَعْنَوِيِّ الَّذِي لَا يُثْبَتُ بِدَلِيلٍ خَاصٍّ، بَلْ بِأَدِلَّةٍ مُضَافٍ بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، مُخْتَلِفَةِ الْأَغْرَاضِ، بِحَيْثُ يَنْتَظِمُ مِنْ مَجْمُوعِهَا أَمْرٌ وَاحِدٌ تَجْتَمِعُ عَلَيْهِ تِلْكَ الْأَدِلَّةُ، ... فَلَمْ يعتمد النَّاسُ فِي إِثْبَاتِ قَصْدِ الشَّارِعِ فِي هَذِهِ الْقَوَاعِدِ عَلَى دَلِيلٍ مَخْصُوصٍ، وَلَا عَلَى وَجْهٍ مَخْصُوصٍ، بَلْ حَصَلَ لَهُمْ ذَلِكَ مِنَ الظَّوَاهِرِ وَالْعُمُومَاتِ، وَالْمُطْلَقَاتِ وَالْمُقَيَّدَاتِ، وَالْجُزْئِيَّاتِ الْخَاصَّةِ، فِي أَعْيَانٍ مُخْتَلِفَةٍ، وَوَقَائِعَ مُخْتَلِفَةٍ»[١].

واته: بۆ تێگەیشتن لەو سێ یاسایە (الضَّرُورِيَّاتُ، وَالْحَاجِيَّاتُ، وَالتَّحْسِينَاتُ) کە هیچ یاسایەك لە یاساکانی ئیسلامی لێ دەرناچێت، مەبەست لەو یاسایانە هێزی داواکاری هێنانەدی پلەی فەرمان و کاملێ ئەداکردنە... ئەم یاسایانە هیچ زانایەکی شەرعی پلەی ئیجتیهاد نکوولێ لێ ناکات، وە دڵنیابوون لەوەی کە ئەم یاسایانە مەبەستەکانی شەرعە، خوێندنەوەی شێوازی گشتی شەرع و بەڵگە گشتییە ووردەکان و ئەوەی ئەم یاسایانە دەیگرێتەوە؛ بە شێوەی مانا ناوەڕۆکییەکانی، کە بەڵگەیەکی دیاریکراوی لەسەر نییە، بەڵکوو بە ڕێگەی لێکدانی بەڵگەکان و جۆراوجۆری حوکمەکان دروست دەبێت، بە شێوەیەك لە هەموو فەرمانێکدا ڕێکدەکەوێت کە هەموو بەڵگەکان لەخۆ بگرێت.

بۆ مەبەستەکانی شەرع پشت نەبەستراوە بە بەڵگەی تایبەت یا خوێندنەوەی ڕوویەکی تایبەت، بەڵکوو ئەم یاسایانە بەدەست هاتووە لە بەڵگە ڕووکەش و گشتییەکان و ڕەها و تایبەت و یاسا وورده پەیوەستەکان بە جۆرە جیاوازەکان لە ڕووداوە جیاجیاکاندا.

وە (ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «الشَّرِيعَةَ مَبْنَاهَا عَلَى تَحْصِيلِ الْمَصَالِحِ وَتَكْمِيلِهَا، وَتَعْطِيلِ الْمَفَاسِدِ، وَتَقْلِيلِهَا بِحَسَبِ الْإِمْكَانِ، وَمَعْرِفَةِ خَيْرِ الْخَيْرَيْنِ وَشَرِّ الشَّرَّيْنِ، حَتَّى يُقَدَّمَ عِنْدَ التَّزَاحُمِ خَيْرُ الْخَيْرَيْنِ وَيُدْفَعَ شَرُّ الشَّرَّيْنِ»[٢].

---

(١) "الموافقات" للشاطبي (٢/ ٨١).

(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٦/ ١١٨).

واتە: شەرع و یاسای ئیسلام بنیاد نراوە لەسەر هێنانەدی سوودمەندییەکان و خێرەکان، هەوڵدان بۆ تەواو حەقپێدان و کاملکردنی، وە لەکارخستنی خراپەکان و کەمکردنەوەیان بە گوێرەی توانا، ئاشنا و شارەزابوون بەسەر چاکترین خێر و خراپترین شەڕدا، تا لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە و تێکەڵبووندا باشترین خێر پێش بخرێت و خراپترین شەڕ لابرێت.

وە (ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَكُلُّ مَسْأَلَةٍ خَرَجَتْ عَنْ الْعَدْلِ إلَى الْجُوْرِ، وَعَنْ الرَّحْمَةِ إلَى ضِدِّهَا، وَعَنْ الْمَصْلَحَةِ إلَى الْمَفْسَدَةِ، وَعَنْ الْحِكْمَةِ إلَى الْعَبَثِ؛ فَلَيْسَتْ مِنْ الشَّرِيعَةِ وَإِنْ أُدْخِلَتْ فِيهَا بِالتَّأْوِيلِ»[1].

واتە: هەر بابەتێك لە دادپەروەرییەوە دەرچوو بۆ ستەم، وە لە بەزەییەوە بۆ دژەکەی، وە لە سوودەکانەوە بۆ خراپەکان، وە لە داناییەوە بۆ گاڵتە و گەپ؛ ئەوە شەریعەت نییە، ئەگەرچی جۆرە خوێندنەوەیەکیشی بۆ کرابێت.

زانابوون لەم بوارەدا توانایەك بۆ خاوەنەکەی دروستدەکات، کە بتوانێت پێوانە سوودمەندییەکان و کێشانەیان بە خۆیان و بەرامبەرەکانیان بۆ بێنێتە بەرهەم، وە زانابوون بەسەر پێشخستنی ئەوانەی شایستەی پێشخستنن، وە دانانی فەرمانەکان لە شوێنی شیاوی خۆیاندا؛ کاملی زانستی بەدەست دێت، وە لەم ڕووەوە زانایان چەندەها یاسایان داناوە، وەکوو هەڵپەساردنی قورسییەکان (رفع الحرج)، وە پێشگرتن لە زەرەرەکان (دفع الضر)، وە داخستنی ڕێگەی پێشبینییەکان (سد الزرائع)، وە سوودمەندییە گرێدراوەکان (مصالح المرسلة) و چەندەها یاسای تر، هەمووی یارمەتیدەری ئەهلی ئیجتیهادە بۆ دابەزینی یاساکان لە شوێنی خۆیاندا، وە گەیشتن بە مەبەستەکانی خۆی، هەرچەند کات و جۆرەکانیش جیاواز بن، وە متمانەی زیاتر کە ئیجتیهاد لە دیندا سەلامەت بێت لە لادان و گۆڕانکاری.

ئەمەی باسمانکرد ڕێگە و بەرنامەی ئەهلی سوننەتە لە چۆنێتی وەرگرتن و تێگەیشتنی بەڵگەکان، وە بنەمای باوەڕ و کاری دینداریيان لەسەر بنیاد ناوە و لادان لێی گومڕایی و سەرلێشێواوییە.

---

(١) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (٣/ ١١).

**بەرنامەی ئەهلی سوننەتمان بۆیە پێشخست بەسەر بەرنامەی گومڕا و بیدعەکاراندا؛ تاوەکوو خوێنەر ئاشنا و شارەزا بێت بەسەر ڕێگەی حەقدا، پێشەکی و دواتر لەو ڕووەوە بەرنامەی گومڕاییان هەڵسەنگێنێت و دڵنیایی تەواوی زانستی بۆ دروست بێت بەسەر حەقەکەدا لە ڕێگە گومڕاکان.**






# ب- بەرنامەی بیدعەکاران لە چۆنێتی وەرگرتنی بەڵگەکان

## (منهج التلقي والاستدلال عند أهل البدع)

خاوەن هەوا و ئارەزووەکانی بیدعەکاران ڕێگە و شێوازی بەڵگەهێنانەوەی تایبەتیان بۆ خۆیان دارِشتووە، هەر لە کۆنەوە زانایانی ئەهلی سوننەت پەردەیان لەسەر ڕێگا و چۆنێتی هێنانەوەی بەڵگەکانیان لاداوە لە زۆر نووسیندا.

وەکوو ئیمامی (الشاطبي) ﵀ دەڵێت: «إِذَا تَبَيَّنَ أَنَّ لِلرَّاسِخِينَ طَرِيقًا يَسْلُكُونَهَا فِي اتِّبَاعِ الْحَقِّ، وَأَنَّ الزَّائِغِينَ عَلَى غَيْرِ طَرِيقِهِمْ، فَاحْتَجْنَا إِلَى بَيَانِ الطَّرِيقِ الَّتِي سَلَكَهَا هَؤُلَاءِ لِنَتَجَنَّبَها»[(١)].

واتە: زانایانی ڕۆچوو لە زانستدا ڕێگەی تایبەتیان هەیە بۆ شوێنکەوتنی حەق، ئەوانیتریش ڕێگەی جیاوازیان هەیە، پێویستمان بە ڕوونکردنەوەی ڕێگاکانیان هەیە تا دوورەپەرێز بین لێیان.

هەروەکوو خوای پەروەردگار ڕوونکردنەوە دەدات لەسەر ڕێگەکەی خۆی و ڕێگە گومڕاکان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣﴾ [الأنعام: ١٥٣].

وە تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ بە وێنە لەسەر زەوی خەتێکی ڕاستی کێشا و بە چواردەوریدا چەند خەتێکی تری کێشا و ئەم ئایەتەی خوێندەوە[(٢)]، بۆ زیاتر چاوڕۆشنی شوێنکەوتەی ڕێگە ڕاستەکەی پەروەردگار و دوورکەوتنەوە لە ڕێگەکانی تر، وە (مجاهد) ﵀ دەڵێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ﴾: ڕێگە داهێنراوەکانە[(٣)].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٨٥).

(٢) رواه الترمذي (٢٤٥٤) وحسنه الألباني في "المشكاة" (١٦٦)، وفي "ظلال الجنة" (١٦)، و "التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان" (٦)، ورواه ابن حبان في "صحيحه" (٦)، وأحمد في "المسند" (٤٤٣٧)، والدارمي في "السنن" (٢٠٨)، وابن وضاح في "البدع" (٧٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٦).

(٣) "تفسير القرطبي" (٧/ ١٢٤).

# نیشانە سەرەکییەکانی بەرنامەی ئەهلی بیدعە

## ١. لادان و بەسەرچاوە نەگرتنی قورئان و فەرموودە لە ڕووی بەڵگەوە:

پێویستە موسوڵمانان پەیوەستی تەواوی قورئان و فەرموودە (صحيح)ەکان بن، بەشێوەی بەرنامەڕێژی خۆی لە ڕووی کردنە بەڵگە و بنەمای بۆچوون و کارەکانیان، بە شێوەیەکی زۆر و یەقینی تەواو، ئەوەی لەم بازنەیە بەدووره شوێنی گومانە، دەبێت ڕاکێشرێتە سەر تێگەیشتنی دەقەکان، وە گەرنا؛ پەراوێزکردنی کارێکی حەق و پڕ ڕەواییە، لەبەر پارێزراوی (معصومية)ی دەقەکان و کامڵی عیلمی خالق بەسەر مەخلوقدا.

بەڵام بیدعەکاران هەموو هەوڵێکیان دوورکەوتنەوەیە لە دەقەکان بە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، زانایان ڕوونکردنەوەی زۆریان داوە لەسەر ڕێگەکانیان و شێوازی دەرچوونیان لە دەقەکان، لەو جۆر و ڕێگایانەش ئەمانەن:

### أ. بەرنامەی حەرفی (المنهج الحرفي):

شیکردنەوەی دەقەکان بە شێوەی حەرفی بەبێ گەڕانەوە بۆ تێگەیشتن و وردەکاری زانایانە لە کردنە بناغە و وەرگرتن لێی، واتە بە شێوەیەکی ڕووکەش بەسەرداچوون.

وەکوو (خەوارجەکان) هەر وشەیەك بهاتایە بە ناوی (مشرك، كافر، مرتد، لايؤمن، لعنة، وە هەرەشە) بە ڕووکەشە حەرفییەکەی دایان دەبەزاندە سەر خاوەنەکەی، بەبێ هیچ خوێندنەوەیەکی تری دینی بۆی.

### ب. بەرنامەی مانا و شەرح ترازاندن لە حەقیقەت و ڕاست و دروستی خۆی (المنهج التأويلي):

ڕاپێچکردنی دەقەکان بۆ بەرنامە و بنەما داڕێژراوەکانی خۆیان، بەبێ گەڕانەوە بۆ تەفسیری هاوشێوە دەقەکانی تر و شیتەڵکردنەوەی هاوەڵان و زانایانی خاوەن مەنهەج و تایبەتمەند.

وەکوو پێناسەی بیدعە لە ڕووی زمانەوە نەك شەرعییەوە، یا (حسنة وسيئة) بە پێناسەی عورفی و شێوە گشتییەکەی.

وەکوو (أهل التصوف) کە پێناسەی (ولي، توسل، أولياء، كرامات، ...) دەکەن بە شێوەی مەبەست و تێگەیشتن و بەرنامەی خۆیان، دوور لە هەموو بەڵگە و مەرجە شەرعییەکان و ڕەچاوکردنی تەوحید و یاساکانی ئیسلام و ڕەنگدانەوە و کێشانەی بە کرداری ناو هاوەڵان و تابعین و خواناسان و زانایانی پەیوەستبوو بە شەرعی خواوە ﷻ.

وەکوو وشەی (الدعوة، الجهاد، الجماعة، ...) ئەمڕۆ سەرتاپا گرووپە ئیسلامییەکان بە شێوازی پێویستی خۆیان تەفسیر و بەکارهێنانیان بۆ دەکەن، بەبێ گەڕاندنەوە بۆ شیکردنەوەی زانایان لەسەری و پێناسە شەرعییەکان.

**ج. بەرنامەی ناوەڕۆکی و شاراوەیی بۆ دەقەکان دەکەن (المنهج الباطني):**

بەو مانایەی کە دەقەکان مانای ڕووکەش و ناوەڕۆکییان هەیە، ناوەڕۆکە شاراوەکان ئەوانەیە کە لەگەڵ بەرنامە و مەبەستەکانی خۆیان بگونجێت.

وەکوو شیعەکان دەڵێن (علم الباطن) ئیمامە مەعصومەکانمان دەیزانن، لە خەڵکی گشتی شاراوەیە، ئەو زانستەیە ڕووکەش شتێك دەگەیەنێت و ناوەڕۆکیش باس لە شتێکی تر دەکات، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە قورئان مانا و دڵنیایی و یەکلاکەرەوەیی نییە لە باسەکانیدا.

هەروەك ڕستەی «مَنْ كُنْتُ مَوْلَاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلَاهُ»[1] واتە: هەرکەسێك من سەرپەرشتیکاری بم ئەوا (عەلی) سەرپەرشتیکاریەتی، دەکەنە بەڵگە بۆ بوون بە خەلیفەی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁) پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ.

یا لە تەفسیری قورئاندا ئایەتی ﴿تَذْبَحُواْ بَقَرَةً﴾ [البقرة: ٦٧] واتە (عائیشە)، وە ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾ [المسد: ١] واتە (ئەبو بەکر و عومەر)، وە ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ﴾ [التوبة: ١٢] واتە (تەڵحە و زوبەیر)[2].

---

(١) رواه الترمذي (٣٧١٣)، وابن ماجه (١٢١)، والنسائي في "الكبرى" (٨٠٨٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٣١)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٩٥٩)، والطبراني في "الكبير" (١٧٥)، والحاكم في "المستدرك" (٤٥٧٨)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٣٥٤)، والآجري في "الشريعة" (١٥١٣)، واللالكائي في "شرح أصول إعتقاد" (٢٦٣٨)، وصححه الألباني في "الصحيحة" برقم (١٧٥٠).

(٢) "تأويل مختلف الحديث" لابن قتيبة ص١٢٣، "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ٣٥٩).

وە سۆفییەکانیش هەمان بیرۆکەی بەرنامەی (علم الباطن)یان هەیە بۆ وەلیەکانیان، بۆیە لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾﴾ [الكهف : ٦٥] دەیکەنە بەڵگە بۆ زانینی عیلمی شاراوەی تایبەت بۆ شێخەکانیان، کە پێی دەوترێت (علم لدني)، کە دەبێتە مایەی فێربوونی هەموو زانستەکان لە لایەنی غەیبەوە بەبێ شوێنکەوتەی قورئان و فەرموودە، وە تەنانەت تەفسیری ناوەکی هەیە بۆ ئایەتەکان.

وەك تەفسیری ئایەتی: ﴿وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾﴾ [الحجر : ٩٩]، پەیوەست بوون بە شەرع و عیبادەتەوە تا ئەو کاتەیە کە دامەزراوی دڵیت بۆ دروست دەبێت، پاش ئەوە دەرچوونە لە شەرع و هیچ فەرمان و واجبێك نامێنێ و هیچ حەرامێك لەسەری حەرام نامێنێت بە قۆناغبڕینی بۆ پلەی یەقین[1].

## ٢. داهێنانی بنەمای تازە بۆ کردنە بەڵگە (ابتداع أصول جديدة للإستدلال):

داهێنەرانی ڕێی گومڕایی و بیدعە بەوەوە نەوەستان کە پشتکردنە بەڵگە و یاساکانی شەرع و دەرچوون بوو لە سنوورەکەی، بەڵکوو پەنایان بردە بەر سەرچاوە دروستکردنی بەڵگە، تا ببێتە سەرچاوەی دەرچوون و گەڕانەوە، بە یاسا و ڕێساکردنی داهێنراوەکانیان، بە هەوڵی دروستکردنی بەرگی شەرعی بۆیان و پاساوی دەرنەچوون لە سنووری شەرع، وە پاشان هەوڵدان بۆ ڕەتکردنەوە و مانا گۆڕین و تەفسیرکردنێکی چەواشەکاری بۆ دەق و ئەو فەرموودانەی لەگەڵ ویست و ئارەزووەکانیاندا ناگونجێت.

ئەمە مانای پاشگەزبوونەوەی ناڕاستەوخۆ و پەیوەستنەبوونە لە بەشی دووەمی (شهادتين)دا، کە «أَشْهَدُ أَنْ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِّ» دەرنەچوونە لە فەرموودە و کار و ڕێگاکانی پێغەمبەری خوا و ﷺ دانەنان و پێش نەخستنی کەسی ترە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «خَيْرُ الْهُدْيِ؛ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»، وَفِي لَفْظٍ: «وَإِنَّ أَفْضَلَ»، وَفِي لَفْظٍ: «وَأَحْسَنَ الهَدْيِ»[2].

---

(١) "تفسير القيم" لابن القيم ص٩٩، و "الرد على الشاذلي" لابن تيمية ص٥٠، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢/ ٩٥)، و "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ١٢٤).

(٢) رواه البخاري (٧٢٧٧)، ومسلم (٨٦٧)، وابن ماجه (٤٥)، والنسائي في "الكبرى" (١٧٩٩)، وأحمد (١٤٣٣٤)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٧٨٥)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٢١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٣)، والبيهقي في =

واتە: باشترین ڕێی هیدایەت و پەیوەستبوون پێوەی ڕێگەی (ﷺ)ە.

بۆیە بە ناوی خۆیشی ناوی بردووە کە هاوتا و بەشداربوو و جێگری نییە لەم ڕێگەیەدا.

وە یەکێك لە مەرجەکانی «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ» بریتییە لە (الانقیاد والقبول)، واتە: پەیوەستبوون و قبووڵبوونی خوا و شەرعەکەی بە هەموو وردەکارییەکانییەوە.

کەواتە بیدعەکاران نە پەیوەستن و نە قبووڵیشیانە یاسا و داڕێژراوەکان و شەرعی خوا لەسەر ڕێباز و کاری پێغەمبەرەکەی ﷺ.

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَأَمَّا الْقَوْلُ عَلَى اللهِّ بِلَا عِلْمٍ فَهُوَ أَشَدُّ هَذِهِ الْمُحَرَّمَاتِ تَحْرِيمًا، وَأَعْظَمُهَا إِثْمًا، ... ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٣﴾ [الأعراف : ٣٣] فَهَذَا أَعْظَمُ الْمُحَرَّمَاتِ عِنْدَ اللهِّ وَأَشَدُّهَا إِثْمًا، فَإِنَّهُ يَتَضَمَّنُ الْكَذِبَ عَلَى اللهِّ، وَنِسْبَتَهُ إِلَى مَا لَا يَلِيقُ بِهِ، وَتَغْيِيرَ دِينِهِ وَتَبْدِيلَهُ، وَنَفْيَ مَا أَثْبَتَهُ وَإِثْبَاتَ مَا نَفَاهُ، ... فَلَيْسَ فِي أَجْنَاسِ الْمُحَرَّمَاتِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِّ مِنْهُ، وَلَا أَشَدُّ إِثْمًا، وَهُوَ أَصْلُ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ، وَعَلَيْهِ أُسِّسَتِ الْبِدَعُ وَالضَّلَالَاتُ، فَكُلُّ بِدْعَةٍ مُضِلَّةٍ فِي الدِّينِ أَسَاسُهَا الْقَوْلُ عَلَى اللهِّ بِلَا عِلْمٍ.

وَلِهَذَا اشْتَدَّ نَكِيرُ السَّلَفِ وَالْأَئِمَّةِ لَهَا، وَصَاحُوا بِأَهْلِهَا مِنْ أَقْطَارِ الْأَرْضِ، وَحَذَّرُوا فِتْنَتَهُمْ أَشَدَّ التَّحْذِيرِ، وَبَالَغُوا فِي ذَلِكَ مَا لَمْ يُبَالِغُوا مِثْلَهُ فِي إِنْكَارِ الْفَوَاحِشِ، وَالظُّلْمِ وَالْعُدْوَانِ، إِذْ مَضَرَّةُ الْبِدَعِ وَهَدْمُهَا لِلدِّينِ وَمُنَافَاتُهَا لَهُ أَشَدُّ»[١].

واتە: قسەکردن و بڕیاردان بەناوی خواوە جَلَّ جَلَالُهُ بەبێ عیلم و زانست گەورەترین تاوانە و قەدەغەکراوە لای خوا، لەبەرئەوەی ئەمانە لەخۆ دەگرێت: درۆکردن بە ناوی خواوە و گۆڕانکاری لە دینەکەیدا بە لابردنی ئەو و دانانی دژەکانی، ... لە هەموو جۆری حەرامەکان لەمە تاوانی گەورەتر نییە لای خوا، ئەم کارە بناغەی هاوبەشدانان و کوفرە، بەم جۆرە بڕیار لەسەر هەموو داهێنراو و گومڕاییەك دراوە، هەموو داهێنراوێك لە دیندا بناغەکەی وتن و بڕیاردانە

---

= "الشعب" (٤٤٥١)، واللالكائي في "شرح أصول إعتقاد" (٨٣).

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٣٧٨).

بەناوی خواوە، بۆیە هاوەڵان و پێشووە صاڵحەکان و ئیمامەکان زۆر بە توندی دژایەتییان کردووە، زیانی بیدعەیان بە ڕووخاندنی دین و پێچەوانە و دژایەتی تەواوی دین ناو بردووە.

بێگومان هەرچی بتپەرستی و جۆرەکانی هاوبەشبڕیاردانە بەناوی نزیکبوونەوە و ڕازیبوونی خواوە کراوە، وە هەرچی ڕێگەی چەوت و گومڕاییشە هەر بەناوی دینی تەواو و ڕازیبوونی خواوە کراوە، بڕوانە تەورات و ئینجیل و گۆڕانکارییەکان و هەموو مەزهەب و فیرەقە دینییەکان.

## لە سەرچاوە و بنەما تازەکانیان

١. دواکەوتنی ئیمام و کەسە ناودارەکانیان.

٢. کەشف و ئیلهامات و دەرکپێکردنە غەیبییەکان.

٣. عەقڵ و گومانەکان.

٤. خەوبینینەکان.

٥. پشتبەستن بە ڕیوایەتی هەڵبەستراو و گوماناوی.

٦. پاشماوە و بیروڕا کۆنەکان.

### ١. دواکەوتنی ئیمام و کەسە ناودارەکانیان.

شوێنکەوتەی باوك و باپیران و ناودارەکان دەردێکی کۆنە لەگەڵ ئادەمیزاددا، هۆکاری گومڕایی نەبڕانەوەی ڕێی هەڵەیە، وە هەموو بەڵگەیەکی بێبڕواکان لە وەرنەگرتنی حەقدا وتنی ئەم ئایەتەیە: ﴿إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ٢٣﴾ [الزخرف: ٢٣].

واتە: ئێمە باوك و باپیرانمان لەسەر ئەم ڕێگایە بینیوە، ئێمەش شوێنکەوتەی ئەوانین.

مەبەست بەم قسانە شوێنکەوتەی حەق نەبوو، بەڵکوو دەمارگیری تەواو بوو بۆ پشتیوانیکردنی بەتاڵ[1].

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٧٦٤.

وەلاّمیش دەدرانەوە بە: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ١٠٤﴾ [المَائِدَة: ١٠٤].

واتە: خۆ باوکانیان تێنەگەیشتوو بوون لە حەق و نەزان و گومڕا بوون، چۆن شوێنیان دەکەون کە ئەمە حاڵیان بووە[١].

وەکوو لە (عمرو بن العاص)یان ﷺ پرسی: «ما أبطأ بك عن الإسلام وأنت في عقلك؟ قال كنا مع قوم لهم علينا تقدم وكانوا مما توازي أحلامهم الجبال فلذنا بهم فلما ذهبوا وصار الأمر إلينا نظرنا فإذا حق بيّن فوقع الإسلام في قلبي»[٢].

واتە: هۆکار چی بوو لە دواکەوتنت لە ئیسلام لەگەڵ ئەو عەقڵە زۆرەدا؟ وتی: ئێمە لەگەڵ کەسانێکا بووین لەپێش ئێمەوە بوون لە تەمەندا، ژیرییان وەکوو شاخەکان بوو، پەنامان بوون، کاتێك ئەوان نەمان کار کەوتە دەستی خۆمان، سەیرمان کرد ئەمە حەقێکی زۆر ڕوونە، ئیتر ئیسلام کەوتە دڵم.

## ئەوانەی لەم بوارەدا تێکەوتوون

**أ. شیعەکان (الرافضة):**

ئەوانەی دەسەڵاتی دینی و دونیایی قۆرخ دەکەن لە بنەماڵەی (عەلی کوڕی أبو تالیب) ﷺ و چەند نەوە و ئیمامێکی دیاریکراون کە بڕیاری بێتاوانی و پارێزراوی خوایی (العصمة المطلقة) یان وەکوو پێغەمبەرانیان پێ دەدەن، وە بڕیاری دەستکاریکردنی شەریعەت بەناوی پلەی (ولاية الفقيه) بە جێگری کۆتا ئیمامیان دەدەن تاوەکوو دێت، ئەمانە دەبنە سەرچاوەی وەرگرتنی کاری هەموو دین و دونیا بەناوی شوێنی گەڕانەوەی دینییەوە (المرجعية).

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «وَمَنْ تَرَكَ النَّقْلَ الْمُصَدَّقَ عَنْ الْقَائِلِ الْمَعْصُومِ، وَاتَّبَعَ نَقْلًا غَيْرَ مُصَدَّقٍ عَنْ قَائِلٍ غَيْرِ مَعْصُومٍ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا»[٣].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٢/١٠٨).

(٢) "محمد صلى الله عليه وسلم" لمحمد رضا ص٤٥٨، و "فيض القدير" للمناوي (٧/ ١٨).

(٣) "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٢/ ٤٣٣)، و "مجموع الفتاوى" (٢٧/ ١٢٥).

واتە: ئەوەی دەقێکی ڕاستگۆی باوەڕپێکراو لە خاوەن پارێزراوێکی تایبەتی خوایی (معصوم) واز لێبێنێت؛ وە شوێن دەقێکی باوەڕپێنەکراو لە کەسێکی سادەیی ناپارێزراو بکەوێت؛ ئەوە تووشی گومڕاییەکی دوور بووە.

وەکوو ئیمامی (الكليني)[1] یان دەڵێت: «الْأَئِمَّةُ بِمَنْزِلَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ إِلَّا أَنَّهُمْ لَيْسُوا بِأَنْبِيَاءَ»[2].

واتە: ئیمامەکان لە پلەوپایەی پێغەمبەر ﷺ دان، بەس ئەوەیە کە پێغەمبەر نین.

وە ناوداریان (المجلسي)[3] دەڵێت: «اعلم أنّ الإماميّة اتّفقوا على عصمة الأئمّة عليهم السّلام من الذّنوب صغيرها وكبيرها، فلا يقع منهم ذنب أصلاً، لا عمداً ولا نسياناً، ولا لخطأ في التّأويل، ولا للإسهاء من الله سبحانه»[4].

واتە: بزانە شیعە ئیمامییەکان کۆدەنگن لەسەر بێگەردی ئیمامەکان لە تاوانی گەورە و بچووك، هیچ تاوانێکی ئەنقەست و لەبیرچوون و هەڵەیان لێ ناوەشێتەوە.

ئەمە بردنە ڕیزی خواوەیە، وەکوو خوای گەورە بە گاوورەکان دەفەرموێت: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ [التوبة: ٣١].

واتە: زاناکانیان و عابیدەکانیان دەکردن بە خوا و گەورەی خۆیان، حەڵاڵ و حەرامیان بۆ دەگۆڕین، شەرع و یاسایان بۆ دادەنان[5].

وە تەنانەت بەناو زانا و ناوداریان (ابن بابوية)[6] دەڵێت: «ومن نفى عنهم العصمة في شيء من أحوالهم فقد جهلهم، ومن جهلهم فهو كافر»[7].

---

(١) هو (محمد بن يعقوب بن إسحاق الكليني الرازي)، من كبار فقهاء ومحدثي الشيعة الإمامية، ومؤلف كتاب "الكافي" الذي يعد من أهم المصادر الحديثية الأربعة عند الشيعة.

(٢) "الكافي" للكليني (١/ ٢٧٠) باب فِي أَنَّ الْأَئِمَّةَ بِمَنْ يُشْبِهُونَ مِمَّنْ مَضَى وَكَرَاهِيَةِ الْقَوْلِ فِيهِمْ بِالنُّبُوَّةِ.

(٣) هو (محمد باقر المجلسي)، من علماء الشيعة الإمامية الأثني العشرية، صاحب الكتاب "بحار الأنوار".

(٤) "بحار الأنوار" للمجلسي (٢٥/ ٢١١).

(٥) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٣٣٤، و "تفسير القرطبي" (١٤/ ٢٠٩).

(٦) هو (أبو الحسن، علي بن الحسين بن موسى بن بابوية)، من علماء الشيعة الإمامية الأثني العشرية، صاحب الكتاب "الاعتقادات في دين الإمامية".

(٧) "الاعتقادات في دين الإمامية" لابن بابوية ص١٠٨.

واتە: ئەوەی دان بە بێتاوانی (المعصومية)تیاندا نەنێت لە هەموو بارودۆخێکیاندا؛ ئەوە بە نەزانیان دادەنێت، وە ئەوەشی بە نەزانیان دابنێت کافرە.

گومڕاییان گەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە دەڵێن ئیمامەکانمان فریشتەکان دەبینن و قسەیان لێ وەردەگرن، وەکوو (الكليني) دەڵێت: «وَالْإِمَامُ هُوَ الَّذِي يَسْمَعُ الْكَلَامَ (ملائكة) وَ لَا يَرَى الشَّخْصَ»[1].

وە (المجلسي) دەڵێت: «باب أن الملائكة تأتيهم (الأئمة) وتطأ فرشهم وأنهم يرونهم»[2].

واتە: فریشتەکان دێن بۆ لای ئیمامەکان و لەسەر جێگەکانیان دادەنیشن و دەیانبینن.

لەبەر ئەوە (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «لَا يَعْتَمِدُونَ عَلَى الْقُرْآنِ، وَلَا عَلَى الْحَدِيثِ، وَلَا عَلَى إِجْمَاعٍ إِلَّا لِكَوْنِ الْمَعْصُومِ مِنْهُمْ، وَلَا عَلَى الْقِيَاسِ»[3].

واتە: پشت نابەستن بە قورئان و فەرموودە و کۆدەنگی زانایان و قیاس، کە ئەمانە بەڵگەی شەرعین.

بەدواداچوونی بەڵگە و شیکارکردنی و پلەی فەرموودە و خوێندنەوەی هۆکار و حیکمەتی یاساو دەقەکان؛ ئەمانە هەمووی لە کار کەوتوون و کەسی (مرجع) و ئیمام لایان دینە، بۆیە دینی خوا لە فەرموودەی خوا و پێغەمبەرەکەی هاتە سەر کەسێکی هاتووی بە هەزار ساڵ دوای پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە فەتوا و بڕیارەکانی جێگری ئەو دەقانە بێت.

**ب. سۆفییەکان:**

سەرچاوەیان گەڕانەوەیە بۆ شێخەکانیان، بە گومانی ئەوەی زانست و عیلمی ڕاستەخۆی پێ بەخشراوە لەلایەن خواوە، وەکوو چۆن (خضر) عَلَيْهِ السَّلَامُ پێی بەخشرا بوو، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ﴿وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ٦٥﴾ [الكهف: ٦٥].

---

(١) "الكافي" للكليني (١/ ١٧٦).

(٢) "بحار الأنوار" للمجلسي (٢٦/ ٣٥١).

(٣) "منهاج السنة النبوية" (١/ ٦٩).

کەواتە (علم الباطن)یان هەیە و پێویست ناکات پەیوەست بن بە (علم الظاهر)ەوە کە قورئان و فەرموودەیە، بۆیە گەڕانەوە بۆ لایان وەکوو سەرچاوە پێویستە، بەڵکوو پلەی شێخەکانیان بەپێی ئەم پێناسەیە بەرزترە لە پلەی پێغەمبەران، وەکوو (ابن العربي حلاج) دەڵێت:

مَقَـامُ الـنُّبُـوَّةِ فِي بَـرْزَخٍ      فُـوَيْـقَ الرَّسُـولِ وَدُونَ الْـوَلِيِّ[١]

واتە: پلەی (نبي) لە بەرزەخدا کەمێك لە سەرووی (رسول)ەکانەوەیە و لە خواری پلەی (ولي)یەوەیە.

وە (ابن العربي)یان دەڵێت: «حَتَّى إِنَّ الرُّسُلَ إِذَا رَأَوْهُ لَا يَرَوْنَهُ إِلَّا مِنْ مِشْكَاةِ خَاتَمِ الْأَوْلِيَاءِ فَإِنَّ الرِّسَالَةَ وَالنُّبُوَّةَ أَعْنِي رِسَالَةَ التَّشْرِيعِ وَنُبُوَّتَهُ تَنْقَطِعَانِ، وَأَمَّا الْوِلَايَةُ فَلَا تَنْقَطِعُ أَبَدًا ... وَإِنْ كَانَ خَاتَمُ الْأَوْلِيَاءِ تَابِعًا فِي الْحُكْمِ لِمَا جَاءَ بِهِ خَاتَمُ الرُّسُلِ مِنَ التَّشْرِيعِ، فَذَلِكَ لَا يَقْدَحُ فِي مَقَامِهِ، ... فَإِنَّهُ مِنْ وَجْهٍ يَكُونُ أَنْزَلَ، وَمِنْ وَجْهٍ يَكُونُ أَعْلَى»[٢].

واتە: تەنانەت پێغەمبەران هیچ شتێك نازانن بێجگە لە دەلاقەی ڕووناکی کۆتا ئەولیا نەبێت، پێغەمبەرایەتی و نێردراوەکان کە پەیامی یاسایی پێغەمبەرایەتیان پێیە کۆتایی پێ دێت، بەڵام وەلییەتی ئەولیاکان کۆتایی پێ نایەت، گەرچی کۆتا ئەولیا پەیوەستە بە یاسای کۆتا پێغەمبەرەوە، ئەوە نابێتە ناتەواوی و ڕەخنە، گەر لە ڕوویەکەوە نزم بێت لە ڕوویەکەوە بەرزترە (واتە لە پێغەمبەر ﷺ).

ئەمە بۆچونیانە، لەبەرئەوە باوەڕیان وایە ئەولیاکان بینین و خەوەکانیان و دەرکپێکردنە دڵی و ناوەڕۆکەکانیان ئیلهامێکی خواییە و دەبێتە شەرع و یاسا؛ واجبە شوێنکەوتنیان.

هەرچەندە پێغەمبەران بە ڕێگەی فریشتەکانەوە (وەحی)یان بۆ دێت، بەڵام ئەولیاکان ڕاستەوخۆ لە خواوە وەری دەگرن، لەوەدا پلەیان لە پێغەمبەران بەرزترە، وەکوو (ابن العربي)یان زۆر ئەو

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢/ ٢٢١)، و "الفتوحات المكية" لابن العربي (٢/ ٩٠).

(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٥/ ٣٣٧).

قسەیەی دوویات دەکردەوە: «ويقول: حدثني قلبي عن ربي، ونحن أخذنا عن الحي الذي لا يموت، وأنتم أخذتم عن الوسائط، ونحن أخذنا بالحقائق، وأنتم اتبعتم الرسوم»(١).

واتە: دڵم لە خواوە دەیگێڕێتەوە، ئێمە زانست لە خوایەکی زیندوو و نەمرەوە وەردەگرین، ئێوە بە هۆکاری ڕاوییەکانەوە، ئێمە ناوەڕۆك و حەقیقەتەکانمان وەرگرتووە، ئێوە شوێنکەوتەی نووسینەکانن (واتە قورئان و فەرموودە).

### ج. دواکەوتنی کوێرانەی ئیمامی مەزهەبەکان:

لە بەرهەمی دواکەوتوویی و نەخوێندەواری و کاملنەبوونی زانستی دینیدا تەقلید و دواکەوتنی کوێرانەی هەر چوار مەزهەبەکە دروست بوو، بە شێوەیەك تاکە سەرچاوەی بنەڕەتی هەموو بوارەکانی دین هەریەکەی لە شوێنکەوتەی مەزهەبێك و ئیمامەکەیدا بەدی کرد، بۆیە لە وەسف و بەگەورە و بەها و بەقەدرکردنی ئیمامی بناغەدانەری مەزهەبەکە زیادەڕەوییەکی زۆر کرا و برایە ڕیزی پێغەمبەرانەوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، تەنانەت گەیشتە ئەو ئاستەی فەرموودەی درۆیان لە پێناودا هەڵدەبەست، ئەمە هۆکارێك بوو لە هۆکاری دروستکردنی فەرموودەی هەڵبەستراو (حديث الموضوع).

یەکێك لەو هەڵبەستراوانەش: «يَكُونُ فِي أُمَّتِي رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ مُحَمَّدُ بْنُ إِدْرِيسَ أَضَرَّ عَلَى أُمَّتِي مِنْ إِبْلِيسَ وَيَكُونُ فِي أُمَّتِي رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ أَبُو حَنِيفَةَ هُوَ سِرَاجُ أُمَّتِي»(٢).

واتە: پیاوێك دەبێت لە ئوممەتەکەم، پێی دەڵێن (محمدی کوڕی ئیدریس)، واتە (ئیمامی شافعی)، زۆر بەزیانترە بۆ موسوڵمانان لە ئیبلیس، وە پیاوێك دەبێت لە ئوممەتەکەمدا، پێی دەڵێن (ئەبو حەنیفە) چرای ئوممەتەکەمە.

تەنانەت گەیشتە ئەو ڕادەیەی وەکوو بێ هەڵە (معصوم)ێك ئیمامەکان سەیر بکرێن.

---

(١) "إغاثة اللهفان من مصايد الشيطان" لابن القيم ص١٢٣، و "مجموع القتاوى" لابن تيمية (١٣/ ٢١٨)، و"المستدرك على مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١/ ١١٢).

(٢) "سلسلة الأحاديث الضعيفة" للألباني (٥٧٠)، و "الموضوعات" لابن الجوزي (١/ ٤٥٧)، و"المسند المستخرج على صحيح الإمام مسلم" لأبي نعيم (٢٤٨).

وەکوو ئیمامی (الجويني) رحمه الله دەڵێت: «**يجب على كافة العاقلين و عامة المسلمين شرقاً، بعداً و قرباً، انتحال مذهب الشافعي و يجب على العوام الطغام، و الجهال الأنذال، أيضاً انتحال مذهبه بحيث لا يبغون عنه حولاً، و لا يريدون به بدلاً**»[(١)].

واته: واجبە لەسەر هەموو عاقڵەکان و گشت موسوڵمانانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا نزیك و دوور؛ لەسەر مەزهەبی شافعی بن و لێی لا نەدەن و نەیگۆڕن.

ئەم قسانە چەند جوان دەبوو گەر بە پەیوەستبوو بە قورئان و فەرموودەوە بوترایە.

گەیشتە ئەو ئاستەی کەوا دەرچوون لە مەزهەبەکان کافربوون بوو، وەکوو (أحمد الصاوي المالكي) رحمه الله دەڵێت: «**ولا يجوز تقليد ما عدا المذاهب الأربعة، ولو وافق قول الصحابة والحديث الصحيح والآية، فالخارج عن المذاهب الأربعة ضال مضل، وربما أداه ذلك للكفر، لأن الأخذ بظواهر الكتاب والسنة من أصول الكفر**»[(٢)].

واته: دروست نییە دەرچوون لە هەرچوار مەزهەبەکە، گەر بێت و پێچەوانەی قورئان و سوننەت و قسەی هاوەڵانیشەوە بێت، دەرچوون لێیان گومڕا و گومڕاکەرە، بەڵکوو ئەبێتە کوفر، لەبەرئەوەی وەرگرتنی ڕووکەشی قورئان و فەرموودە لە بناغەکانی کوفرە.

ئەمانە هۆکاری نەمانی زانست و شوێنکەوتەی کوێرانەیە و لەکارخستنی دین و عەقڵە، وە بەسەرچاوەکردنی خەڵکە.

(ابن القيم) رحمه الله دەڵێت: «**قَالَ الشَّافِعِيُّ قَدَّسَ اللَّهُ تَعَالَى رُوحَهُ: أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَنَّ مَنْ اسْتَبَانَتْ لَهُ سُنَّةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ لَهُ أَنْ يَدَعَهَا لِقَوْلِ أَحَدٍ مِنْ النَّاسِ، قَالَ أَبُو عُمَرَ وَغَيْرُهُ مِنْ الْعُلَمَاءِ: أَجْمَعَ النَّاسُ عَلَى أَنَّ الْمُقَلِّدَ لَيْسَ مَعْدُودًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، وَأَنَّ الْعِلْمَ مَعْرِفَةُ الْحَقِّ بِدَلِيلِهِ، وَهَذَا كَمَا قَالَ أَبُو عُمَرَ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى: فَإِنَّ النَّاسَ لَا يَخْتَلِفُونَ أَنَّ الْعِلْمَ هُوَ الْمَعْرِفَةُ الْحَاصِلَةُ عَنْ الدَّلِيلِ، وَأَمَّا بِدُونِ الدَّلِيلِ فَإِنَّمَا هُوَ تَقْلِيدٌ**»[(٣)].

---

(١) "مغيث الخلق في ترجيح القول الحق" لأبي المعالي عبد الملك الجويني ص١٦.

(٢) "حاشية الصاوي على تفسير الجلالين" (٣/ ١٠) في تفسير سورة: [الكهف : ٢٣ - ٢٤].

(٣) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (١/ ٦).

واتە: ئیمامی (شافعی) ﷺ دەڵێت: کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە گەر سوننەتێکی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت بۆی نییە وازی لێبێنێت بۆ قسەی هیچ کەسێك لە خەڵکی، وە (أبو عمر ابن عبدالبر) و بێجگە لەو لە زانایان دەڵێن: کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کەوا موقەللید لە ئەهلی عیلم نییە، عیلم و زانست ناسینی حەق و بەڵگەیە، بەڵام بەبێ بەڵگەیی تەقلیدە، وە کوێرانە دواکەوتنە.

ئەم دواکەوتنی کوێرانەیە وەکوو (ئەهلی کیتاب) وان، خوای گەورە ﷻ پێیان دەفەرموێت: ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾﴾ [البَقَرَة : ٧٨].

الشَّيخ (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) ﷺ دەڵێت: « ﴿وَمِنْهُمْ﴾ أي: من أهل الكتاب، ﴿أُمِّيُّونَ﴾ أي: عوام، ليسوا من أهل العلم، ﴿لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ﴾ أي: ليس لهم حظ من كتاب الله إلا التلاوة فقط، وليس عندهم خبر بما عند الأولين الذين يعلمون حق المعرفة حالهم، وهؤلاء إنما معهم ظنون وتقاليد لأهل العلم منهم.

فذكر في هذه الآيات علماءهم، وعوامهم، ومنافقيهم، ومن لم ينافق منهم، فالعلماء منهم متمسكون بما هم عليه من الضلال، والعوام مقلدون لهم، لا بصيرة عندهم فلا مطمع لكم في الطائفتين»[(١)].

واتە: لە کەسانی (ئەهلی کیتاب)ن، کە نەخوێندەوارن و کەسانی خاوەن زانست نین، هیچ بەشێکیان لە فەرموودەی خوادا نییە بێجگە لە خوێندنەوە نەبێت، هیچ زانستێکی پێشوویان نییە لەسەر حەق، ئەوانە ئەوەی پێیانە یان گومانە یان تەقلیدی کوێرانەیە بۆ کەسانی خۆیان، ئەم ئایەتە باس لە زاناکانیان دەکات لەگەڵ خەڵکی گشتی و دووڕووەکانیان، زاناکانیان پەیوەستن بە گومڕاییەوەو نەخوێندەوارەکانیشیان دواکەوتەیانن و کوێرن، لەبەر ئەوە بە هیچ شێوەیەك شوێنی هیچ هیدایەتێك نین.

ئەوەتا زاناکانی گاوور و جوولەکە لە ڕیزی نەخوێندەوار و خەڵکی گشتیدا دادەنێت، بەهۆی نەزانینی زانست و حەقەوە، کەواتە بەناو زانایانی موقەللیدی موسوڵمانان لە ڕیزی بەناو زانایانی

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٥٦.

(ئەهلی کیتاب)دان، ئەمە هۆکاری گومڕایی گاوور و جوولەکە بوو، وە هەمان هۆکارە بۆ موسوڵمانان.

لە زووەوە وتراوە «يضيِّع الدنيا والآخرة رجلان: نصف طبيب، ونصف عالم، نصف طبيب يهلك الأبدان، ونصف عالم يضيع الأديان»[(١)].

واتە: هۆکاری لەناوبردنی دونیا و ئاخیرەت دوو کەسن: نیوە پزیشکێك و نیوە زانایەك، نیوە پزیشکەکە هۆکاری لەناوبردنی لاشەیە بە هەڵە، وە نیوە زاناکەش هۆکاری لەدەستدانی دینە.

### د. فەیلەسووفە مەنتیقییەکان:

ئەو قوتابخانە کەلامییانەن کە لەناو بازنەی ئیسلامدا دروست بوون، وەکوو: (موعتەزیلە، قەدەرییە، ئەشاعیرە، مورجیئە، ...) بەناوی پێشکەوتنێکی تەواو و ڕزگاربوون لە تەقلید و بەکارهێنانی عەقڵ و گەیشتنە بنج و بناوانەکان، هەستان بە شوێنکەوتنی بیروبۆچوونەکانی فەلاسیفەکانی یۆنان و ڕۆمان و کردنە یاسای بنەڕەتی بۆ تێگەیشتن لە هەموو بوارە دینییەکاندا.

بەهۆی گرنگیدان بە (فەلسەفە و مەنتیق)ەوە چەندەها فیرقە و کۆمەڵی جیاواز سەری هەڵدا، بەتایبەت لە سەرەتای سەردەمی عەباسییەکانەوە، بە دیاریکراوی سەردەمی (مأمون) جیهانی ئیسلامی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد، وە تەنانەت دەسەڵاتی سیاسییان گرتە دەست و ڕەواجێکی گەورەیان پێدا و بووە هۆکاری شێواندنی هەموو تێگەیشتنە دینییەکان، بەتایبەت بابەتە غەیبیەکان، وەکوو: (التوحيد، القضاء والقدر، الإيمان والكفر، العلم والعمل، ...).

ئەمە گەیشتە ئێمە کە پاشماوەی ئەورووپا بوو لە تێکدانی تێڕوانینە دینییەکانیاندا، وەك یەکێك لە توێژەرەوەکان دەڵێت: «يكاد يتفق مؤرخو الفلسفة على أن العلم لم ينهض في مطلع العصر الأوربي الحديث إلا بعد الثورة المزدوجة على السلطة العلمية ممثلة في المنطق الأرسطي، والسلطة الدينية ممثلة في رجال الكنيسة»[(٢)].

واتە: نزیکەی زۆرینەی نووسەرانی مێژووی فەلسەفە کۆدەنگن لەوەی زانستی پێشکەوتن لە ئەورووپادا سەری هەڵنەدا، بەڵکوو لەدوای دوو شۆڕشی تێکەڵ بەسەر دەسەڵاتی زانستی لە

---

(١) "شرح صحيح البخاري" لأبي اسحاق الحويني (٥/ ٢)، و "شرح سنن أبي داود" لعبد المحسن العباد (٥/ ٣٢٠).

(٢) "الغزو الفكري في المناهج الدراسية" لعلي لبن ص٤٢، و "مناهج البحث عند مفكري الإسلام" ص٩٠.

چوارچێوەی مەنتقی ئەرستۆدا و دەسەڵاتی دینی لە چوارچێوەی پیاوانی كەنیسەدا بوو.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لَا تَجِدُ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ حَقَّقَ عِلْمًا مِنْ الْعُلُومِ وَصَارَ إمَامًا فِيهِ مُسْتَعِينًا بِصِنَاعَةِ الْمَنْطِقِ لَا مِنْ الْعُلُومِ الدِّينِيَّةِ وَلَا غَيْرِهَا فَالْأَطِبَّاءُ والحساب وَالْكُتَّابُ وَنَحْوُهُمْ يُحَقِّقُونَ مَا يُحَقِّقُونَ مِنْ عُلُومِهِمْ وَصِنَاعَاتِهِمْ بِغَيْرِ صِنَاعَةِ الْمَنْطِقِ»[1].

واتە: ئێمە كەسمان نەبینیوە لەسەر زەوی زانستێك بەدەست بێنێت و ئیمام بێت تیایدا بە هۆكاری (منطق)ەوە، نە لە زانستە دینییەكاندا وە نە بێجگە لەوانیش، پزیشكەكان و ئەندازیارەكان وە بێجگە لەوانیش؛ ئەوەی بەدەستیان هێناوە لە زانستەكانیاندا بەهۆی (منطق)ەوە نەبووە.

بۆیە كاتێك لە سەردەمی (هارونە ڕەشید)دا داوای ئەو پەرتووكە فەلسەفییە مەنتیقییانە كرا لە مەلیكی ڕۆم، یەكێك لە قەشەكان وتی: «فما دخلت هذه العلوم على دولة شرعية إلا أفسدتها وأوقعت بين علمائها»[2].

واتە: ئەم زانستانە ناچێتە هیچ وڵاتێكی دامەزراوەیی دینییەوە بە دڵنیاییەوە دەیشێوێنێت، وە دووبەرەكایەتی و كاردانەوە لەناو زاناكانیاندا دروست دەكات.

قسەكەی زۆر ڕاست دەرچوو، لەدوای ئەوەی ئەم كتێبە (سۆفسەتیانە) كەوتە ناو جیهانی ئیسلامی و خوێندنەوەی لەسەر كرا و هەموو باسە دینییەكانی لەسەر پێناسە كرا، جۆراوجۆری بۆچوون بۆ هەموو بابەتەكان دروست بوو، دووبەرەكایەتی و جیاوازییەكی بێ ئەندازە باڵی بەسەردا كێشان، تا وای لێهات بیروڕا و بابەتە جێگیرەكانی دینیی ون بوون و هەر تاقمێك لەسەر بابەتێك دەدوا، پێناسە و بەرنامەی تێگەیشتنی جیاوازی هەبوو، هەریەكەی بە دیوێكدا، وەكوو (قدري ومجبرة)كان لەسەر: (القضاء والقدر)، وە (المعتزلة ومتأخرين الخوارج) لەسەر: (الإيمان والكفر)، وە (الجهمية والمشبه والمفوضة) لەسەر: (الأسماء والصفات)، وە (المرجئة) لەسەر: (الأعمال والإيمان)، وە (تصوف الفلسفي) لەسەر: (اللاهوت والناسوت) پێناسەی

---

(١) "نقض المنطق" ص١٦٨، و "مجموع الفتاوى" (٩/ ٢٣)

(٢) "صون المنطق والكلام" لجلال الدين السيوطي ص٦، ٧.

خالق و مەخلوق و وجوود، وە (الأشاعرة والماتوريدية) بە تێکەڵ لەسەر بابەتەکانی پێشوو، ئیتر با (إباضية) خەوارجەکان و فیرەقی شیعەکان وەکوو (إسماعيلية والباطنية والقرامطة)کان لەولاوە بووەستێ کە تێکەڵ لە هەموو دین و مەزاهیبەکانی سەر زەوین.

ئەمانە بە گشتی ئیمام و شوێنکەوتەی تەواویان بێجگە لە قورئان و فەرموودە بوو، ئەگەرچی هەمووی بە دوورونزیك خۆی بە هەڵگریان دەزانی، خۆ ئەگەر کێشانە بکرایە لەسەر بوونی بەڵگە و پەیوەستی تەواو پێوەی؛ دەبوو بە یەك لەسەر دە، باشترین بەڵگە جیهانی ئیسلامی ئێستا لە (العقيدة)دا نەوەد و هەشت لە سەدی لەسەر مەزهەبی (ئەشعەری) و (ماتۆریدی) تێکەڵ بە (موعتەزیلە)کانن، کراونەتە سەرچاوە و خوێندنی ئایینی، تەنانەت کاردانەوە و تێکەڵییان لەسەر زانستی شەرعی (علوم الشرعية) هەبووە، بەتایبەت (أصول الفقه).

مەفاهیمە دینییەکانی گێڕایەوە سەر ئەو (السفسطة والجدال الكلامية)یانە، کە تێکەڵکردن و لێکدانی قسەیە و بەس، بەبێ بنەما یەقینییەکان.

هەروەك مێژووی (فلسفة ومنطق) تۆماری کردووە کە قۆناغی یەکەمی فەلسەفە بریتییە لە (قسە کردنە بۆ سەرکەوتن، نکوڵیکردن لە بنەماکان، موناقەشەکردن لەسەر شتە ڕوونەکان)ە، حەق لای هەموو کەس ڕێژەیەکی خۆییە، هەموو کەس لە خۆیدا دەیبینێ، هەڵەش ئەستەمە تیایدا، لەبەرئەوەی ئادەمیزاد خۆی هەڵسەنگاندنی حەقە بۆ خۆی، گەر هەموو خەڵکیش بە پێچەوانەوە بوون، وە هەموو دژەکانیش حەقن ... .

بەم شێوەیە بوون تاوەکوو (سقراط) هات ڕێگەی (سەفسەتائی)یەکانی گۆڕی و بناغە و یاسای تازەی دانا بۆ وتوویژ و قسەکردن لەسەر بنەمای خوێندنەوەی پێشەکی و بیرورا بلاوەکان کە دەبنە هۆکاری بەرهەم و بە یارمەتیدانی نەیارەکان لە وتوویژدا تا گەیشتن بە حەقیقەتەکان.

پاشان (أفلاطون) قوتابی (سقراط) هات لەسەر ڕێگاکەی (سقراط) و زیاتر پەرەی پێدا، بەرەو مانا و پێناسە و دارِشتنەکان هەنگاوی نا و بواری تێکەڵکردن و هەڵەی کەمکردەوە، بەڵام (أفلاطون) دەڵێت گەیشتن بە جیهانی ڕاستی (عالم الحقائق) بە گەیشتن بە جیهانی هاوشێوە (عالم المثل)؛ بە ڕێگەی بەکارهێنانی خەیاڵ و نهێنی دەبێت، نەك ئەم جیهانە مادییە هەستپێکراوە

کە شەبەح و تارمایی ناحەقیقەتە، بەڵکوو ئەم جیهانە شێواز و ڕەنگدانەوەی ئەو جیهانە خەیاڵییە ڕاستییە هاوشێوەیەیە.

پاش ئەم (أرسطو)ی قوتابی (أفلاطون) هات هەموو یاسا و ڕێسا و توێژینەوە مەنتیقییەکانی زیاتر بۆ دارِشت و خزمەتی کرد[١].

ئەمە قۆناغەکانی فەلسەفە و مەنتیقییەکانە لەسەر دەستی بناغە دانەرەکانی، کە سەرەتاکەی باوەڕنەبوون بوو بە بوون و حەقیقەتەکان و کۆتا قۆناغیشی کەوتنە ناو جیهانی خەیاڵات و بلاّوی عەقڵ و تەسەورات و بۆچوونی نهێنی بێ بنەما بوو، کۆتاییەکەی سەرلەنوێ باوەڕنەبوون بووە بە دونیا و هەموو حەقیقەتەکان و بوونەکان.

بۆیە (أبو القاسم السهيلي وأبو بكر العربي المالكي) دەڵێن: «نَعُوذُ بِاَللَّهِ مِنْ قِيَاسٍ فَلْسَفِيٍّ وَخَيَالٍ صُوفِيٍّ»[٢].

واتە: پەنا ئەگرین بە خوا لە ئەندازەگیری فەلسەفی و خەیاڵاتی سۆفیگەری.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «الَّذينَ عَظَمُوا فَلاَسِفَةَ الْيونَان كَأَرِسْطو وَأَمْثَالُه، وَقَلَّدُوهُم فِي مَنْطِقِهِمْ، وَعَارَضُوا الْكِتَابَ وَالسُّنَّة بِأَقْوَالِهِمْ، وَالْعَجِيبُ أَنَّهُمْ يَنْهَوْنَ الْعَامَّةَ عَنْ تَقْلِيدِ الرُّسُلِ فِيمَا أَخْبَرَتْ بِهِ مِنْ صِفَاتِ اللَّهِ تَعَالَى؛ لِزَعْمِهِمْ أَنَّ الْعَقْلَ عَارَضَهَا؛ مَعَ الْجَزْمِ بِأَنَّ الرُّسُلَ لَا تَقُولُ إلَّا حَقًّا. وَهُمْ يُقَلِّدُونَ رُءُوسَهُمْ فِي مُعَارَضَةِ ذَلِكَ بِمُقَدِّمَاتِ يَزْعُمُونَهَا عَقْلِيَّاتٍ وَأَتْبَاعُهُمْ لَمْ تَجْزِمْ بِهَا عُقُولُهُمْ لَكِنَّهُمْ يُقَلِّدُونَ رُءُوسَهُمْ فِيهَا»[٣].

واتە: ئەوانەی فەیلەسوفەکانی یۆنانیان بە گەورە دادەنا وەکوو (ئەرستۆ) و هاوشێوەکانی و کوێرانە دوایان کەوتن و دژایەتی ئایەت و فەرموودەیان پێ کرد، وە سەرسامی لەوەدایە ئەوان ڕێگرن لە شوێنکەوتەی پێغەمبەران عليهم السلام، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان شوێنکەوتەی سەرانیانن، لە

---

(١) "منهج الإستدلال على مسائل الإعتقاد عند أهل السنة والجماعة" لعثمان بن علي حسن (٢/ ٦٠٢) رسالة ماجستير، جامعة بن سعود – رياض.

(٢) "الرد على المنطقين" لابن تيمية ص٤٨٢، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ٤٩١).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ٢٨٩).

پێچەوانەیەتی بەرنامەی پێغەمبەران بە کۆمەڵێ تێڕوانینی عەقڵی لەگەڵ پێچەوانەیەتی عەقڵیان بۆی، بەڵام کوێرانە هەر دواکەوتەیانن.

## ٢. کەشف و ئیلهامات و دەرکپێکردنە غەیبییەکان.

دەقەکانی (وەحی) لای سۆفییەکان هۆکارێکە بۆ زانینە شەرعییەکان، بەڵام ئەو دەقانە مانای ڕووکەش و ناوەڕۆکی جیاواز لە ڕووکەشیان هەیە، بێگومان ئەو مانا ناوەڕۆکانەی کە پشتگیری لە بیر و کارەکانیان دەکات، وە گەر نا ئەوا ئەو دەقانە مانای تری بۆ دەدۆزرێتەوە، واتە دەقەکانی (وەحی) بڕیار نین، بەڵکوو پشتیوانن، یاسا نین، بەڵکوو یاسا بەسەرا دارێژراون.

بۆیە کەشف و ئیلهامەکانیان ئەو مانا ناوەڕۆك و یاسایانەن کە دەبنە بەڵگە و یەقینیات و مەعریفەی تەواو، ئەم ڕێگایە بووە بە بەڵگە و زانستی شەرعی بۆیان، (تواناکاری نییە بۆ فێربوونی و شەرحی و بەڵگەهێنانەوە لەسەری، بەڵکوو توانینی فێربوونی بە هۆکار و بەرنامە و یاساکانییەوەیە بۆ کەسی خۆی تا دەگاتە مەبەست، ئەمە خاڵی جیاکەرەوەی سۆفییەکانە لە مەعریفەتدا لە ڕێگاکانی تر، واتە هۆکاری زانستیانەی نییە بۆ گەیاندن بە کەسانی تر، بەڵکوو بەرنامەیەکی تایبەتە بە خاوەن مەبەست)[1].

یەقین لای (سهروردي) سێ پلەیە:

الأولى: علم اليقين: وهو ما كان من طريق النظر والاستدلال.

الثانية: عين اليقين: وهو ما كان من طريق الكشف.

الثالثة: حق اليقين: وهو مشاهدة الغيوب مشاهدة المرئيات[2].

واتە: پلەی یەکەم: زانستی یەقین: ئەمە بە ڕێگەی تێڕوانین و بەڵگە هێنانەوەیە.

پلەی دووەم: بینینی یەقین: ئەمە بە ڕێگای کەشف و ئیلهاماتە.

پلەی سێیەم: حەقی یەقین: بینینی غەیب و نادیارەکان وەکوو بینینی دیارەکان.

---

(١) "منهج الإستدلال على مسائل الإعتقاد عند أهل السنة والجماعة" لعثمان بن علي حسن (٢/ ٦٤١)، و "المعرفة عند مفكري المسلمين" لدكتور محمد غلاب ص٨٩.

(٢) "عوارف المعارف" للسهروردي (٢/ ٥٨٩)، و "منهج الإستدلال على مسائل الإعتقاد عند أهل السنة والجماعة" لعثمان بن علي حسن (٢/ ٦٤٢).

قۆناغی دووەم و سێ یەم قۆناغی بەڵگە و زانستە شەرعییەکانیانە، (بەڵکوو زانستە عەقڵی و شەرعییەکان بەربەست و ڕێگرن لەڕێی خاوەن مەبەستی ئەم ڕێگایە، دەبێت تێیان پەڕێنێت، ڕێگەی ڕیوایەتی فەرموودەکان گومانە، ڕێگە مەعریفە و تەواو کەشف و بینین و ئیلهامە)[(١)].

(أبو حامد الغزالي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «أن الطريق إلى هذه الغاية لا يكون عن طريق تحصيل العلم والنظر في المصنفات والبحث عن الأقاويل والأدلة المذكورة، بل عن طريق المجاهدة ومحو الصفات المذمومة وقطع العلائق ... والزهد في الدنيا ... وبقطع الهمة عن الأهل والمال والولد والوطن وعن العلم والولاية ... ثم يخلو بنفسه في زواية مع الاقتصار على الفرائض والرواتب ويجلس فارغ القلب مجموع الهم ولا يفرق فكره بقراءة قرآن ولا بالتأمل في تفسير ولا بكتب حديث ولا غيره ... فلا يزال بعد جلوسه في الخلوة ... (والخلوة لايكون إلا في بيت مظلم فإن لم يجد ألقى ألقى برأسه في جيبه ... مثل هذه الحالة يسمع نداء الحق ويشاهد جلال الحضرة الربوبية) ... قائلاً بلسانه الله على الدوام»[(٢)].

واتە: ڕێگا بۆ گەیشتن بەم مەبەستە (کەشف و ئیلهام)، بە ڕێگەی بەدەستهێنانی زانست و تێڕوانین لە نووسراوەکان و قسە و بەڵگەکان نییە، بەڵکوو بە ڕێگەی پاککردنەوەی دەروون و هەوڵدانی سڕینەوەی خراپەکان و لابردنی ڕێگرەکان و دوورکەوتنەوە لە دونیارو ماڵ و منداڵ و کەس و زانست و دەسەڵاتە ... پاشان گۆشەگیری بەتەنیا لە سووچێکدا مانەوە و کورتکردنەوە لەسەر فەرز و سوننەتەکان و دانیشتن بە دڵێکی بەتاڵ و بیر و هۆشدار، وە نابێت بیری دوورخاتەوە بە خوێندنی قورئان و تێڕوانینی تەفسیر و نووسینی فەرموودە و شتی تر، بەردەوام پەیوەست بێت بەم چۆڵییەوە و بە زمان بڵێت (الله، الله)، وە ئەم چۆڵییە دەبێت لە ماڵێکی تاریکدا بێت، گەر نا ئەوا با سەری بخاتە ناو جلەکانی و ... لەم حاڵەتەدا دەگاتە ئەوەی حەق ببیستێت و بە خزمەتی گەورەی بگات، وەکوو پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە پێی گەیی، وەکوو: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١﴾ [المزمل: ١]، وە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١﴾ [المدثر: ١].

---

(١) "مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين" لابن القيم الجوزي (٣/ ١٦٥).

(٢) "إحياء علوم الدين" (٣/ ١٩، ٧٦).

ئەمە خۆخستنە ڕیزی پێغەمبەرەوە ﷺ نییە کە بیەوێ وەکوو ئەو وەحی بۆ بێت؟! بەڵام ئەم ناوی دەنێت (کەشف و ئیلهام)، بۆیە دەڵێت: «فالأنبياء والأولياء انكشف لهم الأمر وفاض على صدورهم النور لا بالتعلم والدراسة والكتابة للكتب بل بالزهد في الدنيا ...»[١].

واتە: پێغەمبەران و ئەولیاکان هەموو کارەکانیان زانیوە و بەرچاو ڕۆشن بوون و نوور باریوە بەسەر سنگیاندا، بە فێربوونی زانست و نووسینەوە و فێربوونی کتێب نەبوو، بەڵکوو بە دەستبەردان بوو لە دونیا و ... .

(ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «هذا الكلام مضمونه أنه لا يستفاد من خبر الرسول صلى الله عليه وسلم شيء من الأمور العلمية، بل إنما يدرك ذلك كل إنسان بما حصل له من المشاهدة والنور والمكاشفة. وهذان أصلان للإلحاد»[٢]. وە دەڵێت: «وغاية هؤلاء الشطح وهو التصديق بالباطل»[٣].

واتە: ئەم قسانە ئەوە لەخۆ دەگرێت کە سوود لە ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ نابینرێت لە هیچ کارێکی دینیدا، بەڵکوو هەموو ئادەمیزاد ئەو زانستانە بەدەست دێنێت بە ڕێگەی بینین و نوور و کەشف، ئەم دوانە (لادان و کارنەکردن بە هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ و کارکردن بە کەشف و ئیلهام) دوو بناغەی بێبڕوایین. وە کۆتا کاری ئەمانە ڕێلێتێکچوون و تێکەڵکردنە، ئەویش باوەڕ بوونە بە بەتاڵ.

وەکوو (القشيري) دەڵێت: «واعلم أَن، أجل الكرامات الَّتِي تكون للأولياء: دوام التوفيق للطاعات، والعصمة عَنِ المعاصي والمخالفات»[٤].

واتە: بەرێزترین کەرامات بۆ ئەولیاکانی خوا بەردەوامییەتە لەسەر عیبادەت و پارێزراوییە لە تاوان و سەرپێچی.

---

(١) "إحياء علوم الدين" للغزالي (٣/ ١٩).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٥/ ٣٤٨).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٥/ ٣٤٦).

(٤) "الرسالة القشيرية" (٢/ ٥٢٦).

(سهروردي) دەڵێت: «و من الخواطر ما هي رسول اللهّ تعالى إلى العبد كما قال بعضهم: لي قلب إن عصيته عصيت اللهّ»[١].

واتە: هەندێك پێگەیشتنی دڵییان هەیە لە لایەنی خواییەوە بۆ بەندەکەی، وەکوو هەندێکیان وتویانە (دڵێکم هەیە گەر بێفەرمانی بکەم؛ بێفەرمانی خوام کردووە).

(ابن حجر) ﷬ دەڵێت: «فَمَنْ ظَنَّ أَنَّهُ يَكْتَفِي بِمَا يَقَعُ فِي خَاطِرِهِ عَمَّا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ فَقَدِ ارْتَكَبَ أَعْظَمَ الْخَطَإِ وَأَمَّا مَنْ بَالَغَ مِنْهُمْ فَقَالَ حَدَّثَنِي قَلْبِي عَنْ رَبِّي فَإِنَّهُ أَشَدُّ خَطَأً فَإِنَّهُ لَا يَأْمَنُ أَنْ يَكُونَ قَلْبُهُ إِنَّمَا حَدَّثَهُ عَنِ الشَّيْطَانِ»[٢].

واتە: ئەوەی گومان ببات بەوەی کە دەکەوێتە دڵییەوە بەسیەتی و پێویستی بەوە نابێت کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی؛ ئەوە گەورەترین هەڵە دەکات، وە ئەوەی زیادەڕەوی دەکات لێیان و دەڵێت: دڵم لە خواوە بۆم دەگێڕێتەوە؛ ئەوە خراپترین هەڵەیە، لەبەر ئەوەی متمانە نییە دڵی لە شەیتانەوە نەگێڕێتەوە.

وە (الحکیم الترمذي) ﷬ دەڵێت: «فکما أن النبوة محفوظة من القاء الشیطان کذلك محل المکالمة والمحادثة محفوظ من القاء النفس وفتنتها»[٣].

واتە: هەروەکوو چۆن پێغەمبەرایەتی پارێزراوە لە پێگەیشتنی شەیتان، بەو شێوەیەش شوێنی قسە لەگەڵکردن و وتووێژ (دڵی وەلییە) پارێزراوە لە هەواو ئارەزووی نەفس و فیتنەکانی.

ئەگەر ئەولیاکان (معصوم) بن ئەوا پێغەمبەرایەتییە، وەکوو (ابن العربي الحلاج) دەڵێت: «وأما النبوة العامة فأجزاؤها لا تنحصر ولا یضبطها عدد فإنها غیر مؤقتة لها الاستمرار دائماً دنیا وآخرة، وهذه مسئلة أغفلها أهل طریقنا فلا أدري عن قصد منهم کان ذلك أو لم یوقفهم الله علیها أو ذکروها وما وصل ذلك الذکر إلینا والله أعلم بما هو الأمر علیه، ولقد حدثني أبو

---

(١) "عوارف المعارف" للسهروردي (٢/ ٥١٣).

(٢) "فتح الباري" (١١/ ٣٤٥).

(٣) "عوارف المعارف" للحکیم الترمذي ص٣٢٢.

**البدر التماشكي البغدادي رحمة الله عن الشيخ بشير من ساداتنا بباب الأزج عن امام العصر عبد القادر أنه قال: معاشر الأنبياء أوتيتم اللقب وأوتينا ما لم تؤتوا»[(١)].**

**واته: لە وەڵامی پرسیاری (٨٣) دا دەڵێت: پێغەمبەرایەتی دوو جۆرە: پێغەمبەر واتە شەریعەت و پێغەمبەرایەتی گشتی، وە ئەمەش بەشەکانی زۆرە بە ژماردن دیاری ناکرێت، وە کاتی دیاریکراوی بۆ نییە، بەردەوامە بە بەردەوامی دونیا و ئاخیرەت، وەکوو بۆیان گێڕاومەتەوە لە ئیمامی سەردەمەوە (شێخ عبد القادری گەیلانی) کە دەڵێت: پێغەمبەران ناویان پێدراوە کە پێیان دەڵێن (پێغەمبەر)، بەڵام ئەوەی بە ئێمە دراوە بەوان نەدراوە کە ئیلهام و کەشفی بەردەوامە.**

(أبو يزيد البسطامي) **دەڵێت: «وخضنا بحرا وقفت الأنبياء بساحله»[(٢)].**

**واتە: لە دەریایەکمان پێدراوە پێغەمبەران لە قەراغیدا وەستاون.**

**وە تەنانەت باوەڕیان بە میعراجی دڵییان هەیە بۆ لای خوا، وەکوو** (سهروردي) **باسی دەکات[(٣)]، وە یەکەم کەس ئەوەی دراوەتە پاڵ** (أبو يزيد البسطامي)**ە[(٤)]، وە** (عبدالكريم الجيلي) **لە نەوەی (شێخ عبد القادری گەیلانی) باس لەوە دەکات، وە کۆبووەتەوە لەگەڵ هەموو پێغەمبەران و فریشتەکان، وە کەشفی هەموو حەقیقەتەکانی کردووە لە کاتی میعراجی دڵیاندا[(٥)].**

**وە باوەڕیان وایە دین بریتییە لە شەریعەت و حەقیقەت، وە حەقیقەت گەورەترین کامڵبوون و کۆتا گەیشتنەکانی تەسەوفە، ئەویش بریتییە لە دەرککردن بە بەڕێوەبردنەکانی خوایی لە کەوندا، شەریعەت بە ڕێگەی پێغەمبەرانە، کردنی کارەکانە و پەرستنی خوایە، وە حەقیقەتیش نزیکبوونەوەیە بەبێ هۆکار و بینینی کردارەکانە، بگرە شەریعەت ڕێگای تەریقەت و حەقیقەتە[(٦)].**

---

(١) "الفتوحات المكية" لابن العربي (٣/ ٧٩).

(٢) "الفتوحات الإلهية في شرح المباحث الأصلية" لابن عجيبة الحسني ص٢٦١، و "الفكر الصوفي في ضوء الكتاب والسنة" لعبد الرحمن بن عبد الخالق اليوسف ص٣٨.

(٣) "مدارج السالكين" لابن القيم (٣/ ٣٢٢).

(٤) "الفكر الصوفي في ضوء الكتاب والسنة" لعبد الرحمن بن عبد الخالق اليوسف ص٢٠١.

(٥) "الإنسان الكامل" لعبدالكريم الجيلي (٢/ ٦٥).

(٦) "جامع الأصول" للنقشبندي ص٤٢.

وە ئەم حەقیقەتە کێشانەیە بۆ تێگەیشتن لە دین و یاساکانی، (غەزالی) لە بابەتە عەقیدەییەکاندا و تێگەیشتن لێی دەڵێت: «لا يطلع عليه إلا الموفقون الذين يدركون الأمور بنور إلهي لا بالسماع ثم إذا انكشفت لهم أسرار الأمور على ما هي عليه نظروا إلى السمع والألفاظ الواردة فما وافق ما شاهدوه بنور اليقين قرروه وما خالف أولوه»[1].

واتە: کەس دەرکیان پێ ناکات بێجگە لە یارمەتی دراوەکان نەبێت، کە دەرك بە بابەتەکان دەکەن بە نووری خوایی، نەك بە بیستراوەکان (قورئان و فەرموودە)، وە گەر تەواو بوون لە کەشف و ئیلهامات ئەوا بۆ ڕوونبوونەوەی نهێنی بابەتەکانیان سەیری (قورئان و فەرموودە) دەکەن، وە داڕێژراوەکانیان لەسەری گەر گونجا لەگەڵ بینین و دەرك پێکردنەکانیاندا (الکشف والالهامات)؛ وەری دەگرن و بڕیاری لەسەر دەدەن، وە گەر نەگونجا ئیلهاماتەکانیان ماناکەی بۆ دەگۆڕن و تەئویل دەکەن.

وە دەڵێن: «مَنْ أَرَادَ التَّحْقِيقَ - يَعْنِي تَحْقِيقَهُمْ - فَلْيَتْرُكْ الْعَقْلَ وَالشَّرْعَ»[2].

واتە: ئەوەی دەیەوێت بگاتە حەقیقەت با واز لە عەقڵ و شەرع بێنێت.

بەم شێوەیە حەقیقەت کاملترە تا شەریعەت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەوا پەیوەستنەبوون بە پێغەمبەران و دەرچوون لە شەریعەتەکەیان دروستە، وەك (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَإِنَّ مِنْ هَؤُلَاءِ مَنْ يَظُنُّ: أَنَّ مِنْ الْأَوْلِيَاءِ مَنْ يَسُوغُ لَهُ الْخُرُوجُ عَنْ الشَّرِيعَةِ النَّبَوِيَّةِ كَمَا سَاغَ لِلْخَضِرِ الْخُرُوجُ عَنْ مُتَابَعَةِ مُوسَى وَأَنَّهُ قَدْ يَكُونُ لِلْوَلِيِّ فِي الْمُكَاشَفَةِ وَالْمُخَاطَبَةِ مَا يَسْتَغْنِي بِهِ عَنْ مُتَابَعَةِ الرَّسُولِ فِي عُمُومِ أَحْوَالِهِ أَوْ بَعْضِهَا وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ يُفَضِّلُ الْوَلِيَّ فِي زَعْمِهِ إمَّا مُطْلَقًا وَإِمَّا مِنْ بَعْضِ الْوُجُوهِ عَلَى النَّبِيِّ زَاعِمِينَ أَنَّ فِي قِصَّةِ الْخَضِرِ حُجَّةٌ لَهُمْ وَكُلُّ هَذِهِ الْمَقَالَاتِ مِنْ أَعْظَمِ الْجَهَالَاتِ وَالضَّلَالَاتِ؛ بَلْ مِنْ أَعْظَمِ أَنْوَاعِ النِّفَاقِ وَالْإِلْحَادِ وَالْكُفْرِ»[3].

---

(١) "إحياء علوم الدين" للغزالي (١/ ١٠٤).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٢٤٣).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٤٢٢).

واته: لەمانه هەیانه گومان دەبات که وەلی بۆی هەیه دەرچێت له شەریعەتی پێغەمبەرایەتی، وەکوو چۆن (خضر) عليه السلام له شەریعەتی موسا دەرچووە، وە هەیانه پلەی وەلی به تەواوی یاخود له هەندێك ڕووەوە به گەورەتر دادەنێ تا پێغەمبەران، وەلی ئەوەندە ئیلهام و کەشفی هەیه که پێویستی به شوێنکەوتەیی پێغەمبەران نەبێت لە هەموو کاتێکدا، ئەم قسانە هەمووی گەورەترین دووڕوویی و دەرچوون و کوفرە لە ئیسلامدا.

وە ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «يَعْتَمِدُونَ فِي كَثِيرٍ مِنَ الْأَحْكَامِ عَلَى الْكَشْفِ وَالْمُعَايَنَةِ، وَخَرْقِ الْعَادَةِ، فَيَحْكُمُونَ بِالْحِلِّ والحرمة، ويبنون عَلَى ذَلِكَ الْإِقْدَامَ وَالْإِحْجَامَ، كَمَا يُحْكَى عَنِ المحاسبي أنه كان إذا تناول طعاماً فيه شُبْهَةٍ يَنْبِضُ لَهُ عِرْقٌ فِي إِصْبَعِهِ فَيَمْتَنِعُ مِنْهُ.

وَقَالَ الشِّبْلِيُّ: (اعْتَقَدْتُ وَقْتًا أَنْ لَا آكُلَ إِلَّا مِنْ حَلَالٍ، فَكُنْتُ أَدُورُ فِي الْبَرَارِيِّ، فَرَأَيْتُ شَجَرَةَ تِينٍ، فَمَدَدْتُ يَدَيْ إِلَيْهَا لِآكُلَ، فَنَادَتْنِي الشَّجَرَةُ: احْفَظْ عَلَيْكَ عَهْدَكَ، لَا تَأْكُلْ مِنِّي فَإِنِّي لِيَهُودِيٍّ.

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ الْخَوَّاصُ رحمه الله: (دَخَلْتُ خَرِبَةً فِي بَعْضِ الْأَسْفَارِ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ بِاللَّيْلِ، فَإِذَا فِيهَا سَبُعٌ عَظِيمٌ، فَخِفْتُ، فَهَتَفَ بِي هَاتِفٌ اثْبُتْ، فَإِنَّ حَوْلَكَ سَبْعِينَ أَلْفَ مَلِكٍ يَحْفَظُونَكَ).

فَمِثْلُ هَذِهِ الْأَشْيَاءِ إِذَا عُرِضَتْ عَلَى قَوَاعِدِ الشَّرِيعَةِ ظَهَرَ عَدَمُ الْبِنَاءِ عَلَيْهَا، ... لَا يَدُلُّ عَلَى التَّحْلِيلِ وَلَا التحريم، ... كُلُّ مَا عَمِلَ بِهِ الْمُتَصَوِّفَةُ الْمُعْتَبَرُونَ فِي هَذَا الشَّأْنِ لَا يَخْلُو ... فَإِنْ كَانَ لَهُ أَصْلٌ فَهُمْ خُلَقَاءُ بِهِ، ... وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ أَصْلٌ فِي الشَّرِيعَةِ فَلَا عَمَلَ عَلَيْهِ، لِأَنَّ السُّنَّةَ حُجَّةٌ عَلَى جَمِيعِ الْأُمَّةِ، وَلَيْسَ عَمَلُ أَحَدٍ مِنَ الْأُمَّةِ حُجَّةً عَلَى السُّنَّةِ، لِأَنَّ السُّنَّةَ مَعْصُومَةٌ عَنِ الْخَطَأِ، وَصَاحِبَهَا مَعْصُومٌ، وَسَائِرُ الْأُمَّةِ لَمْ تَثْبُتْ لَهُمْ عِصْمَةٌ ... فَالصُّوفِيَّةُ كَغَيْرِهِمْ مِمَّنْ لَمْ تَثْبُتْ لَهُ الْعِصْمَةُ، ... بَلْ نَعْرِضُ مَا جَاءَ عَنِ الْأَئِمَّةِ عَلَى الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، فَمَا قَبِلَاهُ قَبِلْنَاهُ، وَمَا لَمْ يَقْبَلَاهُ تَرَكْنَاهُ»[1].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٣٥٤ – ٣٦٣).

واتە: لە زۆری کارەکاندا پشت دەبەستن بە کەشف و ئیلهام و حوکمی حەڵاڵ و حەرام دەدەن بەسەریاندا، کردن و نەکردن بەگوێرەی ئەوە ئەنجام دەدەن، وەکوو (محاسبي) کە هەر خواردنێك گومانی تێدا بوایە دەستی بۆ ببردایە دەستی عەرەقی دەکرد، ئەوکات نەیدەخوارد، وەکوو قسەکردنی درەختێك بۆ (شبلي) وتی مەمخۆ من ماڵی جولەکەیەکم، وە (إبراهيم الخواص) کاتێك دڕندەی بینی ترسا و بانگی لێ کرا مەترسە حەفتا هەزار فریشتە دەتپارێزێ.

هاوشێوەی ئەمانە بدرێتە بەر شەریعەت هیچ بنەمایەکی نییە، ئەمانە بەڵگە نین لەسەر حەڵاڵ و حەرامی، هەموو کارەکانی سۆفی یا ئەوەتا بنەمای شەرعی هەیە ئەوە کاری پێ دەکرێت، وە گەر نا ئەوە کاری پێ ناکرێت، لەبەر ئەوە سوننەت بەڵگەیە لەسەر موسوڵمانان، کاری هیچ کەسێك بەڵگە نییە لەسەر سوننەت، سوننەت خۆی و خاوەنەکەشی پارێزراو (معصوم)ن لە هەڵە، هیچ کەس لە موسوڵمانان (معصوم) نین، سۆفییەکانیش وەکوو هەموو ئوممەت ... هەرچی لە ئیمامانەوە دەردەچێت دەخرێتە بەر قورئان و فەرمووده؛ پێکایان ئەوا وەری دەگرین، گەر نەیان پێکا وەری ناگرین.

وە شەرعی خواش دادوەر و پێوانەیە، (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَكُلَّمَا قَوِيَ الْإِيمَانُ فِي الْقَلْبِ قَوِيَ انْكِشَافُ الْأُمُورِ لَهُ؛ وَعَرَفَ حَقَائِقَهَا مِنْ بَوَاطِلِهَا»[(١)].

واتە: تا ئیمان بەهێز بێت لە دڵدا زیاتر چاوڕۆشنی بۆ دروست دەبێت لە کارەکاندا، وە باشتر حەق و بەتاڵی بۆ جیا دەبێتەوە.

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَقَالَ أَبُو عُثْمَانَ النَّيْسَابُورِيُّ مَنْ أَمَّرَ السُّنَّةَ عَلَى نَفْسِهِ قَوْلًا وَفِعْلًا نَطَقَ بِالْحِكْمَةِ وَمَنْ أَمَّرَ الْهَوَى عَلَى نَفْسِهِ قَوْلًا وَفِعْلًا نَطَقَ بِالْبِدْعَةِ»[(٢)].

واتە: (ئەبو عوسمانی نەیسابوری) دەڵێت: هەرکەسێك سوننەت جێبەجێ بکات و پەیوەست بێت پێوەی؛ هەموو وتەکانی حیکمەت دەبێت، وە ئەوەی هەواو ئارەزووەکانی جێبەجێ بکات ئەوا وتەکانی بیدعە دەبێت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/ ٤٥).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٢١٠)، و "الجامع لأخلاق الراوي" للخطيب البغدادي (١/ ٨٠).

گەورەترین ڕێگەی بەدیهێنانی کەرامات بەدیهێنانی تەواوی شوێنکەوتەی سوننەتە، بە ڕووکەش و ناوەڕۆکەوە[١].

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «قَالَ أَبُو عَلِيٍّ الجوزجاني: كُنْ طَالِبًا لِلاسْتِقَامَةِ لَا طَالِبًا لِلْكَرَامَةِ. فَإِنَّ نَفْسَك منجبلة عَلَى طَلَبِ الْكَرَامَةِ وَرَبُّك يَطْلُبُ مِنْك الِاسْتِقَامَةَ»[٢].

واتە: (ئەبو عەلی جوزجانی) دەڵێت: هەوڵی بەدەستهێنانی بەردەوامی و مانەوە بدە لەسەر ڕێگاکەی خوا، نەك هەوڵی بەدەستهێنانی کەرامات، نەفست داوای بەدیهێنانی کەرامات دەکات، وە خوای پەروەردگاریشت داوای مانەوە و بەردەوامی سەر ڕێگاکەیت لێ دەکات.

* مەرجی وەلییەکان مەعصومیەت نییە کە هەڵە نەکەن، بەڵکوو هەرکەس کە خاوەنی ئیلهام و کەشفە لە خوار پلەی ئیمامی (عومەر)ەوەیە، کە ئەو بە فەرموودە خاوەن ئیلهام (مُحدِث)ی ئەم ئومەتەیە، لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەپێکا، (ئەبوبەکری صدیق) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ چەند کارێکی شاراوەی بۆ ئیمامی (عومەر) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ ڕوون دەکردەوە ئەویش دەگەڕایەوە سەری، وەکوو لە (صلح الحديبية)دا ڕێنمونی کرد، وە لە ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەری خوادا ﷺ، وە لە ڕۆژی شەڕکردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا ... کەواتە (صديق) بەڕێزتر و کامڵترە لە شوێنکەوتەی خواو پێغەمبەردا ﷺ تاوەکوو خاوەن ئیلهام[٣].

## ٣. عەقڵ و گومانەکان.

ئیسلام ڕێزو مافی خۆی بە عەقڵ بەخشیوە، لەوەی هەموو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی لەسەر بوونی عەقڵ داناوە، وە بە بوونی عەقڵ پایە بەرزی کردووە بەسەر بوونەکانی چواردەوریدا، داوای لێکردووە بە بیرکردنەوەو تێڕوانین، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ٢٩﴾ [ص: ٢٩]، ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ﴾ [النساء: ٨٢]، ﴿وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ١٩٧﴾ [البقرة: ١٩٧].

وە سوودمەندیەکانی بیرخستنەوە و پەند وەرگرتنی پەیوەست کردووە بە خاوەن عەقڵەکانەوە،

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٧٧).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٣٢٠)، و "شرح العقيدة الطحاوية" لأبي العز الحنفي ص٤٩٦.

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٤/ ٣٧٧).

وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٣٥﴾ [العنكبوت : ٣٥].

وە بە خراپ ناوی ئەوانەی بردووە کە بەکاری ناهێنن و دواکەوتنی کوێرانە دەکەن، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ١٧٠﴾ [البقرة : ١٧٠].

وە هەموو هۆکارەکانی لەکارخستن و کەمکردنەوە و تێکدانی عەقڵی حەرام کردووە، وەکوو عەرەق و سیحر و فێڵ و درۆ ...، وە یەکێکە لە پێنج پێویستییەکان (ضروريات الخمس)، کە ئیسلام بۆ پاراستنی هاتووە، وە تەنانەت کەسێك لە سەری یەکێك بدات و هەموو عەقڵی لەدەست بچێت دەبێت هەموو خوێنەکەی بدات[1]، خۆ گەر عەقڵ نەبێت ئەوا گوێ و چاو و زمان ... پارچە گۆشتێکی بێسوودن: ﴿صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ١٧١﴾ [البقرة : ١٧١]، کەواتە خراپترین بوون لە ئادەمیزاددا بەکارنەهێنەری عەقڵە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ٢٢﴾ [الأنفال : ٢٢]، وە سزای بەکارنەهێنانیشی دەچێژن: ﴿وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ١٠﴾ [الملك : ١٠].

لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام سنووری کارکردنی بۆ عەقڵ دیاری کردووە، لەبەر ئەوەی وەکوو هەموو پارچەکانی تر توانای دیاریکراوە و داوای زیاتری لێ ناکرێت، ئایا داوا لە چاو دەکرێت کە هەموو بوونەکان ببینێت؟! یاخود داوا لە گوێ دەکرێت هەموو دەنگەکان ببیستێت؟! یاخود داوا لە دەست دەکرێت شاخ هەڵبگرێت؟! وە یاخود لە قاچ داوا دەکرێت تەلارە بەرزەکان بڕوخێنێت؟! وە یاخود لە لوت و زمان کە هەموو بۆنەکان و تامەکان بچەشن[2]؟!

وە داوا لە عەقڵیش ناکرێت هەموو بوونەکان بزانێت، سەرچاوەی عەقڵیش هەر پێنج هەستەکانە، لە سنووریان دەرچێت دەوەستێت[3]، گەرچی عەقڵیش دوو بەشە: «وَالْعقل نَوْعَانِ غريزي واكتسابي، فالغريزي مَا يكون مَوْجُودا مَعَ الْمَوْلُود كعقله للارتضاع ... ثمَّ يكْتَسب

---

(١) "المغني" لابن قدامة (٨/ ٤٦٥).

(٢) "العقلانيون" لعلي الحلبي ص٣٨.

(٣) "منهج الاستدلال" لسعود بن سعد (١/ ١٧٥).

الصَّبِي زِيَادَة فِي الْعقل عَلَى مُرُور الْأَيَّام إِلَى أَن يبلغ أَرْبَعِينَ سنة، ... ومنتهى تعلم الْعلم يَنْتَهِي الْعُمر، ... أَن الْعَاقِل إِذا جن ذهب عَنهُ الْعقل الاكتسابي ... وَيَبْقَى مَعَه الْعقل الغريزي يفعل مَا يَفْعَله الصَّبِي»(١).

واتە: عەقڵ دوو جۆرە: غەریزی و بەدەستهێنان، غەریزی لە لەدایکبوونەوە هەیە، وەکوو ژیری، شیرخواردن، پێکەنین بۆ خۆشییەکانی، گریان بۆ ناخۆشییەکانی، بەڵام عەقڵی بەدەستهێنان بە تێپەڕبوونی ڕۆژانە بەدەستی دەهێنێت، تا چل ساڵ کامڵ دەبێت و بەردەوام بەدەستهێنانی تا مردنە، وە گەر یەکێك شێت بێت عەقڵی بەدەستهێنانی لەدەست دەچێت و عەقڵی غەریزی دەمێنێتەوە وەکوو منداڵ.

بەدەر لەوەش عەقڵ ڕێژەییە، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «فَالْإِنْسَانُ وَإِنْ زَعَمَ فِي الْأَمْرِ أَنَّهُ أَدْرَكَهُ وَقَتَلَهُ عِلْمًا لَا يَأْتِي عَلَيْهِ الزَّمَانُ إِلَّا وَقَدْ عَقَلَ فِيهِ مَا لَمْ يَكُنْ عَقَلَ، ... وَلَا يَخْتَصُّ ذَلِكَ عِنْدَهُ بِمَعْلُومٍ دُونَ مَعْلُومٍ»(٢).

واتە: ئادەمیزاد گەرچی دەری ببڕێت لە کارێکدا زانیویەتی و دەرکی پێکردووە؛ هەر کاتێك دێت کە زیاتر شارەزا دەبێت کە نەیبووە لەوەو پێش، ئەمە لە هەموو بوارێکدا، نەك تایبەت بێت.

ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «أَنَّ اللهَ جَعَلَ لِلْعُقُولِ فِي إِدْرَاكِهَا حَدًّا تَنْتَهِي إِلَيْهِ لَا تَتَعَدَّاهُ، وَلَمْ يَجْعَلْ لَهَا سَبِيلًا إِلَى الْإِدْرَاكِ فِي كُلِّ مَطْلُوبٍ. وَلَوْ كَانَتْ كَذَلِكَ لَاسْتَوَتْ مَعَ الْبَارِي تَعَالَى فِي إِدْرَاكِ جَمِيعِ مَا كَانَ وَمَا يَكُونُ وَمَا لَا يَكُونُ»(٣).

واتە: خوای گەورە سنوورێکی بۆ عەقڵ دارشتووە کە تێیدا بوەستێت و تێپەڕی نەکات، ڕێگەیەکی بۆ دانەناوە بۆ هێنانەدی هەموو مەبەستەکانی، وە گەر وا بوایە ئەوا لەگەڵ خوادا یەکسان دەبوو بۆ زانینی بوونەکان و ئەوانەی دەبێت و نابێت.

---

(١) "الحجة في بيان المحجة" للأصبهاني (٢/ ٥٤١ - ٥٤٢).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٨٣٥ - ٨٣٦).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٨٣١).

وە زانستەکانیش دەبێت بە سێ بەشەوە: «الْمَعْلُومَاتِ عِنْدَ الْعُلَمَاءِ تَنْقَسِمُ إِلَى ثَلَاثَةِ أَقْسَامٍ: قِسْمٌ ضَرُورِيٌّ لَا يُمْكِنُ التَّشْكِيكُ فِيهِ، كَعِلْمِ الْإِنْسَانِ بِوُجُودِهِ، وَعِلْمِهِ بِأَنَّ الِاثْنَيْنِ أَكْثَرُ مِنَ الْوَاحِدِ، وَأَنَّ الضِّدَّيْنِ لَا يَجْتَمِعَانِ.

وَقِسْمٌ لَا يَعْلَمُهُ أَلْبَتَّةَ، إِلَّا أَنْ يُعْلَمَ بِهِ أَوْ يُجْعَلَ لَهُ طَرِيقٌ إِلَى الْعِلْمِ بِهِ، وَذَلِكَ كَعِلْمِ الْمُغَيَّبَاتِ عَنْهُ، . . . .

وَقِسْمٌ نَظَرِيٌّ يُمْكِنُ الْعِلْمُ بِهِ وَيُمْكِنُ أَنْ لَا يَعْلَمَ بِهِ - وَهِيَ النَّظَرِيَّاتُ - وَذَلِكَ الْقِسْمُ النَّظَرِيُّ هُوَ الْمُمْكِنَاتُ الَّتِي تُعْلَمُ بِوَاسِطَةٍ لَا بِأَنْفُسِهَا. إِلَّا أَنْ يَعْلَمَ بِهَا إِخْبَارًا»[(١)].

واتە: زانست لای زانایانی عەقڵ سێ بەشە:

**بەشی یەکەم:** پێویستییە و بەشی گومانی تێدا نابێت، هەموو خاوەن عەقڵێك دەزانێت، وەکوو بوونی خۆی، وە دوان زیاترە لە یەك، وە ئەستەمی کۆبوونەوەی دوو دژ یا نەبوونیان.

**بەشی دووەم:** نازانێت بە هیچ شێوەیەك مەگەر پێی بوترێت یا ڕێگەیەکی زانستی لە بارەیەوە پێبدرێت، وەکوو بابەتە غەیبییەکان.

**بەشی سێیەم:** بەشی تێڕوانین، دەتوانرێت بزانرێت و دەشێت نەزانرێت، بە هۆکار دەزانرێت، یا بە ڕێگەی هەواڵ.

کەواتە عەقڵ بەشی زانستی (ضروري) دەزانێت لەگەڵ (نظري) تێڕوانین گەر توانای بەسەریدا بشکێت، وە بەشێك دەمێنێت کە هەر نایزانێت ئەویش نادیارەکانە (الغيبيات).

سێ ڕێگەی زانیاری هەن: (العلم والعقل والحواس)، عەقڵ و هەستەکان توانای هەموو دەرکێکیان نییە، دەبێت بە ناچاری شوێنکەوتەی (علم) زانست بن، بە بەڵگەی ئەوەی عەقڵی (غریزی) سنووردارەو بە عەقڵی (اكتسابي) توانای زیادبوونی زانستی بەدەست هێنا، کەواتە «أَن الْعقل أَضْعَف من الْعلم، وَأَن الدّين لَا يدْرك بِهِ لضَعْفه وقلته، وَيدْرك بِالْعلمِ لقُوته وكثرته»[(٢)].

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٨٣٢، ٨٣٣).

(٢) "الحجة في بيان المحجة" للأصبهاني (٢/ ٥٤٢).

واتە: عەقڵ لاوازترە لە عیلم و زانست، بۆیە بوارەکانی ئایین نازانرێت لەبەر لاوازی و کەمی، بەڵکوو بە زانست دەزانرێت، لەبەر بەهێزی و زۆری.

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «وَقُوَّةٌ فِيهَا بِمَنْزِلَةِ قُوَّةِ الْبَصَرِ الَّتِي فِي الْعَيْنِ؛ فَإِنْ اتَّصَلَ بِهِ نُورُ الْإِيمَانِ وَالْقُرْآنِ كَانَ كَنُورِ الْعَيْنِ إذَا اتَّصَلَ بِهِ نُورُ الشَّمْسِ وَالنَّارِ. وَإِنْ انْفَرَدَ بِنَفْسِهِ لَمْ يُبْصِرْ الْأُمُورَ الَّتِي يَعْجِزُ وَحْدَهُ عَنْ دَرْكِهَا»[(١)].

واتە: عەقڵ وەکوو توانای بینینە لە چاودا، گەر نووری ئیمان و قورئانی پێبگات تەواوتر دەبینێت، هەروەك ڕووناکی چاو، گەر ڕووناکی ڕۆژ یا ئاگری لەگەڵدا بێت بینینەکەی تەواوترە، وە گەر بە تەنیا خۆی بێت ئەوا توانای دەرککردنی نابێت بەوانەی کە لە توانای خۆیدا نییە بە تەنیا دەرکیان پێبکات.

لەبەر ئەوە زانست کامڵترە تاوەکوو عەقڵ، بۆیە هەندێك لە زاناکان وتویانە: «لَا يُوصف الله بِكَوْنِهِ عَاقِلا ويوصف بِكَوْنِهِ عَالما فَدلَّ أَن الْعلم أقوى من الْعقل»[(٢)].

واتە: خوای پەروەردگار وەسف ناکرێت بە عاقڵ، بەڵکوو وەسف دەکرێت بە زانا، ئەوە بەڵگەیە کە زانست بەهێزترە لە عەقڵ.

**بەڵام گومڕایانی ئەم ڕێگەیە دەبن بە دوو بەشەوە:**

**بەشی یەکەم:** لەکارخستنی عەقڵەکان، وەکوو موقەلیدی مەزاهیبە فیقهییەکان و شوێنکەوتەی (تصوف) و مەرجەعیەتی ئیمامەکان.

**بەشی دووەم:** سەیرکردنی عەقڵ بە موقەدەس و مەعصوم و پارێزراو لە هەڵە، وەکوو موعتەزیلە و فیرەقە کەلامییە فەلسەفییەکان.

ئەوانەی دووەم عەقڵیان بە هاوتای شەرعی خوا داناوە، بەڵکوو حاکم و یاساداڕێژە بەسەریدا، وە پێشەنگییەتی، بۆیە بەڵگەی ئایەت و فەرموودەیان بە بیستن (سمعي) ناوبردووە و لە ڕیزبەندی گوماندایە و بە عەقڵیش دەڵێن یەکلابووەوە (قطعي) شوێنی نەبوونی گومان، بۆیە

---

(١) "مجموع الفتاوى" (٣/ ٣٣٩).

(٢) "الحجة في بيان المحجة" للأصبهاني (٢/ ٥٤٥).

دادەنرێت بە بناغە (أصول)، وە قورئان و فەرموودە بە (فروع) لق و پەل دادەنرێت، بۆیە دەبێت بگەڕێنرێتەوە سەر بناغە (أصول) و بە وەرگرتنی ئەو و ڕەتکردنەوەی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، تەنانەت عەقڵ لای ئەوان بە (محكم) یاساو مانا نەگۆڕ دادەنرێت و شەرعی خوا بە (متشابه) لێکچوو یەکلانەبووە و شوێنی گومان سەیر دەکرێت، کۆتا بڕیاری ئەم فیرەقە فەلسەفیانە ئەوەیە کە بگرە بەڵگە نین و ئەرکی چوونە ژێر باری مانا بۆ دۆزینەوە و گونجاندن لەگەڵ دەقەکان دەبێت بگرینە بەر (ئەمە بە ئەرك و تەکلیفێکی دینی لەسەر خۆیان دەزانن و خۆبەخشانە کاری بۆ دەکەن؟!). گەورەیی بۆ خوا لە گومڕایی ئەمانە چەندە بە بەزەیین بۆ دین!

وە مامەڵەشیان لەگەڵ دەقەکاندا بە شێوەی تاقیگەرییە، وەك (ابن تيمية) ﷀ دەڵێت: «وَأُصُولَ دِينٍ قَدْ ابْتَدَعُوهُ بِرَأْيِهِمْ ثُمَّ يَعْرِضُونَ عَلَى ذَلِكَ الْقُرْآنَ وَالْحَدِيثَ فَإِنْ وَافَقَهُ احْتَجُّوا بِهِ اعْتِضَادًا لَا اعْتِمَادًا وَإِنْ خَالَفَهُ فَتَارَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَيَتَأَوَّلُونَهُ عَلَى غَيْرِ تَأْوِيلِهِ ... وَتَارَةً يُعْرِضُونَ عَنْهُ وَيَقُولُونَ: نُفَوِّضُ مَعْنَاهُ إلَى اللَّهِ وَهَذَا فِعْلُ عَامَّتِهِمْ. وَعُمْدَةُ الطَّائِفَتَيْنِ فِي الْبَاطِنِ غَيْرُ مَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ يَجْعَلُونَ أَقْوَالَهُمْ الْبِدْعِيَّةَ مُحْكَمَةً يَجِبُ اتِّبَاعُهَا وَاعْتِقَادُ مُوجَبِهَا وَالْمُخَالِفُ إمَّا كَافِرٌ وَإِمَّا جَاهِلٌ ... وَيَجْعَلُونَ كَلَامَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ الَّذِي يُخَالِفُهَا مِنْ الْمُتَشَابِهِ الَّذِي لَا يَعْرِفُ مَعْنَاهُ إلَّا اللَّهُ ... فَيَجْعَلُونَ مَا ابْتَدَعُوهُ هُمْ بِرَأْيِهِمْ هُوَ الْمُحْكَمَ»[(١)].

واتە: چەند بنەمایەکی دینییان بە ڕاوبۆچوونیان داناوە و قورئان و فەرموودەکان دەخەنە بەر پێوانەی ئەو ڕاوبۆچوونانە، گەر گونجا دەیکەنە بەڵگە وەکوو بەهێزکردن نەك بناغە و پشتیوانی، وە گەر نەگونجا ماناکەی دەگۆڕن بە شێوەی گۆڕانکاری و مانای بۆ دروست دەکەن و دەڵێن (تأویل)ە. وە هەندێ جاریش پشتی تێدەکەن و دەڵێن: ماناکەی لای خوایە (بە ڕووکەش دەیهێڵنەوە بەبێ مانا) ئەمە کاری گشتیانە، وە کاری ناوەڕۆکی ئەم دوو کۆمەڵە لە ناوەڕۆکدا ئەوە نییە کە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە، قسە داهێنراوەکانیان بە مانا نەگۆڕ (محكم) دادەنێن و بە پێویستی دەزانن باوەڕ پێهێنانی و شوێنکەوتنی و بەرپەرچدەرەوەکانی بە بێبڕوا و نەزان دادەنێن،

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ١٤٢، ١٤٣).

**فەرموودەی خوا و پێغەمبەر ﷺ گەر پێچەوانەیان بوو ئەوا مانا نادیارە و (متشابە)ە، کە بەس خوا دەیزانێت، بەڵام ڕاکانیان یاسای نەگۆڕە.**

**ئەم کارەیان بە یاسایەکی گشتی کردووە و قبوڵی لادان نییە کە دەڵێن:** (إذا تعارض العقل والنقل قدم العقل مطلقاً)، **وە** (فخرالدين الرازي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەڵێت:** «**هذا هو القانون الكلي**»[1].

**واتە: گەر عەقڵ و قورئان و فەرموودە پێچەوانەی یەك بوون؛ عەقڵ بە گشتی پێش دەخرێت و ئەمە یاسایەکی گشتییە.**

**وە (الرازي) دەڵێت:** «**فإذن الدليل السمعي لا يفيد اليقين بوجود مدلوله، إلا بشرط أن لا يوجد دليل عقلي على خلاف ظاهره، ... أن الأدلة النقلية لا يجوز التمسك بها في المسائل العلمية**»[2].

**واتە: کەواتە بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە دڵنیابوونی تێدا بەدەست نایەت لە ڕووە ماناییەکەیەوە، بە مەرجێك مانایان تێدا بەدەست دێت کە لە بەڵگە عەقڵیەکاندا پێچەوانە و دژی مانا دارێژراوەکەی نەبێت. بەڵگە نەقڵییەکان نابێت پەیوەست بین پێوەی لە بابەتە زانستییەکاندا.**

**(قاضي عبدالجبار) گەورەی موعتەزیلەکان لە ڕیزبەندکردنی بەڵگەکاندا دەڵێت:** «**أولها العقل**»[3].

**واتە: یەکەمیان عەقڵە.**

**(قاضي عبدالجبار الهمذاني) سەرکردەی دیاری موعتەزیلەکان لە باسی فەرموودەدا بۆ کردنە بەڵگەی (عقيدة)ی دەڵێت:** «**فإن كان موافقا لحج العقول قُبل ... لا بمكانه بل للحجة العقلية**»[4].

---

(١) "أساس التقديس في علم الكلام" للرازي ص١٢٥.

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٥/ ٣٣١، ٣٣٥).

(٣) "العقلانيون" لعلي الحلبي ص٥٤، و "فضل الاعتزال" للقاضي عبد الجبار ص١٣٩.

(٤) "شرح أصول الخمسة" للقاضي عبد الجبار الهمداني ص٧٦٩ بتحقيق عبد الكريم عثمان.

واتە: گەر بەڵگەکان لەگەڵ عەقڵدا گونجان ئەوا وەردەگیرێت، نەك لەبەر ئەوەی بەڵگەی شەرعییە، بەڵکوو لەبەر بەڵگە عەقڵییەکەی.

وە (النَّظَّامِ)ی سەرکردەی موعتەزیلەکانی گروپی (النظامية) دەڵێت: «أَن حُجَّةِ الْعَقْلِ قَدْ تَنْسَخُ الْأَخْبَارَ»[١].

واتە: لایەنی عەقڵ دەشێت هەواڵەکانی قورئان و فەرموودە بسڕێتەوە (نسخ).

وە (الزمخشري) دەڵێت: «إمش في دينك تحت راية السلطان، ولا تقنع بالرواية عن فلان وفلان»[٢].

واتە: لە دینەکەتدا بە ژێر سێبەری (سوڵتانی عەقڵدا) بڕۆ، پابەند مەبە بە گێڕانەوەی فلاّن لە فلاّنەوە.

وە (الجاحظ المعتزلي) دەڵێت: «ما الحكم القاطع إلا للذهن وما الاستبانة إلا للعقل»[٣].

واتە: هیچ یاسایەکی یەکلا بووەوە نییە بێجگە لە بیر، وە هیچ ڕوونبوونەوەیەك نییە بێجگە لە عەقڵ.

وە (إمام الحرمين الجويني الأشعري) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «إذا ورد الدليل السمعي مخالفاً لقضية العقل فهو مردود قطعاً»[٤].

واتە: گەر بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە دژایەتی عەقڵی کرد؛ ئەوا وەرناگیرێت و ڕەد دەکرێتەوە.

وە (إمام الغزالي الصوفي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «كُلُّ مَا دَلَّ الْعَقْلُ فِيهِ عَلَى أَحَدِ الْجَانِبَيْنِ فَلَيْسَ لِلتَّعَارُضِ فِيهِ مَجَالٌ إِذْ الْأَدِلَّةُ الْعَقْلِيَّةُ يَسْتَحِيلُ نَسْخُهَا، وَتَكَاذُبُهَا، ... دَلِيلَ الْعَقْلِ لَا يَقْبَلُ النَّسْخَ، وَالْبُطْلَانَ»[٥].

---

(١) "تأويل مختلف الحديث" لابن قتيبة ص٩٤.

(٢) "أطواق الذهب في المواعظ والخطب" لزمخشري ص١٦.

(٣) "رسالة التربيع والتدوير" للجاحظ ص٥٨.

(٤) "الارشاد" للجويني ص٣٥٩.

(٥) "المستصفى" للغزالي ص٢٥٢.

**واتە: هەر بەڵگەیەکی عەقڵی لەلایەك بوو؛ ئەوا دژایەتی و پێچەوانەیەتی بواری بۆ نییە، بەڵگە عەقڵییەکان ئەستەمە سڕینەوە و بەدرۆ کەوتنەوەیان ... بەڵگەی عەقڵی قبوڵی هەڵوەشاندنەوە و بەتاڵکردنەوە ناکات.**

**بەم شێوەیە بە پیرۆز و پارێزراو و بێگەردی لە هەڵە و (مقدس ومعصوم) عەقڵ ناوبراوە و سەرچاوەیان بووە، بۆیە لە کۆتاییدا دەکرێت بە یاسایەکی گشتی وەکوو لە ئاسمان دابەزیبێت، یاخود وەکوو تاقیگەیەك هەموو دەقەکانی پیادا تێپەڕ دەبێت و قابیلی ڕەتکردن و ڕەخنە و گۆڕین نییە، ئەو پێشەنگە و ئیمام و (محکم) و یەقینە و بەڵگەیە، قورئان و فەرموودە شوێنکەوتە و (متشابە) و گومان و یەکلا نەبووەوەیە، ئەم یاسایە بە (القانون الكلي) ناوبراو لەسەر دەستی (فخرالدين الرازي)دا کلێشەی داڕشتنی یاسای بە بەرگدا کرا و فیرەقەکان هەر لە (موعتەزیلە و ئەشعەری و ماتۆریدی و شیعە و سۆفی و خەوارجەکانی متأخرين ... قورئانییەکان و عەقلانییەکانی ئەم سەردەمە)ی شوێنکەوتەیین دەردی کوشندەی دینی هەموو سەردەمێکە.**

**ئەمەش دەقی یاساکەیە: (فخرالدين الرازي) ناوداری ئەشعەرییەکان دەڵێت:** «اعلم: أن الدلائل القطعية العقلية إذا قامت على ثبوت شيء، ثم وجدنا أدلة نقلية يشعر ظاهرها بخلاف ذلك. فهناك لا يخلو الحال من أحد أمور أربعة: إما أن يصدق مقتضى العقل والمنطق فيلزم تصديق النقيضين وهو محال، وإما أن نبطلها فيلزم تكذيب النقيضين. وهو محال، وإما أن نكذب الظواهر النقلية، ونصدق الظواهر العقلية، وإما أن تصدق الظواهر النقلية وتكذب الظواهر العقلية، وذلك باطل لأنه لا يمكننا أن نعرف صحة الظواهر النقلية. إلا إذا عرفنا بالدلائل العقلية: إثبات الصانع، وصفاته، وكيفية دلالة المعجزة على صدق الرسول ﷺ وظهور المعجزات على محمد ﷺ، ولو صار القدح في الدلائل العقلية القطعية، صار العقل متهماً، غير مقبول القول، ولو كان كذلك لخرج عن أن يكون مقبول القول في هذه الأصول. وإذا لم تثبت هذه الأصول، خرجت الدلائل النقلية عن كونها مفيدة. فثبت: أن القدح في العقل لتصحيح النقل، يفضي إلى القدح في العقل والنقل معاً. وإنه باطل. ولما بطلت الأقسام الأربعة

لم يبق إلا أن يقطع بمقتضى الدلائل العقلية القاطعة: بأن هذه الدلائل النقلية إما أن يقال أنها غير صحيحة، أو يقال: إنها صحيحة، إلا أن المراد منها غير ظواهرها. ثم إن جوزنا التأويل: اشتغلنا على سبيل التبرع بذكر تلك التأويلات على التفصيل. وإن لم تجوز التأويل فوضنا العلم بها إلى الله تعالى. فهذا هو القانون الكلي المرجوع إليه في جميع المتشابهات (وبالله التوفيق)»[(١)].

**واته: بزانە: گەر بەڵگە یەکلابووەوە عەقڵییەکان شتێکیان سەلماند پاشان بینیمان بەڵگەی نەقڵی (قورئان و فەرموودە) لە ڕووکەشدا پێچەوانەی بوو، لێرەدا لە چوار حاڵەت بەدەر نییە:**

**١ – گەر بۆچوونە عەقڵی و نەقڵییەکە بەڕاست دابنرێت، ئەوا باوەڕ بە دوو پێچەوانەی یەك دەکرێت، کە ئەوەش مەحاڵە.**

**٢ – یاخود هەردووکیان بەدرۆ بخرێنەوە، ئەوەش مەحاڵە.**

**٣– یا دەقە نەقڵییەکان بەڕاست دابنرێت و دەقە عەقڵییەکان بە درۆ بخرێنەوە، ئەوەش بەتاڵە، لەبەر ئەوەی ڕاستی و دروستی دەقە نەقڵییەکان بێجگە لە ڕێگەی بەڵگە عەقڵییەکانەوە نەبێت نازانرێت، وەکوو سەلماندنی دروستکار و سیفەتەکانی، وە چۆنێتی بەڵگەکانی موعجیزە لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر ﷺ، گەر بێت و ڕەخنەگرتن لە بەڵگە عەقڵییەکان بە دروست بزانرێت، ئەوا عەقڵ شوێنی گومانە و قسەی لێ وەرناگیرێت، وە گەر وا بێت ئەوا شوێنی وەرگرتنی قسە نابێت لەم بناغە دینیانەدا، وە گەر نا بەڵگە نەقڵییەکان ڕاست نین و هیچ سوودێکیان نابێت، دەرکەوت گەر ڕەخنە لە عەقڵ بگیرێت بۆ ڕاستکردنەوەی نەقڵ هۆکارە بۆ ڕەخنەگرتن لە عەقڵ و نەقڵ بەیەکەوە، کەواتە هەڵە و بەتاڵە.**

**کاتێك هەر چوار بەشەکە بەتاڵ بووەوە هیچ نامێنێتەوە.**

**٤. بێجگە لە یەکلابوونەوەی بەڵگە عەقڵییەکان نەبێت و پێشخستنیان بەسەر نەقڵدا لەو کاتەدا دەڵێن ئەو بەڵگە نەقڵییانە یا ئەوەتا (صحيح) نین، یاخود (صحيح)ن، بەڵام مەبەست پێیان ڕووکەشە داڕێژراوەکانیان نییە، پاشان دەبێت ڕێگە بدەین بە (تأويل، مانا بۆ گونجاندن)،**

(١) "أساس التقديس في علم الكلام" لفخر الدين الرازي ص١٢٥، ١٢٦، و "أسباب الوقوع في البدع" لسعود بن سعد ص٢٠٥، و "منهج الاستدلال" لعثمان علي (١/ ٣٦٨)، و "العقلانيون" لعلي الحلبي ص٨٤.

ئەوسا بە ڕێی خۆبەخشین؟! دەست بکەین بە هێنانی ئەو مانا بۆ دروستکردنانە (تأویلات) بە دووررودرێژی، خۆ ئەگەر (تأویل) دروست نەبێت (وەکوو دین) ئەوا (کۆتا چارەسەر) ماناکانیان دەگێڕینەوە بۆ لای خوا ﷻ، ئەمە ئەو یاسا گشتییەیە کە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ سەری لە هەموو ئەو شتانەی کە مانا لێکچوو نادیارن (متشابهات).

(ابن تیمیة) ﷀ بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم یاسایە کتێبێکی بەناوی "درء تعارض العقل والنقل" نووسیوە کە دە بەرگە، بە چل و چوار ڕێگەی عەقڵی ئەم یاسایە هەڵدەوەشێنێتەوە، وە قوتابییەکەی (ابن القیم) ﷀ لە کتێبی "الصواعق المرسلة" دا بە پشتیوانی ئەو چل و چوار ڕێگەیەی مامۆستاکەی دەیگەیەنێتە دووسەد و چل و یەك ڕێگە لە بەرچەرچ و هەڵوەشاندنەوەیدا.

بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم یاسایە بە شێوەی کورت و تێپەڕبوون چەند ڕەخنە و ڕەددێکی (ابن تیمیة) ﷀ کە لە "درء تعارض العقل والنقل" دا باسی کردووە بە شێوەی خاڵ دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** یاساکانیان لەسەر سێ پێشەکی دارشتووە کە هەرسێکیان بەتاڵن و هەڵەن:

**أ.** دانانی دژایەتی و پێچەوانە لە نێوان عەقڵ و نەقڵدا، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگە عەقڵییەکان گونجاون لەگەڵ ئەوەی کە هاتووە بۆ پێغەمبەران: «وأن صريح المعقول لا يناقض صحيح المنقول، وإنما يقع التناقض بين ما يدخل في السمع وليس منه»[(١)].

واتە: عەقڵێکی ڕاست و دروست پێچەوانەی نەقڵێکی (صحیح) ناکات، پێچەوانەکان لەوەدا دروست دەبن کە بە بەڵگەی نەقڵی دادەنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەویشدا نییە، یاخود بە بەڵگەی عەقڵی دادەنرێت وە هەروەها لەویشدا نییە.

(ابن تیمیة) ﷀ دەڵێت: «وَالرُّسُلُ جَاءَتْ بِمَا يَعْجِزُ الْعَقْلُ عَنْ دَرْكِهِ. لَمْ تَأْتِ بِمَا يُعْلَمُ بِالْعَقْلِ امْتِنَاعُهُ»[(٢)].

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تیمیة (٢/ ٣٦٤).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تیمیة (٣/ ٣٣٩).

واتە: پێغەمبەران ئەوەی کە هێناویانە عەقڵ توانای دەرکپێکردنی نییە، ئەوەیان نەهێناوە کە عەقڵ ڕێگری لە بوونی بکات.

وە دەڵێت: «وَلِهَذَا كَانَ الصَّوَابُ عِنْدَ جَمَاهِيرِ أَهْلِ السُّنَّةِ ... أَنَّ الْعِلْمَ وَالْعَقْلَ وَنَحْوَهُمَا يَقْبَلُ الزِّيَادَةَ وَالنُّقْصَانَ»[١].

واتە: کۆدەنگی ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەیە کە زانست و عەقڵ و هاوشێوەکانی شاییستە بە زیاد و کەمن.

وە دەڵێت: «وَلَيْسَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَالْإِجْمَاعِ بَاطِلٌ وَلَكِنْ فِيهِ أَلْفَاظٌ قَدْ لَا يَفْهَمُهَا بَعْضُ النَّاسِ أَوْ يَفْهَمُونَ مِنْهَا مَعْنًى بَاطِلًا فَالْآفَةُ مِنْهُمْ لَا مِنْ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ»[٢].

واتە: لە قورئان و فەرموودە و کۆدەنگی موسوڵماناندا شتێك نییە دژایەتی عەقڵێکی بێ هەڵە بکات، گەر ببێت ئەوە بەتاڵە و بەتاڵیش لەوانەدا نییە، بەڵکوو ئەو وشانەی تێدایە کە هەندێك لە خەڵکی لێی تێناگەن، یان مانایەکی هەڵە و بەتاڵی لێ تێدەگەن، هەڵە و ناتەواوییەکە لای ئەمانە نەك قورئان و فەرموودە، «فَالرُّسُلُ صَلَوَاتُ اللَّهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِمْ تُخْبِرُ بِمَحَارَاتِ الْعُقُولِ لَا تُخْبِرُ بِمُحَالَاتِ الْعُقُولِ»[٣].

واتە: پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت هەواڵ دەدەن بە سەرسامی عەقڵەکان تیایاندا، هەواڵ نادەن بە مەحاڵ و ئەگەرەکانی عەقڵ.

ب. کۆکردنەوەی ئەم تێڕوانینە لە چوار بەشی دیاریکراودا بە ناوی (عەقڵ و نەقڵ) هەڵەیە، (ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «فأما القطعيان فلا يجوز تعارضهما ... وإن كان أحد الدليلين قطعياً والآخر ظنياً فإنه يجب تقديم القطعي سواء كان هو السمعي أو العقلي، وإما إن كانا جميعاً ظنيين: فإنه يصار إلي ترجيح أحدهما، فأيهما ترجح كان هو المقدم، سواء كان سمعياً أو عقلياً، لا لكونه عقلياً، وهذا القسم لم يذكره وهو الحق لا ريب فيه»[٤].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٧٢٢).
(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٤٩٠).
(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٧/ ٤٤٤).
(٤) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٧٩)، و "منهج الاستدلال على مسائل الاعتقاد" لعثمان بن علي حسن ص٣٧٣.

واتە: گەر هەردووکیان یەکلابووەوە (قطعي) بوون، دژایەتییان نییە، وە گەر یەکێکیان گومان (ظني) و ئەویتریان یەکلابووەوە (قطعي) بوو، پێویستە (قطعي)یەکە پێش بخرێت گەر نەقڵ بوو یا عەقڵ، گەر هەردووکیان گومان بوون پێشخەری بۆ دەکرێت گەر عەقڵی بوو یا نەقڵی، کەواتە پێویستە (قطعي وظني) لێکبدرێتەوە نەك (عەقڵی و نەقڵی)، ئەمە ئەو بەشەیە کە باسیان نەکردووە.

بڕیاری کۆتایی دابەشکردنەکە کە پێشکەوتنی عەقڵە بگۆڕێت بۆ «يقدم العقلي تارة والسمعي أخري، فأيهما كان قطعياً قدم»[1].

واتە: هەندێ جار عەقڵ و هەندێ جاری تر نەقڵ، کامیان یەکلا بووەوە (قطعي) بوو پێش دەکەوێت.

ج. بڕیاردان لەسەر (قطعي وظني) دەقەکان: «أَمْرٌ نِسْبِيٌّ يَخْتَلِفُ بِاخْتِلَافِ الْمُدْرِكِ الْمُسْتَدِلِّ، لَيْسَ هُوَ صِفَةً لِلدَّلِيلِ فِي نَفْسِهِ»[2].

واتە: ڕێژەییە، دەگۆڕێت لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تری بەڵگەهێنەر یا ووردبین، ئەمە بۆخۆی نابێتە وەسفێکی بەڵگەکە و بە ڕەها سەیری بکرێت و بکرێتە یاسا بەناوی (قطعي وظني) ئەمە گومانەو ئەوە یەکلابووەوەیە، ڕەنگە لای من گومان بێت و لای تۆ یەکلابووەوە بێت، کەواتە ئەو ڕێژەییە ڕەها نییە بەسەر دەقەکاندا.

**دووەم:** «أن مقدمات الدليل الشرعي كلها ظنية لا تفيد الثبوت القطعي وجعلوا أصول الدين نوعين:

١. العقليات: وهو مما لا يعلم بالكتاب والسنة.

٢. السمعيات: حصروا الدليل الشرعي في السمعيات وهذا باطل، فالشرعي لا يقابل

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٨٧)، و (٥/ ٢٧٧).

(٢) "درء تعارض" لابن تيمية (١/ ١٩٨)، "مختصر الصواعق المرسلة" لابن القيم ص٦٠٤، اختصره (ابن الموصلي).

بكونه عقلياً وإنما يقابله بكونه بدعياً، إذ البدعة تقابل الشرع ... فالشرع قد يكون سمعياً وقد يكون عقلياً، وهذا هو الحق في التقسيم الأدلة»[(١)].

ئەهلی عەقڵ هەموو بەڵگە شەرعییەکانیان بە گوماناوی دەزانن و یەکلابوونەوەو دڵنیایی تیا نابینن، لەبەر ئەوە بنەماکانی دینیان کردووە بە دوو بەشەوە:

أ. **عەقڵییەکان:** ئەمە بە هیچ شێوەیەك قورئان و فەرموودەی تێدا نییە.

ب. **بیستنەکان:** هەموو بەڵگە شەرعییەکانیان تێدا کۆکردووەتەوە.

ئەم جۆرە دابەشکردنە هەڵەیە، وشەی شەرعی بەرامبەری عەقڵ نییە، بەڵکوو بەرامبەر (بدعة) یە، لەبەر ئەوەی (بدعة) بەرامبەرکێ دەکات لەگەڵ شەرعدا، وە شەرعیش دوو بەشە:

أ. **بیستنەکان:** واتە قورئان و فەرموودە.

ب. **هەندێ جاریش عەقڵییەکان:** بە بنەمادارى نەقڵ وەکوو (القياس).

ئەمە شێوەی ڕاستە بۆ دابەشکردنی جۆری بەڵگە، لەبەر ئەوە شەرع وەصفە، وە دەبێت بیدعە بەرامبەری بێت، لەبەر ئەوەی زەم و بێزراوە، شەرع بۆ عەقڵ هاتووە و قابیلی وەرگرتنە، نەك بەرامبەرێتیکردنی.

**سێیەم:** «إن قدمنا النقل كان ذلك طعناً في أصله الذي هو العقل، ... إن العقل أصل للنقل ... إن أراد أن العقل أصل في معرفتنا بالسمع ودليل لنا علي صحته ... وإن أردت بالعقل الذي هو دليل السمع وأصله المعرفة الحاصلة بالعقل، فيقال ... لم تكن جميع المعقولات أصلاً للنقل، لا بمعني توقف العلم بالسمع عليها، ولا بمعني الدلالة علي صحته، ولا بغير ذلك»[(٢)].

واتە: ئەگەر نەقڵ پێش بخەین لە کاتی دژایەتیدا؛ ئەوا هەڵوەشاندنەوەی بناغەی باوەڕهێنانە بە دین ئەویش عەقڵە، لەبەر ئەوە عەقڵ بناغەی نەقڵە، گەر مەبەستی بە عەقڵ بناغە و هۆکاری ناسینمانە بە دین و بەڵگەمانە بۆ دروستی دین، گەر ئەو زانست و مەعریفاتانە بێت کە عەقڵ

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٨٧).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٨٧ – ٩٠).

دەرکی پێدەکات؛ ئەوا هەموو ئەو مەعریفە عەقڵیانە بناغە نین بۆ ناسینی دین، لەبەر ئەوەی مەعریفەکانی عەقڵ زۆرن، ناسینی دین بە هەندێك لە مەعریفە عەقڵییەکان پێویستە، نەك بە هەمووی.

کەواتە دین نەوەستاوە لەسەر سەلماندنی هەموو بوارە زانستییەکانی عەقڵ، یاخود هەمووی ببێت بە بەڵگە لەسەر دین، ڕێژەیەکی دیاریکراوی دەوێت، وەکوو پێشەکی نەك بە ڕەها هەموو زانستە عەقڵییەکان بە بناغە و سەلماندنی دین دانرێت، وە گەر نا ئەوا بە بەتاڵ دانانی هەموو عەقڵە، وە لەلایەکی ترەوە دین لەسەر ئەوە نەوەستاوە عەقڵ بیسەلمێنێ و دانی پێدابنێ و بناغە بێت بۆ وەرگرتنی، بەڵکوو هۆکاری ناسین و ئاشنابوون و تێگەیشتنە، ... خۆ گەر وابێت (خالق) لەسەر (مخلوق) پەیوەست دەبێت بە بوونی (مخلوق)، ئەوکات (خالق)ە و بە نەبوونی نەبوونە، ... لەگەڵ ئەوەشدا (خالق) لە پێش و بەبێ بوونی (مخلوق) هەر (خالق)ە.

**چوارەم:** پێویستە لە کاتی دژایەتیدا نەقڵ پێش کەوێت، لەبەر ئەوەی عەقڵ باوەڕی بە هەموو شەرع هێناوە بە کۆبەند بە هەموو هەواڵەکانی، بەڵام شەرع باوەڕی بە هەموو هەواڵەکانی عەقڵ نەهێناوە[1].

عەقڵ وەکوو نابینایەك خۆی ڕادەستی شەرع کردووە، باوەڕی بە کاملی و بینینی ئەو کردووە، یا نەخوێندەوارێك و نەزانێك شوێنکەوتەی زانایەك بێت ئایا دەبێت پێشی بڕیارەکانی بکەوێت؟ وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ [الحجرات: ١].

واتە: پەلە مەکەن لە شتەکاندا و پێش خوا و پێغەمبەرەکەی مەکەون، بەڵکوو شوێنکەوتەی بن لە هەموو کارەکاندا[2].

**پێنجەم:** تەواوکەری پێشوو، دەکرێت یاسای (إذا تعارض العقل والنقل قدم العقل) پێچەوانە کرێتەوە (... قدم النقل)[3].

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٣٨).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٣٤٠).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٧٠).

لەبەر ئەوەی عەقڵ بەڵگە بوو لەسەر شەرع، کاتێك دژایەتی کرد ئەوا لە بەڵگەیەتی کەوت، وە ئەویش بەڵگە نییە، ناتوانێت بەرامبەریێتی بکات لەگەڵ بەڵگەدا، چۆن دانی پێدا دەنێت خۆی ڕادەستی دەکات، پاشان دژایەتی بکات ئەوە پەشیمانییە، وە گەر بەڵگەیەکی ڕاست نەبوو ئەوا ناکرێتە شوێنکەوتە، بەدەر لەوەی پێش بخرێت بەسەر شەرعدا، وەکوو ئەوە وایە بلێت: «لَا تُصَدِّقْهُ فِي هَذَا الْخَبَرِ؛ لِأَنَّ تَصْدِيقَهُ يَسْتَلْزِمُ عَدَمَ تَصْدِيقِهِ»[١].

واتە: باوەڕ بە شەرع مەکە، گەر باوەڕی پێ بکەیت ئەبێتە هۆکاری باوەڕ پێنەکردنم.

**شەشەم:** وە گەر عەقڵ پێش کەوێت؛ چ جۆرە عەقڵێك؟! (فەیلەسوفێك؟ بیرمەندێك؟ بێبڕوایەك؟ ئەدیبێك؟ شاعرێك؟ جولەکەیەك؟ گاورێك؟ بتپەرستێك؟ فەیلەسوفێکی یۆنانی؟ عیلمانییەك؟ ئیسلامییەك؟ وە کام لە فیرەقەکانی ناو بازنەی ئیسلام؟!...) وە ئایا عەقڵی هەزار ساڵ لەمەوپێش یا عەقڵی داهاتوو یاخود فەقیهەکان یان موفەسیرەکان یان ...؟!

بڕیارێکە دراوە بە ڕەها بەبێ هیچ مەرج و بنەما و ڕێکخستنێك، لەگەڵ ئەوەشدا گەر پیاچوونەوە بە بیروبۆچوونەکان بکەیت هەموویان یەکتری هەڵدەوەشێننەوە بە (نفي إثبات)ن، وە هەریەکەیان دەڵێن: «إن العقل الصريح دل على النفي، والآخر يقول: العقل الصريح دل على الإثبات»[٢]، وەکوو (جەبەری)یەکان بەرامبەر (قەدەری)یەکان، وە (مورجیئە)کان بەرامبەر (خەوارج)ەکان، ... .

**حەوتەم:** وە گەر داوایان لێ بکرێت پێناسەی (قطعي وظني)مان بۆ بکەن، یاخود سنووری بۆ دیاری بکەن چی گومانەو چی یەقینە، کۆدەنگییەك نابینیت، لەبەر ئەوەی ئەمەش ڕێژەییە، بە گوێرەی ئاستی زانستی و هەستپێکردن و دەرك و ووردەکاری و ئیمان و وورياییی جیاوازە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر.

---

(١) "مختصر الصواعق المرسلة" لابن القيم ص١١١، اختصره (ابن الموصلي)، "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٣٤).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٥٦).

**هەشتەم:** (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «**العقل إما أن يكون عالماً بصدق الرسول، ... وإما أن لا يكون عالماً بذلك. فإن لم يكن عالما امتنع التعارض عنده إذا كان المعقول معلوماً له، لأن المعلوم لا يعارضه المجهول**»(١).

واته: عەقڵ یا زانایە بەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەردا ﷺ و ئەو هەواڵەی کە داویەتی، یا زانا نییە بە سەریدا، ئەگەر نەزان بوو وە مانای هەواڵەکەی دیار بوو؛ ئەوا نابێت دژایەتی بوونی هەبێت، لەبەر ئەوەی نەزانین بەرامبەر زانین دژایەتی نییە، وە گەر مانای هەواڵەکەی پێغەمبەر ﷺ نەزانراو بوو؛ ئەوا (لم يتعارض مجهولان) دوو نەزانین دژایەتییان نییە بەرامبەر یەك، وە گەر زانا بوو بەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەردا ﷺ نابێت زانا نەبێت بەسەر فەرموودەکەیدا، ئەوپەڕی ئەوەیە کە نەیبیستبێت یا مانای نازانێت، لە هەردوو حاڵەتەکەدا ناتوانێت دژایەتی و هەڵوەشاندنەوە بکات، لەبەر نەزانین و بێئاگایی.

**نۆیەم:** ئەهلی عەقڵ بڕیاری بەکارهێنانیان داوە بە عەقڵ لە هەموو بوارەکاندا، زانستی و کرداری (علمي وعملي)، هیچ بوارێکیان تەرخان نەکردووە کاری تێدا نەکات، کەواتە نەمانزانی (خالق) کێیە و (مخلوق) کێیە و جیاوازی زانستییان چییە، وە (حاكم ومحكوم) کامیانە، خاوەن بڕیار ئەبێت کامیان بێت، وە جێبەجێکار دەبێت قورئان و فەرموودە بێت.

**دەیەم:** دڵنیان (معصوم) قورئان و پێغەمبەرە ﷺ، پارێزراون لە هەموو هەڵەو نەزانین و لێتێکچوونییەك، وە عەقڵێش خاوەنەکانی (مخلوق)ن و (معصوم) نین، ئایا ئەمە هەڵگێڕانەوەی ئەو یاسایە نییە؟ کەواتە چ جیاوازییەك هەیە لەسەر (بتەکان) کە کرابوون بە خوا و عەقڵ؟ بگرە عەقڵ لە بتپەرستی و شیرکەکانی دونیا باڵا دەست و دەست ڕۆشتوو و پەرستراوترە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾﴾ [النمل: ٦٣].

واته: ئەوە لەگەڵ خوادا خوایەکی تر هەیە؟! خوا بێگەردە لەو هاوبەشانەی بۆی بڕیار دەدەن.

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٣٤).

**یانزەیەم:** لە ئەنجامدا دوو ڕێگەیان داناوە بۆ جۆری تێڕوانینی دەقی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت): «طريقتا المبتدعة في نصوص الأنبياء. أولاً: طريقة التبديل: أهل التبديل نوعان. أهل الوهم والتخييل، وأهل التحريف والتأويل .. ثانياً: طريقة التجهيل»(١).

**ڕێگەی یەکەم:** گۆڕین (التبديل): گۆڕینیش دوو جۆرە:

**یەکەم:** گومان و خەیاڵات (الوهم والتخييل): واتە پێغەمبەران نەیانزانیوە حەقەکە و بە ڕێگەی گومان و خەیاڵات خەڵکییان تێگەیاندووە، وەکوو: زیندوبوونەوە، وەصفەکانی خوا و ڕۆژی دوایی.

**دووەم:** گۆڕین و مانا بۆ دروستکردن (التحريف والتأويل): دەڵێن پێغەمبەران مەبەستیان بەم وشانە حەق بووە، بەڵام ئەو حەقەیە کە ئێمە بە عەقڵ زانیومانە، بۆیە پەنایان بردووەتە بەر جۆرەها مانا بۆ گونجاندن لەگەڵ عەقڵ و ڕاکانیاندا، لەگەڵ ئەوەشدا وریاکانیان دەزانن پێغەمبەران مەبەستیان بەو مانایانە نەبووە، وە هەندێکیان دەڵێن پێغەمبەران زانیویانە و ڕوونیان نەکردووەتەوە.

**ڕێگەی دووەم:** (التجهيل): واتە پێغەمبەران نەزان بوون بەسەر ئەوەی خوا مەبەستیەتی، ماناکانیان پێچەوانەی ڕووکەشەکانیان و تێگەیشتنەکانە، نە پێغەمبەر و نە هاوەڵان و نە زانایان نازانن ماناکانی و مەبەستی خوا، کۆتا کاریان گەڕانەوەی (تفويض) واتە ماناکانیان دەگێڕنەوە بۆ لای خوا و مانای بۆچوونەکانیان ئەوەیە پێغەمبەران نە عەقڵیان زانیوەوە و نە نەقڵیان زانیوە، بۆیە بە ڕای هەندێکیان فەیلەسوف و زانا و ... کامڵتر بوون لە پێغەمبەران، وە پێغەمبەران لە بورای کرداریدا زانا بوون، نەك زانستی.

**دوانزەیەم:** ئایەتێك لە قورئان یاخود دەقێکی (صحيح) لە بنەماکانی دین (أصول الدين)دا نییە کە کۆدەنگی (إجماع)ی ئەم ئوممەتە پێچەوانەی بووبێت و بە دژایەتی عەقڵیان دانابێت، کۆدەنگی موسوڵمانان پێش دەرکەوتنی ڕای پێچەوانە بووە، ئەمە ڕەددێکە بۆ ئەوەی کە دەڵێن ئەم بابەتانە کۆدەنگی عەقڵی لەسەرە بۆ پێچەوانەی یاسا عەقڵییەکان.

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٨ - ١٥)، و "مجموع الفتاوى" (٧/ ٥٨٩)، و (٩/ ٢٤٧).

گەر کۆدەنگی هەبێت، نابێت بوونی بەرامبەر هەبێت، لەگەڵ بوونی ئەو کۆدەنگییەی هاوەڵان و شوێنکەوتوان و زانایان بە درێژایی هەزار ساڵ دوای ئەوان.

واتە ئەو بۆچوونانە هیچ نییە بێجگە لە بۆچوونی هەندێك لە فیرەقەکان نەبێت، وە تاوانی دەقەکان چییە کە چەند عەقڵێك لە خەڵکی بۆی وەرناگیرێت؟! لەگەڵ ئەوەشدا (إجماع) پارێزراو (معصوم)ە، لەپاش قورئان و فەرموودە بە تایبەت (إجماع الصحابة والتابعين)، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ أُمَّتِي لَا تَجْتَمِعُ عَلَى ضَلَالَةٍ»[١].

واتە: موسوڵمانان لەسەر گومڕایی کۆدەنگ نابن.

بەڵام عەقڵ پارێزراو نییە لە هەڵە و کەم و کورتی، کەواتە (إجماع) لە پێش عەقڵەوەیە.

**سیانزەیەم:** ئەو بابەتە دینیانەی کە دەڵێن عەقڵ تیایدا دژایەتی دەکات، وەکوو هەمان ئەو بابەتانەی «كمسائل الحساب والهندسة والطبيعيات الظاهرة والإلهيات البينة»[٢]. ژمێریاری و ئەندازەیی و سروشتییەکان وایە، کە لە دیندا باسکراوە و هەڵەی تێدا نییە و شوێنی دڵنیایین، هەر لە دابەشکردنی میراتی و دانانی ساڵ و ڕۆژ و دیاریکردنی جۆرەکانی نەخۆشی و ... تەنانەت ئەوانەی ئەمڕۆ پێیان دەوترێت (إعجاز العلمي في القرآن والسنة) زۆری ئەو بابەتانەی ئەمڕۆ دەرکەوتوون هیچیان پێچەوانەی قورئان و فەرموودە نییە، بگرە دەقاودەق گونجاون، کەواتە چۆن ئەم بابەتانە هەڵەی تێدا نییە، ئەو بابەتانەی تریش بە هەمان شێوە عەقڵ دژایەتی ناکات و هەڵەی تێدا نابێت گەر عەقڵ پێشی نەزانێت! لەبەر ئەوە «عدم العلم ليس علماً بالعدم»[٣]. نەبوونی بەڵگە، بەڵگە نییە لەسەر نەبوون، ئەمە یاسایەکی زانستییە؛ نەزانینمان لەسەر شتەکان بەڵگە نییە لەسەر نەبوونی زانست لەسەری.

---

(١) رواه ابن ماجه (٣٩٥٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٨٤)، وابن بطة في "الإبانة" (١١٨)، واللالكائي في "اعتقاد أهل السنة" (١٥٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢٣٨/٩)، وصححه الألباني في" الصحيحة" (١٣/٤)، وفي "صحيح الجامع الصغير" (١٨٤٨).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١٤٨/١).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٨٧/١).

**چواردەیەم:** یاسا بنەڕەتییەکان پێچەوانە بووەوە: «هؤلاء عكسوا شرعة الله وحكمته وضادوه في أمره فإن الله سبحانه جعل الوحي إماما والعقل مؤتما به وجعله حاكما والعقل محكوما عليه ورسولا والعقل مرسلا إليه وميزانا والعقل موزونا»(١). خوای پەروەردگار وای داناوە کە وەحی ئیمام و حاکم و نێردراو بێت و عەقڵ شوێنکەوتە و جێبەجێکار و بۆ نێردراو و پێوانەکراو بێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي ﴾ [طه: ١٢٤]. بێبڕواکان بەس پشتیان تێ دەکرد، بەڵام ئەمان بەرامبەرکێیەتی لەگەڵ دەکەن.

**پانزەیەم:** هۆکارەکانی گومان بەوەی کە عەقڵ پێچەوانەی قورئان و فەرموودەیە(٢):

١. گومان بەوەی دەقە شەرعییەکان توانای پڕکردنەوەی پێویستییەکانی ئادەمیزادی لە بوارەکانی ژیاندا بەتایبەت بابەتە (عقيدة)ییەکان نییە.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن لە: «مَعَانِيَ النُّصُوصِ الْعَامَّةِ الَّتِي هِيَ أَقْوَالُ اللهِ وَرَسُولِهِ وَشُمُولُهَا لِأَحْكَامِ أَفْعَالِ الْعِبَادِ»(٣). مانای دەقە گشتییەکان بۆ گرتنەوەی هەموو یاسا پێویستییەکانی خەڵکی.

٢. ئەو دەق و فەرموودانەی کە دەکرێنە بەڵگە لەو بابەتانە زۆریان هەڵبەستراو (ضعيف وموضوع)ن، زانایانی فەرمووودەناس ئەمە بە باشی دەزانن.

٣. یا دەقەکە (صحيح)ە، بەڵام کردنە بەڵگەی بۆ ئەو بابەتە نەپێکاوە.

٤. یا ئەو بابەتانە لەوانەن ڕوون نین بە پێوەرە عەقڵییەکانەوە.

٥. هەڵە پێوانەکردن (قياس) بە هۆکاری هەندێك لە پێشەکییەکانی، یا شێوە گشتییەکەی، لەبەر بوونی چەند وشەیەکی لەیەکچوو و کورت و تایبەت.

---

(١) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٣/ ٨٩٠).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٤٨).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٩/ ٢٨٠).

**٦.** بڕیاردان بەسەر بەڵگە شەرعییەکاندا کە دڵنیاکەرەوە (قطعي) نین، یا لێکچوو (متشابە) یەکلاکەرەوە نین، یا دانانی یاسا عەقڵییەکان لە دیندا بە شێوەی بنەڕەتی و بناغەیی (أصول)ین، وە دانانی شەرعیش بە (فرع) و لق خوێندنەوە و پێویستە لە هەموو کاتێکدا بگەڕێنەوە سەر یاسا عەقڵییەکان، ئەمە گەورەترین هۆکارەکانی گومڕابوونی پێشکەوتنی عەقڵە.

**٧.** بۆچوونیان بۆ چارەسەری ئەم دژایەتییە عەقڵیە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت؛ دەکرێت شوێنی قبوڵکردنی لە دیندا بە ڕێگەی مانا بۆ دۆزینەوە لەسەر بنەما عەقڵییەکان بێت، کە پێی دەوترێت (تأويل)، یا پەنابردنە بەر (تفويض) بێت، واتە وازهێنان لە دۆزینەوە مانا و گەڕاندنەوەی بۆ لای خوا.

**٨.** بڕیاردان بە دژایەتی عەقڵ بۆ قورئان و سوننەت «فقد قال بتكافؤ الأدلة ... فإذا تعارضا تكافآ»[1]. بڕیاردانە بە هاوتاکردنی لەگەڵ بەڵگەدا، مادام بەرامبەر دەق وەستاوە کەواتە بەڵگەیە وەکوو ئەو، بەڵکوو گەر یەکێکیان پێش نەخرێت ئەوا لە گومان و سەرسوڕمان دەرناچێت، وە عەقڵیش بناغەی وەرگرتنی (وەحی)یە دەبێت پێش بکەوێت، کەواتە نەك هاوتای بەڵگەیە بەڵکوو پێشخەریشە، ئەمە (شرك وبدعة)یە لە حەقی خوا و پێغەمبەردا ﷺ، وەکوو عەقلانییەکان دەڵێن: «للعقل سلطان وللنقل سلطان، فإذا تعارضا قدم العقل».

واتە: عەقڵ بەڵگەیە وەکوو قورئان و فەرموودە، گەر نەگونجان ئەوا عەقڵ پێشخەرە.

## بەرهەمە تاڵاوەکانی ئەم یاسا عەقڵییانە

**یەکەم:** لاوازبوونی متمانەی موسوڵمانان بە قورئان و فەرموودە، بە شێوەیەك شوێنی گومان و نەبوون بە بەڵگە و بەدەستنەهێنانی دڵنیابوون لێیان و بە پلە دوو لە دوای عەقڵەوە سەیرکردن؛ سیمای قورئان و فەرموودەکانە لای گومڕایان[2].

---

(١) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٣/ ٩٨٩).

(٢) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لدكتور عبدالرحمن بن صالح المحمود (٢/ ٨٤٠).

**دووەم:** هۆکاری لەسەر دڵ قورسبوون و ڕقلێبوون و گوێ لێنەگرتن و حەز لە بینین و خوێندنەوەی ئەو دەقانەی کە دەڵێن پێچەوانەی پێوەرە عەقڵییەکانە بەتایبەت غەیبییەکان، «ومن المعلون أنك لا تجد أحداً ممن يرد نصوص الكتاب والسنة بقوله إلا وهو يبغض ما خالف قوله، ويود أن تلك الآية لم تكن نزلت، وأن ذلك الحديث لم يرد، ولو أمكنه كشط ذلك»(١)، «فلا تجد قط مبتدعاً إلا وهو يحب كتمان النصوص التي تخالفه، ويبغضها، ويبغض إظهارها وروايتها والتحدث بها»(٢).

واتە: کەسێك نابینیت لەوانەی بەرپەرچی ئایەت و فەرموودە دەدەنەوە ڕقیان لەو دەقانە نەبێتەوە کە دژایەتییان دەکات، وە ئاواتیان ئەوەیە ئەو ئایەتانە نەهاتنایەتە خوارەوە، یاخود ئەو فەرموودەیەیان پێی نەگەیشتبایە، تەنانەت بیانتوانیایە دەیانسڕییەوە، هەموو بیدعەکارێك پێی خۆشە ئەو دەقانە بشارێتەوە کە پێچەوانەیەتی، وە دژیەتی دەرکەوتنی و گێڕانەوە و باسکردنییەتی.

بە پێچەوانەی خواناسانەوەیە کاتێك ئایەتەکانی خوا دەخوێنرێتەوە موچوڕکە بە لەشیاندا دێت، لەبەر گەورەیی و بەهاو دەسەڵاتی خوا، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ [الزمر: ٢٣].

واتە: ئەوانەی لە خوا دەترسن لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا پێستیان گرژ دەبێت و خاو دەبێتەوە و دڵەکانیان نەرم دەبێت بۆ یادی خوا.

**سێیەم:** وە ئەگەر بەڵگە شەرعییەکان لە کار بخرێن بەم یاسایە، ئەوا: «لم يبقى معهم إلا طريقان: إما طريق النظار: وهي الأدلة القياسية العقلية، وإما طريق الصوفية: وهي الطريقة العبادية الكشفية، ... إنما يؤول به الأمر إلى الحيرة والشك، إن كان له نوع عقل وتمييز، وإن كان جاهلاً دخل في الشطح والطامات التي لا يصدق بها إلا أجهل الخلق.

فغاية هؤلاء الشك، وهو عدم التصديق بالحق، وغاية هؤلاء الشطح وهو التصديق بالباطل، والأول يشبه حال اليهود، والثاني يشبه حال النصارى»(٣).

---

(١) (٢) (٣) "درء تعارض العقل والنقل" (٥/ ٢١٧)، (١/ ٢٢١)، (٥/ ٣٤٥، ٣٤٦).

واتە: هیچ حاڵەتێك نامێنێتەوە بۆ بە بەڵگەکردن، بێجگە لە ڕێگەی تێڕوانینەکان نەبێت، ئەویش بەڵگە کێشانە عەقڵییەکانە، یاخود ڕێگەی سۆفییەکان نەبێت کە دەیانەوێت بە ڕێگەی عیبادەتەکانەوە بگەنە کەشف و دەرکپێکردنەکان، ... کۆتا کاری عەقڵییەکان گومان و سەرسوڕمانە کە هۆکاری باوەڕ نەبوونە بە حەق، ئەمە هاوشێوە بوونی جوولەکەکانە، وە کۆتا کاری سۆفییەکانیش تێکەڵکردن و شێواندنە، ئەوەش باوەڕ بوونە بە بەتاڵ، ئەمەش بە هاوشێوەبوونی گاوورەکانە.

کاتێك شەرع لەکار بکەوێت ئەبێت پەنا ببەینە بەر قیاسی فەلسەفی و خەیاڵاتی سۆفی، بۆیە (أبو القاسم السهيلي) و بێجگە لەو دەڵێن: «نَعُوذُ بِاَللَّهِ مِنْ قِيَاسٍ فَلْسَفِيٍّ وَخَيَالٍ صُوفِيٍّ»[١].

واتە: پەنا بە خوا لە پێوانەی فەلسەفەیی و خەیاڵاتی سۆفیگەری.

عەقڵییەکان داوا دەکەن شەرع لەکار بخرێت و کار بە عەقڵ بکرێت، سۆفییەکانیش داوا دەکەن عەقڵ و شەرع لەکار بخرێت و بە کەشفی غەیبی کار بکرێت، وەکوو دەڵێن: «وَمَنْ أَرَادَ التَّحْقِيقَ فَلْيَتْرُكْ الْعَقْلَ وَالشَّرْعَ»[٢].

**چوارەم:** گرتنەبەری ئەم یاسایە بووە هۆکاری ڕێگە دۆزینەوە بۆ ڕزگاربوون لە بەڵگە شەرعییەکان، بە گرتنە بەری «آل بهم الأمر إلى التأويل أو التفويض ... من مسائل الاعتقاد ... تندرس أصول الملة والدين»[٣].

گۆڕین (تحريف) بەناوی (تأويل)ەوە، واتە تەفسیرکردن، یاخود (تفويض) نەزانینی مانا و گەڕاندنەوەی بۆ لای خوا.

بەو مانایەی هەموو مانای ئایەت و فەرموودەیەك لەگەڵ عەقڵدا نەگونجا ماناکەی بگۆڕدرێت، یاخود وشە و داڕشتنێکی بێ مانایە، تەنانەت پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان ﵃ و کۆڕا (إجماع)ی ئەم ئوممەتە نەیانزانیوە.

---

(١) "الرد على المنطقيين" لابن تيمية ص٤٨٢.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٢٤٣).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٢٠١).

کەواتە پێغەمبەر ﷺ خۆشی لە قورئان تێنەگەیشتووە، نەیتوانی بێت بە بەڵگەی خوایی بەسەر خەڵکەوە و هۆکاری هیدایەت و گەیاندنی دین نەبووە، وە بگرە هۆکاری گومان و شێواندنی عەقڵیان بووە، وە بوونی قورئان هیچ سودێکی تێگەیشتنی نەبووە، وە تەنانەت (ولله المثل الأعلى) عیلمی خوا تەواو نییە و توانای دەربڕین و تێگەیشتنی خەڵکی نییە.

خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾﴾ [النساء : ١٢٢]، ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾﴾ [النساء : ٨٧]، ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا﴾ [الأنعام : ١١٥].

واتە: قسەو هەواڵێك نییە لە ئایەت و هەواڵەکانی ئەو تەواوتر و کاملتر بێت، فەرموودەکانی خوا تەواوە لە وتندا و دادپەروەرە لە بڕیاردا[1].

**پێنجەم:** ئەم یاسایە بە مەرجگرتنی ئیمان و باوەڕە بە ناڕاستەوخۆ، وەك بڵێیت: من باوەڕ بەوە ناکەم کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی و وتوویەتی تاوەکوو بۆم ڕوون نەبێتەوە کە دژایەتی عەقڵی نییە: «أنه لا يمكن أن يكون تصديق الرسول فيما أخبر به معلقاً بشرط، ولا موقوفاً على انتفاء مانع»[2].

واتە: نابێت باوەڕکردن بە پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکانی هەڵپەسێردرابێت بە مەرج، یا وەستێنرابێت لەسەر نەبوونی ڕێگر لە وەرگرتندا، بەڵکوو دەبێت باوەڕی تەواوت بە قورئان و فەرموودە هەبێت بەوەی تێیدایەتی، گەر زانیبێتت یا نەتزانیبێت.

وەکوو ئیمامی (الشافعي) رحمه الله دەڵێت: «آمَنْت بِاَللَّهِ وَبِمَا جَاءَ عَنْ اللَّهِ عَلَى مُرَادِ اللَّهِ وَآمَنْت بِرَسُولِ اللَّهِ وَمَا جَاءَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ عَلَى مُرَادِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[3].

واتە: باوەڕم بە خوا هێناوە و بەوەی لای خواوە هاتووە، لەسەر مەبەستەکانی خوا، وە باوەڕم بە پێغەمبەر هێناوە و بەوەی لای ئەوەوە هاتووە، لەسەر مەبەستەکانی پێغەمبەر ﷺ، با نەیشیزانم.

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٢/ ٢٦٨)، (٣/ ٢٨٨).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٨٨).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٦/ ٣٥٤)، و "جامع المسائل لابن تيمية" (٥/ ٦٢)، و "الرسالة المدنية" لابن تيمية ص٣، و "لمعة الاعتقاد" لابن قدامة (١/ ٧)، و "معارج القبول" للحافظ الحكمي (١/ ٣٦٥).

باوەڕی مەرجدار وەرگیراو نییە و پێی ناوترێت باوەڕدار، وەکوو ئەوانە وان کە دەیان وت: ﴿قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ﴾ [الأنعام : ١٢٤].

واتە: باوەڕ ناهێنین تاوەکوو ئایەت بە فریشتەکانا بۆ ئێمە دانەبەزێت وەکوو بۆ پێغەمبەران دابەزیوە[١].

**شەشەم:** دوورکەوتنەوە لە قورئان و سوننەت هۆکاری سزای خوایین بە گومڕابوون و هەڵگەڕانەوە و هەڵگرتنی پێچەوانەی حەق: «أن الله سبحانه اقتضت حكمته وعدله أن كلما كان الرجل عن الرسول أبعد كان عقله أقل وأفسد فأكمل الناس عقولاً اتباع الرسل ...»[٢].

واتە: دادپەروەری و دانایی پەروەردگار لەوەدایە کە هەرکەسێك هەتا دوور بێت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ عەقڵی کەمتر و شێواوتر دەبێت، کامڵترین کەس لە عەقڵدا شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانن سەلامی خوایان لەسەر بێت، لەبەر ئەوە ئەهلی سوننەت و فەرموودە عاقڵترین کەسن و وەکوو هاوەڵان وان لەناو فیرەقەکاندا.

## چەند نموونەیەك لە تێکچوون و هەڵگەڕانەوە عەقڵییەکان

**أ.** ڕازی نەبوونی موشریکەکان کە پێغەمبەرەکەیان ئادەمیزاد بێت، بەڵام ڕازیبوون بەوەی کە خواکەیان بەرد و پەیکەر بێت.

**ب.** ڕێگەی شەریك بۆ خوا قەراردان و گومڕایی و سزای دونیا و کۆتاییان هەڵبژارد بەسەر (تەوحید)و هیدایەت و سەرفرازی دونیا و ئاخیرەتدا، وەکوو هاوەڵان کە چۆن ناوزیندوو و کامڵی دونیا و ئاخیرەت بەدەست بێنن.

**ت.** یا قسەی فەلاسیفە ئەستێرە پەرستەکان پێشخەن بەسەر فەرموودەی خوا و پێغەمبەردا ﷺ، یاسایەکی خواییە لە بەندەکانیدا کە هەرشتێك فەرمانی خوای تێدا بشکێنرێت بەوە سزای دەدات، گەر بە ماڵی تاوان بکات ماڵەکەی لێ دەشێوێنێت، وە گەر بە پلەوپایە و زمان و دڵ و هەر پارچەیەکی لاشەی تاوان بکات لێی دەشێوێنێت گەر هەستیشی پێ نەکات[٣].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٣/ ٢٩٧).

(٢) (٣) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٣/ ٨٦١).

**ث.** وەکوو گاوور و جوولەکەکان هەرچی قەشەکانیان حەلاڵیان بکردایە یا حەرامیان بکردایە با دەقی تەورات و ئینجیلیشی لەسەر نەبوایە گوێڕایەڵیان دەکردن، ئەمە بۆ خۆی (نسخ) و سڕینەوەی شەریعەتیانە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا قبووڵیان نەدەکرد شەریعەتەکەیان بە قورئان سڕدرابێتەوە.

**ج.** یا قەشەکانیان کامڵ و پلەدار دەکرد بە نەبوونی خێزان و منداڵ، کەچی قەراری خێزان و منداڵیان دەدا بۆ خوا و دەیان وت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ﴾ [المَائِدَة : ٧٣]، ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾ [التَّوبَة : ٣٠].

وە ئیبلیس ڕازی نەبووە سوجدە بۆ ئادەم ببات، بەڵام ڕازی بوو سەرکردەی هەموو تاوانێك بێت، وە خەوارج و ڕافیزەکان هاوەڵانی پێغەمبەریان ﷺ کافر دەکرد، بەڵام هەرچی کافر و موشریك و دووڕووی ئەو کاتەی مەککە و مەدینە و دونیا هەیە سەلامەتن لە دەست و زمانیان: «يَقْتُلُونَ أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَيَدَعُونَ أَهْلَ الْأَوْثَانِ»[(١)].

واتە: پێغەمبەر ﷺ لە نیشانە دیارەکانی خەوارجدا دەفەرموێت: موسوڵمان دەکوژن و بێبڕوا و بتپەرستان سەلامەتن لە دەست و زمانیان.

**ح.** جەبرییەکان و قەدەرییەکان بە عەقڵ ویستیان سیفەتی کامڵ بۆ خوا دابنێن لە کارەکانیدا، کۆتاییەکەی ئەویان زوڵم و ستەمی دایە پاڵ خوا بەوەی هیچ کردەوەیەك بە ئیختیاری ئادەمیزاد نییە، ئەمیشیان بێ دەسەڵاتی خستە پاڵ خوا بەوەی هەموو ئیختیارێك لەدەست ئادەمیزاددایە و هیچ بۆ خوا نەمایەوە، وە مورجیئەکان بە عەقڵی تەنیا ویستیان پێناسەی ئیمان بکەن، لە کۆتاییدا (فیرعەون و ئەبو جەهل و ئیبلیس و هەرچی بێبڕوا ...) هەیە هێنایانە ناو دین و ئیمانەوە، خەوارجەکانیش هەموویان دەرکرد لە دین.

**خ.** موعتەزیلە و ئەشعەرییەکان بە عەقڵی ئازاد ویستیان وەصفی خوا بکەن و پاکڕاگری بکەن لە هەموو سیفەتێکی ناتەواوی ئادەمیزاد و دروستکراوەکانی، کۆتاییەکەیان باوەڕنەمان بووە بە سیفەتەکانی خوا و شوبهانیان بە (معدومات و ممتنعات ومستحیلات)ەوە، واتە نەبوو

---

(١) رواه البخاري (٣٣٤٤)، ومسلم (١٠٦٤)، وأبو داود (٤٧٦٤)، والنسائي في "الكبرى" (٢٣٧٠)، وأحمد (١١٦٤٨)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (٢/ ٥٤٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩١٠).

ئەستەمەکان کە هەر ببێت یا زاتێکی بێ هیچ وەسف و باس و شوێنێکی وجودە، کۆتاییەکەی لەکارخستن و نەمان و بێبڕواییە (تعطيل والإلحاد).

وە ئەم سەردەمە بەناوی گەڕانەوەی ئیسلام بە (سەردەمیانە و گشتگیری واقعیانە و چوونە ناو دەسەلات)، تا کۆتایی توانەوە لەناو دەسەلاتدا و لەدەستچوون و پاشەکشەیەکی دینی و غەرقبوون لە دونیا و شەهەواتدا.

**حەوتەم:** شکاندنی قەدر و حورمەتی قورئان.

قورئان لای خەواریجەکان بە حەرفییەت خوێندنەوە و کارپێکردنی ڕووکەشە، بەبێ تێگەیشتن و ئاگالێبوونی هەموو دەقەکان و ناوەڕۆك خوێندنەوەیەك لەسەری، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ»[1].

واتە: قورئان دەخوێننەوە بەلام لە قورگیان ناچێتە خوارەوە.

شیعەکانیش بڕیاریان لەسەر ئەوە دا کە قورئان ناتەواوی تێدایە، وەکوو (كليني) دەلێت: «إن القرآن الذي جاء به جبريل إلى محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سبعة عشر ألف آية»[2].

واتە: ئەو قورئانەی جبریل بۆ (محمد)ی ﷺ هێناوەتە خوارەوە حەڤدە هەزار ئایەتە.

لەگەڵ ئەوەشدا شەش هەزار و چەند ژمارەیەکە، واتە نزیکەی دوو لەسەر سێی قورئان یان (یازدە هەزار) ئایەتی قورئان نەما، وە ئیمامەکانیان (معصوم)ن، بەلام قورئان (معصوم) نییە.

وە دەلێت: «إن القرآن لا يكون حجة إلا بقيّم ... وأن علياً قيّم القرآن»[3].

واتە: قورئان بەبێ چاودێرێك نابێت بە بەلگە، وە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) چاودێری قورئانە.

(١) رواه البخاري (٣٦١٠)، ومسلم (١٠٦٤)، وابن ماجه (١٦٨)، وأبو داود (٤٧٦٥)، والترمذي (٢١٨٨)، والنسائي في "الكبرى" (٣٥٥٢)، وأحمد (١٣٠٣)، والدارمي في "السنن" (٢١٠)، والطبراني في "الكبير" (٨٢٦٠)،والحاكم في "المستدرك" (٢٦٤٧)، وابن وضاح في "البدع" (٢٥٨)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩١٣)، والبزار في "المسند" (٥٦٦)، والمروزي في "السنة" (٥٢)، والآجري في "الشريعة" (٣٨)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٥٥٢).

(٢) "أصول الكافي" للكليني (٢/ ١٣٤).

(٣) "أصول الكافي" للكليني (١/ ١٨٨).

وە سۆفیە فەلسەفییەکان وەکوو (حلاج، ابن سبعين، سهروردي، تلمساني ...) سەرچاوەیان ڕای شێخەکان و ئیلهاماتیانە، بۆیە قورئان هیچ بنەمایەکی وەرگرتنی نییە، هەروەك (تلمساني) کاتێك کتێبی "فصوص"ی (ابن عربي الحلاج) دەخوێنێتەوە، یەکێك پێی دەڵێت: ئەمانە هەمووی پێچەوانەی قورئانە، ئەویش دەڵێت: «الْقُرْآنُ كُلُّهُ شِرْكٌ لَيْسَ فِيهِ تَوْحِيدٌ وَإِنَّمَا التَّوْحِيدُ فِي كَلَامِنَا»[1].

واتە: قورئان هەمووی شیرکە و تەوحیدی تێدا نییە، بەڵکوو تەوحید لە قسەی ئێمەدایە.

وە فیرەقە فەلسەفییە کەلامییەکانیش وەکوو (معتزلة، قدرية، جهمية ومرجئة ...) ئەمان زیاتر لەبەر نەگونجاندنی عەقڵ لەگەڵیدا، وەکوو (بشر المريسي) دەڵێت: «ليس شيء أنقض لقولنا من القرآن، فأقروا به في الظاهر، ثم صرفوه بالتأويل»[2].

واتە: شتێك نییە پێچەوانەی قسەکانمان بێت بێجگە لە قورئان، بە ڕووکەش و زارەکی بیخوێننەوە و باوەڕی پێبکەن پاشان ماناکەی لێ بترازێنن بە تەئویل.

ئەم قۆناغانەیەن بڕی بە قورئان: حەرفیەت، پاشان تەحریف بە ناوی تەفسیرەوە، پاشان لەکارخستنی ماناکانی بەناوی (مجاز)ەوە، واتە چەند مانایەکی هەیە، ئەو مانایەی دەیویست بۆی دادەنا و دەی سەپاند بەسەریدا و پاشان تێنەگەیشتن لێی و گەڕانەوەی ماناکانی بۆ لای خوا بەناوی (تفويض)ەوە، کەواتە کاری قورئان بەس خوێندنەوە بێت، واتە بەتاڵکردنەوە لە مانا و مەبەستەکانی خۆی.

پاشان باوەڕنەبوون بەوەی کە خوای گەورە بە حەقیقی قسە و فەرموودەی هەیە، بەڵکوو دروستی کردووە وەکوو دروستکراوەکان و لێی وەرگیراوە بە بیرۆکەی (قرآن مخلوق)ەوە، پاشان هەر سەرچاوەی یاسا و شەرع نییە، بەڵکوو عەقڵ و ئیمامەکان و ئیلهامات سەرچاوەن و (معصوم)ن، (طريقة وشريعة) جیاوازن و پەیوەندیان بە یەکەوە نییە.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢/ ٢٠١).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٥/ ٢١٨).

بێبڕواکانیش باوەڕیان بە هاتنەخوارەوەی قورئان نەبوو، بە پێغەمبەریان دەوت (خۆی هەڵی بەستووە)، پاشان وتیان: ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ۝٢٥﴾ [المدثر: ٢٥]. واتە: ئەمە قسەی بەشەرە و قسەی خوا نییە، پاشان دەیان وت شیعرە و سیحرە.

وە هەروەها سوننەتیش: خەواریجەکان بە بەڵگەی ئەوەی کە بەس قورئان بەڵگەیە: «زعماً منهم على ما قيل أن لا حجة إلا القرآن»[1].

باوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ کرد بە «وَإِنَّمَا صَدَّقُوهُ فِيمَا بَلَغَهُ مِنْ الْقُرْآنِ دُونَ مَا شَرَعَهُ مِنْ السُّنَّةِ الَّتِي تُخَالِفُ بِزَعْمِهِمْ ظَاهِرُ الْقُرْآنِ»[2].

واتە: لە گەیاندنی قورئاندا بەبێ ڕوونکردنەوەی سوننەت، کە بە قسەیان دژایەتی ڕووکەشی قورئان دەکات.

ئەوە شیعەکانیش لەبەر تەکفیرکردنی هەموو صەحابە «بَلْ كَفَرُوا إِلَّا نَفَرًا قَلِيلًا»[3]. بێجگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت، وە دەڵێن: «كان الناس أهل الردة بعد النبي صلى الله عليه وسلم إلاّ ثلاثي: المقداد بن الأسود، وأبو ذر الغفاري، وسلمان الفارسي»[4].

واتە: خەڵکی هەمووی هەڵگەڕاوە بوون لە دین پاش پێغەمبەری خوا ﷺ بێجگە لە (میقدادو ئەبو زەڕو سەلمانی فارسی) نەبێت.

ئیتر لە کێوە فەرموودە وەربگیرێت؟!

وە فیرەقە کەلامییەکانیش دابەشکردنیان بۆ فەرموودە دانا بەناوی (المتواتر والآحاد)، ئەمە بووە بڕیاری کارپێکردن، نەك پلەی فەرموودەکە (صحیح) یا (ضعیف)، کارکرا بە (متواتر)، وە (آحاد) لاخرا، گەر هەر پلەیەکی (صحیح)یشی هەبێت.

---

(١) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص١٨٤.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٩/ ٧٣).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣٥٦).

(٤) "رجال الكشي" ص٨، "أصول الكافي" للكليني (٢/ ٢٤٤)، "أصول الشيعة" للقفاري (٢/ ٥١٧).

لەبەر ئەوەی عەقڵ بە گومانەوە سەیری ئەو فەرموودانە دەکات کە ژمارەی ڕاوییەکانی کەمن، وە گومانیش کاری پێناکرێت، بەڵام لە کۆتا کاریاندا (موعتەزیلە و ئەشعەری)یەکان بە هیچ شێوەیەك فەرموودەیەك پێچەوانەی یاسا و ڕێسا عەقڵییەکانیان بوایە کاریان پێنەدەکرد، گەر (متواتر)یش بوایە، لەبەر ئەوەی (قطعي) نین، بەڵکوو (ظني)ن، عەقڵ بە گومانە لێیان.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أَنَّ الْمُعَظِّمِينَ لِلْفَلْسَفَةِ وَالْكَلَامِ ... هُمْ أَبْعَدُ عَنْ مَعْرِفَةِ الْحَدِيثِ وَأَبْعَدُ عَنْ اتِّبَاعِهِ مِنْ هَؤُلَاءِ. هَذَا أَمْرٌ مَحْسُوسٌ بَلْ ... مِنْ أَجْهَلِ النَّاسِ بِأَقْوَالِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَحْوَالِهِ ... لَا يُمَيِّزُونَ بَيْنَ مَا قَالَهُ الرَّسُولُ وَمَا لَمْ يَقُلْهُ بَلْ قَدْ لَا يُفَرِّقُونَ بَيْنَ حَدِيثٍ مُتَوَاتِرٍ عَنْهُ وَحَدِيثٍ مَكْذُوبٍ مَوْضُوعٍ عَلَيْهِ. وَإِنَّمَا يَعْتَمِدُونَ فِي مُوَافَقَتِهِ عَلَى مَا يُوَافِقُ قَوْلَهُمْ سَوَاءٌ كَانَ مَوْضُوعًا أَوْ غَيْرَ مَوْضُوعٍ»[(١)].

واتە: ئەهلی فەلسەفە دوورترین کەسن لە فەرموودە و شوێنکەوتنی، بەڵکوو نەزانترین کەسن بە فەرموودە و ژیانی پێغەمبەر ﷺ، وە بگرە جیاوازی نێوان فەرموودە و ئەوەی کە فەرموودە نییە نازانن، ئەوەی کە دەگونجێت لەگەڵ بیروڕایاندا دەیکەنە بەڵگە، گەر هەڵبەستراو بێت یاخود نا.

وە لەلایەکی تریشەوە باوەڕیان بە دادوەری صەحابە نییە و هۆکاری کێشەکانی نێوانیانە، وە گومانیان لە ئیمانیان هەیە، بڕیاری فاسقیان بەسەردا دەدەن، وە بە پلەی (منزلة بين منزلتين) لە نێوان کوفر و ئیماندا ناویان دەبەن.

وە سۆفییەکانیش ڕێگەکانیان جیا کردووەتەوە بەناوی (حقيقة وشريعة)، حەقیقەت پلەی شێخەکانیانە و هاتووە و قابیلی هەڵە و گومڕایی نین، بەڵکوو (علم الباطن) ناوەڕۆك خوێندنەوەیان هەیە بۆ دەقەکان، پلەیان پلەی (معصوم)یەتە، هەرچی لەوانەوە دەرچێت مامەڵەی دەقی بۆ دەکرێت، بگرە پێش دەقەکانیش دەخرێت، لەبەرئەوە فەرموودەکان کار و باسیان نییە[(٢)].

(١) "مجموع الفتاوى" (٤/ ٩٥)، و "أسباب الوقوع في البدع" لسعود بن سعد العتيبي ص٥٧.

(٢) "منهج الإستدلال على مسائل الإعتقاد عند أهل السنة والجماعة" لعثمان بن علي حسن (٢/ ٦٧٠) رسالة ماجستير، جامعة بن سعود - رياض.

**هەشتەم:** یەکێك لە بەرهەمە تاڵەکانی ئەم یاسا و ڕێگە عەقڵییانە: «ولهذا تجد كثيراً من هؤلاء لما لم يتبين له الهدي في طريقة نكص علي عقبيه، فاشتغل باتباع شهوات الغي في بطنه وفرجه أو رياسته وماله ونحو ذلك، لعدم العلم واليقين الذي يطمئن إليه قلبه، وينشرح له صدره.

وفي الحديث المأثور عن النبي صلي الله عليه وسلم "إِنَّ أَخْوَفُ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ: شَهَوَاتُ الْغَيِّ فِي بُطُونِكُمْ وَفُرُوجِكُمْ، وَمُضِلَّاتُ الْهَوَى"»[(١)].

واتە: زۆری ئەمانە کاتێك هیدایەتیان بۆ ڕوون نەبووەوە لە ڕێگە عەقڵییەکانیانەوە پاشەوپاش گەڕانەوە تێکەڵی حەز و ئارەزووەکانی ورگ و شەهەوات بوون، لە دەسەڵات و ماڵ و لەبەر نەبوونی زانستی دروست و نەگەیشتنە دڵنیایی تەواو لە بوارە دینییەکەیاندا، نەگەیشتنە ئاسوودەیی تەواوی دڵ و دەروونی ئیمانی.

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «وتجد أَئِمَّة أهل الْعلم من أهل الْبِدْعَة والفرقة من أهل الْإِيمَان والنفاق يصنفون لأهل السَّيْف وَالْمَال من الْمُلُوك والوزراء فِي ذَلِك ويتقربون إِلَيْهِم بالتصنيف فِيمَا يوافقهم كَمَا صنف كتاب تَحْلِيل النَّبِيذ لبَعض الْأُمَرَاء وَهُوَ الكرخى وَقد صنف الجاحظ ... وكما صنف ابْن فورك ... وَأَبُو المعالى ... لنظام الْملك وكما صنف الرَّازِيّ كتاب الملخص فِي الفلسفة لوزير وقته زُهَيْر وكتابا فِي أَحْكَام النُّجُوم لملك وقته عَلَاء الدّين وكتابا فِي السحر وَعبادَة الْأَوْثَان لأم الْملك وكما صنف السهروردي الحلبى الْمَقْتُول الألواح الْعمادِيَّة»[(٢)].

واتە: پێشەوایانی زانست لە ئەهلی بیدعە نووسینێکی زۆریان بۆ دەسەڵات نووسیوە و بە هۆکاربوونی نزیکبوون لێیان و گونجاندن لەگەڵیان، تەنانەت لە بواری سیحر و ئەستێرە و بورجەکان نووسیویانە بۆ خۆ نزیککردنەوە، وەکوو کتێبی "السر المكتوم في مخاطبة الشمس والنجوم" ی ئیمامی (الرازي) کە هەزار دیناری ئەو وەختەی لەسەر وەرگرتووە لەلایەن

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٦٥)، و "الصواعق المرسلة" لابن القيم (٣/ ١٨٤)، والحديث رواه أحمد في "المسند" (١٩٧٧٢)، وقال محققه (شعيب الأرنؤوط): رجاله ثقات رجال الشيخين، ورواه الطبراني في "الصغير" (٥١١)، والبزار في "المسند" (٣٨٤٤).

(٢) "الاستقامة" لابن تيمية (١/ ٤٣ - ٤٥).

دەسەلاتەوە و سیحرەکانی (تنكلو شاه البابلي وطمطم الهندي وابن وحشية) ى تیادا خڕ کردووەتەوە[1]، وە (كرخي وجاحظ وابن فورك والجويني وسهروردي)یش هەموویان بۆ خزمەتی دەسەلات شتیان بۆ نووسیون، بە حەلالکردنی ئەوانەی پێیان خۆشە.

**نۆیەم:** شێواندنی بەهای عەقڵ، کە خۆی گەورەترین بەهای خواییە بۆ ئادەمیزاد، هۆکاری پلە بەرزییە بەسەر بوونەوەرەکانی تردا، ئەمەش بە شێواندنی ڕێگە ڕاستی و دروستییەکەی خۆی، «إِنَّ الْعَقْلَ الصَّرِيحَ لَا يُخَالِفُ النَّقْلَ الصَّحِيحَ»[2].

واتە: عەقڵێکی ڕەوان و دروست دژایەتی دەقێکی ڕاست ناکات.

وە گەر بڕیاری دژایەتی پێبدەن، ئەوا لە دەقە شەرعییەکە بە تەواوی و دروستی تێنەگەیشتوون، بەڵکوو پێچەوانەی مەبەست و مانا و دارشتنەکەی تێگەیشتوون و دژە بەڵگەی عەقڵییان بۆ دروست کردووە، ئەم مانا بۆدروستکردنە بەتاڵە، دژایەتی مانا شاراوە شەرعییە دروستەکە ناکات.

زۆری ئەو بەڵگە عەقڵییانەی کە دژایەتی شەرعییەکانی پێدەکەن «شبهات فاسدة يعلم بالعقل بطلانها بل يعلم بالعقل ثبوت نقيضها الموافق للنقل ... الجاهل يظن أن تلك الشبهة عقلية وهي جهلية خيالية من جنس شبه السوفسطائية»[3].

واتە: لێتێکچوونێکی هەڵەیە بە عەقڵ دەزانرێت، بەڵکوو عەقڵ پێچەوانەکەی پشتگیری دەکات کە گونجاوە لەگەڵ شەرعدا، نەزانیش وا دەزانێت بەڵگەی تەواوی عەقڵێن، بەڵکوو نەزانین و خەیالاتن لەسەر شێوەی (سۆفسەتائییە وجوودییەکان).

لەبەر ئەوەی عەقڵ هەڵە دەکات، وەکوو چۆن هەستەکان هەڵە دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا حوکمی هەستەکان بەهێزترە تاوەکوو عەقڵ، وە ئەو زانستە نادیارانەی زانست دەرکی پێدەکات چەندەها قاتی ئەو زانستانەیە کە هەست و عەقڵ دەرکیان پێدەکات، لەبەر ئەوە بیستن بەهێزترە تا

---

(١) "أسباب الوقوع في البدع" لسعود بن سعد العتيبي ص٣١٠.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ٦٦٥)، "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٣/ ٨٢٩).

(٣) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٣/ ٨٢٩)، و (٤/ ١٢٠٧).

بینین: ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ﴾ [الإسراء: ٣٦]، بۆیە پێشی خستووە لەبەر ئەوەی زانیاری لەسەر «المعدومة والموجودة والحاضرة والغائبة والعلوم التي لا تدرك بالحس»[(١)]. نادیار و دیار و ئامادە و دوور و ئەو زانستانەی بە هەست پێی نازانرێت لە بیستنا خڕ دەبێتەوە، ئەوەی بە چاو دەبینرێت بەهێز و تەواوترە، وە ئەوەی بە بیستن دەبیسترێت فراوانترە، وە ئەو بوارە عەقڵییانەی دژایەتی شەرعی پێ دەکەن لەوانە بەهێزتر یاخود وەکوو ئاستی خۆی بەڵگەی عەقڵی هەیە پشتگیری دەقە شەرعییەکان دەکات، مادام بۆچوون و پێچەوانەی عەقڵی هەبێت بۆ عەقڵییەکان؛ ئەوا توانای دژایەتیکردنی نابێت.

وە گەر پیاچوونەوەی قسە عەقڵییەکان بکەین بەرامبەر دەقەکان دانراوە دوو بابەتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

**یەکەم:** جیاوازی بیروڕایەك لە نێوان خۆیاندا بە شێوەی دژ و هەڵوەشاندنەوەی یەکتری «العقل الصريح دل علي النفي، والآخر ... دل علي الإثبات ... وأما الفلاسفة فلا يجمعهم جامع، ... وأكثر الفضلاء العارفين بالكلام والفلسفة، ... تجدهم فيه حيارى»[(٢)].

واتە: لێرەدا عەقڵ دەیسەلمێنێت وە لەولاشەوە هەڵی دەوەشێنێتەوە، خۆ فەیلەسووفەکانی کۆکەرەوەیەك کۆیان ناکاتەوە، بەڵکوو ئەهلی کەلام و فەلسەفەی موسوڵمانان ئەوە هەموویان حەیرانن.

**دووەم:** سەرچاوەی قسەکانیان بەبێ عیلم و زانستە، بەڵکوو گومان و بە خەیاڵ دانانە: ﴿إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴿١٠﴾﴾ [الذاريات: ٨ - ١٠]. لەسەر قسەیەکی جیاوازن بەرامبەر (محمد) ﷺ، ئەوەی پشتی لێ دەکات و بە درۆی دەزانێت؛ پشتکردنە لە ئیمان، وە خوا ئەوانە بکوژێت کە بەبێ زانست قسە لەسەر خوا دەکەن[(٣)].

خوای گەورە سوێند دەخوات ئەوەی فەرموودەکەی ڕەت دەکاتەوە بەردەوام لە جیاوازی و دووبەرەکایەتیدایە: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ ... إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾﴾ [الذاريات: ١، ٨].

---

(١) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٣/ ٨٧٣).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ١٥٦ - ١٥٩).

(٣) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي ص٨٠٨.

بۆیە پەنا دەبەنە بەر قسەکانی «عمدوا إلى ألفاظ مجملة مشتبهة تحتمل في لغات الأمم معاني متعددة وصاروا يدخلون فيها من المعاني ماليس هو المفهوم منها في لغات الأمم، ثم ركبوها وألفوها تأليفاً طويلاً بنوا بعضه على بعض، وعظموا قولهم، وهولوه في نفوس من لم يفهمه، ولا ريب أن فيه دقة وغموضاً لما فيه من الألفاظ المشتركة والمعاني المشتبهة، فإذا دخل معهم الطالب وخاطبوه بها تنفر عنه فطرته فأخذ يعترض علهم قالوا له: أنت لا تفهم هذا، وهذا لا يصلح لك، فيبقى ما في النفوس من الأنفة والحمية يحملها على أن تسلم تلك الأمور قبل تحقيقها عنده، وعلى ترك الاعتراض عليها خشية أن ينسبوه إلى نقص العلم والعقل، فهذا أصل ضلال من ضل من أهل النظر والبحث في المعقولات ... فالواجب على من يريد كشف ضلال هؤلاء وامثالهم أن لا يوافقهم على لفظ مجمل حتى يتبين معناه ويعرف مقصوده فيكون الكلام في معنى معقول يتوارد النفي والإثبات فيه على محل واحد»[(١)].

واتە: پەنایان بردووەتە بەر چەند وشەیەکی کورت لە ژێریدا مانای لەیەکچوو و شاراوەی تێدایە لە زمانەکانی تردا چەند مانای جیاوازی هەیە، چەند مانایەکی تێنەگەیەنراو و نادیاریان لە زمانی گەلاندا تێکەڵ کردووە، پاشان دایان ڕشتووە بە شێوەیەکی دووروودرێژ، هەندێکیان پەیوەست کردووە بە هەندێکیانەوە، بیرکردنەوەو بۆدانانی ڕێژە و درێژکردنەوەی تێگەیشتن و پێشخستنیان بۆ کردووە، پاشان گەورەیان کردووە لای کەسانێك لێی تێناگەن، بێگومان ووردەکاری و نادیاری تێدایە لەبەر وشە کورت و مانا هاوشێوەکان، وە گەر قوتابییەك گوێی لێبێت بە دەروون پاکی و فیترەتی خۆی دژایەتی دەکات، ئەوانیش ڕووی ڕەخنەی تێدەکەن و دەڵێن تۆ تێناگەیت و ئەمە بۆ تۆ ناشێت، لە ناخی ئادەمیزاددا غیرەتی خۆپاراستن و حەز بە هاودەمیکردن هۆکار دەبن بۆ خۆبەدەستەوەدان لەم بابەتانە پێش شیکردنەوە، وە واز لە ڕەخنە دێنێت لە ترسی ئەوەی نەیخەنە پاڵ ناتەواوی عەقڵ و زانست، ئەمەیە بناغەی هەموو گوێڕایەڵییەکان کە خاوەن تێڕوانین و توێژینەوە عەقڵییەکان بەکاری دێنن، پێویستە بۆ دەرخستنی

---

(١) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٣/ ٩٩٥)، "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٢٩٥).

گومڕایی ئەمانە و هاوشێوەکانیان پشتگیری وشە کورتەکانیان نەکەن، تا مانا و ڕوونکردنەوەی تەواو لـەسەریان بەدەست دێت و مەبەستیان دەردەکەوێت، تا قسەکە لـە مانایەکی وەرگیراودا بەدی دەکرێت، ئەو کاتە لـە یەك شوێندا بە بوون و نەبوون ڕووی تێدەکرێت، نەك لـە وشەیەکی هاوشێوە و شاراوەدا، خۆ ئەگەر عەقڵ شایستەی بیرکردنەوە نەبێت چۆن قورئان ئەو هەموو داواکارییەی لێ دەکات بۆ بیرکردنەوەو گەیشتنە ئامانج؟ وەکوو دەفەرمویێت: ﴿لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [الأعراف: ١٧٦]، ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [يونس: ٢٤]، ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ [النساء: ٨٢]، ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾، ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾.

وە گەر عەقڵ دژایەتی دەقەکان بکات چۆن پێغەمبەران و کتێبەکانی دەنێرێت بۆ نەمانی پاساو و بەڵگە؟ وەکوو دەفەرموێت: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ﴾ [النساء: ١٦٥]. پێشخستنی قسەی (مەخلوقات) بەسەر قسەی (خوا و پێغەمبەرەکەیدا) و بڕیار و بۆچوونی عەقڵەکان ویست و ئارەزووەکانی مرۆڤ یاسا بێت، ئەم جۆرە بڕیارە قسە و کاری بێبڕوایان و دووڕووەکان بووە، ئەمانەش پاشکۆ هەڵگری میراتی ئەوانن.

خوای پەروەردگار فەرمانی داوە پێش فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی نەکەون، وەکوو دەفەرموێت: ﴿لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ [الحجرات: ١]. وە تەنانەت دەنگیان بەسەر دەنگی پێغەمبەرەکەیدا بەرز نەکەنەوە، چ جای بڕیاردان و مانا گۆڕین و عەقڵ پێشخستن و ... .

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٢﴾ [الحجرات: ٢].

واتە: ئەی ئیمانداران دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز مەکەنەوە وەکوو نێوانی خۆتان، تاوەکوو کردارەکانتان نەسڕێتەوە و پێیشی نەزانن.

گەر دەنگ بەرزکردنەوە سڕینەوەی کارە چاکەکان بێت؛ ئەبێت حاڵی ئەمانە چۆن بێت؟!

کە بڕیارە عەقڵی و ئارەزووەکانیان پێش دەخەن و قورئان و فەرموودە دەکەنە پاشکۆ.

## ٤. خەوبینینەكان.

هەندێك لە بیدعەكاران خەوبینینەكان دەكەنە بەڵگە و سەرچاوە، بە جۆرێك لە وەحی و ئیلهامی خوایی دەزانن، بە هۆكارییەوە كردن و نەكردنی كارەكانیان پێوە پەیوەست دەكەن، وە تەنانەت بە بەشێك لە سەرچاوەی تەفسیری قورئان و یەكلاكەرەوەی پلەی فەرموودەكان و بەهێز و لاوازی یاسا فیقهییەكانی دادەنێن.

ئیمامی (الغزالي) رحمه الله دەڵێت: «وقد قرب الله تعالى على خلقه بأن أعطاهم نموذجاً من خاصية النبوة، وهو النوم، إذ النائم يدرك ما سيكون من الغيب، إما صريحاً وإما في كسوة مثال يكشف عنه التعبير»[(١)].

واته: خوای پەروەردگار نموونەیەكی تایبەتی پێغەمبەرایەتی نزیك خستووەتەوە لە بەندەكانی، ئەویش خەوە، خەوتوو دەرك دەكات بە ڕووداوەكان لە غەیبەوە ڕاستەوخۆ، یا لە پۆشاكێكی هاوشێوەدا تەعبیری خەوەكان دەری دەخات.

ئەم قسەیەی (الغزالي) هەمان بۆچوونی (فارابي)یە لە پێناسەی (وەحی)دا، كە بە هێزی (الفيض والاشراق) واته عەقڵی بەهێز و ڕێژە و بۆدەركەوتوو ناوی دەبات.

ئەو هێزەی لە عەقڵێكی بەهێزدایە كە جیهانی خواروو بە سەرووە دەبەستێتەوە دەتوانێت هەموو ئەو شێوە و خەیاڵانەی كە هەیەتی بۆی بنەخشێنێت و شتی لێ وەربگرێت (واتە وەحی بینینی جبریل و فەرموودەی خوا لێوەرگرتنی حەقیقەتی نییە، بەڵكوو خەیاڵە) لە بەرهەمی عەقڵێكی بەهێزدا بۆ خاوەنەكەی دروست دەبێت.

ئەم بۆچوونەی (فارابي)ش لە (ئەرستۆ)وە وەری گرتووە كە باسی بینینی خەو دەكات، ئەمان پێناسە و ناسینی (وەحی)یان هێناوەتە ژێر بارییەوە[(٢)].

(١) "المنقذ من الظلال" ص١٨٢، ١٨٣.

(٢) "قانون التأويل" للإشبيلي ص٢٦٦ بتحقيق محمد السليماني، و "الفلسفة الإسلامية منهج وتطبيق" لدكتور ابراهيم بيومي مدكور ص١٢٤ –١٣٨، و "كتاب الروح" لابن القيم ص٣٠.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویت: «الرُّؤْيَا ثَلَاثَةٌ: فَرُؤْيَا الصَّالِحَةِ بُشْرَى مِنَ اللهِ، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَرُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسَهُ»[(١)].

واتە: خەو بینین سێ جۆرە:

١. خەوێکی باش کە لە خواوەیە.

٢. خەوێك کە مایەی خەفەتە لە شەیتانەوەیە.

٣. خەوێك کە بە خەیاڵییەوە خەوتبێتی.

کەواتە ڕاست و دروستی لە خەودا پارێزراو نییە: «وَأَمَّا رُؤْيَا غَيْرِهِمْ فَتُعْرَضُ عَلَى الْوَحْيِ الصَّرِيحِ، فَإِنْ وَافَقَتْهُ وَإِلَّا لَمْ يُعْمَلْ بِهَا»[(٢)].

بێجگە لە خەوی پێغەمبەران ﷺ هەر خەوێکی تر بێت دەدرێتە پێش قورئان و فەرموودەی (صحیح)، گەر گونجا وەکوو پاشکۆ و هاودەمێك لەدوای بەڵگەکان دادەنرێت، وە گەر نا؛ ئاوڕی لێ نادرێتەوە.

کەواتە کارکردن هەر بە وەحییە، وە سوودی خەوەکەش ئاگادارکردنەوە و مژدە و هاودەمییە.

(ابن الوزير المعلمي) رحمه الله دەڵێت: «اتفق أهل العلم على أن الرؤيا لا تصلح للحجة، وإنما هو تبشير وتنبيه وتصلح للإستئناس بها إذا وافقت حجة شرعية صحيحة»[(٣)].

واتە: کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە خەو نابێتە بەڵگە، بەڵام موژدە و ئاگادارکردنەوەیە و ئەبێتە دڵخۆشکەر گەر بێت و گونجا لەگەڵ بەڵگە شەرعییە (صحیح)ەکاندا.

وە گەر بێت و خەوەکە چاك بێت و لە پیاوێکی ساڵحەوە بێت بۆ هێنانەدی؛ مەرجەکانی دروستی خەوەکە شوێنی تێڕوانینە[(٤)].

---

(١) رواه مسلم (٢٢٦٣)، وأبو داود (٥٠١٩)، والترمذي (٢٢٧٠)، وأحمد (١٠٥٩٠)، وفي "صحيح الجامع الصغير" (٣٥٣٣) بمفهومه.

(٢) "مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين" (١/ ٧٥).

(٣) "التنكيل بما في تأنيب الكوثري من الأباطيل" (٢/ ٢٤٢).

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٨٠).

زۆری بیدعەکاران خەو بینین بە پێغەمبەرەوە ﷺ دەکەنە بەڵگە، بە گوێرەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي»[(١)].

واتە: ئەوەی لە خەودا من ببینێت ئەوە منی بینیوە، شەیتان ناتوانێت خۆی بخاتە سەر شێوەی حەقیقی من.

(محمد بن سیرین) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «إِذَا رَآهُ فِي صُورَتِهِ»[(٢)].

واتە: ئەگەر بە شێوەی ڕاستی و دروستی خۆی ببینێت.

وە (عبدالرحمن ی کوڕی عەباس و حەسەنی بەصری) ئەگەر یەکێك خەوی بە پێغەمبەرەوە ﷺ بینیایە دەیان وت لە شێوەی (حەسەنی کوڕی عەلی) دەچوو؟ ئەگەر بیوتایە بەڵێ دەیوت بینیوتە[(٣)].

زانایانی تەعبیر دەڵێن: ئەشێت شەیتان بێتە خەوی کەسێك و هێمای بۆ بکات بۆ پیاوێك و بڵێت ئەوە پێغەمبەر فلانە و لە کەسەکەی تێك بدات و ئەوکات ئەو شێوەیە فەرمان و نەهییەکی پێچەوانەی شەرعی پێ بڵێت و ئەویش وابزانێت لە پێغەمبەرەکەوەیە، ئەمە متمانەی پێ ناکرێت[(٤)].

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَيَتَّفِقُ هَذَا كَثِيرًا الْمُتَرَسِّمِينَ بِرَسْمِ التَّصَوُّفِ، وَرُبَّمَا قَالَ بَعْضُهُمْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّوْمِ، فَقَالَ لِي كَذَا، وَأَمَرَنِي بِكَذَا، فَيَعْمَلُ بِهَا وَيَتْرُكُ بِهَا؛ مُعْرِضًا عَنِ الْحُدُودِ الْمَوْضُوعَةِ فِي الشَّرِيعَةِ، وَهُوَ خَطَأٌ، لِأَنَّ الرُّؤْيَا مِنْ غَيْرِ الْأَنْبِيَاءِ لَا يُحْكَمُ بِهَا شَرْعًا»، و «لَا يَحْكُمُ بِمُجَرَّدِ الرُّؤْيَا حَتَّى يَعْرِضَهَا عَلَى الْعِلْمِ؛ ... وَعَلَى الْجُمْلَةِ، فَلَا يَسْتَدِلُّ (بِالرُّؤْيَا) فِي الْأَحْكَامِ إِلَّا ضَعِيفُ الْمُنَّةِ.

نَعَمْ؛ يَأْتِي الْمَرْئِيَّ تَأْنِيسًا وَبِشَارَةً وَنِذَارَةً خَاصَّةً، بِحَيْثُ لَا يَقْطَعُونَ بِمُقْتَضَاهَا حُكْمًا، وَلَا يَبْنُونَ عَلَيْهَا أَصْلًا، وَهُوَ الِاعْتِدَالُ فِي أَخْذِهَا، حَسْبَمَا فُهِمَ مِنَ الشَّرْعِ فِيهَا، وَاللهُ أَعْلَمُ»[(٥)].

---

(١) رواه البخاري (٦٩٩٣)، ومسلم (٢٢٦٦)، وأبو داود (٥٠٢٣)، والترمذي (٢٢٧٦)، والنسائي في "الكبرى" (٧٥٨٢)، وابن ماجه (٣٩٠١)، وأحمد (٤١٩٣)، والدارمي في "السنن" (٢١٨٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٠٤٦٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٠٥٢)، والطبراني في "الكبير" (١٢٤٠٣)، والبزار في "المسند" (٢٠٧٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٢٨٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٣٣٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٦١٧).

(٢) رواه البخاري (٦٩٩٣).

(٣) (٤) "فتح الباري" لابن حجر (١٢/ ٣٨٤).

(٥) "الاعتصام" (١/ ٣٣١ - ٣٣٦).

واته: ئەم بینینی خەوانە کەسانی خۆڕازێنەرەوە بە تەسەوف باسی دەکەن، ڕەنگە هەندێکیان بڵێن: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لە خەودا ئەوەی پێ وتووم، یا فەرمانی ئەوەی پێ کردووم، ئەمیش کاری پێ بکات و ڕەچاوی فەرمانەکانی شەرع نەکات، ئەمە هەڵەیە، لەبەر ئەوەی خەوی بێجگە لە پێغەمبەران لە ڕووی شەرعەوە نابێت بە یاسا و کاری پێ ناکرێت.

کار بە خەو ناکرێت تا نەدرێت بە شەرع، وە بەکورتی: کەس خەو ناکاتە بەڵگە لە حوکمەکاندا بێجگە لە عەقڵ لاواز نەبێت، بەڵێ بۆ زانایان خەو موژدە و هاودەم و ئاگادارکەرەوەی تایبەتە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ یاسایەکی لەسەر داناڕێژن و بنەمایەکی لەسەر دروست ناکەن، ئەمە شێوازی تەواوی مامەڵەکردنە لەگەڵ خەودا، وە بەو شێوەیەی تێگەیشتووین لە شەرعدا، خوای گەورەش زاناترە.

بەڵکوو هەندێك لە تەریقە سۆفییەکان بینینی پێغەمبەر ﷺ بە حەقیقی باس دەکەن و شوێنی تایبەتی بۆ دەڕازێننەوە، وەکوو تەریقەی (تیجانی) لە ئەفریقا: «ولا يكمل العبد في مقام العرفان حتى يصير يجتمع برسول الله صلى الله عليه وسلم يقظة ومشافهة»[(١)].

واته: بەندەکان ناگەنە مەقامی عیرفان هەتا کۆ نەبنەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بە خەبەربوون، وە قسەی لەگەڵدا نەکەن.

فەرموودەیەك دەکەنە بنەما بۆ خۆیان کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ ...»[(٢)].

واته: ئەوەی منی بینی لە خەودا ئەوا من دەبینێت لەکاتی خەبەر بووندا.

بەڵام بێئاگاییان لە شێوەی تێگەیشتنی فەرموودە هۆکارە بۆ ئەم بۆچوونانە.

لەبەر ئەوە زانایان دەڵێن ئەستەمە پێغەمبەر ﷺ دوای وەفاتی ببینرێت، وە ئیمامی (السخاوي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لم يصل إلينا ذلك عن أحد من الصحابة، ولا عن من بعدهم. وقد

---

(١) "التيجانية" لعلي محمد الدخيل ص١٢٧.

(٢) رواه البخاري (٦٩٩٣)، ومسلم (٢٢٦٦)، وأبو داود (٥٠٢٣)، وأحمد (٢٢٦٠٦)، والطبراني في "الكبير" (٦٦٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٢٨٨).

اشتد حزن فاطمة عليه صلى الله عليه وسلم حتى ماتت كمدا بعده بستة أشهر على الصحيح وبيتها مجاور لضريحه الشريف، ولم ينقل عنها رؤيته في المدة التى تأخرت عنه»[١].

واته: پێمان نەگەیشتووە لە یەکێك لە هاوەڵانەوە و ئەوانەی دوای ئەوان کە پێغەمبەریان ﷺ بینیبێت، (فاطمة)ی کچی چەندە غەمبار بوو بە وەفاتی پێغەمبەری باوکی ﷺ، بە شێوەیەك دوای ئەو شەش مانگ بە خەفەتەوە مرد،ماڵەکەشی لەپاڵ گۆڕەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەگێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری بینیبێت لەو ماوەیەی دوای ئەو.

بەڵکوو مانای فەرموودەکە وەکوو زانایان دەڵێن مەبەستی پێ ئەوەیە وەکوو ئەوە وایە بە حەقیقی منی بینیوە، نەك من بە حەقیقی لە دونیادا دەبینێت، هەروەکوو لە ڕیوایەتێکی ئیمامی (موسلیم) دا هاتووە: «لَكَأَنَّمَا رَآنِي فِي الْيَقَظَةِ»[٢].

واته: وەکوو منی بینیبێت لە خەبەربووندا.

گەر وا بێت کە هەرکەسێ خەوی بە پێغەمبەرەوە بینی ئەوا لە خەبەر بوونیشدا دەیبینێت؛ ئەوا ئەمانە بەدوای خۆیدا دەهێنێت:

١. ئەوەی دەیبینێت دەبێتە (صەحابە)، وە خەڵك بوون بە (صەحابە)یش هەتاکوو ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت. ئەمەش بێگومان بەتاڵە[٣].

٢. بەردەوامبوونی وەحی و حوکمی تازە وەرگرتن لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لە دوای تەواوبوونی دین و وەفاتی دەهێنێت. ئەمەش بە کۆدەنگی زانایان (إجماع) بەتاڵە[٤].

٣. پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ئاخیرەت و خەوبینەر لە دونیادا نایەتە دی، یان دەبێت وەکوو صەحابە لە دونیادا بینیبێتی، یا لە دوای مردن[٥].

---

(١) "المواهب اللدنية بالمنح المحمدية" لأحمد بن محمد القسطلاني (٢/ ٣٧١)، و "شرح الزرقاني على المواهب اللدنية بالمنح المحمدية" للزرقاني (٧/ ٢٩٢)، و "منهج الإستدلال على مسائل الإعتقاد" لعثمان بن علي حسن ص٦٨٤.

(٢) "صحيح مسلم" (٢٢٦٦)، ورواه أبو داود برقم (٥٠٢٣).

(٣) "فتح الباري" لابن حجر (١٢/ ٣٨٥).

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٨١).

(٥) "مشتهى الخارف الجاني" لمحمد خضر الشينقيطي ص٧٥.

**٤. پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە و زیندووبوونەوەی دوای وەفاتی هەڵوەشاندنەوەی ئەم ئایەتەیە: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ۝٣٠﴾ [الزمر: ٣٠]. تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن**[١].

**٥. گەر بڕیار بدرێت لەسەر بینینی لە دونیادا بۆ ئەوانەی خەویان پێوە بینیبێت، وە پاش خەوەکان نەیەتە دی و نەیانبینیبێت؛ ئەوا بەدرۆ خستنەوەی ئەم فەرموودەیەیە**[٢].

## ٥. پشت بەستن بە ڕیوایەتی هەڵبەستراو و گوماناوی.

بەرنامەی بیدعەکاران ناویان بە خۆیانەوەیە کە دوورن لە بەڵگە و ووردەکارییەکانی، بۆیە هیچ گرنگییەکیان نییە بە ڕاست و دروستی و شێوازی بەڵگەکردن، ڕێگەی زانستی بۆ وەرگرتن (سند) بەرنامە و سیمای ئەهلی سوننەیە، ئەگەر سەیری سەرچاوەکانی تەسەوف و شیعە و کەلامییەکان بکەین زۆر بە ئاشکرا دیارە.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «وَأَمَّا أَهْلُ الْأَهْوَاءِ وَنَحْوُهُمْ: فَيَعْتَمِدُونَ عَلَى نَقْلٍ لَا يُعْرَفُ لَهُ قَائِلٌ أَصْلًا لَا ثِقَةٌ وَلَا مُعْتَمَدٌ. وَأَهْوَنُ شَيْءٍ عِنْدَهُمْ الْكَذِبُ الْمُخْتَلَقُ. وَأَعْلَمُ مَنْ فِيهِمْ لَا يَرْجِعُ فِيمَا يَنْقُلُهُ إلَى عُمْدَةٍ بَلْ إلَى سماعات عَنْ الْجَاهِلِينَ وَالْكَذَّابِينَ وَرِوَايَاتٍ عَنْ أَهْلِ الْإِفْكِ الْمُبِينِ»[٣].

واتە: بیدعەکاران پشت دەبەستن بە دەقێك کە خاوەنی بە هیچ شێوەیەك ناناسرێت، وە نەبوونی متمانە و هیچ جۆرە پشتبەستنێك بوونی نییە لایان، ئاسانترین کار لایان درۆی هەڵبەستراوە، زاناترینیان ئەوەی دەیگەیەنێت ناگەڕێتەوە بۆ بنەماکەی، بەڵکوو هەمووی ئەو بیستنانەیە لە نەزان و درۆزنەکان و گێڕانەوە لە کەسانی درۆ هەڵبەستە.

وە دەربارەی ئیمامی (غەزالی) رحمه الله دەڵێت: «وأبو حامد ليس له من الخبرة والآثار النبوية والسلفية ما لأهل المعرفة بذلك، الذين يتميزون بين صحيحه وسقيمه. ولهذا يذكر في كتبه من الأحاديث والآثار الموضوعة والمكذوبة ما لو علم أنها موضوعة لم يذكرها»[٤].

---

(١) "ذكر الله بين الاتباع والابتداع" لعبدالرحمن محمود خليفة ص٤١٨.

(٢) "فتح الباري" لابن حجر (١٢/ ٣٨٥).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" (٨/ ٢٧٧).

(٤) "درء تعارض العقل والنقل" (٧/ ١٤٩).

واتە: (ئەبو حامید) شارەزایی نەبووە بەسەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و پاشماوەی پێشووەکاندا لە هاوەڵان و تابعین وەکوو ئەهلی خۆی هەیبووە، لەبەر ئەوە لە کتێبەکانیدا فەرموودە و گێڕانەوە هەڵبەستراوە درۆکان باس دەکات، گەر بیزانیایە هەڵبەستراوە نەیدەهێنا.

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «وَلَوْ كَانَ مِنْ شَأْنِ أَهْلِ الْإِسْلَامِ الذَّابِّينَ عَنْهُ الْأَخْذُ مِنَ الْأَحَادِيثِ بِكُلِّ مَا جَاءَ عَنْ كُلِّ مَنْ جَاءَ؛ لَمْ يَكُنْ لِانْتِصَابِهِمْ لِلتَّعْدِيلِ وَالتَّجْرِيحِ مَعْنًى، مَعَ أَنَّهُمْ قَدْ أَجْمَعُوا عَلَى ذَلِكَ، وَلَا كَانَ لِطَلَبِ الْإِسْنَادِ مَعْنًى يَتَحَصَّلُ، فَلِذَلِكَ جَعَلُوا الْإِسْنَادَ مِنَ الدِّينِ»[(١)].

واتە: گەر کاری پارێزەرانی ئەهلی ئیسلام وەرگرتنی فەرموودە بێت لە هەرکوێ بێت و لە هەرکەس بێت؛ ئەوا (تعديل وتجريح) پاڵفتەی ڕاوییەکان هیچ مانایەکی نەدەبوو، وە بەدەستهێنانی سەنەد هیچ بەرهەمێکی نەدەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کۆدەنگی زانایانی لەسەرە، بۆیە سەنەد و بەدواداچوونی ڕێگەی فەرموودەکان بە دین دادەنرێت.

### جۆری فەرموودە کردنە بەڵگە لای بیدعەکاران دوو شێوەیە:

**یەکەم:** ئەوانەی بە دەس ئەنقەست درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ دەکەن، ئەو جۆرە بەناو فەرموودانە هەڵدەبەستن کە گونجاو بێت لەگەڵ بۆچوون و بەرنامە و بیروباوەڕیاندا، ئەوانەی لەم بوارەدا بەناوبانگن (ڕافیزە)کانن، لەبەر ئەوە ئیمامی (شافعی) رحمه الله دەڵێت: «لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ الْأَهْوَاءِ أَشْهَدَ بِالزُّورِ مِنَ الرَّافِضَةِ»[(٢)].

واتە: نەمبینیوە لە کۆمەڵانی هەواوئارەزوو (بیدعەکاران) شایەتی زۆر لەسەر درۆ بدەن لە ڕافیزە زیاتر.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٨٧، ٢٨٨).

(٢) "الكفاية في علم الرواية" للخطيب البغدادي ص١٢٦، و "الإبانة الكبرى" لإبن بطة (٦٨٨)، و "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢٨١١)، و "حلية الأولياء وطبقات الأصفياء" لأبي نعيم (٩/ ١١٤)، و "السنن الكبرى" للنسائي (٢٠٩٠٥).

(ابن تيمية) ﵀ ده‌ڵێت: «وَقَدِ اتَّفَقَ أَهْلُ الْعِلْمِ بِالنَّقْلِ، وَالرِّوَايَةِ، وَالْإِسْنَادِ عَلَى أَنَّ الرَّافِضَةَ أَكْذَبُ الطَّوَائِفِ، وَالْكَذِبُ فِيهِمْ قَدِيمٌ، وَلِهَذَا كَانَ أَئِمَّةُ الْإِسْلَامِ يَعْلَمُونَ امْتِيَازَهُمْ بِكَثْرَةِ الْكَذِبِ»[(١)].

واته: كۆده‌نگی زانایانی فه‌رمووده‌ناسی گێڕانه‌وه‌ و گواستنه‌وه‌ و ڕێگاكانی فه‌رمووده‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه‌ كه‌ شیعه‌ی ڕافیزه‌ درۆزنترین كۆمه‌ڵن، درۆ تیایاندا كۆنه‌، زانایان به‌ ڕێژه‌ی زۆر درۆكردن جیایان ده‌كه‌نه‌وه‌.

**دووه‌م:** كۆمه‌ڵی دووه‌م ئه‌وانه‌ن كه‌ درۆ ناكه‌ن، به‌ڵام فه‌رمووده‌ی (ضعيف وموضوع) هه‌ڵبه‌ستراو ده‌گێڕنه‌وه‌، گرنگی ناده‌ن به‌ پیاچوونه‌وه‌ی گێڕانه‌وه‌كان و پاڵفته‌كردنیان، ئه‌مه‌ بووه‌ته‌ هۆی لادانێكی زۆری به‌رنامه‌یی و گومڕایی و دژایه‌تییه‌كی ئاشكرا له‌ بواره‌ دینییه‌كاندا، هه‌موو مه‌به‌ستێكیان گونجاندن و پاڵپشتییه‌ بۆ بۆچوونه‌كانیان.

(ابن تيمية) ﵀ ده‌ڵێت: «ولهذا نجد جمهور أهل الكلام من أبعد الناس عن معرفة الحديث وأقوال الصحابة، ويذكرون أحاديث يظنونها صحيحة وتكون من الموضوعات المكذوبات، وأحاديث تكون صحيحة متلقاة بالقبول، ... وهم يكذبون بها أو يرتابون فيها»[(٢)].

واته: ده‌بینین زۆری ئه‌هلی كه‌لام دوورترین كه‌سن له‌ ناسینی فه‌رمووده‌ و قسه‌ی هاوه‌ڵانه‌وه‌، كۆمه‌ڵێك فه‌رمووده‌ باس ده‌كه‌ن وا گومان ده‌به‌ن (صحيح) بن، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا درۆ و هه‌ڵبه‌ستراون، وه‌ فه‌رمووده‌ش هه‌ن (صحيح)ن و شوێنی وه‌رگرتنی زانایانه‌، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا به‌درۆی ده‌خه‌نه‌وه‌ و گومانی تیادا دروست ده‌كه‌ن.

### ٦. پاشماوه‌و بیروڕا كۆنه‌كان.

له‌ پاش بڵاوبوونه‌وه‌ی ئیسلام به‌ جیهاندا گه‌لانی جیاواز و ئایین و بیروڕای جیاواز هاتنه‌ ناو بازنه‌ی ئیسلامه‌وه‌، به‌ڵام هه‌ڵكه‌ندنی بیروباوه‌ڕ و دروستبوون له‌سه‌ر بنه‌مای تازه‌ كارێكی ئاسان

(١) "منهاج السنة النبوية" (١/ ٥٩).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" (٨/ ٢٧٧).

نییە، بۆیە سروشتی ئادەمیزادیش خۆگونجاندن و هاودەمییە بە هۆکاری تێکەڵبوونی یەکتری، کە پێی دەوترێت (مدنية الطبع)، لەم ڕووەوە زۆر لە پاشماوەکان گونجێندران لەگەڵ ئیسلامدا، بەجۆرێك لە گونجاندن و پیا هەڵواسین، زۆری ئەو داهێنراوانە بنەما و پاشکۆیەکی ڕابوردووە و ماوەتەوە و ئێستا بە ئیسلام کراوە.

ئەم جۆرە دروستبوونانە لە سەردەمی پێغەمبەرانەوە سەلامی خوایان لەسەر بێت ناو بەناو سەری هەڵداوە، وەکوو:

(أبو واقد الليثي) ﵁ دەڵێت: «خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى حُنَيْنٍ وَنَحْنُ حُدَثَاءُ عَهْدٍ بِكُفْرٍ، ولِلْمُشْرِكِينَ سِدْرَةٌ يَعْكُفُونَ عِنْدَهَا، ويَنُوطُونَ بِهَا أَسْلِحَتَهُمْ يُقَالُ لَهَا ذَاتُ أَنْوَاطٍ. قَالَ: فَمَرَرْنَا بِالسِّدْرَةِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ الله اجْعَلْ لَنَا ذَاتَ أَنْوَاطٍ كَمَا لَهُمْ ذَاتُ أَنْوَاطٍ. فَقَالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " اللهُ أَكْبَرُ، إِنَّهَا السُّنَنُ، قُلْتُمْ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ كَمَا قَالَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ: ﴿ٱجْعَل لَّنَآ إِلَـٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ [الأعراف: ١٣٨]، لَتَرْكَبُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ "»[(١)].

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ چووین بۆ شەڕی (حونەین) و تازە موسوڵمان بووبووین و لە کوفر ڕزگارمان بووبوو، تێپەڕ بووین بەلای موشریکەکاندا دارێکیان هەبوو پێیان دەوت (ذات أنواط)، شمشێرەکانیان پیا هەڵدەواسی و دەمانەوە لە ژێریدا بۆ بەرەکەت، ئێمەش وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دارێك بۆ ئێمە دروست بکە وەکوو موشریکەکان هەیانە، فەرمووی: الله أکبر ئەوە ڕێگا و بیروباوەڕە ئەوەی وتتان، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو داواکارییەیە کە جوولەکەکان بە (موسى) ﵇ یان وت، کاتێك تێپەڕ بوون بەلای گوێرەکەی دروستکراودا کە دەپەرستـرا، ﴿ٱجْعَل لَّنَآ إِلَـٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ [الأعراف: ١٣٨] خوایەك بۆ ئێمە

(١) رواه الترمذي (٢١٨٠)، والنسائي في "الكبرى" (١١١٢١)، وأحمد (٢١٨٩٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٣٧٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٧٠٢)، والطبراني في "الكبير" (٣٢٩١) واللفظ له، وابن بطة في "الإبانة" (٧١٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٠٥)، والمروزي في "السنة" (٣٩)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٧٦)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٥٤٠٨)، و "التعليقات الحسان إلى صحيح ابن حبان" (٦٦٦٧).

دروست بکە وەکوو ئەوان هەیانە.

مێژووی فیرەقەکانیش بۆ هەمان کاریگەر دەگەڕێتەوە، (خەوارج)ەکان لەبەر ئەوەی لادێیی بوون، هیچ زانا و ئەهلی زانستێکیان تیا نەبوو، وە بیرکردنەوەکانیشیان هەمان شێوە بوو، دەیان وت: فەرمووودەمان ناوێت، خۆمان لە قورئان تێدەگەین، وە قورئان دەبێت خۆی حوکم بکات نەك پیاوان لە جیاتی ئەو، واتە خەلیفە نابێت ببێت، وە ئەوەی هەر تاوانێك بکات پێی دەردەچێت لە ئیسلام.

وە (شیعە)کانیش هەڵگری بیروڕای فارسەکانن، وەك باوەڕبوون بە بنەماڵە و پشتاوپشت لە دەسەڵاتی دینی و دونیاییدا، وەکوو پاشایەتی فارسەکان، بۆیە باوەڕیان بە پشتاوپشتی ئیمامەکان هەیە، وە بیروڕای مەزهەبییەکان لە ئیباحیەتدا، وە ڕەگەزایەتی فارسی بە مەزهەب گەرێتیدا، بۆیە پاشماوەی نەورۆز و گۆڕپەرستی و مەرجەعیەت، هەموو ئەمانە بیروڕای فارسە کۆنەکانە لە دینی (مجوس)یەتدا، وە پاشان بۆ پاراستنی بیروڕاکانیان نهێنی تەواو (التقية) ... .

تەسەوفیش تێکەڵکردنی ڕەهبانییەتی گاوورەکان و بۆچوونی تێکەڵبوون لەگەڵ خوادا، وەك بە (مسیح) ﷺ یان دەوت بەشێکە لە خوا، یا کوڕیەتی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ ﴾ [المائدة: ٧٣]. و سڕینەوەی ڕۆحەکان و گواستنەوەی بۆ لاشەیەکی تر (تناسخ الأرواح) بووزییەکان و عیشقی ئیلاهی و تێکەڵکردنی بۆچوون و فەلسەفە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواییەکان لە گاوور و بووزی و زەردەشتییەکان ... لە ئەنجامی ئەم لێکدانە تەسەوف لە دایك بوو، بۆیە دوای گەیشتنی ئیسلام بۆ تورکیا کە پاشماوەی دینی گاوورەکانە تەسەوف هاتە دی، وە لە دوای ئاگرپەرستەکان (مجوسية) و شیعە بە بەرگی دینی دروست بوو.

وە فیرەقە کەلامییەکانیش لە ڕێگای پاشماوەی فەلسەفەی یۆنانی و ڕۆمانییە ئەستێرە پەرستەکانەوە بوو، وە کاریگەری دەستکردی دەستی پاشماوە دینییەکان کاتی خۆی کە کاریگەری ئەو فەلسەفیانەیان لەسەر بووە و گومڕا بوون لە دینی خۆیاندا، وەك (هشام بن عروة) لە باوکیەوە دەڵێت: «لَمْ يَزَلْ أَمْرُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مُسْتَقِيمًا حَتَّى أَدْرَكَ فِيهِمُ الْمُوَلَّدُونَ أَبْنَاءُ سَبَايَا الْأُمَمِ،

فَأَخَذُوا فِيهِمْ بِالرَّأْيِ، فَأَضَلُّوا بَنِي إِسْرَائِيلَ»(١).

واتە: کاری دینی جوولەکەکان (بەنو ئیسرائیل) بە ڕێکی دەڕۆی، تاوەکوو نەوەی کۆیلە و بەندەکانی ژێر دەستی جوولەکەکان گەورە بوون لەناویاندا، بیروبۆچوونەکانی خۆیان تێکەڵ بە دینی جوولەکە کرد و جوولەکەکان گومڕا بوون.

وە ئیمامی (الأوزاعي) ﵀ دەڵێت: «أَوَّلُ مَنْ نَطَقَ فِي الْقَدَرِ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ يُقَالُ لَهُ: سَوْسَنٌ كَانَ نَصْرَانِيًّا فَأَسْلَمَ، ثُمَّ تَنَصَّرَ، فَأَخَذَ عَنْهُ مَعْبَدٌ الْجُهَنِيُّ، وَأَخَذَ غَيْلَانُ عَنْ مَعْبَدٍ»(٢).

واتە: یەکەم کەس باسی قەزاوقەدەری وورووژاند لەناو خەڵکدا پیاوێك بوو لە عێراق، ناوی (سوسن) بوو، گاوور بوو پاشان موسوڵمان بوو پاشان گاوور بووەوە، (معبد الجهني) سەرکردەی قەدەرییەکان ئەم بۆچوونەی لێوە وەرگرت و پاشان (غيلان الدمشقي) لە (معبد) یەوە وەرگرت و فیرقەی قەدەرییەکانی لەسەر دروست بوو.

پاش وەرگێڕانی کتێبە فەلسەفییەکان لە سەردەمی (مأمون) دا بڵاو بووەوە، (أبي فرج الجوزي) ﵀ دەڵێت: «طالعت المعتزلة مثل أبي الهذيل العلاف والنظام ومعمر والجاحظ كتب الفلاسفة فِي زمان الْمَأْمُون واستخرجوا منها مَا خلطوه بأوضاع الشرع ... وأول مسألة اظهروها القول بخلق القرآن»(٣).

واتە: کەسانی موعتەزیلە وەکوو (عەلاف و نیزام و موعەمەری جاحز) خوێندنەوەی کتێبە فەلسەفییەکانیان دەکرد لە سەردەمی (مأمون)دا و تێکەڵیان کرد بە بابەت و ناونیشانە شەرعییەکان، یەکەم بابەت قورئان (مخلوق)ە، واتە وەکوو هەموو دروستکراوەکان خوا دروستی کردووە و قسە بە حەرف و دەنگ و ناردنی (جبريل) بوونی نییە.

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ١٧٢)، وأخرجه ابن عبدالبر في "جامع بيان العلم وفضله" (٢٠١٣، ٢٠١٥) بإسنادين صحيح والآخر حسن (قاله مشهور حسن محققه).

(٢) رواه ابن بطة في "الإبانة" (١٩٥٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٣٩٨)، والفريابي في "القدر" (٣٤٨).

(٣) "تلبيس إبليس" ص٨٧.

وە فیرقەی (النسطورية)كان (الشهرستاني) دەڵێت: «ومن النسطورية من ينفي التشبيه، ويثبت القول بالقدر»[١].

واتە: (نەستۆری)یەکان لە گاوورەکاندا باوەڕیان بە وەسفەکانی خوا و قەزاوقەدەر نەبوو، بیروڕایان وا بوو ئادەمیزاد خۆی کاری خۆی دروست دەکات.

(داود بن أبي هند) دەڵێت: «مَا فَشَتِ الْقَدَرِيَّةُ بِالْبَصْرَةِ حَتَّى فَشَا مَنْ أَسْلَمَ مِنَ النَّصَارَى»[٢].

واتە: قەدەرییەکان لە بەصرە بڵاو نەبوونەوە تاوەکوو گاوورەکان موسوڵمان بوون.

بوونی (عبدالله ی کوڕی سبأ) نموونەیەکی ئاشکرایە لەم بوارەدا، کە پێشتر جوولەکەیەکی دانیشتووی شاری (صەنعا) بوو لە (یەمەن)، موسوڵمان بوو لە سەردەمی ئیمامی (عوسمان)دا، پاشان دەورێکی تێکدان و فیتنەگێڕی گێڕا بە شێوەیەك خەڵکی هاندا لە ئیمامی (عوسمان) بە درۆ و گەورەکردنی شتەکان، تاوەکوو ناوی زڕاند وە خەڵکی عێراق و میسری هێنایە سەر تا لە ماڵەکەی خۆیدا شەهیدیان کرد و پاشان خۆی پەنا دا، تاوەکوو بە ئیمامی (عەلی)شی وت: تۆ خوایت، وە بڵاوی کردەوە چۆن (یوشع ی کوڕی نون) بە وەسیەتی (موسی) ﵇ جێگری بووە، (عەلی)ش بە هەمان شێوە جێگری پێغەمبەرە ﷺ بە وەسیەتی، ستەمی لێ کراوە، وە پاش شەهیدبوونی ئیمامی (عەلی)ش بۆچوونی گەڕانەوەی بڵاو کردەوە، وەکوو چۆن (إلیاس) چوو بۆ ئاسمان پاشان دەگەڕێتەوە بۆ گەڕانەوەی دین و یاسا ئاواش ئیمامی (عەلی) دەگەڕێتەوە[٣].

ئایا بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ دروست نەکراوە بە چاولێکردنی بۆنەی لەدایکبوونی (عیسی) ﵇ ؟! وە ئایا کەش و جۆری دەروێشەکان تقوس و کەشی هیندۆسەکان نییە؟! وە ئایا هەڵبەستنی گوڕ و پەرستنی کاری گاوور و جوولەکەکان نییە؟ وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) "الملل والنحل" للشهرستاني (٢/ ٣٠).

(٢) "الإبانة الكبرى" لابن بطة (١٩٥٩).

(٣) "المقالات" للأشعري (١/ ٨٦)، و "الفرق بين الفرق" للبغدادي (٣٣٥)، و "الملل والنحل" للشهرستاني (١٧٤)، و "بذل المجهود" لعبدالله الجميلي (١/ ١٤٤)، و "الشيعة والتشيع" لإحسان ظهير (٦١).

دەفەرموێت: «لَعَنَ اللهُ الیَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ»[(١)].

واتە: نەفرەتی خوا لـە گاوورو جوولـەکەکان بێت، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکرد بە مزگەوت.

وە ئایا شێخی تەریقە و مەرجەعیەتەکان وەرنەگیراوە لـە ڕاهیبەکانی بوزا و حاخامی جوولـەکەکان و قەشە و پاپای گاوورەکان؟! وە هەروەها تەسبیح و کۆرس و کردنی زیکرەکان بە دەنگی بەرز و تەکیە و خانەقا و فاڵچیەتی و خوێندنەوەی بورجەکان و هەڵواسینی چاو و دەست و ... بە ماڵەکاندا پاشماوەی زەرادەشت و سابیئییەکان و گاوور و جوولـەکەکان و ئایینە پێشووەکان نییە؟!



---

(١) رواه البخاري (١٣٩٠)، ومسلم (٥٢٩)، والنسائي في "الكبرى" (٧٨٤)، وأحمد (١٨٨٤)، والدارمي في "السنن" (١٤٤٣)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٧٥٤٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٦١٩)، والطبراني في "الأوسط" (٨٧٧٦)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٥٨٨)، والبزار في "المسند" (١٢٧٨)، والبغوي في "شرح السنة" (٥٠٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٤٢٧٥).

# بەشی چوارەم

# شێوازی کارکردنی بیدعەکاران لەگەڵ دەقەکان

بیدعەکاران گەر سەرچاوەکانیان ئەوانە بێت دەبێت مامەڵەیان بۆ ڕزگاربوون لە دەقەکان کاریان بێت، بۆیە شێوازی جۆراوجۆریان گرتۆتە بەر، گەرچی چەند شێوازێك ڕەنگدانەوەی تەواوی بەسەر هەموویاندا هەیە و کۆیان دەکاتەوە تیایاندا، لەو شێوازانە:

**١. هێنانەوەی بەڵگە هاوشێوە ماناکان (المتشابه).**

**٢. بیروڕایان پاشان بەڵگە (اعتقادهم ثم إستدلالهم).**

**٣. پشتکردنە بەرنامەی هاوەڵان (هجر منهج السلف الصالح).**

**٤. کارنەکردن بە فەرموودەکانی (الآحاد).**

**٥. تێکدانی بنەمای تێڕوانین و کردنە بەڵگە (اضطراب أصول النظر والاستدلال).**

## یەکەم : هێنانەوەی بەڵگەی هاوشێوە ماناکان ( الاستدلال بالمتشابه )

دارِشتنەکانی قورئان پێکهاتووە لە (مُحكَم) و (متشابِه)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ﴾ [آل عمران : ٧].

هەواڵی خواییە کە لە قورئاندا ئایەتە (مُحكمات)ەکان ڕوون و ئاشکرا مانان، بێ لێتێکچوونی هیچ کەسێك، ئەمە ﴿هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ﴾ بناغەی گەڕانەوەی لێتێکچوونی ماناکانە، ... وە ئایەتە (متشابِه) مانا نادیارەکانە لای زۆری یا هەندێکی خەڵکی، ماناکانی (مُحكَم) لەخۆ دەگرێت، وە دەشێت لە ڕووی پێکهاتەی وشە و لێکدانەوە مانای تر لەخۆ بگرێت نەك لە ڕووی مەبەستەوە[1].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (١/ ٣٥).

ئەو دەقە هاوشێوانە لە مانادا: «هُوَ الصَّحِيحُ أَنَّ التَّشَابُهَ أَمْرٌ نِسْبِيٌّ فَقَدْ يَتَشَابَهُ عِنْدَ هَذَا مَا لَا يَتَشَابَهُ عِنْدَ غَيْرِهِ»[١]. هاوشێوەییان لە مانادا ڕێژەییە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر.

**لێکچووی ماناکانیش دوو جۆرە:**

**١. المتشابه الحقيقي: كأمر الروح والساعة ... .**

**٢. المتشتبه الإضافي: كالمنسوخ والمجمل والظاهر والعام والمطلق ...[٢].**

واتە: لێکچوونی تەواو: ئەو ئایەتانەیە کە ماناکانی دەزانی و ڕاستی و دروستییەکەی نازانرێت، وەکوو ڕۆح و هاتنی ڕۆژی دوایی ...، وە لێکچوونی پاشگر: ئەو ئایەتانەیە کە بە پشتیوانی بابەتەکانی تر دەزانرێت، وەکوو شێوازی بەڵگە ڕووکەش و کورت و سڕاوەو گشتی و ڕەهاکان.

بەڵام (متشابِه): «فالله تعالى نفى العلم بتأويل المتشابه ولم ينف العلم بمعناه وتفسيره»[٣].

واتە: خوای پەروەردگار باسی لە نەزانینی (متشابِه) کردووە لە ڕووی حەقیقەتەکەیەوە، نەك لە ڕووی مانا و تەفسیرەکەیەوە، وەکوو بابەتە غەیبیەکان.

کەواتە شتێك نییە لە قورئاندا مانای نەزانرێت.

(ابن قتيبة) ﵀ دەڵێت: «ولسنا ممن يزعم: أنّ المتشابه في القرآن لا يعلمه الراسخون في العلم. وهذا غلط من متأوّليه على اللّغة والمعنى. ولم ينزل الله شيئا من القرآن إلا لينفع به عباده، ويدلّ به على معنى أراده»[٤].

واتە: ئێمە کەسێك نین بڵێین مانا لێکچووەکان (متشابِه) لە قورئاندا زانایان نایزانن، ئەمە هەڵەیە لە ڕووە زمانی و ماناییەکەیدا، خوای پەروەردگار هیچ شتێکی لە قورئاندا نەناردووەتە

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ١٤٤).

(٢) "منهج الإستدلال على مسائل الإعتقاد" لعثمان بن علي حسن (٢/ ٤٨٥)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ٣٥ – ٣٨)، (١٧/ ٣٧٢)، و "الموافقات" للشاطبي (٣/ ٩١).

(٣) "منهج الإستدلال على مسائل الإعتقاد" لعثمان بن علي حسن (٢/ ٤٨٤)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ٢٧٥،٢٨٤).

(٤) "تأويل مشكل القرآن" لابن قتيبة ص٦٦.

خوارەوە بێجگە لە سوودمەندی نەبێت بۆ بەندەکانی و ڕێنمایی نەبێت بۆ سەر مانا و مەبەستەکانی.

ئیمامی (المجاهد) رَحِمَهُ ٱللَّهُ قوتابی (ابن عباس) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «عرضت المصحف علي ابن عباس من فاتحته إلي خاتمته أقفه عند كل آية وأسأله عنها. وقال ابن مسعود: ما في كتاب الله آية إلا وأنا أعلم فيم أنزلت. وقال الحسن البصري: ما أنزل الله آية إلا وهو يحب أن يعلم ما أراد بها»[1].

واتە: قورئانم کردەوە لە سورەتی (الفاتحة)وە تا کۆتاییەکەی، دەموەستاند لەسەر هەموو ئایەتێك پرسیارم لێ دەکرد، (ابن مسعود) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: ئایەتێك نییە لە قورئاندا ئیلا دەزانم لەسەر چی هاتووەتە خوارەوە، وە (الحسن البصري) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: هەر ئایەتێك خوا ناردوویەتیە خوارەوە خوا پێی خۆشە بەندەکانی بزانێت مەبەستی پێی چییە.

کەواتە (متشابِه الحقيقي) ئەو بابەتە غەیبییانەی حەقیقەتەکانی نازانین وەکوو (ڕۆح، قیامەت، بەهەشت و دۆزەخ و ووردەکاری قەدەر و سیفاتەکانی پەروەردگار ...)، بەڵام ماناکانیان دەزانین، دەبێت باوەڕمان پێیان هەبێت و تەسلیمیان بین، لەبەر نەتوانینمان لە دەرکپێکردن و ڕوونبوونەوەدا، ئەم بابەتانەش زاناکانیش دەبێت بڵێن: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧﴾ [آل عمران: ٧].

واتە: ڕاست و دروستی بابەتەکان نازانرێت بێجگە لە پەروەردگار نەبێت، وە زانایانی ڕۆچوو لە زانستدا دەڵێن هەمووی (مُحكم ومتشابِه) حەقە و لای خواوەیە جَلَّ جَلَالُهُ، ڕاستە و هەردوو لایان یەکتری بە ڕاست دەخەنەوە و شایەتن لەسەر یەکتری، ئەوەی لای خواوەیە دژ و جیاواز نییە و باوەڕمان پێیەتی، ئەوانەی خاوەنی تێگەیشتن و عەقڵ و بیرکردنەوەی ڕاست و دروستن تێدەگەن[2].

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٢٠٨)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٥٥)، (٥/ ١٥٩).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٢/ ١٢).

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَقَدْ قَالَ كَثِيرٌ مِنْ السَّلَفِ: إنَّ الْمُحْكَمَ مَا يُعْمَلُ بِهِ وَالْمُتَشَابِهَ مَا يُؤْمَنُ بِهِ وَلَا يُعْمَلُ بِهِ»[1].

واتە: زۆری هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان وەکوو (ابن عباس وعائشة وحسن البصري وقتادة والضحاك ...) دەڵێن: (مُحكم) کاری پێ دەکرێت، وە (متشابِه) باوەڕی پێ دەهێنرێت و کاری پێ ناکرێت، واتە بەس بابەتێکی عەقیدەیین، هۆکاری تاقیکردنەوەی بەندەکانە.

(مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرِ بْنِ الزُّبَيْرِ) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «الْمُتَشَابِهَاتُ لَهُنَّ تَصْرِيفٌ وَتَحْرِيفٌ وَتَأْوِيلٌ، ابْتَلَى اللهُ فِيهِنَّ الْعِبَادَ»[2].

واتە: (متشابِه)ەکان لادان و مانا گۆڕین و بۆ دروستکردن ڕوویان تێدەکات و تاقیکردنەوەی خواییە بۆ بەندەکانی.

بیدعەکارانیش بۆ بەڵگە هێنانەوە ڕوو دەکەنە (متشابِه)ەکان، مانا و بۆچوونی خۆیانی بۆ دادەتاشن تاوەکوو شەرعییەت بە کارەکانیان بدەن و خەڵکی پێ چەواشە بکەن، وا گومانیان بۆ دروست بکەن کە لەسەر ڕێڕەوی ڕاستی قورئان و فەرموودەن.

ئەمە هەواڵی خواییە لەسەریان کە دەفەرمووێت: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ﴾ [آل عمران: ٧].

واتە: ئەوانەی لە دڵیاندا گومڕایی هەیە و دەرچوون لە حەق؛ شوێنکەوتەی مانا هاوشێوە (متشابِه)ەکانن بۆ گومڕاکردنی شوێنکەوتووانیان، وە مانا گۆڕینی دەقەکان بە گوێرەی ئارەزوو و ویستیانە[3].

واتە ستەمکارن لە مافی خەڵکدا کە گومڕایان دەکەن و لە مافی خواشدا کە فەرموودە و قسەکەی دەگۆڕن لە مانا و مەبەستەکەی خۆی.

---

(١) "مجموع الفتاوى" (١٧/ ٣٨٦).

(٢) "تفسير الطبري" (٦/ ١٧٧)، و "تفسير القرطبي" (٤/ ١١)، و "تفسير البغوي" (١/ ٢٦٩)، و "تفسير ابن كثير" (٢/ ٧).

(٣) "تفسير ابن كثير" (٢/ ٨).

(عائشة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە فەرمووی: «فَإِذَا رَأَيْتِ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكِ الَّذِينَ سَمَّى اللهُ فَاحْذَرُوهُمْ»[(١)].

واتە: گەر بینیت ئەوانەی شوێنکەوتەی مانا هاوشێوەکان (متشابِه)ن ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا ناوی بردوون، خۆتیان لێ بپارێزە.

ئەم جۆرە نووسینانەش لەسەر بیدعە و بیدعەکاران ڕێگەیەکە بۆ ناسینیان و خۆ پاراستن لێیان.

ئیمامی (الطبري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَهَذِهِ الْآيَةُ وَإِنْ كَانَتْ نَزَلَتْ ... مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ، فَإِنَّهُ مَعْنِيٌّ بِهَا كُلُّ مُبْتَدِعٍ فِي دِينِ اللهِ بِدْعَةً، ... كَائِنًا مَنْ كَانَ، وَأَيَّ أَصْنَافِ الْبِدْعَةِ كَانَ»[(٢)].

واتە: ئەم ئایەتە ئەگەرچی بۆ موشریکەکان هاتووەتە خوارەوە، بەڵام هەموو بیدعەکاران لەخۆ دەگرێت لە هەرکوێ بن و لە هەر شتێکدا بێت.

## نیشانەکانی مانا لێکچووەکان ( متشابه )

هەموو دەقێکی شەرعی کە ڕووکەشی دارشتنەکەی باس لە مانایەك بکات و ئەو مەبەستەی نەبێت لە شەرعدا؛ ئەوە (متشابِه)ە و پێویستە بگەڕێندرێتەوە سەر مانای (محکم)ەکان تا مەبەستی ڕاست لە ماناکەی دەرکەوێت.

وە هەموو ڕووکەشی دەقێك مانایەکی ڕاست بدات بە دەستەوە، بەڵام پێویستی بە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تەواوتر هەبێت، کارپێکردنی ئەو ڕووکەشە بەبێ گەڕاندنەوەی بۆ مەبەست و مانا گشتییەکانی شەرع کە کۆدەنگی بەڵگەکانی لەسەر کۆ دەبێتەوە؛ کارکردنە بە (متشابِه)[(٣)].

لە نیشانەکانی شوێنکەوتەی (متشابِه) کارکردنە بە دەقە ڕەها (مطلق)ەکان پێش تێڕوانینی لە ڕووە پەیوەستەکانیەوە (مقید)، وە تێڕوانینی دەقە گشتی (عام)ەکان بەبێ گەڕاندنەوە بۆ

---

(١) رواه البخاري (٤٥٤٧)، ومسلم (٢٦٦٥)، وأبو داود (٤٥٩٨)، وأحمد (٢٦١٩٧)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٥١٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٢١)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٩٥٨).

(٢) "جامع البيان" (٥/ ٢١٤).

(٣) "وسائل أهل الباطل في تقرير باطلهم" لمحمد بن عمر بازمول ص١٦.

**تایبەتمەندییەکان** (خاص)؟! وە بە پێچەوانەشەوە بۆ هەردووکیان[١].

واتە هێنانەوەی بەڵگەی ئایەت و فەرموودە بۆ هەر بابەتێك مەرج نییە خاوەنەکەی پێکابێتی و بەس بێت بۆ بابەتەکە، تاوەکوو دڵنیایی بەدەست نەهێنێت لە لایەن زانایانی شەرعی بەرنامە پاکەوە (الراسخون في العلم)، خوای پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ [النحل: ٤٣].

واتە: پرسیار لە زانایانی خاوەن تایبەت بکەن گەر نەتانزانی.

زانست سێ جۆرە بێجگە لەوانە زیادەیە **"آية محكمة أو سنة متبعة أو فريضة عادلة"**[٢]، ئایەتێکی مانا تەواو وە سوننەتێکی کارپێکراو وە حوکمێکی دادپەروەرانە.

پاڵپشتی هەموو گومڕاییەك شوێنکەوتەی بەڵگە شەرعییە هاوشێوەکانە (متشابِه) و پێوانە عەقڵییەکانە (قیاس).

(ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «عَامَّةُ الضَّلَالُ مِنْ جِهَةِ التَّشَابُهِ، ... فَلِهَذَا كَانَ ضَلَالُ بَنِي آدَمَ مِنْ قِبَلِ التَّشَابُهِ وَالْقِيَاسِ الْفَاسِدِ لَا يَنْضَبِطُ كَمَا قَالَ الْإِمَامُ أَحْمَدُ: أَكْثَرُ مَا يُخْطِئُ النَّاسُ مِنْ جِهَةِ التَّأْوِيلِ وَالْقِيَاسِ؛ فَالتَّأْوِيلُ: فِي الْأَدِلَّةِ السَّمْعِيَّةِ، وَالْقِيَاسُ: فِي الْأَدِلَّةِ الْعَقْلِيَّةِ ... وَالتَّأْوِيلُ الْخَطَأُ إِنَّمَا يَكُونُ فِي الْأَلْفَاظِ الْمُتَشَابِهَةِ، وَالْقِيَاسُ الْخَطَأُ إِنَّمَا يَكُونُ فِي الْمَعَانِي الْمُتَشَابِهَةِ»[٣].

واتە: بە گشتی گومڕایی لە ڕێی (متشابِه)ەوەیە، کە ڕووکەشی دەقەکانە و بەبێ گەڕانەوە بۆ شیکردنەوەی فەرموودە و وتەی هاوەڵان، وە پەیوەستبوون بە (قیاس) و بۆچوون و پێوانە عەقڵییەکان و پشتکردنە دەقە شەرعییەکان ڕێگاکاری بیدعەکارانە.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٤٥).

(٢) "وسائل أهل الباطل في تقرير باطلهم" لمحمد بن عمر بازمول ص١٥، و "إعلام الموقعين" لابن القيم (١/ ٦٨)، وەکوو فەرموودە (ضعيف)ە لە "ضعيف الجامع الصغير" (٣٨٧١)، و "ضعيف أبي داود" (٤٩٦).

(٣) "التدمرية" ص١٠٧، و "مجموع الفتاوى" (٣/ ٦٣).

(ابن أبي العز) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «فَهَلْ قُتِلَ عُثْمَانُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ إِلَّا بِالتَّأْوِيلِ الْفَاسِدِ! وَكَذَا مَا جَرَى فِي يَوْمِ الْجَمَلِ، وَصِفِّينَ، وَمَقْتَلِ الْحُسَيْنِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَالْحَرَّةِ؟ وَهَلْ خَرَجَتِ الْخَوَارِجُ، وَاعْتَزَلَتِ الْمُعْتَزِلَةُ، وَرَفَضَتِ الرَّوَافِضُ، وَافْتَرَقَتِ الْأُمَّةُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، إِلَّا بِالتَّأْوِيلِ الْفَاسِدِ؟ !»[1].

واتە: ئایا ئیمامی (عوسمان) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ نەکوژرا بە لێکدانەوەی هەڵە واتە (متشابِه) و هەروەها ڕووداوەکانی شەڕی (الجمل والصفين) شەهیدکردنی (حوسەین) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ و ڕووداوی (الْحَرَّةِ) ئابلۆقەی مەدینە لەلایەن (حەجاج)ەوە بە بەکارهێنانی بەڵگە هاوشێوە (متشابِه)ەکانەوە نەبوو؟!

وە هۆکاری دروستبوونی گرووپە گومڕاکان لە (خەواریج) و (موعتەزیلە) و (ڕافیزە) و دابەشبوونی موسوڵمانان بۆ حەفتاوسێ کۆمەڵ، ئەمانە هەمووی هۆکاری بوونی لێکدانەوەی هەڵە نەبوو بە هۆکاری بەکارهێنانی دەقە هاوشێوەکان و کارنەکردن بە دەقە جێگیر (محكم)ەکان؟!

لەگەڵ ئەوەشدا بوونی دەقە (متشابِه)ەکان کەمن، (وە دەقی ڕاستەوخۆ لەسەر ئەوەیە کە "محكم" زۆری پێکهاتەی قورئانە: ﴿ءَايَٰتٌ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ [آل عمران: ٧]، وە گەر زۆری (متشابِه) بوایە زۆری دەقەکان مانایان شاراوە بووە، وە زۆری شەرعیش نەزانراو بووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت قورئان هۆکاری هیدایەت و ڕووناکی و شیفا بێت، وە وادەی شیکردنەوەی ئایەتەکانی داوە: ﴿أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ﴾ [هود: ١])[2].

---

(١) "شرح الطحاوية" بتحقيق (الأرنؤوط) (١/ ٢٠٨، ٢٠٩).

(٢) "الموافقات" للشاطبي (٣/ ٨٦)، و"منهج الإستدلال على مسائل الإعتقاد" لعثمان بن علي حسن (٢/ ٤٨٨).

# چەند نموونەیەك لە شوێنکەوتنی (متشابە) و کردنە بەڵگە

ڕەتکردنەوەی (ڕافیزە) لەو دەقانەی باسی وەصف و لێخۆشبوون و شوێنکەوتن و خۆشەویستی و داوای لێخۆشبوونی هاوەڵان (الصحابة) ﷺ دەکات بە بەکارهێنانی ئەو بەڵگە (متشابِه)انەی وەك: «لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[1].

واتە: لەدوای من مەگەڕێنەوە سەر بێبڕوایی هەندێکتان هەندێکتان بکوژن.

ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هاوەڵان بە ڕووداوەکانی نێوانیان هەڵگەڕاونەتەوە و دەرچوون لە ئیسلام، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە مەبەستی دەرچوونی تەواو نییە لە ئیسلام.

وە ڕەتکردنەوەی (خەوارج)ەکان لە لایەنگری خۆشەویستی (الولاء) بۆ موسوڵمانان، گەر هەر کارێکی هەڵەیان لێ بووەشێتەوە بە دەقە هەڕەشەکان کە زۆری بۆ بێبڕواکان دابەزیوە لەبەر نەبوونی ئیمانیان، بەڵام ئەمان ئیمانیان هەیە، ... بۆیە هۆکاری «فَسَادُ الدُّنْيَا وَالدِّينِ مِنْ تَقْدِيمِ الْمُتَشَابِهِ عَلَى الْمُحْكَمِ، وَتَقْدِيمِ الرَّأْيِ عَلَى الشَّرْعِ وَالْهَوَى عَلَى الْهُدَى»[2].

واتە: مایەی تێکچوونی دونیا و دین هۆکاری پێشخستنی (متشابِه) بەسەر ئایەتە (محکم)ەکاندا و پێشخستنی عەقڵە بەسەر شەرعدا، وە پێشخستنی هەواوئارەزووە بەسەر هیدایەتدا.

وە لە بیدعە بچووکەکاندا وەکوو: سڵاوات دان دوای بانگ و پێش قامەت ... بە بەڵگەی ﴿صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾ [الأحزاب: ٥٦] کە ئەم ئایەتە گشتییە و ئەوانە تایبەتن، وە مەولوودنامە بە بەڵگەی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ، کە خۆی خۆشەویستی بەگوێکردن و شوێنکەوتە و دەرنەچوونە لە یاساکانی شەرع، وە دوعا نوسین بە دوعا خوێندن، وە کۆڕی زیکرکردن بە دەنگی بەرز بە کۆڕی عیلم و زانستی شەرعی ... .

---

(١) رواه البخاري (١٢١)، ومسلم (٦٥)، وابن ماجه (٣٩٤٢)، وأبو داود (٤٦٨٦)، والترمذي (٢١٩٣)، والنسائي في "الكبرى" (٣٥٧٧)، وأحمد (٢٠٣٦)، والدارمي في "السنن" (١٩٦٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧١٧٦)، وابن حبان في "صحيحه" (١٨٧)، والطبراني في "الكبير" (٣٥٧٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٠١٩)، والبغوي في "شرح السنة" (١٩٦٥)، والبيهقي في "الشعب" (٤٩٣٦)، ونعيم بن حماد في "كتاب الفتن" (٤٣١).

(٢) "إعلام الموقعين" لابن القيم (١/ ٢١٨).

**کورتەی قسە:** (أيوب السختياني) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «لَا أَعْلَمُ الْيَوْمَ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ يُخَاصِمُ إِلَّا بِالْمُتَشَابِهِ»(١).

واتە: ئەمڕۆ کەسێك نابینم لە خاوەن هەوا و بیدعەکاران گوفتار و بەڵگەکانیان (متشابه) نەبێت.

## دووەم : بیرو ڕایان پاشان بەڵگەکاری
## (إعتقادهم ثم إستدلالهم)

هەواو ئارەزووی ئادەمیزاد و بەرنامەی خوایی دوو دژبەیەك و تاقیکردنەوەی خوایین، بۆیە بیدعەکاران پێشەنگن لەم بوارەدا، هەموو کات بیروڕا و بەرنامەداڕێژی خۆیان پێشخستووە و پاشان شاڵاویان بەرەو دەقە شەرعییەکان بردووە و ڕاپێچی بەڵگەکانیان کردووە بەرەو یاسا و دارِشتنەکانی پێشوەختەی خۆیان.

تاوەکوو لە ڕوانگە ئەوانەوە پێناسەو شیکردنەوەی دەقەکان بکەن، چی گونجاو و پاڵپشت بوو بیهێڵنەوە و باقییەکەی تری تۆمەتی جۆراوجۆری بۆ دروست بکەن کە لەگەڵ عەقڵدا دژایەتی دەکات، یاخود شوێنی گومانە، یا ئیمام و شێخ و مەزهەب و سەرکردە ناودارەکان وەریان نەگرتووە و بە بەڵگەیان دانەناوە.

لە بەرامبەر ئەمانەدا ئەهلی سوننەت گرنگییەکی تەواویان داوە بە دەقەکان لە ڕووی پەیوەست و شیکردنەوە بەیەکەوە، وە گرنگیدان بە ڕیوایەت و پاککردنەوەی بە زانستی شەرعی تایبەت و پێشەنگکردنی قورئان و فەرموودە بەبێ هیچ ناو و پاڵدانێك، وەك (خطيب البغدادي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وَكُلُّ فِئَةٍ تَتَحَيَّزُ إِلَى هَوًى تَرْجِعُ إِلَيْهِ، أَوْ تَسْتَحْسِنُ رَأْيًا تَعْكُفُ عَلَيْهِ، سِوَى أَصْحَابِ الْحَدِيثِ، فَإِنَّ الْكِتَابَ عُدَّتُهُمْ، وَالسُّنَّةُ حُجَّتُهُمْ، وَالرَّسُولُ فِئَتُهُمْ، وَإِلَيْهِ نِسْبَتُهُمْ»(٢).

واتە: هەموو کۆمەڵێك خۆی جیا دەکاتەوە بە ئارەزوو و بیروڕایەك دەگەڕێتەوە سەری و پەنای پێ دەبات بێجگە لە کەسانی فەرموودەناس، ئەوان قورئان توێشوویانە و فەرموودە بەڵگەیانە

(١) "الإبانة" لابن بطة (٢/ ٥٠١) رقم (٥٦٠).

(٢) "شرف أصحاب الحديث" للخطيب البغدادي ص٩.

و پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵ و ناونیشانیانە.

هیچ قۆناغێکی سەرەتامان نییە بۆ ئەهلی سوننەت بێجگە لە دەقەکان نەبێت، ئەوە بناغەیە، پاشان قۆناغی بنیادنان لەسەر دەقەکان دەست پێدەکات.

(أَبُو عُثْمَانَ الْحِيرِيَّ) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «مَنْ أَمَّرَ السُّنَّةَ عَلَى نَفْسِهِ قَوْلًا وَفِعْلًا نَطَقَ بِالْحِكْمَةِ وَمَنْ أَمَّرَ الْهَوَى عَلَى نَفْسِهِ نَطَقَ بِالْبِدْعَةِ لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾ [النور: ٥٤]»[١].

واتە: هەرکەسێك سوننەت جێبەجێ بکات بەسەر خۆیدا لە گوفتار و کاردا؛ دانەوەکانی داناییە، وە هەرکەسێك هەواوئارەزووەکانی بەسەر خۆیدا بسەپێنێ؛ دانەوەکانی بیدعەکارییە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾ [النور: ٥٤]. گەر گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکەن هیدایەت دراون.

(الحسن البصري) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «إنَّ المؤمن يأخذ دينه عن ربه عز وجل، وأن المنافق نصب رأيه فاتخذه ديناً»[٢].

واتە: ئیماندار دینی لە خواوە وەردەگرێت، بەڵام دووڕووەکان بیروڕایان کردووە بە دین.

(وكيل بن الجراح) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «مَنْ طَلَبَ الْحَدِيثَ كَمَا جَاءَ فَهُوَ صَاحِبُ سُنَّةٍ وَمَنْ طَلَبَهُ لِيُقَوِيَّ بِهِ رَأْيَهُ فَهُوَ صَاحِبُ بِدْعَةٍ»[٣].

واتە: ئەوەی فەرموودە بەکاربێنێت وەکوو خۆی؛ لایەنگر و خاوەنی سوننەتە، وە ئەوەی فەرموودە بە دەست بێنێت بۆ بەهێزکردنی بیروڕاکەی؛ ئەوە بیدعەکارە.

---

(١) رواه أبو نعيم في "الحلية" (١٠/ ٢٤٤)، والشوكاني في "ولاية الله والطريق إليها" ص٢٣٧، والخطيب البغدادي في "جامع لأخلاق الراوي" (١/ ١٤٥)، والسيوطي في "مفتاح الجنة في الاحتجاج بالسنة" ص٧١، والبيهقي في "الزهد الكبير" ص١٥١، وفي "الرسالة القشيرية" للقشيري (١/ ٨٢)، و "صفة الصفوة" لابن الجوزي (٢/ ٣٠٢)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٤/ ٦٤)، و "ذم الكلام وأهله" للهروي (٤/ ٣٨٠)، و "الحجة" للمقدسي (١/ ٢٤٣)، و "من أخلاق الرسول الكريم ﷺ" لعبدالمحسن العباد ص٨٨.

(٢) "الحجة على تارك المحجة" لمحمد عبدالغني لمقدسي (٢/ ٥٢٠).

(٣) "ذم الكلام وأهله" للهروي (٢/ ١٨٧) رقم (٣٣٧).

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «سُمِّيَ أَهْلُ الْبِدَعِ أَهْلَ الْأَهْوَاءِ لِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ فَلَمْ يَأْخُذُوا الْأَدِلَّةَ الشَّرْعِيَّةَ مَأْخَذَ الِافْتِقَارِ إِلَيْهَا، وَالتَّعْوِيلِ عَلَيْهَا، حَتَّى يَصْدُرُوا عَنْهَا، بَلْ قَدَّمُوا أَهْوَاءَهُمْ، وَاعْتَمَدُوا عَلَى آرَائِهِمْ، ثُمَّ جَعَلُوا الْأَدِلَّةَ الشَّرْعِيَّةَ مَنْظُورًا فِيهَا مِنْ وَرَاءِ ذَلِكَ»(١).

واتە: بیدعەکاران بە خاوەن هەوا و ئارەزووەکان ناوبراون، لەبەر ئەوەی شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزوویانن و بەڵگە شەرعییەکانیان بە شێوەی پەیوەیستبوون پێی و گەڕانەوە سەری وەرنەگرتووە تا بیکەنە بناغە، بەڵکوو هەوا و بیروڕایان پێشخستووە، پاش ئەمان خوێندنەوەی بەڵگەکان دێن.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «وَطَرِيقُ أَهْلِ الضَّلَالِ وَالْبِدَعِ بِالْعَكْسِ يَجْعَلُونَ الْأَلْفَاظَ الَّتِي أَحْدَثُوهَا وَمَعَانِيهَا هِيَ الْأَصْلَ وَيَجْعَلُونَ مَا قَالَهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ تَبَعًا لَهُمْ فَيَرُدُّونَهَا بِالتَّأْوِيلِ وَالتَّحْرِيفِ إِلَى مَعَانِيهِمْ»(٢).

واتە: بەرنامەی بیدعەکاران و گومڕاییان بە پێچەوانەی ئەهلی سوننەتەوەن، ئەو وتە و داڕشتنانەی دروستیان کردووە و مانایان بۆ داناوە بناغەیە، وە فەرموودەی خوا و پێغەمبەر ﷺ دواکەوتەیانە و بە لادان و گۆڕینی مانا دەیانبەنەوە سەریان.

(ابن القيم) رحمه الله دەڵێت: «نَظَرُوا فِي السُّنَّةِ فَمَا وَافَقَ أَقْوَالَهُمْ مِنْهَا قَبِلُوهُ، وَمَا خَالَفَهَا تَحَيَّلُوا فِي رَدِّهِ أَوْ رَدِّ دَلَالَتِهِ، وَإِذَا جَاءَ نَظِيرُ ذَلِكَ أَوْ أَضْعَفُ مِنْهُ سَنَدًا وَدَلَالَةً وَكَانَ يُوَافِقُ قَوْلَهُمْ قَبِلُوهُ»(٣).

واتە: سەیری سوننەت دەکەن؛ گەر لەگەڵیان گونجا وەری دەگرن، وە گەر نا فێڵکاری دەکەن بۆ بەرپەرچدانەوەی یا مانا گۆڕینی، وە گەر هاوشێوەی ئەوە هات یا لاوازتر لەڕووی گێڕانەوە و بەڵگەوە بە مەرجێك لەگەڵ ڕاکانیان بگونجێت؛ وەری دەگرن.

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٨٣).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٧/ ٣٥٥).

(٣) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (١/ ٦٠).

وە دەڵێت: «وأنت تجد جميع هذه الطوائف تنزل القرآن على مذاهبهم وبدعها وآرائها فالقرآن عند الجهمية جهمي وعند المعتزلة معتزلي وعند القدرية قدري وعند الرافضة رافضي وكذلك هو عند جميع أهل الباطل»[١].

واتە: کاتێك دەبینیت هەموو ئەو فیرەقانە قورئان لەسەر بیروڕا و بۆچوونەکانیان دادەبەزێنن، قورئان لای (جەهمی)یەکان (جەهمی)یە و لای (موعتەزیلە)کان (مەعتەزیلی)یە و لای (قەدەری)یەکان (قەدەری)یە و لای (ڕافیزە) (ڕافیزی)یە و لای هەموویان بە گوێرەی هەموویانە.

کەواتە جیاوازی بەرنامەیی لە نێوان ئەهلی سوننەت و گومڕایاندا ڕوونە، ئەهلی سوننەت پەیوەستبوون بە دەقە شەرعییەکان و کۆبوونەوەیان لە چواردەوری و کۆکردنەوەی هەموو چمکەکانی نیشانە و ناونیشانێکی زۆر دەرکەوتوو و ئاشکرایانە، وە بەو هۆکارەوە هەموو جیاوازی و دووبەرەکایەتییەکیان لێوە دوورە، وە پەیوەندییەکی تەواویان بە سەردەمی یەکەمی ئیسلامەوەیە، خاوەنی بەرنامەیەکی پڕ سەنەد و زنجیرەی زانستین و دوورن لە شوێنکەوتەی کوێرانە و تەقدیسکردنێك و بە (معصوم) دانانێك بێجگە لە قورئان و فەرموودە نەبێت، بە پێچەوانەی بەرنامەی بیدعەکاران و گومڕایانی کار بە عەقڵ و پەیوەستبوو بە هەموو سەرچاوەیەك بێجگە لە وەحی، وە بەبێ بوونی سەنەد و وردەکاری زانستی و لەخۆگری پڕ لە دووبەرەکایەتی و چۆنێتی جیاواز، وە دانان و بە (تقديس) کردنی فەیلەسوف و ناودارەکانیان.

## سێیەم : پشتکردنە بەرنامەی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان
## ( هجر منهج السلف الصالح )

لە نیشانە دیارەکانی بیدعەکاران بە قەدر و ڕێز سەیرنەکردنی بەرنامەی دینی پێشینی ئەم ئومەتەیە (السلف الصالح)، بەڵکوو تەنانەت توانج و بەکەم سەیرکردن کاریانە لەگەڵیاندا.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «فَعُلِمَ أَنَّ شِعَارَ أَهْلِ الْبِدَعِ: هُوَ تَرْكُ انْتِحَالِ اتِّبَاعِ السَّلَفِ. وَلِهَذَا قَالَ الْإِمَامُ أَحْمَدُ: أُصُولُ السُّنَّةِ عِنْدَنَا التَّمَسُّكُ بِمَا كَانَ عَلَيْهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ»[٢].

(١) "شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل" لابن القيم ص٨٣. (٢) "مجموع الفتاوى" (٤/ ١٥٥).

واته: نیشانەی بیدعەکاران شوێننەکەوتنی پێشووە صالّحەکانە، لەبەر ئەوە ئیمام (أحمد) ﷺ دەڵێت: لە بنەماکانی ئەهلی سوننە: پەیوەستبوونە بە کار و ڕێنماییە دینیەکانی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ.

(أبو حاتم الرازي) ﷺ دەڵێت: «عَلَامَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ الْوَقِيعَةُ فِي أَهْلِ الْأَثَرِ»(١).

واته: یەکێك لە نیشانەکانی بیدعەکاران قسەوتنە بە هەڵگرانی فەرموودە (هاوەڵان) ﷺ.

ئیمامی (الأوزاعي) ﷺ دەڵێت: «مَا ابْتَدَعَ رَجُلٌ بِدْعَةً إِلَّا غَلَّ صَدْرُهُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ»(٢).

واته: هەرکەسێك داهێنراوێك دابهێنێت لە دڵیدا ڕق و کینەی بۆ دروست دەبێت لەسەر موسوڵمانان (هاوەڵان)، لەبەر ئەوەی ئەوان هەڵگری دینێکی پاکی بێ داهێنراو بوون.

ئیمام (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) ﷺ دەڵێت: «إِذَا رَأَيْتَ رَجُلًا يَذْكُرُ أَحَدًا مِنَ الصَّحَابَةِ بِسُوءٍ فَاتَّهِمْهُ عَلَى الْإِسْلَامِ »(٣).

واته: گەر کەسێکت بینی بە خراپە باسی یەکێك لە هاوەڵانی کرد؛ تۆمەتی دژ بە ئیسلامی بخەنە پاڵ.

(أبو زرعة) ی فەرمووەناس ﷺ دەڵێت: «إِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يَنْتَقِصُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِّ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاعْلَمْ أَنَّهُ زِنْدِيقٌ،... وَإِنَّمَا يُرِيدُونَ أَنْ يُجَرِّحُوا شُهُودَنَا لِيُبْطِلُوا الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ ، وَالْجَرْحُ بِهِمْ أَوْلَى وَهُمْ زَنَادِقَةٌ»(٤).

واته: گەر یەکێکت بینی قسە و توانجی لە هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ دا بزانە ئەوە دەرچووە لە دین، ... ئەوانە دەیانەوێت شایەتەکانی دینمان تۆمەتبار بکەن بۆ ئەوەی قورئان و فەرموودە بەتاڵ بکەنەوە، ئەوان شایستەی تۆمەتن، ئەوان بێبڕوان لە دین.

---

(١) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (١/ ١٩٧).

(٢) "تأريخ الإسلام" للذهبي (٤/ ١٢٠)، و "ذم الكلام وأهله" للهروي (٩١٩)، و "الحجة في بيان المحجة" للأصبهاني (١/ ٣٣٠).

(٣) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٤٨).

(٤) "الكفاية في علم الرواية" للخطيب البغدادي ص٤٩.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «أَنَّ أَوَّلَ هَذِهِ الْأُمَّةِ هُمُ الَّذِينَ قَامُوا بِالدِّينِ تَصْدِيقًا، وَعِلْمًا، وَعَمَلًا، وَتَبْلِيغًا، فَالطَّعْنُ فِيهِمْ طَعْنٌ فِي الدِّينِ»[1].

واتە: یەکەم کەس ئەوان بوون (واتە هاوەڵان) هەڵگری ئەم دینە بوون بە باوەڕ پێهێنان و زانست و کارکردن پێی و گەیاندنی، تانەدان لێیان تانە دانە لە دین.

ئیمامی (البربهاري) رحمه الله دەڵێت: «إذا رأيت الرجل يحب أبا هريرة وأنس بن مالك وأسيد بن حضير فاعلم أنه صاحب سنة»[2].

واتە: گەر یەکێکت بینی (ئەبو هورەیرە و ئەنەسی کوڕی مالیك و ئەسیدی کوڕی حوزەیر)ی خۆش ویست؛ بزانە ئەوە هەڵگر و هاوەڵی سوننەتە.

تەنانەت ڕق و کینەیەکی زۆریان لە فەرموودە ناسەکان هەیە، لەبەر گواستنەوەی فەرموودە و وتە و بۆچوون و ڕوونکردنەوەی دینی هاوەڵان، وەك (أبو اسماعيل الصابوني) رحمه الله دەڵێت: «علامة أهل البدع على أهلها بادية ظاهرة وأظهر آياتهم وعلاماتهم شدة معاداتهم لحملة أخبار النبي صلى الله عليه وسلم واحتقارهم لهم واستخفافهم بهم»[3].

واتە: نیشانەی بیدعەکاران ڕوون و ئاشکرایە پێیانەوە، دەرکەوتووترین نیشانە دژایەتی زۆریان بۆ هەڵگرانی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و بە سوك سەیرکردنیان و کەم زانینیانە.

بۆیە گەر سەیری مێژووی فیرەقەکان بکەین کۆدەنگن لەسەر دژایەتیکردنی هاوەڵان و تەنانەت کافرکردنیان لەلایەن (خەوارج)ەکان و تۆمەتی هەڵگەڕانەوەیان لای (ڕافیزە)کان و بە لادێیی و ڕەشۆکی سەیرکردنیان لای (موعتەزیلە)کان و گرنگیپێنەدانیان لای (ئەشعەری و سۆفی)یەکان ...، وەکوو ناوداری موعتەزیلەکان (عەمری کوڕی عوبەید) بە (عبدالله ی کوڕی عومەر) رضي الله عنهما دەڵێت: «كان ابن عمر حشويًّا»[4].

---

(١) "منهاج السنة النبوية" (١/ ١٨).

(٢) "شرح السنة" للبربهاري ص١١٦.

(٣) "عقيدة السلف أصحاب الحديث" للإمام الصابوني ص١٠٢ رقم (١٦٣).

(٤) "بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية" لابن تيمية (٢/ ١٢٨)، و "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم ص١٤٥، و "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٧/ ٣٥١)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ١٨٦).

واتە: (عبد الله ی کوڕی عومەر) ڕەشۆکی بووە، واتە: سادەی بێ ئاگا.

وە هەر ئەوە کە دەڵێت: «لَوْ شَهِدَ عِنْدِي عَلِيٌّ وَعُثْمَانُ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ عَلَى شِرَاكِ نَعْلٍ؛ مَا أَجْزَتُ شَهَادَتَهُمْ»[١].

واتە: گەر (عەلی کوڕی ئەبو تالب و تەڵحەی کوڕی عبیداللە و زوبێری کوڕی عەوام و عوسمانی کوڕی عەفان) شایەتی لای من بدەن لەسەر پاژنەی نەعلێك شایەتییان لێ وەرناگرم.

ئەم هەڵوێستانەیان بووەتە هۆکاری گومڕاییان لە شارەزابوونی دینیدا، لەبەر بەدەستەوەنەمانی بەڵگە و زانست و وردەکاری هەڵگران و کاملان و زانایانی سەرەتایی ئەم ئیسلامە، بەرهەمەکەی ڕاکردن لە هاوەڵان و کەوتنە ناو عەقڵ و بۆچوونی فەیلەسووفەکان و هەوا و ئارەزووی چینەکانی دوای ئەوانە، کە لە هەموو بەهاکانی دین دوور و بێئاگا بوون.

(ابن رجب الحنبلي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «فالعلم النافع من هذه العلوم كلها ضبط نصوص الكتاب والسنة وفهم معانيها والتقيد في ذلك بالمأثور عن الصحابة والتابعين وتابعيهم في معاني القرآن والحديث»[٢].

واتە: زانستی بەسوود لەم زانستانەدا هەمووی پەیوەستکردنی دەقەکانی قورئان و فەرموودەیە بە پاشماوەکانی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان.

وە گەر شیکردنەوەی ئایەتێك یا فەرموودەیەك بکەن کە لە سەردەمی (صەحابە) بەو شێوەیە نەبوو بێت و نەیانکردبێت بە پێچەوانەی ئەوانەوە بێت؛ ئەوە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە وەك (ابن عبدالهادي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «فإن هذا يتضمن أنهم جهلوا الحق في هذا وضلوا عنه، واهتدى إليه هذا المعترض المستأخر»[٣].

واتە: ئەوە دەگەیەنێت کە هاوەڵان نەزان بوون لەمەدا و گومڕا بوون، ئەم ڕەخنەگرە دواهاتووە زانیویەتی و هیدایەتی وەرگرتووە.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٥٨)، و "عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام" لناصر بن علي عائض حسن الشيخ (٢/ ٨٢١)، و "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٧٥)، و "مختصر الكامل في الضعفاء" للمقريزي ص٥٣٧.

(٢) "بيان فضل علم السلف على علم الخلف" لابن رجب الحنبلي ص١٠٥.

(٣) "الصارم المنكي في الرد على السبكي" لابن عبدالهادي ص٣١٨.

## چوارەم: کار نەکردن بە فەرموودەکانی (الآحاد)
## (رد حديث الآحاد)

گەر هەڵوێستیان بەرامبەر هاوەڵان بەو شێوەیە بێت، ئەوا چ هۆکار و متمانەیەك ماوە بۆ وەرگرتنی فەرموودە؟ بۆیە پەنایان بردە بەر پاساو هێنانەوە بۆ ڕزگاربوونیان لە فەرموودەکان بە ناونیشانێکی بەناو زانستی کە گێڕانەوە تاکەکان (خبر الآحاد) هۆکار و شوێنی گومانن لە وەرگرتندا، هەڵبژاردنی ئەم ناونیشانە لەبەر دوو هۆ بوو:

**یەکەم:** بڕیاردانیان بەسەر (صەحابە)دا بە تاوان و دەرچوون لە دین، کەمترینیان بە سادە و ساکار سەیرکردنیان.

**دووەم:** بەبۆنەی ڕێژەی زۆری ئەو فەرموودانە کە لەژێر ناونیشانی (الآحاد)دا کۆدەبێتەوە، لەبەر ئەوە باشترین ڕێگایە بۆ ڕزگاربوون لە فەرموودەکان.

ئەم دوو هۆکارە دەرفەتێکی باشیانی پێدا بۆ خۆدزینەوە لە پەیوەستبوون بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ، ئەگەر چی لە فەرموودەکانی (متواتر)یش بەناوی بوونی گومانەوە خۆیان دەدزیەوە و ڕێگەی ماناکردنی خۆیان دەگرتە بەر، بەم کارەیان فەرموودەیان کردە دوو بەش و لە هەردوو بەشەکەش خۆیان ڕزگار کرد.

هەروەك چۆن هەڵوێستیشیان دەربارەی قورئان کردە دوو بەشی بەناو زانستی (المجاز والقطعي والظني الدلالة) دانەوە و بەڵگەیەتی یەکلابووەوە و گوماناوی، ئەو ئایەتانەی دەبووە پاڵپشت لەسەر بەرنامەکەیان یەکلا بووەوە بووە و شوێنی متمانەی تەواو بووە، وە ئەو ئایەتانەی لەگەڵیاندا نەدەگونجا شوێنی گومان و دوودڵی بووە کە مایەی کارپێنەکردن بووە.

ئەمە هەڵوێستی گشتی فیرقە گومڕاکانی کۆن و تازەشە گەر بە هەر بەرگێکەوە بن، لەبەر ئەوەی گەر (بەرنامەی حەقی ئەهلی سوننەتی تەواویان وەرنەگرت یاخود پێیان نەبوو؛ ئەوا بەبێ گومان هەڵگری بەرنامەی بەتاڵ دەبن کە بەرامبەر بەرنامەی حەقە، سەلامەتی و یەکلابوونەوە لە هەڵگرتن و ئاشنابوونە لە بەرنامەی حەقی لانەدەر لە قورئان و فەرموودە.

(ابن القيم) رحمه الله دەڵێت: «وجاء أفضل متأخريهم فنصب على حصون الوحي أربعة مجانيق.

الأول: أنها أدلة لفظية لا تفيد اليقين.

الثاني: أنها مجازات واستعارات لا حقيقة لها.

الثالث: أن العقل عارضها فيجب تقديمه عليها.

الرابع: أنها أخبار آحاد وهذه المسائل علمية فلا يجوز أن يحتج فيها بالأخبار ولهذا تجد كثيرا من هؤلاء لا يجب تبليغ النصوص النبوية أو إظهارها وإشاعتها ...»[١].

واته: باشترین کەسیان وەکوو ئیمامی (أبو المعالي الجويني) و (فخرالدين الرازي) هاتن به چواردەوری شوورای وەحیدا چوار مەنجەنیقیان دابەست:

**یەکەم:** وشەکانی قورئان و فەرمووده دارِشتنێکی وشەیین، متمانه و دڵنیابوونێك نادات بەدەستەوە.

**دووەم:** چەند مانا و شێوەیەك لەخۆ دەگرێت و هیچ ڕاستییەك نادات بەدەستەوە.

**سێیەم:** بۆچوونه عەقڵییەکان بەرامبەری دەوەستێت، پێویسته پێش بکەون.

**چوارەم:** ڕێگەی فەرموودەکان ژماره کەم و تاکەکانن گوماناوین، ئەمانه بابەتێکی زانستین، نابێت دەقەکان بگەیەنرێت.

ئەم دژایەتییەیان بەتایبەت بۆ فەرمووده دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری سەرەکی بێ زانستی و نەزانینیان به فەرمووده و ڕێگە و زانستییه وورده‌کانی.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «لَكِنَّ الْأَحَادِيثَ عَامَّةُ أَهْلِ الْبِدَعِ جُهَّالٌ بِهَا وَهُمْ يَظُنُّونَ أَنَّ هَذِهِ رَوَاهَا آحَادٌ ... وَلَا يَعْرِفُونَ مِنْ كَثْرَةِ طُرُقِهَا وَصِفَاتِ رِجَالِهَا وَالْأَسْبَابِ الْمُوجِبَةِ لِلتَّصْدِيقِ بِهَا مَا يَعْلَمُهُ أَهْلُ الْعِلْمِ بِالْحَدِيثِ»[٢].

---

(١) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٣/ ١٠٣٩).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٧/ ٤٤٤).

واتە: بەڵام فەرموودەکان بە گشتی بیدعەکاران نەزانن پێی، وا گومان دەبەن ئەمە گێڕانەوە تاکەکان (آحاد)ن، نەزانن دەربارەی زۆری ڕێگاکان، وە سیفاتەکانی پیاوانی هەڵگری ڕیوایەتەکان و هۆکارەکانی متمانە و باوەڕپێهێنان و یەکلابوونەوەی زانستی بەو شێوەیەی زانایانی هەڵگری فەرموودە دەیزانن.

(ابن أبي العز الحنفي) رحمه الله دەڵێت: «وَخَبَرُ الْوَاحِدِ إِذَا تَلَقَّتْهُ الْأُمَّةُ بِالْقَبُولِ عَمَلًا بِهِ وَتَصْدِيقًا لَهُ: يُفِيدُ الْعِلْمَ الْيَقِينِيَّ عِنْدَ جَمَاهِيرِ الْأُمَّةِ، وَهُوَ أَحَدُ قِسْمَيِ الْمُتَوَاتِرِ. وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَ سَلَفِ الْأُمَّةِ فِي ذَلِكَ نِزَاعٌ»[١].

واتە: فەرموودە ژمارە کەمەکان هەموو زانایانی ئەم ئوممەتە وەریان گرتووە و کاریان پێ کردووە و شوێنی باوەڕ و زانستی یەکلابووەوەیە، بە کۆدەنگی زانایانی موسوڵمانان یەکێکە لە بەشی (متواتر)، ئەمە لەناو زانایانی پێشوودا هیچ دووبەرەکایەتییەکی تێدا نییە.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «لَمَّا اقْتَرَنَ بِهِ إِجْمَاعُ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالْحَدِيثِ عَلَى تَلَقِّيه بِالتَّصْدِيقِ، كَانَ بِمَنْزِلَةِ إِجْمَاعِ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالْفِقْهِ عَلَى حُكْمٍ»[٢].

واتە: لەبەر ئەوەی کۆدەنگی زانایانی فەرموودەناسی لەسەرە بۆ وەرگرتن وەکوو کۆدەنگی زانایانە لەسەر حوکمێك، بۆچی بۆ حوکم وەری دەگرن بەڵام بۆ بڕیاری فەرموودەی (آحاد) وەری ناگرن؟!

وە کۆدەنگی ئەم ئوممەتە گومڕایی تێناکەوێت: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَجْمَعُ أُمَّتِي - أَوْ قَالَ: أُمَّةَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - عَلَى ضَلَالَةٍ»[٣]، وفي لفظ: «إِنَّ أُمَّتِي لَا تَجْتَمِعُ عَلَى ضَلَالَةٍ»[٤].

---

(١) "شرح الطحاوية" بتحقيق الأرنؤوط (١/ ٥٠١).

(٢) "الفتاوى الكبرى" (٥/ ٨١)، و "مجموع الفتاوى" (١٨/ ٤١).

(٣) رواه الترمذي (٢١٦٧)، وأحمد (٢٧٢٢٤)، والطبراني في "الكبير" (٢١٧١)، والحاكم في "المستدرك" (٣٩٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٥)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" برقم (١٨٤٨).

(٤) رواه ابن ماجه (٣٩٥٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٨٤)، وابن بطة في "الإبانة" (١١٨)، واللالكائي في "اعتقاد أهل السنة" (١٥٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ٢٣٨)، وفي "صحيح الجامع الصغير" (١٨٤٨).

ئەمە پاڵپشتێکی گەورەیە بۆ کارپێکردن و وەرگرتنی.

وە گەر ئەم بەرنامەی گومڕاییانە جێبەجێ بکرێت؛ ئەوا هیچ متمانەیەك لە دین و دونیادا نامێنێت، گەر ژمارەی کەم پێوەری یەکلابوونەوەی حەق بێت بەبێ چۆنێتی و چواردەور و وردەکاری بابەتەکە، بەس ژمارە؛ بەبێ ئەو وردەکاریانە، ئەوا پێغەمبەریش ﷺ تەنیا (آحاد)ە ئەبوایە چەندەها پێغەمبەری تری لەگەڵدا بوایە، وە تەنانەت (جبریل)یش ﵇ تەنیا (آحاد)ە و ئەبوایە چەندەها هاوشێوەی (جبریل)ی لەگەڵدا بوایە.

وەك (ابن القيم) ﵀ دەڵێت: «إِخْبَارُ الصَّحَابَةِ بَعْضِهِمْ بَعْضًا فَإِنَّهُمْ كَانُوا يَجْزِمُونَ بِمَا يُحَدِّثُ بِهِ أَحَدُهُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَقُلْ أَحَدٌ مِنْهُمْ لِمَنْ حَدَّثَهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَبَرُكَ خَبَرُ وَاحِدٍ لَا يُفِيدُ الْعِلْمَ حَتَّى يَتَوَاتَرَ»[١].

واتە: هەواڵەکانی صەحابە بۆ یەکتری باوەڕپێکراو بوو لە نێوان خۆیاندا، یەکێکیان بەویتریانی نەدەگوت هەواڵەکەت تاکە و شوێنی دڵنیایی نییە، تاوەکوو نەبێت بە (متواتر) کۆمەڵ.

خۆ ئەکرێت پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو شوێن و کاتێکدا کۆمەڵێك خەڵکی لەگەڵدا بێت تا دینەکە هەمووی بگەیەنێت (آحاد) نەبێت (متواتر) بێت.

ئەو هەموو نوێنەرەی دەنارد بۆ لای (کیسرا) و (هرقل) دەسەڵاتداران و بێباوەڕان متمانەیان دەکرد و بە نوێنەریان دەزانین، ئەو هەموو بانگەواز و جیهاد و ئەمیر و کار بەڕێوەبەرانە کاری دینییان دەگەیاند بەبێ ئەوەی شوێنی گومان و هەڵوێستە بێت، وە ڕەخنەی ژمارەیان لەسەر بێت.

بێگومان پاساو لەسەر گومان و دوودڵی دانەمەزراوی ئیمان دروست دەبێت، وە ئەمانەش شایستە بە خاوەنەکانی خۆیانن و دینیش تاقیکردنەوەیە لەسەر ئادەمیزاد، تا کێ دەتوانێت وەکوو خۆی وەری بگرێت بەبێ کاریگەرییەکان.

---

(١) "مختصر الصواعق المرسلة" ص٥٥٢.

# پێنجەم: تێکدانی بنەمای تێڕوانین و کردنە بەڵگە
# (اضطراب أصول النظر والاستدلال)

بیدعەکاران سیمای نەپاراستنی ڕێکارە زانستییەکانە، بەڵکوو بێ ئاگاییان لێیانە لەبەر نەگرتنە بەری زانستە شەرعییەکان، وە قاڵ نەبوون تیایاندا، بە پێچەوانەوە ڕووکردنە بابەتە عەقڵی و فەلسەفە و زمانەوانی و ڕەوانبێژی و مەنتیق ... یەکان.

بە شێوەیەکی پیاتێپەڕبوون ئەو شێواز و ڕێگا نازانستییانەی بیدعەکاران گرتوویانەتە بەر بۆ تێڕوانین و شێوازی بەڵگە هێنانەوە بۆ دین دەخەینە ڕوو:

**١. گرنگیدان بە شێوەکاری داڕشتنی زمانەوانی بەبێ ڕەچاوکردنی تایبەتمەندی قورئان و فەرموودە.**

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أَكْثَرُ مَا فِيهِ الْخَطَأُ مِنْ جِهَتَيْنِ - حَدَثَتَا بَعْدَ تَفْسِيرِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَتَابِعِيهِمْ بِإِحْسَانٍ؛ ... إِحْدَاهُمَا: قَوْمٌ اعْتَقَدُوا مَعَانِيَ ثُمَّ أَرَادُوا حَمْلَ أَلْفَاظِ الْقُرْآنِ عَلَيْهَا. والثَّانِيَةُ: قَوْمٌ فَسَّرُوا الْقُرْآنَ بِمُجَرَّدِ مَا يُسَوِّغُ أَنْ يُرِيدَهُ بِكَلَامِهِ مَنْ كَانَ مِنَ النَّاطِقِينَ بِلُغَةِ الْعَرَبِ مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ إِلَى الْمُتَكَلِّمِ بِالْقُرْآنِ وَالْمُنَزَّلِ عَلَيْهِ وَالْمُخَاطَبِ بِهِ. فالْأَوَّلُونَ رَاعَوْا الْمَعْنَى الَّذِي رَأَوْهُ مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ إِلَى مَا تَسْتَحِقُّهُ أَلْفَاظُ الْقُرْآنِ مِنْ الدَّلَالَةِ وَالْبَيَانِ. والْآخَرُونَ رَاعَوْا مُجَرَّدَ اللَّفْظِ وَمَا يَجُوزُ عِنْدَهُمْ أَنْ يُرِيدَ بِهِ الْعَرَبِيُّ مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ إِلَى مَا يَصْلُحُ لِلْمُتَكَلِّمِ بِهِ وَلِسِيَاقِ الْكَلَامِ. ثُمَّ هَؤُلَاءِ كَثِيرًا مَا يَغْلَطُونَ فِي احْتِمَالِ اللَّفْظِ لِذَلِكَ الْمَعْنَى فِي اللُّغَةِ ... كَمَا أَنَّ الْأَوَّلِينَ كَثِيرًا مَا يَغْلَطُونَ فِي صِحَّةِ الْمَعْنَى الَّذِي فَسَّرُوا بِهِ الْقُرْآنَ ... وَالْأَوَّلُونَ صِنْفَانِ: تَارَةً يَسْلُبُونَ لَفْظَ الْقُرْآنِ مَا دَلَّ عَلَيْهِ وَأُرِيدَ بِهِ وَتَارَةً يَحْمِلُونَهُ عَلَى مَا لَمْ يَدُلَّ عَلَيْهِ وَلَمْ يُرَدْ بِهِ وَفِي كِلَا الْأَمْرَيْنِ قَدْ يَكُونُ مَا قَصَدُوا نَفْيَهُ أَوْ إثْبَاتَهُ مِنْ الْمَعْنَى بَاطِلًا فَيَكُونُ خَطَؤُهُمْ فِي الدَّلِيلِ وَالْمَدْلُولِ وَقَدْ يَكُونُ حَقًّا فَيَكُونُ خَطَؤُهُمْ فِي الدَّلِيلِ لَا فِي الْمَدْلُولِ»[1].

---

(١) "مقدمة في أصول التفسير" ص٣٣، و "مجموع الفتاوى" (١٣/ ٣٥٥، ٣٥٦).

واتە: زۆربەی ئەو هەڵانەی کە دروست بوون لەدوای تەفسیری هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان لە دوو ڕووەوەیە:

**یەکەم:** کەسانێك چەند مانایەکیان دارشتبوو دەیانویست دارشتنەکانی قورئان بسەپێنن بەسەریاندا.

**دووەم:** کەسانێك قورئانیان وا تەفسیر دەکرد بە شێوەی مەبەستی قسەکەران بە زمانی عەرەبی بەبێ تێڕوانین بەسەر خاوەن گوفتاری قورئان، وە ئەوەی بۆی هاتووەتە خوارەوە وە ئەوانەی گوفتاریان لەگەڵدا کراوە.

سەرەتاکانیان هەوڵی پاراستنی ئەو مانایەیان دەدەن کە مەبەستیان بوو بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو مانایانەی کە قورئان لەخۆی دەگرێت لە ڕووە دارشتن و مانا دانەوەکانەوە.

ئەوانی تریش تەنها مەبەستیان بەس پاراستنی پێکهاتەی وشەکەیە بەو ڕێگایەی کە قسەکەرێکی عەرەب بەکاری دەهێنێت، بەبێ تێڕوانین بە مەبەستی قسەکردن پێی و شێوازی پێکهاتەی لە قسەکردندا.

ئەمانە زۆری هەڵە دەکەن بە هەڵگرتنی مانای ئەو وشەیە لە زماندا ... هەروەك پێشووەکانیان زۆری هەڵە دەکەن لە پێکاندنی ئەو مانایەی تەفسیری قورئانیان پێ کردووە.

**ئەمانە دوو جۆرن:** هەندێك جار ئەو مانایەی قورئان مەبەستیەتی لە وشەکەدا و بەڵگەیە بۆی و لێی دادەڕنن، وە هەندێك جار ئەو مانا و مەبەستەی بۆ دەکەن کە مەبەستی نییە و هەڵگری نییە، لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەندێك جار ئەوەی مەبەستیانە لە نەفی و سەلماندنی ماناکەیدا هەڵەیە، لەو کاتەدا هەڵەکەیان لە بەڵگە و ماناکەیدایە، هەندێ کات ڕاستە بەڵام هەڵەکەیان لە بەڵگەکەدایە، نەك مانا و مەبەستەکەی.

وە (ابن القیم) رحمه الله دەڵێت: «وينبغي أن يتفطن ههنا لأمر لا بد منه وهو أنه لا يجوز أن يحمل كلام الله عز وجل ويفسر بمجرد الاحتمال النحوى الاعرابي الذي يحتمله تركيب الكلام ويكون الكلام به له معنى ما فإن هذا مقام غلط فيه أكثر المعربين للقرآن ... بل للقرآن عرف خاص ومعان معهودة لا يناسبه تفسيره بغيرها ولا يجوز تفسيره بغير عرفه والمعهود من معانيه فإن نسبة معانيه إلى المعاني كنسبة ألفاظه إلى الألفاظ بل أعظم فكما أن ألفاظه ملوك الألفاظ

وأجلها وأفصحها ولها من الفصاحة أعلى مراتبها التي يعجز عنها قدر العالمين فكذلك معانيه أجل المعاني وأعظمها وأفخمها فلا يجوز تفسيره بغيرها من المعاني التي لا تليق به ... فلا يجوز حمله على المعاني القاصرة بمجرد الاحتمال النحوي الإعرابي فتدبر هذه القاعدة ولتكن منك على بال فإنك تنتفع بها في معرفة ضعف كثير من أقوال المفسرين وزيفها»[(١)].

واتە: پێویستە ئاگاداری كارێك بكەین لێرەدا؛ ئەویش ئەوەیە نابێت مانای فەرموودەكانی خوا بكرێت بەس بە شێوەی ڕاڤەكرنی زمانەوانی (النحوي)، هەڵگری پێكهاتەی قسەكردن كە جۆرێك مانا دەدات بەدەستەوە، لەم شوێنەدا زۆری ڕاڤەكارانی قورئان هەڵەیان كردووە، بەڵكوو قورئان شێوازێكی تایبەت و مانای سەربەخۆی هەیە، تەفسیر بەبێ ئەم شێوە كارانە لەگەڵیدا ناگونجێت، وە دروستیش نییە لابدرێت لەو شێوە و بارودۆخەی خۆی، ماناكانی قورئان بدرێتە پاڵ ماناكانی قسەكردن وەكوو ئەوە وایە وشەكانی بدرێتە پاڵ وشەكانی قسەكردن، بەڵكوو گەورەتریش.

وشەكانی قورئان پاشای وشەكانە، بەڵكوو بەرێزتر و پاراوترو بەرزترین پلەی ڕەوانبێژی لەخۆ دەگرێت، كە هەموو بوونەكان لە ئاستیدا دەستەوەستانن، وە هەروەها ماناكانی بەهاترین مانا و بەقەدرترین و كامڵترین لەخۆ دەگرێت، نابێت تەفسیری بەبێ ئەوە بكرێت كە شایستەی نییە.

نابێت مانا و تەفسیرێكی كەموكورتی بۆ بكرێت بەبۆنەی شێوازی لەخۆگرتنی ڕاڤەیی (الإعرابي)، هەڵوێستێك لەسەر ئەم بنەمایە بكە و لەبیری مەكە، سوودمەند دەبیت تیایدا لە هەستپێكردن بە هەڵە و لاوازی زۆری موفەسیرەكاندا.

ئەو تایبەتمەندییەی كە وشە و پێكهاتەكانی قورئان و فەرموودە لەخۆی دەگرێت، وشە سادەكانی عەرەبی لەخۆی ناگرێت، وە تەنانەت ئەو وشە و پێكهاتە مانا عورفییەی صەحابە ﭫ بەكاریان هێناوە جیاوازن لەگەڵ بەكارهێنانی وشە عەرەبییەكاندا، بۆیە تەفسیر و ماناداڕشتن بۆیان بەگوێرەی هەڵگرتنی وشە و زمانەوانی عەرەبییە، كە لەدەستدانی ڕاست و دروستییە شەرعییەكانە لەو وشانەدا، وە هەروەها لەدەستدانی ئەو شێوە عورفییەیە كە بنەمایە لەسەری.

---

(١) "بدائع الفوائد" لابن القيم (٣/ ٢٨، ٢٩).

ئەم هەڵانە زۆری لەو کتێبانە دەکرێت کە تەنها مانای وشەکانی قورئان دەکات (كلمات القرآن) لە ڕووی زمانەوانی (اللغوي)یەوە[(١)].

**٢. تەفسیرکردنی دەقەکانی قورئان و فەرموودە لەسەر بنەمای عەقڵی.**

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «مَنْ فَسَّرَ الْقُرْآنَ أَوْ الْحَدِيثَ وَتَأَوَّلَهُ عَلَى غَيْرِ التَّفْسِيرِ الْمَعْرُوفِ عَنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ فَهُوَ مُفْتَرٍ عَلَى اللَّهِ مُلْحِدٌ فِي آيَاتِ اللَّهِ مُحَرِّفٌ لِلْكَلِمِ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَهَذَا فَتْحٌ لِبَابِ الزَّنْدَقَةِ وَالْإِلْحَادِ وَهُوَ مَعْلُومُ الْبُطْلَانِ بِالِاضْطِرَارِ مِنْ دِينِ الْإِسْلَامِ»[(٢)].

واتە: ئەوەی تەفسیری قورئان و فەرموودە بکات بەبێ چوونەوە سەر ئەو شێوازە ناسراوەی هاوەڵان و شوێنکەوتوانی لە تەفسیرکردندا؛ ئەوا بەر درۆکردن دەکەوێت لە بەرامبەر خوادا و تووشی لادان دەبێت لە ئایەتەکانی خوادا و قسەکان دەگۆڕێت لە شوێنی خۆیدا و دەرگای دەرچوون لە دین و بێبڕوایی دەکاتەوە، ئەمە بە ئاشکرا بەتاڵە لە ئیسلامدا.

وە دەڵێت: «أَنَّ أَصَحَّ الطُّرُقِ فِي ذَلِكَ أَنْ يُفَسَّرَ الْقُرْآنُ بِالْقُرْآنِ؛ ... وَحِينَئِذٍ إذَا لَمْ نَجِدْ التَّفْسِيرَ فِي الْقُرْآنِ وَلَا فِي السُّنَّةِ رَجَعْنَا فِي ذَلِكَ إلَى أَقْوَالِ الصَّحَابَةِ فَإِنَّهُمْ أَدْرَى بِذَلِكَ لِمَا شَاهَدُوهُ مِنْ الْقُرْآنِ وَالْأَحْوَالِ الَّتِي اخْتَصُّوا بِهَا؛ وَلِمَا لَهُمْ مِنْ الْفَهْمِ التَّامِّ وَالْعِلْمِ الصَّحِيحِ وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ؛ لَا سِيَّمَا عُلَمَاؤُهُمْ وَكُبَرَاؤُهُمْ ... إذَا لَمْ تَجِدْ التَّفْسِيرَ فِي الْقُرْآنِ وَلَا فِي السُّنَّةِ وَلَا وَجَدْته عَنْ الصَّحَابَةِ فَقَدْ رَجَعَ كَثِيرٌ مِنْ الْأَئِمَّةِ فِي ذَلِكَ إلَى أَقْوَالِ التَّابِعِينَ ... فَأَمَّا " تَفْسِيرُ الْقُرْآنِ بِمُجَرَّدِ الرَّأْيِ فَحَرَامٌ ...»[(٣)].

واتە: ڕاستترین ڕێگە بۆ تەفسیرکردن تەفسیری قورئان بە قورئانە ... گەر نەبوو تەفسیری قورئان بە سوننەت کردنە، لەبەر ئەوەی شیکەرەوە و ڕوونکەرەوەی قورئانە، وە گەر نەبوو لەو دوانەدا بە وتەی هاوەڵان تەفسیر بکرێت، ئەوان شارەزا و شاهیدحاڵی هاتنەخوارەوەی قورئانن و

(١) "وسائل أهل الباطل في تقرير باطلهم" لمحمد بن عمر بازمول ص٢٩.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ٢٤٣).

(٣) "مقدمة في أصول التفسير" ص٣٩ - ٤٦، و"مجموع الفتاوى" (١٣/ ٢٦٣ - ٣٧٠).

ئاگاداری هۆکارەکانی هاتنەخوارەوەین و خاوەنی تێگەیشتنی تەواو و زانستی دروست و کاری خێرن، بەتایبەت زاناکان و گەورەکانیان ... وە گەر نەبوو لەمانەشدا زۆری زاناکان گەڕاونەتەوە بۆ وتەکانی شوێنکەوتوانی هاوەڵان (تابعین)، بەڵام تەفسیری قورئان بە عەقڵ حەرامە.

کەمتەرخەمی لە جێبەجێ کردنی بنەمای تەفسیری دەقەکان یاسای ئەم بابەتە ئەمەیە:

«إذا ورد لفظ في نص شرعي فإنه يفسر بعرف الشرع إذا وجد، فإن لم يوجد فسر بعرف زمن التشريع، فإن لم يعرف فسر بحسب اللغة وإلا بحسب المجاز عند القائلين به»[١].

واتە: ئەگەر داڕشتنێکی شەرعی هەبوو ئەوا شی دەکرێتەوە بە عورف و شێوازی شەرع، وە گەر نا بە عورفی سەردەمی دابەزینی شەرع، گەر نەزانرا بە گوێرەی زمانەوانی، وە گەر نا بە گوێرەی (مجاز) بە ڕای ئەوانەی دەیڵێن.

**٣. نەخوێندنەوەی پێش و پاش و سیاقی داڕشتنی ئایەت و فەرموودەکان.**

ئەمە هۆکارە بۆ تێنەگەیشتنی تەواوی دەقەکە، وەکوو: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ ...﴾ [الممتحنة : ١]. بکرێتە بەڵگە بۆ کافرکردنی کەسێك کە بە هەر شێوەیەك پەیوەندییەکی نزیکی ببەستێت لەگەڵ کافراندا.

ئەم تێگەیشتنە تیایدا مەبەست نییە، لەبەر ئەوەی پێشەکییەکەی بە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئیمانداران کراوەتەوە، وە هۆکاری هاتنەخوارەوەکەی (حَاطِبُ بْنُ أَبِي بَلْتَعَةَ)ە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەبەستی پێ خۆشەویستی و نزیکییەکی تایبەتە لەگەڵ بێبڕوایاندا، نەك پەیوەندی گشتی (مطلق المودة)، بۆیە حەڵاڵە ئافرەتانی گاوور و جوولەکە مارە بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستی لە نێوانیاندا هەیە[٢].

**٤. بەکارهێنانی وشەی کورت بەبێ شیکردنەوەی مەبەست.**

(ابن تیمیة) ﷀ دەڵێت: «الذين يعارضون الكتاب والسنة ... إنما يبنون أمرهم في ذلك

---

(١) "وسائل أهل الباطل في تقرير باطلهم" لمحمد بن عمر بازمول ص٥٢.

(٢) "وسائل أهل الباطل في تقرير باطلهم" لمحمد بن عمر بازمول ص٥٥.

على أقوال مشتبهة مجملة، تحتمل معاني متعددة، ويكون ما فيها من الاشتباه لفظاً ومعني يوجب تناولها لحق وباطل، ... فإن البدعة لو كانت باطلا محضاً لظهرت وبانت، وما قبلت، ولو كانت حقا محضا، لا شوب فيه، لكانت موافقة للسنة، فإن السنة لا تناقض حقاً محضاً لا باطل فيه، ولكن البدعة تشتمل على حق وباطل»[(١)].

واتە: ئەوانەی پێچەوانەی قورئان و فەرموودەن ... بنەمای بەرنامە و ڕاکانیان لەسەر کۆمەڵێك قسەی لێکچوو و کورت دەنێن، کە چەند مانایەك لەخۆ دەگرێت، دەبێتە هۆکاری هەڵگرتنی حەق و بەتاڵ ... بیدعەکان گەر بەتاڵی ڕوون و ئاشکرا بێت و دەرکەوێت ئەوا وەرناگیرێت، وە گەر حەقێکی ڕوون و ئاشکراش بێت ئەوا لەگەڵ سوننەتدا دەگونجێت، لەبەر ئەوەی سوننەت پێچەوانەی حەقێك نییە بەتاڵی تیا نەبێت، بەڵکوو داهێنراوەکان حەق و بەتاڵ لەخۆ دەگرن.

(ابن القيم) ﷺ دەڵێت: «قيل أصل بلاء أكثر الناس من جهة الألفاظ المجملة التي تشتمل على حق وباطل فيطلقها من يريد حقها، فينكرها من يريد باطلها، فيرد عليه من يريد حقها»[(٢)].

واتە: دەڵێن زۆری بەڵای خەڵکی لە ڕووی وشە کورتەکانەوەیە کە حەق و بەتاڵ لەخۆ دەگرێت، ئەوەی مەبەستی حەقە بە شێوەی گشتی بەکاری دەهێنێت، ئەوەی مەبەستی بەتاڵە دژایەتی دەکات، مەبەستی حەقیش ڕەتی دەداتەوە.

**٥. گۆڕین (التحريف).**

گۆڕینی بەڵگەکان لە شوێنی خۆیاندا جۆرێکی شاراوەیە، زۆر کەس تێی کەوتووە بە نیەتی خێر، بەڵام خاوەنی شارەزایی تەواو و تێگەیشتن نییە لە دیندا، ئەمەش هۆکارێکی فراوانە بۆ دروستبوونی داهێنراوەکان، بیدعەکاران بەزۆری پەنای پێ دەبەن تاوەکوو لەگەڵ بۆچوون و ویست و ئارەزووەکانیاندا بگونجێت.

(ابن القيم) ﷺ دەڵێت: «والتحريف: العدول بالكلام عن وجهه وصوابه إلى غيره وهو نوعان تحريف لفظه وتحريف معناه»[(٣)].

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" (١/ ٢٠٨، ٢٠٩).

(٢) "شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل" ص١٣٦.

(٣) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" (١/ ٢١٥).

واتە: **گۆڕین:** لادانی وتەکانە لە ڕووی ڕاستی خۆی بۆ بێجگە لە خۆی، دوو جۆرە: گۆڕینی وشە، گۆڕینی مانا.

**یان:** هاتنی بەڵگەیەك بە شێوازێك و گۆڕینی بۆ شێوازێکی تر بۆ گومان بەوەی هەردووکیان یەك شێوازن، ئەمە جۆرێکی شاراوەیە لە گۆڕینی وتەکان لە شوێنی خۆیدا[١].

مێژووی گۆڕانکاری (تحريف) لە دەقدا کۆنە، هەر لە (ئیبلیس)ەوە جێبەجێکردنی فەرمانەکەی خوای گۆڕی بۆ سەرەتای جۆری دروستبوون، پاشان کاردانەوەی تەواوی ئەم کارە لەناو جوولەکەکاندا ڕووی دا، (ابن القيم) ﵀ دەڵێت: «اليهود فهم الراسخون فيهما وهم شيوخ المحرفين وسلفهم»[٢].

هەردوو جۆرەکەی (تحريف) لە جوولەکەوە وەرگیراوە، ئەوان ڕۆچوو و شارەزان تیایاندا و مامۆستا و گەورەی گۆڕینەکان و پێشووەکانیانن.

وەکوو فەرمانیان پێ درا بچنە (بيت المقدس) بە کڕنووش و بڵێن لێمان خۆش بە: ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُولُواْ حِطَّةٞ نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطَٰيَٰكُمۡۚ وَسَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٥٨ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ﴾ [البَقَرَةِ: ٥٨، ٥٩].

بەڵام فەرمانەکەیان گۆڕی: «فَدَخَلُوا يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ، فَبَدَّلُوا، وَقَالُوا: حِطَّةٌ، حَبَّةٌ فِي شَعَرَةٍ»[٣].

واتە: لە کڕنووشەوە بۆ بە خشکە ڕۆیشتن و قسەکەشیان گۆڕی لە (حِطَّةٌ) بۆ هەمان وشە کە (حِطَّةٌ) گەنمێك لە موودا.

یا گۆشتی بەرازیان لەسەر حەرام بوو کەچی چەوری و بەزەکەیان دەفرۆشت و پارەکەیان دەخوارد و دەیان وت: (لحم الخنزير)ی فەرمووە نەك (شحم الخنزير)، گۆشتەکەیەتی کە

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٤٩).

(٢) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" (١/ ٢١٥).

(٣) رواه البخاري (٤٤٧٩)، ومسلم (٣٠١٥)، والترمذي (٢٩٥٦)، والنسائي في "الكبرى" (١٠٩٢٢)، وأحمد (٨٢٣٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٢٥١).

حەرامە نەك چەورییەكەی، ڕاوە ماسی لە شەممەدا حەرام بوو لەسەریان، كەچی لە هەینیدا تۆڕەكەیان تێدەكرد و یەكشەممە دەریان دەهێنا.

وە هەروەها گاوورەكانیش فەرمانەكەی خوا ﷻ (كلمة الله) بۆ دروستبوونی (مسیح) كردیان بە بەشێك یا كوڕی خوا، وە قەشە و عابیدەكانیان چ جۆرە فەرمانێكیان بدایە نەدەگەڕانەوە بۆ (إنجیل)، وەكوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٣١].

پاشان ئەم گۆڕانكارییەش هاتە ناو فیرەقەكانی ناو بازنەی ئیسلام.

(خەواریج) كاریان بە قورئان دەكرد بەبێ فەرموودە، وە كاریان بە دەقەكانی هەڕەشە (وعید) دەكرد بەبێ دەقەكانی لێخۆشبوون و متمانە (وعد).

(ڕافیزە)كان هەموو ئەو دەقانەی باس لە پلە و پایە و لێخۆشبوون و دوعای خێر بۆ هاوەڵان دەكات گۆڕییان بەو دەقانەی هەڕەشە ئامێزن بۆ دووڕووەكان و بێبڕوایان و هەڵگەڕاوە لە دین.

وە (موعتەزیلە عەقلانییە فەلاسیفە)كان گۆڕینی ئەو دەق و باسە غەیبییانەی پەیوەستن بە خوا ﷻ و ڕۆژی كۆتایی بە خوێندنەوە و پێوانە و هاوتاكردنی بابەتە دروستكراوە دونیاییەكان (مخلوقات) و دەركپێكردنی هەستەكان.

(قەدەری)یەكان گۆڕینی ئەو دەقانەی پەیوەستە بە (القضاء والقدر) كە ئادەمیزاد توانای دەرچوونی نییە تیایاندا بۆ ئەو چواردەور و توانا و دەسەڵاتەی توانای كاریان هەیە تیایاندا[1].

بەو شێوەیەش بیدعەكاران بەڵگە و پێناسەی بیدعەیان گۆڕیوە بۆ بیدعەی گەورە و بەس، یا چاك و خراپ تیایدا، یا پێداوستییە بەردەوامەكان (مصلحة المرسلة)، یا عورف و تێكنەچوونی ڕیزی موسوڵمانان ... هۆكار و پاساون بۆ كردنی بیدعە.

(ابن القیم) ﷺ دەڵێت: «فالتأویل الباطل هو إلحاد وتحریف وإن سماه أصحابه تحقیقا وعرفانا وتأویلا»[2].

(١) بڕوانە "تحريف النصوص" للشيخ: بكر بن عبدالله أبو زيد ص١٣٢، و "الصواعق المرسلة" لابن القيم (١/ ٢٣٠)، و "الكشف المبين عن أضاف المبدلين" لأبي نصر محمد عبدالله الإمام.

(٢) "الصواعق المرسلة" (١/ ٢١٧).

واتە: تەفسیری بەتاڵ لادان و گۆڕینە گەر خاوەنەکانیان ناوی ووردەکاری و دەرکپێکردن و شیکردنەوەی لیٚ بنێن.

(ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «كُلُّ مَنْ كَتَمَ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَا أَنْزَلَ اللهُ فَلَا بُدَّ أَنْ يُظْهِرَ بَاطِلًا. وَهَكَذَا "أَهْلُ الْبِدَعِ"»[1].

واتە: هەرکەسێك لە خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان شتێك بشارێتەوە لەوەی خوا ناردوویەتییە خوارەوە؛ پێویست دەکات و پەنا دەباتە بەر بەتاڵێك ئاشکرای بکات، هەروەها ئەم شێوەیەش کاری بیدعەکارانە.

هۆکاری سەرەکیش بۆ پەنابردنە بەر ئەم گۆڕانکارییە؛ خۆشەویستییەکە بۆ بێجگە لە خوا (الحب لغير الله).

(ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «فَالْحُبُّ لِغَيْرِ اللهِ كَحُبِّ النَّصَارَى لِلْمَسِيحِ وَحُبِّ الْيَهُودِ لِمُوسَى وَحُبِّ الرَّافِضَةِ لِعَلِيٍّ وَحُبِّ الْغُلَاةِ لِشُيُوخِهِمْ ... وَيَنْفِرُ عَنْ نَظِيرِهِ ... فَهَذَا مِنْ جِنْسِ أَهْلِ الْكِتَابِ الَّذِينَ آمَنُوا بِبَعْضِ الرُّسُلِ وَكَفَرُوا بِبَعْضٍ وَحَالِ الرَّافِضَةِ الَّذِينَ يُوَالُونَ بَعْضَ الصَّحَابَةِ وَيُعَادُونَ بَعْضَهُمْ»[2].

واتە: خۆشەویستی بۆ بێجگە لە خوا وەکوو گاوورەکان و جوولەکەکان بۆ (موسى و عیسى) سەلامی خوایان لەسەر بێت، وە ڕافیزەکان بۆ (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ﷺ، وە زیادەڕەوەکان بۆ ناودار و زاناکانیان و دوورکەوتنەوە لە هاوەڵان و تابعین، ئەم کارە لە کاری ئەهلی کیتاب دەچێت، کە باوەڕیان بە هەندێك لە ئایەتەکان هەبوو، باوەڕیان بە هەندێك نەبوو، وەکوو ڕافیزەکان لایەنگری هەندێك لە هاوەڵانن و دوژمنی هەندێکی تریانن.



(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ١٧٣).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٥٢٥)، و "الإستقامة" لابن تيمية (٢/ ٢٢٤).

# بەشی پێنجەم

## مەترسیدارێتی داهێنراوەکان

کاری هەڵە و لادانەکان بەبێ زیان نابن، وە زیانەکانیش پاشماوەیەکی زۆر بەدوای خۆیاندا دەهێنن، پاشان هەوڵ و توانایەکی زۆری دەوێت بۆ کەمکردنەوە و بنەبڕکردن، بۆیە خراپە و زیانەکانی داهێنراوەکان پێویستە بخرێتە ڕوو، تاوەکوو ڕێژەی ترسناکی و هەڕەشەی بۆ سەر ئایین و موسوڵمانان بزانرێت، بۆ ئەوەی هەموو ڕێگایەکی پێویست بگیرێتە بەر بۆ بەربەستکردن و نەمانی.

### لەو زیان و مەترسییانەش:

**١. داهێنراو هەڵوێست و قسەکردنە لە دینی خوادا بەبێ زانست (القول على الله بغير علم).**

داهێنراوەکان لە ڕاستیدا بڕیارێکی دینین، بۆیە دەبێتە درۆ بەناوی خواو ﷻ پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، ئەمەش یەکێکە لە تاوانە گەورەکان.

(ابن القيم) ﵀ دەڵێت: «وَأَمَّا الْقَوْلُ عَلَى اللهِ بِلَا عِلْمٍ فَهُوَ أَشَدُّ هَذِهِ الْمُحَرَّمَاتِ تَحْرِيمًا، وَأَعْظَمُهَا إِثْمًا، ... فَإِنَّهُ يَتَضَمَّنُ الْكَذِبَ عَلَى اللهِ، وَنِسْبَتَهُ إِلَى مَا لَا يَلِيقُ بِهِ، وَتَغْيِيرَ دِينِهِ وَتَبْدِيلَهُ، وَنَفْيَ مَا أَثْبَتَهُ وَإِثْبَاتَ مَا نَفَاهُ، ... فَلَيْسَ فِي أَجْنَاسِ الْمُحَرَّمَاتِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ مِنْهُ، وَلَا أَشَدُّ إِثْمًا، وَهُوَ أَصْلُ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ، وَعَلَيْهِ أُسِّسَتِ الْبِدَعُ وَالضَّلَالَاتُ، فَكُلُّ بِدْعَةٍ مُضِلَّةٍ فِي الدِّينِ أَسَاسُهَا الْقَوْلُ عَلَى اللهِ بِلَا عِلْمٍ.

وَلِهَذَا اشْتَدَّ نَكِيرُ السَّلَفِ وَالْأَئِمَّةِ لَهَا، وَصَاحُوا بِأَهْلِهَا مِنْ أَقْطَارِ الْأَرْضِ، وَحَذَّرُوا فِتْنَتَهُمْ أَشَدَّ التَّحْذِيرِ، وَبَالَغُوا فِي ذَلِكَ مَا لَمْ يُبَالِغُوا مِثْلَهُ فِي إِنْكَارِ الْفَوَاحِشِ، وَالظُّلْمِ وَالْعُدْوَانِ، إِذْ مَضَرَّةُ الْبِدَعِ وَهَدْمُهَا لِلدِّينِ وَمُنَافَاتُهَا لَهُ أَشَدُّ»[1].

---

(١) "مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين" لابن القيم (١/ ٣٧٨).

واتە: قسەکردن بەناوی خواوە گەورەترین تاوانە لە تاوانەکان وە زۆرترین زیانی هەیە، ئەمە درۆکردن بەناوی خواوە لەخۆ دەگرێت و هۆکارە خستنەپاڵی کۆمەڵە شتێك بۆی کە شایستە نییە و گومڕاکارییە لە دیندا بە بوون و نەبوون لە بڕیارەکانیدا، لە جۆری تاوانەکاندا هیچ جۆرێکیان وەکوو ئەمە لای خوای گەورە تاوان نییە و زیاندار نییە، بەڵکوو بناغەی هەموو شیرك و بێبڕواییەکە، وە بناغەی داهێنراو و گومڕاییەکانە، وە هۆکاری هەموویان بڕیار و قسەکردنە بەناوی خواوە، بۆیە پێشوانی صالح و ئیمامەکانیان زۆر دژایەتییان کردوون و ناوی خاوەنەکانیان زڕاندوون لە هەموو لایەکی زەویدا و ئاگاداری زەرەرەکانیان کردوون بە شێوەیەکی توند و زیاد لە قەبارەی خۆیشی کە بە شێوەیەك بۆ هیچ تاوان و گوناهێك دژ نەبوون بەم شێوەیە.

بەڵکوو زیانی بیدعەکان و ڕووخاندنیان بۆ دین و دژایەتییان بۆی زۆر زیاترە.

داهێنراو واتە بەدینکردن و بەرگەپۆشکردنی بە حەق و شەرعییەت پێدان و ... .

ستەمە لە حەقی خوادا بە بەشداریکردنی یاسادانان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ [الشورى : ٢١].

ئیمامی (الطبري) رحمه الله دەڵێت: «أم لهؤلاء المشركين بالله ... ابتدعوا لهم من الدين ما لم يبح الله لهم ابتداعه»[(١)].

واتە: ئەوە موشریکەکان دینێکیان داهێناوە بۆ خۆیان کە خوا ڕێگەی پێ نەداون.

وە ستەمە لە حەقی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ بە ڕێنمونی و خۆبردنە پێش دارِشتنی دینی، وە ستەمە لە حەقی خەڵکدا بە گومڕاییکردنیان و سەرلێشێوانیان و بە لاڕێ بردنیان لە دیندا.

٢. **لەکەدارکردنی پلەی پێغەمبەرایەتی.**

داهێنەر بە زمانی حاڵ تۆمەت دەخاتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، بەبێ متمانەیی و نەگەیاندنی دینەکە و شاردنەوەی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ [المائدة : ٦٧].

---

(١) "تفسير الطبري" (٢١/ ٥٢٢).

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمَا: «الْمَعْنَى بَلِّغْ جَمِيعَ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ، فَإِنْ كَتَمْتَ شَيْئًا مِنْهُ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ»[١].

واتە: (ابن عباس) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمَا دەڵێت: بە مانای: بیگەیەنە ئەوەی بۆت هاتووەتە خوارەوە لە خوای خۆتەوە، گەر هەر شتێکی بشاریتەوە ئەوا نەتگەیاندووە.

ئیمامی (مالك) رَحِمَهُٱللَّهُ دەڵێت: «مَنِ ابْتَدَعَ فِي الْإِسْلَامِ بِدْعَةً يَرَاهَا حَسَنَةً، زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَانَ الرِّسَالَةَ، لِأَنَّ اللهَ يَقُولُ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ [المائدة: ٣]، فَمَا لَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ دِينًا، فَلَا يَكُونُ الْيَوْمَ دِينًا»[٢].

واتە: ئەوەی داهێنراوێك دابهێنێت لە ئیسلامدا وا بزانێت چاکە؛ ئەوا وا دەری دەبڕێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ خیانەتی لە پەیامەکەی ئیسلام کردووە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ [المائدة: ٣]، واتە: ئەمڕۆ دینەکەم بۆ تەواو کردوون، ئەوەی لەو ڕۆژەدا دین نەبوو بێت ئەمڕۆ دین نییە.

گەر وابێت ئەوا بیدعەکار بە زمانی حاڵ و گوفتار دەڵێت: شەرعییەتی ئیسلام تەواو نەبووە، هەندێك شتی ماوە واجبە یا پێویستە دیاری بکەین، گەر باوەڕی وابوایە کە تەواو بووە لە هەموو ڕوویەکەوە؛ بیدعەی دروست نەدەکرد، بۆچوونی خۆی نەدەسەپاند، خاوەنی ئەم قسەیەش گومڕایە لە ڕێگەی ڕاست[٣].

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَا بَقِيَ شَيْءٌ يُقَرِّبُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُبَاعِدُ مِنَ النَّارِ، إِلَّا وَقَدْ بُيِّنَ لَكُمْ»[٤].

واتە: شتێك نەماوە نزیکتان بخاتەوە لە بەهەشت، وە دوورتان خاتەوە لە ئاگر هەمووی بۆتان

---

(١) "الجامع لأحكام القرآن" للقرطبي (٦/ ٢٤٢).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٦٥)، و "تهذيب الفروق" (٤/ ٢٢٥)، و "اتباع لا ابتداع" لابن عفانة ص١٣، و "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٧٨)، و "الرد على اللمع" ص٥.

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٦٢).

(٤) رواه الطبراني في "الكبير" (١٦٤٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٨٠٣).

ڕوون کراوەتەوە.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: «قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا، لَا يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلَّا هَالِكٌ»(١).

واتە: بەجێم هێشتوون لەسەر درەوشاوەیەك، شەوی وەکوو ڕۆژی وایە، کەس لێی لا نادات لەدوای من بێجگە لە تیاچوو نەبێت.

(عائشة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دایکی ئیمانداران دەڵێت: «مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا كَتَمَ شَيْئًا مِنَ الْوَحْيِ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللهِ الْفِرْيَةَ»(٢).

واتە: ئەوەی وا دەری ببڕێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی شاردووەتەوە لەوەی بۆی هاتووەتە خوارەوە ئەوە گەورەترین درۆی بەرامبەر خوا کردووە، لەبەر ئەوەی خوا دەفەرمویێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ [المَائِدَة : ٦٧].

### ٣. داهێنراو تۆمەتبارکردنی پێگەی (هاوەڵان)ە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ.

تۆمەتبارکردنی هاوەڵانە لە چەند ڕوویەکەوە (بێئاگایی و نەزانین خستنە پاڵیان بە داهێنانی ئەو داهێنراوانە، بەوەی ئەمان بەئاگا و زانا و کامڵترن لە دەرکپێکردندا، پاشان ناتەواوی و کەمتەرخەمییان و کورتبینییان لە بواری پەیوەستی دین و پەرستندا بە شێوەیەك دەرگای دینداریيان والا کردووە بۆ دوای خۆیان، لە تواناياندا نەبووە ووردبینی و پێویستیەکان، لە هەمووی خراپتر باوەڕبوون بە چاکتر و کامڵتر و باشترین کەسانی چینەکانی دوای هاوەڵان، ئەمە بۆ خۆی بەرپەرچدانەوەی وەسفەکانی قورئان و فەرموودەیە بۆ ئەوان کە لە هەموو ڕوویەکی دینی و

(١) رواه ابن ماجه (٤٣)، وأحمد (١٧١٤٢)، والطبراني في "الكبير" (٦١٩)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧٩)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٤٨)، وابن عبدالبر في "الجامع" (٢٣٠٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٩٣٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٤٣٦٩)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٥٩).

(٢) رواه البخاري (٧٥٣١)، وفي "خلق أفعال العباد" ص٨٩ باب: بَابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ اللهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ [المائدة : ٦٧] وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً، وَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، وَإِنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ»، ورواه مسلم (١٧٧)، والنسائي في "الكبرى" (١١٠٨٢)، والدارمي في "الرد على الجهمية" (١١٦)، وابن خزيمة في "التوحيد" (٢/ ٥٥٠)، وابن منده في "الإيمان" (٧٦٣)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٩٢٣).

دونیاییەوە کامڵ بوون)[١].

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ»[٢].

واتە: گرنگی بدەن بە سوننەت و کار و ڕێگەی من و هاوەڵانی جێنشینە کامڵە هیدایەتدراوەکان و پەیوەست بن پێوەی، وەکوو چۆن بە خرییەکان قەپ دەکرێت بە شتێکدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»[٣].

واتە: باشترین کەسان ئەوانەن کە لە سەردەمی مندان و پاشان ئەوانەی دوای ئەوان و پاشان ئەوانەی دوای ئەوان.

ئیمامی (مالك) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «لا يُصْلِحُ آخِرَ هَذِهِ الأُمَّةِ إِلا مَا أَصْلَحَ أَوَّلَهَا، فَمَا لَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ دِينًا، فَلَا يَكُونُ الْيَوْمَ دِينًا»[٤].

واتە: هیچ ڕێگەیەکی چاکسازی بۆ چاکبوونی ئەم ئوممەتە ناگیرێتە بەر بەدەر لەو ڕێگە چاکسازییەی کە سەرەتای ئەو ئوممەتەی پێ چاك بوو، ئەوەی ئەو ڕۆژە دین نەبووبێت ئەوا ئەمڕۆ دین نییە.

(عبد الله ی کوڕی مەسعود) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: «مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُتَأَسِّيًا فَلْيَتَأَسَّ بِأَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؛ فَإِنَّهُمْ كَانُوا أَبَرَّ هَذِهِ الْأُمَّةِ قُلُوبًا وَأَعْمَقَهَا عِلْمًا وَأَقَلَّهَا تَكَلُّفًا وَأَقْوَمَهَا هَدْيًا وَأَحْسَنَهَا حَالًا، قَوْمًا اخْتَارَهُمُ اللهُ تَعَالَى لِصُحْبَةِ نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَاعْرِفُوا لَهُمْ فَضْلَهُمْ

---

(١) "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لدكتور محمد يسرى ص٣٤.

(٢) رواه ابن ماجه (٤٢)، وأبو داود (٤٦٠٧)، والترمذي (٣٤٢٧)، وسبق تخريجه ص٤٤.

(٣) رواه البخاري (٢٦٥٢)، ومسلم (٢٥٣٣)، وابن ماجه (٢٣٦٢)، وأبو داود (٤٦٥٧)، والترمذي (٢٢٢١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٩٨٦)، وأحمد (٣٥٩٤)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٢٤٠٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٣٢٨)، والطبراني في "الكبير" (٢١٨٧)، والحاكم في "المستدرك" (٤٨٧١)، والبزار في "المسند" (٢٤٨)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٧٨)، والآجري في "الشريعة" (١١٥٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٦٦).

(٤) "مسند الموطأ" للجوهري (٨٨٣)، و "أحكام الجنائز" للألباني ص١٩٨، و "حجة النبي" للألباني ص١٠٣، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١/ ٣٥٣).

وَاتَّبِعُوهُمْ فِي آثَارِهِمْ؛ فَإِنَّهُمْ كَانُوا عَلَى الْهُدَى الْمُسْتَقِيمِ »[(١)].

واته: ئەوەی ئەیەوێت شوێنکەوتە بێت با شوێنکەتەی هاوەڵانی پێغەمبەر بێت ﷺ، ئەوانە خاوەنی چاکترین و خێرترین دڵن لەم ئوممەتەدا، خاوەنی قوڵترین زانستن بەبێ قورسایی و ڕاستترین ڕێنمونی و باشترین حاڵن، کەسانێکن خوای پەروەردگار هەڵی بژاردوون بۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرەکەی، چاکە و پلە و پایەیان بناسن و شوێنکەوتەی پاشماوەکانیان بن، ئەوان لەسەر ڕێگەی ڕاستی ئەم دینە بوون.

(ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَأَمَّا أَهْلُ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ فَيَقُولُونَ فِي كُلِّ فِعْلٍ وَقَوْلٍ لَمْ يَثْبُتْ عَنِ الصَّحَابَةِ: هُوَ بِدْعَةٌ؛ لِأَنَّهُ لَوْ كَانَ خَيْرًا لسبقونا إليه، لأنهم لَمْ يَتْرُكُوا خَصْلَةً مِنْ خِصَالِ الْخَيْرِ إِلَّا وَقَدْ بَادَرُوا إِلَيْهَا»[(٢)].

واته: ئەهلی سوننەت دەربارەی هەموو قسە و کردارێك کە لە هاوەڵانەوە دەرنەچووبێت دەڵێن داهێنراوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر خێر بووبێت پێشمان دەکەون، ئەوان کارێکی خێر نەماوە نەیگەنێ.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَعُلِمَ أَنَّ شِعَارَ أَهْلِ الْبِدَعِ: هُوَ تَرْكُ انْتِحَالِ اتِّبَاعِ السَّلَفِ»[(٣)].

واته: زانراوە یەکێك لە دیاردەکانی بیدعەکاران وازلێهێنانی شوێنکەوتەی پێشینە ساڵحەکانە (هاوەڵان و تابعین).

**٤. داهێنراو ڕکابەری و دژایەتی شەرعی خوا دەکات.**

داهێنەر نکوڵی کار و بەرامبەرێتی لەگەڵ شەرع دەکات، لەبەر ئەوەی شەرع ڕێگای تایبەت و شێوازی تایبەتی دیاری کردووە، خەڵکی ملکەچ کردووە بە فەرمان و قەدەغەکراوەکانی و هەڕەشە و موژدەکانییەوە، وە هەواڵی داوە بە هەموو خێر کە لە خۆیدایە، وە شەڕەکان لە دەرەوە

(١) رواه ابن عبدالبر في "جامع بيان العلم وفضله" (١٨١٠)، و "الحجة في بيان المحجة" للأصبهاني (٤٩٨)، وفي "سلسلة الأحاديث الصحيحة" للألباني (٦/ ٣٠٩) برقم (٢٦٤٩)، وفي "موسوعة الأخلاق" للخراز ص٢٧٥، وفي "مشكاة المصابيح" (١٩٣).

(٢) "تفسير القرآن العظيم" (٧/ ٢٧٨، ٢٧٩).

(٣) "مجموع الفتاوى" (٤/ ١٥٥).

و دەرچوونی خۆیدایە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار زانایە و ئێمە نەزانین و پێغەمبەری ﷺ بە ڕەحمەت ناردووە.

داهێنەر ئەمانە هەموو ڕەت دەکاتەوە، وا دەری دەبڕێت ڕێگای تر هەیە، هەر ئەو دیاریکردنانەی شەرع نییە، بەڵکوو شەرع دەزانێت و ئێمەش دەیزانین، داهێنەر بەرامبەری شەرع وەستاوە، خۆی بە هاوشێوە و بەرامبەری دەزانێت، لەگەڵ شەرعدا یاسا دانەرە، دەرگای جیاوازی کردەوە، مەبەستی شەرعی هەڵوەشاندەوە لە بەتەنیابوونی شەریعەت داناندا، هەر ئەمانە بەسە کە شەڕ بێت بۆ خاوەنەکەی[١].

(عمر بن عبد العزيز) رَحِمَهُ اللهُ لە وەڵامی نامەکەیدا بۆ (عدي بن أرطأة) دەڵێت: «أَمَّا بَعْدُ، أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللهِ، وَالِاقْتِصَادِ فِي أَمْرِهِ، وَاتِّبَاعِ سُنَّةِ نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَتَرْكِ مَا أَحْدَثَ الْمُحْدِثُونَ بَعْدَ مَا جَرَتْ بِهِ سُنَّتُهُ، وَكُفُوا مُؤْنَتَهُ، فَعَلَيْكَ بِلُزُومِ السُّنَّةِ فَإِنَّهَا لَكَ - بِإِذْنِ اللهِ - عِصْمَةٌ، ثُمَّ اعْلَمْ أَنَّهُ لَمْ يَبْتَدِعِ النَّاسُ بِدْعَةً إِلَّا قَدْ مَضَى قَبْلَهَا مَا هُوَ دَلِيلٌ عَلَيْهَا أَوْ عِبْرَةٌ فِيهَا، فَإِنَّ السُّنَّةَ إِنَّمَا سَنَّهَا مَنْ قَدْ عَلِمَ مَا فِي خِلَافِهَا مِنَ الْخَطَإِ وَالزَّلَلِ وَالْحُمْقِ وَالتَّعَمُّقِ، فَارْضَ لِنَفْسِكَ مَا رَضِيَ بِهِ الْقَوْمُ لِأَنْفُسِهِمْ، فَإِنَّهُمْ عَلَى عِلْمٍ وَقَفُوا، وَبِبَصَرٍ نَافِذٍ كَفُّوا، وَهُمْ عَلَى كَشْفِ الْأُمُورِ كَانُوا أَقْوَى، وَبِفَضْلِ مَا كَانُوا فِيهِ أَوْلَى، فَإِنْ كَانَ الْهُدَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ لَقَدْ سَبَقْتُمُوهُمْ إِلَيْهِ وَلَئِنْ قُلْتُمْ إِنَّمَا حَدَثَ بَعْدَهُمْ مَا أَحْدَثَهُ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَ غَيْرَ سَبِيلِهِمْ وَرَغِبَ بِنَفْسِهِ عَنْهُمْ، فَإِنَّهُمْ هُمُ السَّابِقُونَ، فَقَدْ تَكَلَّمُوا فِيهِ بِمَا يَكْفِي، وَوَصَفُوا مِنْهُ مَا يَشْفِي، فَمَا دُونَهُمْ مِنْ مَقْصَرٍ، وَمَا فَوْقَهُمْ مِنْ مَحْسَرٍ، وَقَدْ قَصَّرَ قَوْمٌ دُونَهُمْ فَجَفَوْا، وَطَمَحَ عَنْهُمْ أَقْوَامٌ فَغَلَوْا، وَإِنَّهُمْ بَيْنَ ذَلِكَ لَعَلَى هُدًى مُسْتَقِيمٍ»[٢].

واتە: ئامۆژگاریت ئەکەم بە خوا پەرستی و مانەوە لەسەر فەرمانەکانی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، نەکردنی داهێنراوەکان، ئەوانەی سوننەت پڕی کردوونەتەوە و پێویستیان نەماوە، هەوڵ بدە پەیوەست ببە بە سوننەتەوە بە یارمەتی خوا پاراستنە بۆت، بزانە ئەو خەڵکەی

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٦٢ - ٦٤).

(٢) رواه أبو داود في "سننه" (٤٦١٢) باب لزوم السنة، وصححه الألباني، وسبق تخريجه ص٦١.

هەر داهێنراوێکیان داهێناوە لەوەوپێش بەڵگە هەبووە لەسەری و تێگەیشتنی تیا بووە بۆیان، ئەوەی سوننەتی دارِشتووە زانا بووە بەسەر بەرامبەر و پێچەوانەکەیدا کە هەڵەو نەزانین رِۆچوون و تیاچوونە، رِازی بە بۆ خۆت بەوانەی پێشووان رِازی بوون بۆ خۆیان، ئەوان پێشەنگ بوون و بە زانستەوە لەو ئاستەدا وەستاون، وە بە چاوێکی کراوەوە وازیان هێناوە، لە دەرخستنی نهێنی کارەکاندا بەتوانا بوون، وە گەر خێر بوایە لەپێشترە بۆیان، گەر بڵێن چەند داهێنراوێك دوای ئەوان رِووی داوە، هیچ کەسێك نییە دوای ئەوان داهێنراوی داهێنابێت بێجگە لە لادەرەکان نەبێت لە سوننەت و رِێی هاوەڵان، وە خۆی بە باشتر زانیوە لەوان، بە دڵنیاییەوە ئەوان بۆ ئەمان پێشەنگ بوون، وە ئەوەندە قسەیان لەسەر کردووە کە بەس بێت، وە ئەوەندە وەسف و باسیانی کردووە شیفادەر بێت، ئەوانەی لەخوار ئەوانەوەن کورت هێنەرن، وە ئەوانەی لە سەرووویانەوەن رِێلێگیراون، هەندێك ناگەنە ئەوان وشك و لادەر دەبن، وە هەندێك تەماحیان تیایاندایە وەکوو ئەوان بن زیادە رِەو دەبن، ئەوان لە نێوان ئەم دوانە دان، لەسەر هیدایەت و رِێگەی رِاستن.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: « وَأَمَّا فِي الْبِدَعِ فَثَبَتَ لَهَا أَمْرَانِ:

أَحَدُهُمَا: أَنَّهَا مُضَادَّةٌ لِلشَّارِعِ وَمُرَاغَمَةٌ لَهُ، حَيْثُ نَصَّبَ الْمُبْتَدِعُ نَفْسَهُ نَصْبَ الْمُسْتَدْرِكِ عَلَى الشَّرِيعَةِ، لَا نَصْبَ الْمُكْتَفِي بِمَا حُدَّ لَهُ.

وَالثَّانِي: أَنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ - وَإِنْ قُلْتَ - تَشْرِيعٌ زَائِدٌ أَوْ نَاقِصٌ، أَوْ تَغْيِيرٌ لِلْأَصْلِ الصَّحِيحِ، ... لِأَنَّ الْجَمِيعَ جِنَايَةٌ لَا تَحْمِلُهَا الشَّرِيعَةُ بِقَلِيلٍ وَلَا بِكَثِيرٍ. وَيُعَضِّدُ هَذَا النَّظَرَ عُمُومُ الْأَدِلَّةِ فِي ذَمِّ الْبِدَعِ مِنْ غَيْرِ اسْتِثْنَاءٍ»[١].

واتە: داهێنراو دوو کاری لە بەردەمدایە:

**یەکەم:** دژایەتی شەرعی خوا دەکات و بەربەرەکانێی لەگەڵ دەکات، داهێنەر بەرامبەر و رِکابەری دەکات، یا خۆی بە دەرکپێکەر و ووردەکار داناوە بەسەر شەرعدا، نەك خۆی بە پێویستکار و نەبەزێنی سنوور دانابێت.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٤٤، ٥٤٥).

**دووەم:** هەموو بیدعەیەك دارِشتنێکی زیادەیە، یا ناتەواوە یان گۆڕانکارە لە بناغەیەکی دروستدا ... هەموویان تاوانە، شەریعەت هەڵی ناگرێت، نە بە کەم و نە بە زۆر، ئەم تێڕوانینە کۆگشتی ئەو بەڵگانەی دژایەتی بیدعە دەکات پشتگیریەتی.

**٥. داهێنراو تێکدەری دین و دڵەکانە.**

داهێنەر کاتێك نەفسی خۆی بێبەش کرد لە سوودمەندییەکانی شەریعەت لا دەدات بۆ بیدعە و گومراییەکان، وە هۆکار دەبێت بۆ تێکچوونی فیترەتیان و دروستبوونی تاریکی لە دڵیاندا و پیسبوونی تێگەیشتنیان و لادانی بیروڕایان و گومڕایی لە دینیاندا، ئەمانە دەبێتە هۆکاری نەبینینی حەق و جیانەکردنەوەی هیدایەت و گومڕایی، وە ڕووناکی حەق لە دڵیاندا دەکوژێتەوە[١].

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «أن الشرائع أغذية القلوب، فمتى اغتذت القلوب بالبدع لم يبق فيها فضل للسنن، فتكون بمنزلة من اغتذى بالطعام الخبيث»[٢].

واتە: شەریعەتی خوا خۆراکی دڵەکانە، چ کاتێك دڵەکان خۆراکیان بیدعە و داهێنراوەکان بوو شوێن نامێنێتەوە بۆ سوننەتەکان، وەکوو کەسێکی لێدێت کە خۆراکی پیسی دەرخوارد درابێت.

وە دەڵێت: «ولهذا عظمت الشريعة النكير على من أحدث البدع، وكرهتها؛ لأن البدع لو خرج الرجل منها كفافا لا عليه ولا له لكان الأمر خفيفا، بل لا بد أن يوجب له فسادا، منه نقص منفعة الشريعة في حقه، إذ القلب لا يتسع للعوض والمعوض منه»[٣].

واتە: بۆیە یاساکانی ئیسلام زۆر بە گەورە دژایەتی بیدعەکارانی کردووە و ئاگاداری کردوونەتەوە لێی، وە گەر کەسەکە لە داهێنراوەکە دەرچێت بەبێ هیچ زیان و سوودێك کارەکە ئاسانە، بەڵکوو دەبێت زەرەرۆمەند و زیانبەخش بێت لەسەری، بە گەشەنەکردنی سوودمەندی لە دین بۆی دروست دەبێت، لەبەر ئەوەی دڵ شوێنی داواکاری و لەبریتی بوونەکە ناگرێتەوە.

---

(١) "الفوائد" لابن القيم ص٤٨.

(٢) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" لابن تيمية (٢/ ١٠٤).

(٣) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" لابن تيمية (١/ ٥٤٤).

**٦. داهێنراو تاوانە لە شێوەی پەرستندا.**

ئەوەی بیدعەکاران زیاتر زەرەرۆمەندتر دەکات کارکردنیانە بە ڕازاندنەوەی داهێنراوەکانیان لای خەڵکی و لەبەرکردنی بەرگێکی شەرعی بۆیان، وە شێوازی پەرستن (عبادة)ی پێ دەبەخشن بۆ ئەوەی ڕاوی نەزانانی پێ بکەن، وە تەنانەت داهێنراوەکان دەخەنە پاڵ پیاوە ناودارەکانەوە بۆ زیاتر کاریگەری لەسەر دڵ لاواز و بێئاگاکان.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أن يأتي به صاحبه مموها مزخرف الألفاظ ملفق المعاني مكسوا حلة الفصاحة والعبارة الرشيقة فتسرع العقول الضعيفة إلى قبوله واستحسانه وتبادر إلى اعتقاده وتقليده ويكون حاله في ذلك حال من يعرض سلعة مموهة مغشوشة على من لا بصيرة له بباطنها وحقيقتها ...»[(١)].

واتە: خاوەن بیدعە بە شێوەیەکی شاراوە و قسەی بریق و باق و مانای پێچاوپێچ و بەرگی ڕەوانبێژی دارشتنی ڕێك و ڕەوان بیدعەکەی دەڕازێنێتەوە تا ببێتە هۆکاری ئەوەی دڵە لاوازەکان بە پەلە وەری بگرن و بەچاکی بزانن و باوەڕی پێ بکەن و شوێنکەوتەی بن، وەکوو کەسێك وایە شتومەکێکی خراپ بڕازێنێتەوە لای کەسێك هیچ چاوکراوەییەکی نەبێت لە ڕاستی و ناوەڕۆکیدا.

وە دەڵێت: «أن يعزو المتأول تأويله وبدعته إلى جليل القدر نبيه الذكر من العقلاء أو من آل البيت النبوي أو من حل له في الأمة ثناء جميل ولسان صدق ليحليه بذلك في قلوب الأغمار والجهال فإن من شأن الناس تعظيم كلام من يعظم قدره في نفوسهم وأن يتلقوه بالقبول والميل إليه وكلما كان ذلك القائل أعظم في نفوسهم كان قبولهم لكلامه أتم حتى إنهم ليقدمونه على كلام الله ورسوله ويقولون هو أعلم بالله ورسوله منا ...»[(٢)].

واتە: کەسی بیدعەکار و مانا گۆڕ کارەکەی دەخاتە پاڵ کەسی ناودار و ناسراو لە عاقڵەکاندا، یاخود لە کەس و خزمانیماڵی پێغەمبەرایەتیدا، یا ئەوانەی بە باش ناویان دەبەن

---

(١) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" (٢/ ٤٣٦).

(٢) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" (٢/ ٤٤١).

خاوەنی زمانی ڕاستگۆ بوون، بۆ ڕازاندنەوەیان لە دڵی بێئاگا و نەزانەکاندا، سروشتی خەڵك وایە قسەی ناودارەکانیان بەلاوە بەقەدرە و ڕاستەوخۆ کاریگەری وەرگرتن و هەڵگرتنیان هەیە، هەتا ئەو کەسە بەڕێز و ناودارتر بێت لە دڵیاندا قسەیان زیاتر و تەواوتر وەردەگیرێت، تاوەکوو قسەکانیان پێش فەرموودەی خوا و پێغەمبەر ﷺ دەخەن و دەڵێن ئەوان زانا و شارەزاترن بەسەر فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەری خوادا ﷺ تا ئێمە.

**٧. داهێنراو خراپترە لە تاوان.**

گومڕاییەکان کاریان وایە هەڵگێڕانەوەی ڕێگەی خێر و ڕاستییەکانە بۆ ڕێگا شەڕەکان، وەکوو (ڕافیزە)کان دەڵێن: کوشتن و بڕین زۆر بکەن بۆ ئەوەی (مەهدی) بێت، لەبەر ئەوەی ئەو لە کاتی کوشتار و خراپەیەکی زۆردا دێت.

(خەوارج)ەکان «يَقْتُلُونَ أَهْلَ الْإِسْلَامِ وَيَدَعُونَ أَهْلَ الْأَوْثَانِ»(١). ئەوەی هاتووەتە ناو ئیسلامەوە و موسوڵمان بووە بە هەڵگەڕاوەیان دادەنان و دەیانکوشت و بێبڕواکانیش سەلامەت بوون لە دەستیان، وەکوو (سۆفی)یەکان دەروونیان پاك دەکردەوە لە تاوان، بەڵام دینیان پیس دەکرد بە هاوبەش بڕیاردان و داهێنراوەکان، لەگەڵ ئەوەشدا پێچەوانەیە ئادەمیزاد نییە تاوان نەکات، وە دەبێت هەر ئایینیش بە پاکی بمێنێتەوە.

فیرەقە کەلامییەکان قورئان و فەرموودەیان دەکردە شوێنکەوتەی عەقڵ، گەرچی داوا کراوە پێچەوانە بێت ... خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ [الأنعام: ١١٠].

واتە: سزایان دەدەین بە هەڵگێڕانەوەی دڵیان و نەهێشتنی ئیمانهێنان و یارمەتی نەدانیان هەروەکوو یەکەمجار کە ئیمانیان پێ نەهێناوە، ئەمە دادپەروەری خواییە لەسەریان(٢).

ئەمانە هەر لە سەرەتاوە باوەڕیان تەواو نەبووە بە تەسلیم بوونی تەواوی فەرمانەکان.

(١) رواه البخاري (٣٣٤٤)، ومسلم (١٠٦٤)، وأبو داود (٤٧٦٤)، والنسائي في "الكبرى" (٢٣٧٠)، وأحمد (١١٦٤٨)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (٢/ ٥٤٠)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٨٦٧٦)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩١٠).

(٢) "تفسير السعدي" ص٢٦٩.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «وَالْبِدْعَةُ شَرٌّ مِنْ الْمَعْصِيَةِ كَمَا قَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ: الْبِدْعَةُ أَحَبُّ إلَى إبْلِيسَ مِنْ الْمَعْصِيَةِ؛ فَإِنَّ الْمَعْصِيَةَ يُتَابُ مِنْهَا وَالْبِدْعَةَ لَا يُتَابُ مِنْهَا»(١).

واته: داهێنراو شەڕی زیاترە لە تاوان، وەکوو (سوفیانی سەوری) دەڵێت: داهێنراو خۆشەویستترە لای ئیبلیس لە تاوان، لەبەر ئەوەی تاوان خاوەنەکەی تەوبەی لەسەر دەکات، بەڵام خاوەن بیدعە تەوبە ناکات لەسەر بیدعەکەی، لەبەر ئەوەی بە ڕێگەی خێر و عیبادەتی دەزانێت، وە کێ تەوبە لەسەر خێر و عیبادەت دەکات؟!

(ابن القيم) رحمه الله دەڵێت: «وَلَمَّا كَانَتْ هَذِهِ الْبِدَعُ الْمُضِلَّةُ جَهْلًا بِصِفَاتِ اللهِ وَتَكْذِيبًا بِمَا أَخْبَرَ بِهِ عَنْ نَفْسِهِ وَأَخْبَرَ بِهِ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنَادًا وَجَهْلًا كَانَتْ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ، وَإِنْ قَصُرَتْ عَنِ الْكُفْرِ وَكَانَتْ أَحَبَّ إِلَى إِبْلِيسَ مِنْ كِبَارِ الذُّنُوبِ ... وَقَالَ إِبْلِيسُ: أَهْلَكْتُ بَنِي آدَمَ بِالذُّنُوبِ وَأَهْلَكُونِي بِالِاسْتِغْفَارِ وَبِلَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ بَثَثْتُ فِيهِمُ الْأَهْوَاءَ، فَهُمْ يُذْنِبُونَ وَلَا يَتُوبُونَ، لِأَنَّهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ... وَفِتْنَةُ الْمُبْتَدِعِ فِي أَصْلِ الدِّينِ، وَفِتْنَةُ الْمُذْنِبِ فِي الشَّهْوَةِ، وَالْمُبْتَدِعُ قَدْ قَعَدَ لِلنَّاسِ عَلَى صِرَاطِ اللهِ الْمُسْتَقِيمِ يَصُدُّهُمْ عَنْهُ، وَالْمُذْنِبُ لَيْسَ كَذَلِكَ، ... وَالْمُبْتَدِعُ يَقْطَعُ عَلَى النَّاسِ طَرِيقَ الْآخِرَةِ، وَالْعَاصِي بَطِيءُ السَّيْرِ»(٢).

واته: کاتێك بیدعە گومڕاکان نەزانن بە وەسفەکانی خوا بە درۆخستنەوەی هەواڵەکانی قورئان و فەرموودەیە بە نەزانین و نکوڵی؛ ئەوە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، لای ئیبلیس خۆشەویستترە لە تاوانی گەورەش، ئیبلیس وتی: ئادەمیزادم تیا بردووە بە تاوانکردن، ئەوانیش منیان تیا بردووە بە وتنی ( لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ ) و داوای لێخۆشبوون کردن، کاتێك ئەمەم بینی هەوا و ئارەزووەکانم تیادا بڵاو کردنەوە، ئیتر تاوان دەکەن و تەوبەی لەسەر ناکەن، لەبەر ئەوەی وا گومان دەبەن کاری چاك دەکەن.

شەڕی بیدعەکار لەناو بناغەی دیندایە، بەڵام تاوانبار لە حەزەکانی خۆیدایە، بیدعەکار لە سەرەڕێگەی ڕاستی خوایی دانیشتووە و بە لاڕێیان دەبات، بە پێچەوانەی تاوانبارەوە، بیدعەکار

(١) "مجموع الفتاوى" (١١/ ٤٧٢).

(٢) "الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي" ص١٤٥، و "مفتاح دار السعادة" (١/ ١١٢).

ڕێگەی کۆتایی لە خەڵك دادەخات، بەڵام تاوانبار ڕێگەکە بە هێواشی بۆ دەبڕێت.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «أَئِمَّةُ أَهْلِ الْبِدَعِ أَضَرُّ عَلَى الْأُمَّةِ مِنْ أَهْلِ الذُّنُوبِ. وَلِهَذَا أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلِ الْخَوَارِجِ؛ وَنَهَى عَنْ قِتَالِ الْوُلَاةِ الظَّلَمَةِ»[(١)].

واتە: پێشەوایان و سەرانی بیدعەکاران زیانیان زیاترە بۆ موسوڵمانان لە تاوانباران، ئەمەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بە کوشتنی خەوارجەکان، بەڵام ڕێگری کردووە لە شەڕکردن لەگەڵ کاربەدەستە زاڵمەکاندا.

**٨. داهێنراو ڕێگەی دووبەرەکایەتی و جیاوازی نانەوەیە.**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ [آل عمران: ١٥٣].

واتە: ئەمە ڕێگەی ڕاستی خواییە، شوێنکەوتەی بن و شوێنکەوتەی ڕێگەکانی تر مەبن کە لاتان دەدات لە ڕێگەی خوایی.

ڕێگەی بیدعەکارانی بە کۆ ناو بردووە کە نیشانەی پارچەپارچە بوونیانە.

**مەبەست بە ﴿ٱلسُّبُلَ﴾ ڕێگا جیاوازەکانی بیدعەیە.**

(مجاهد) رحمه الله دەڵێت: «الْبِدَعُ وَالشُّبُهَاتُ»[(٢)].

واتە: ڕێگەکان: داهێنراو و گومڕاییەکانە.

ئەوەی شوێنکەوتەی سوننەت بێت بەرییە لە داهێنراو، وە تەنانەت خوای پەروەردگار جل جلاله پێغەمبەرەکەی ﷺ بەری کردووە لە بیدعەکاران و ڕێگەکانیان، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍ﴾ [آل عمران: ١٥٩]. **مەبەست بە** ﴿فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ﴾: واتە: ئەوانەی دووبەرەکایەتی لە دینەکەیاندا دروست دەکەن و دەبنە چەندەها کۆمەڵ، ئەی (محمد ﷺ) تۆ لەوان نیت لە هیچ شتێکدا.

---

(١) "مجموع الفتاوى" (٧/ ٢٨٤).

(٢) "تفسير الطبري" (٩/ ٦٧٠).

(علي بن أبي طالب وقتادة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێن: «فَارَقُوا دِينَهُمْ»[(١)]. لە دینەکەیان جیا دەبنەوە.

(أبو هريرة) رضي الله عنه دەڵێت: «نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي هَذِهِ الْأُمَّةِ»[(٢)]. ئەم ئایەتە بۆ موسوڵمانان هاتووەتە خوارەوە.

خوای پەروەردگار هەواڵی داوە بە پێغەمبەرەکەی کە بەرییە لەوانەی کە لە دینە حەقەکەی جیا دەبنەوە و دووبەرەکایەتی دەنێنەوە، دەبنە چەندەها تاقم و کۆمەڵ، تۆ لەوان نیت و ئەوانیش لە تۆ نین.

(أم سلمة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دایکی ئیمانداران وتی: «لِيَتَّقِ امْرُؤٌ أَنْ لَا يَكُونَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَيْءٍ»[(٣)].

واتە: هەر یەکە با خۆی بپارێزێت لەوەی کە لە هیچ شتێکی پێغەمبەردا نەبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: «... وَإِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً - يَعْنِي: الْأَهْوَاءَ -، كُلُّهَا فِي النَّارِ إِلَّا وَاحِدَةً، وَهِيَ الْجَمَاعَةُ»[(٤)].

واتە: موسوڵمانان دەبنە حەفتاو سێ بەشەوە، هەموویان لە ئاگردان بێجگە لە یەکێکیان نەبێت، ئەویش ئەوانەن لەسەر ڕێگا و بنەمای هاوەڵانن.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «البدعة مقرونة بالفرقة كما أن السّنة مقرونة بالجماعة»[(٥)].

واتە: داهێنراو پەیوەستە بە جیاوازی و دووبەرەکایەتییەوە، هەروەك چۆن سوننەت پەیوەستە بە کۆبوونەوە و یەکبوون.

---

(١) "تفسير الطبري" (١٠/ ٣٠).

(٢) "تفسير الطبري" (١٠/ ٣٣).

(٣) "تفسير الطبري" (١٠/ ٣٥).

(٤) رواه ابن ماجه (٣٩٩٣)، وأبو داود (٤٥٩٧)، وأحمد (١٦٩٣٧)، والطبراني في "الكبير" (٨٨٥)، والحاكم في "المستدرك" (٤٤٣)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٦٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٥٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٥٢)، والمروزي في "السنة" (٥١)، وأبو يعلى في "مسنده" (٤١٢٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٠٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٠٤٢).

(٥) "الاستقامة" لابن تيمية (١/ ٤٢).

**گەر سەیری مێژووی موسوڵمانان بكەین دەبینین ئەو هەموو فیرقە و تاقمە جیاجیایانە دروست بوون، هەریەكەیان لەسەر ڕای جیاوازن و ناكۆكن لەگەڵ یەكدا، وەكوو** (الخوارج، المعتزلة، القدرية، الجبرية، الجهمية، الرافضة، المرجئة، الأشاعرة ...).

(ابراهيم النخعي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ **لە تەفسیری** ﴿وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ﴾ [المائدة : ٦٤]. **دەڵێت:** «أَصْحَابَ الْأَهْوَاءِ»[(١)].

**واتە: (ئەوانەی دووبەرەكایەتی و ڕق و كینەمان خستووەتە نێوانیان) ئەوانە خاوەن ویست و ئارەزووەكانن، بیدعەكارانن.**

**٩. داهێنراو زیانی دەرەكی و بەردەوامە.**

**زیانی داهێنراو لەسەر دینە، وە داهێنەریش زیانی بۆ دەوروبەریەتی، لەبەر ئەوەی ڕێگەكەی بە حەق دەزانێت و بانگەوازی بۆ دەكات، بۆیە تەوبەی لێ ناكات و متمانەی گەڕانەوەی نییە.**

**پێغەمبەری خوا** ﷺ **دەفەرموێت:** «إِنَّ اللهَّ حَجَبَ التَّوْبَةَ عَنْ كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ حَتَّى يَدَعِ بِدْعَتَهُ»[(٢)]. وفي رواية: «إِنَّ اللهَ احْتَجَزَ التَّوْبَةَ عَنْ كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ»[(٣)].

**واتە: خوای پەروەردگار ڕێگەی تەوبەی داخستووە لەسەر هەموو خاوەن بیدعەیەك، تاوەكوو واز لە بیدعەكەی دێنێت.**

**ئەم ڕێگەی تەوبە داخستنە لەسەری بە شێوەیەكی گشتییە، دوور نییە خوای پەروەردگار هیدایەتی نەدا و نەگەڕێتەوە لە ڕاكەی بۆ سەر حەق، بەڵام بە شێوازێكی گشتی گەڕانەوەیان نییە.**

(ابن سيرين) رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەڵێت:** «مَا أَخَذَ رَجُلٌ بِبِدْعَةٍ فَرَاجَعَ سُنَّةً»[(٤)].

---

(١) "الشرح والإبانة" لابن بطة ص١٤١.

(٢) رواه إسحاق بن راهويه في "مسنده" (٣٩٨)، والطبراني في "الأوسط" (٤٢٠٢)، والبيهقي في "الشعب" (٩٠١١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٧)، وصححه الألباني في "ظلال الجنة" (٣٧)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٥٤)، و "حجة النبي" ص١٠١، وفي "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢١٢) بتحقيق مشهور حسن.

(٣) رواه البيهقي في "الشعب" (٩٠١٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٧)، وابن وضاح في "البدع" (١٤٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٦٢٠)، وفي "مناسك الحج والعمرة" ص٤٤.

(٤) رواه الدارمي في "السنن" (٢١٤).

واته: کەسێك نییە تێوە گلا بێت بە بیدعەیەکەوە و دوای ئەوە توانای گەڕانەوەی هەبێت بۆ سوننەت و حەقەکە.

(أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ) دەڵێت: «كَانَ يُقَالُ: "يَأْبَى اللهُ لِصَاحِبِ بِدْعَةٍ بِتَوْبَةٍ، وَمَا انْتَقَلَ صَاحِبُ بِدْعَةٍ إِلَّا إِلَى شَرٍّ مِنْهَا"»(١).

واته: دەوترا: خوا ڕێگە نادات خاوەن بیدعە تەوبە بکات، ناگۆڕێت خاوەنەکەی بێجگە بۆ خراپتر نەبێت.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمویێت: «يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لَا يَرْجِعُونَ إِلَيْهِ»، و «ثُمَّ لَا يَعُودُونَ»(٢).

واته: لە دین دەردەچن وەکوو تیر چۆن لە تێگیراوەکەی دەردەچێت، پاشان ناگەڕێنەوە بۆی (مەبەست پێی خەوارجەکانە) دیارە هەموو بیدعەکارێك ئەستەمە لە بیدعەکەی بگەڕێتەوە(٣).

(ابن القيم) رحمه الله دەڵێت: «الْبِدْعَةِ أَحَبُّ إِلَى الشَّيْطَانِ، لِمُنَاقَضَتِهَا الدِّينَ، وَدَفْعِهَا لِمَا بَعَثَ اللهُ بِهِ رَسُولَهُ، وَصَاحِبُهَا لَا يَتُوبُ مِنْهَا، وَلَا يَرْجِعُ عَنْهَا، بَلْ يَدْعُو الْخَلْقَ إِلَيْهَا، وَلِتَضَمُّنِهَا الْقَوْلَ عَلَى اللهَّ بِلَا عِلْمٍ، وَمُعَادَاةَ صَرِيحِ السُّنَّةِ، وَمُعَادَاةَ أَهْلِهَا، وَالِاجْتِهَادَ عَلَى إِطْفَاءِ نُورِ السُّنَّةِ، وَتَوْلِيَةِ مَنْ عَزَلَهُ اللهُ وَرَسُولُهُ، وَعَزْلَ مَنْ وَلَّاهُ اللهُ وَرَسُولُهُ، وَاعْتِبَارَ مَا رَدَّهُ اللهُ وَرَسُولُهُ، وَرَدَّ مَا اعْتَبَرَهُ، وَمُوَالَاةَ مَنْ عَادَاهُ، وَمُعَادَاةَ مَنْ وَالَاهُ، وَإِثْبَاتَ مَا نَفَاهُ، وَنَفْيَ مَا أَثْبَتَهُ، وَتَكْذِيبَ الصَّادِقِ، وَتَصْدِيقَ الْكَاذِبِ، وَمُعَارَضَةَ الْحَقِّ بِالْبَاطِلِ، وَقَلْبَ الْحَقَائِقِ بِجَعْلِ الْحَقِّ بَاطِلًا، وَالْبَاطِلِ حَقًّا، وَالْإِلْحَادَ فِي دِينِ اللهَّ، وَتَعْمِيَةَ الْحَقِّ عَلَى الْقُلُوبِ، وَطَلَبَ الْعِوَجِ لِصِرَاطِ اللهَّ الْمُسْتَقِيمِ، وَفَتْحَ بَابِ

---

(١) "البدع" لابن وضاح (١٥٢)، وقال مشهور حسن في "الاعتصام" (١/ ١٤١): سنده صحيح.

(٢) رواه البخاري (٣٦١١)، ومسلم (١٠٦٦)، وأبو داود (٤٧٦٤)، والنسائي في "الكبرى" (٣٥٥٠)، وأحمد (١١٦٩٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٠١٩٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٩٦٤)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٨٦٥٠)، والحاكم في "المستدرك" (٢٦٥٠)، والبزار في "المسند" (٨٧٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٦٧٠٣)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩١٧)، وابن وضاح في "البدع" (١٤٣).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢١٣، ٢١٤).

تَبْدِيلِ الدِّينِ جُمْلَةً.

فَإِنَّ الْبِدَعَ تَسْتَدْرِجُ بِصَغِيرِهَا إِلَى كَبِيرِهَا، حَتَّى يَنْسَلِخَ صَاحِبُهَا مِنَ الدِّينِ، كَمَا تَنْسَلُّ الشَّعْرَةُ مِنَ الْعَجِينِ، فَمَفَاسِدُ الْبِدَعِ لَا يَقِفُ عَلَيْهَا إِلَّا أَرْبَابُ الْبَصَائِرِ، وَالْعِمْيَانُ ضَالُّونَ فِي ظُلْمَةِ الْعَمَى ﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾﴾ [النور: ٤٠].»[(١)].

واتە:

١. بیدعە خۆشەویستترە لای شەیتان لەبەر دژایەتیکردنی بۆ دین.

٢. بەرپەرچدانەوەی ئەوەی کە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەیدا ناردوویەتی.

٣. خاوەنەکەی ناگەڕێتەوە لێی و تەوبە ناکات.

٤. بانگەوازی خەڵکی بۆ دەکات.

٥. قسە و بڕیاردانە لە دیندا بەبێ زانست.

٦. دژایەتیکردنی سوننەت بە ڕوون و ئاشکرا.

٧. دژایەتیکردنی هەڵگرانی سوننەت.

٨. هەوڵدان بۆ کوژاندنەوەی ڕووناکی سوننەت.

٩. کردنە ئیمام و پێشەنگی ئەوانەی خوا و پێغەمبەرەکەی لای داون (هەوا و ئارەزووچیان).

١٠. لابردنی ئەوانەی بە بڕیاردان و سەرپەرشتیکار دانراون لای خوا و پێغەمبەرەکەیەوە (کە قورئان و فەرموودەیە).

١١. ڕەچاوکردنی ئەوانەی خواو پێغەمبەرەکەی ڕەتیان کردووەتەوە (ویستەکانی ئادەمیزاد).

١٢. وە بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی ڕەچاوکراون لە دیندا (قورئان و فەرموودە).

١٣. پشتیوانی و لایەنگرانی دژانی قورئان و فەرموودە.

١٤. دژایەتیکردنی خاوەن بڕیارەکانی دین (خوا و پێغەمبەر ﷺ و شێوازی تێگەیشتنی

---

(١) "مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين" (١/ ٢٣٩).

هاوەڵان ﭫ).

١٥. دانانی ئەوانەی نەفی كردووە (هەوا و ئارەزووەكان).

١٦. وە نەفیكردنی ئەوانەی داینـاوە (مەبەستە شەرعییەكان).

١٧. بە درۆخستنەوەی ڕاستگۆ (قورئان و فەرموودە).

١٨. بە ڕاستگۆكردنی درۆزنان (بیدعەكاران و ئارەزوومەندان).

١٩. ڕكەبەرایەتیكردنی حەق بە بەتاڵ.

٢٠. هەڵگێڕانەوەی ڕاست و دروستییەكان، حەق كردنە بە بەتاڵ و بەتاڵ كردنە بە حەق.

٢١. ڕێگەی دەرچوون لە دین.

٢٢. كوێركردنەوەی حەق لەسەر دڵەكان.

٢٣. هەوڵدان بۆ لار و چەوتكردنی ڕێگا ڕاستەكەی خوا ﻷ.

٢٤. دەرگاكردنەوەی گۆڕانكاری دین بە گشتی.

٢٥. داهێنراو بە ڕۆچوونكردنە لە بچووكەوە بۆ گەورە، تا خاوەنەكەی لە دین دەردەكات وەكوو موویەك لە هەویردا.

زیانەكانی داهێنراو مەگەر زانایان و چاوكراوەكان شارەزا بن بەسەریاندا، بەڵام كوێرەكان گومڕان و لە تاریكی كوێری گومڕاییدان، گەر خوای پەروەردگار نووری هیدایەت نەبەخشێت بە كەسێك نووری دەست ناكەوێت.

هەركەسێك لەم زیانانەی كە (ابن القيم) ﭬ باسی كردووە تێبگات بەسیەتی بۆ تێگەیشتنی لە ترسناكی بیدعە و بیدعەكاران، كە دەیانەوێت شورای پۆڵایین و پارێزراوی ئەم دینە بشكێنن، بەڵام مێژوو شاهیدە لەگەڵ دروستبوونی ئەو هەموو گومڕاییانە لەناو بازنەی ئیسلامدا، نەیان توانیوە سەرچاوە و حەق و بەرنامەی پاكی قورئان و فەرموودە كز بكەن و ون بێت لەبەر چاودا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ [الحجر: ٩].

وادەی خواییە كە پاراستنی دینەكەی نەداوەتە دەستی موسوڵمانان، بەڵكوو خۆی دەیپارێزێت.

**١٠. بیدعەکاران دژایەتی و ڕقلێبوونی خاوەن سوننەت کاریان دەبێت.**

(ابن القطان) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «ليس في الدنيا مبتدع إلا وهو يبغض أهل الحديث»[1].

واتە: بیدعەکارێك نییە لە دونیادا ڕق و کینەی نەبێت بەرامبەر فەرموودەناس.

وە (أبو حاتم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «عَلَامَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ الْوَقِيعَةُ فِي أَهْلِ الْأَثَرِ»[2].

واتە: نیشانەی هەوا و ئارەزووکاران قسە وتنە بە زانایانی فەرموودە.

**١١. داهێنراو هۆکاری وەرنەگرتنی کردەوەیە.**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»[3].

واتە: هەرکەسێك کارێك دابهێنێت لەم ئایینەماندا؛ تیایدا نەبێت (واتە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت) ڕەت دەکرێتەوە.

**١٢. هەڵگێڕانەوەی تێگەیشتنە.**

هەڵگەڕاندنەوەی چاکە بە خراپە و بیدعە بە سوننەت و هەوا و ئارەزوو بە شوێنکەوتن؛ کاری بیدعەکارانە.

(حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: «وَاللهِ لَتَفْشُوَنَّ الْبِدَعُ حَتَّى إِذَا تُرِكَ مِنْهَا شَيْءٌ قَالُوا: تُرِكَتِ السُّنَّةُ»[4].

واتە: سوێند بە خوا داهێنراو بڵاو دەبێتەوە، تا وای لێدێت گەر شتێکی لێ واز بهێنرێت دەڵێن سوننەتت واز لێهێناوە.

**١٣. شایەتی و گواستنەوەی زانستی (الرواية)ی لێ وەرناگیرێت.**

ئیمامی (النووي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «تقبل إذا لم يكن داعية إلى بدعته ولا تقبل إذا كان داعية،

---

(١) "عقيدة السلف" للإمام الصابوني (١٦٣).

(٢) "ذم الكلام وأهله" للهروي (٢٧٥)، "شرح أصول اعتقاد" للالكائي (١/ ١٧٩)، "عقيدة السلف" للإمام الصابوني ص٣٠٤.

(٣) رواه مسلم (١٧١٨)، والبخاري (٧٣٤٩)، وسبق تخريجه ص٤٦ .

(٤) "البدع" لابن الوضاح (١٥١).

وهذا مذهب كثيرين أو الأكثر من العلماء وهو الأعدل الصحيح»[(١)].

واتە: بیدعەکار گەر بانگەوازکار بوو بۆ بیدعەکەی گێڕانەوەی فەرموودەی لێ وەرناگیرێت، ئەمە ڕای دروستی زۆری زانایانە.

**١٤. بیدعەکار زۆری دەکەوێتە دووبەرەکایەتی و فیتنەگێڕییەوە.**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ﴾ [النور: ٦٣].

واتە: ئاگادار بن ئەوانەی لە ڕێگا و بەرنامە و کار و کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ لا دەدەن تووشی گومڕایی و بیدعە دەبن[(٢)].



(١) "شرح النووي على مسلم" (١/ ٦٠).

(٢) "تفسير القرآن العظيم" لابن كثير (٦/ ٨٨).

# بەندی دووەم

## بەشی یەکەم

## تێڕوانین لەسەر دابەشکردنی داهێنراو

## (التحقيق في تقسيم البدع)

**هەموو زانایانی ئەهلی سوننەت کۆدەنگن لەسەر:**

✍ خراپی داهێنراو و زەرەرۆمەندی لە دیندا، وە هەموو بەڵگە ڕاست و یەکلابووەکان پشتیوانن لەسەر ئەوەی داهێنراو گومڕاییە و زیانی لە تاوان گەورەترە و پێویستە موسوڵمان دوورکەوێتەوە لێی و ئاگاداری بێت[(١)].

✍ پێناسەی زمانەوانی هیچ پەیوەندی بە کردنە بەڵگەوە نییە بۆ دابەشکردنی داهێنراو بۆ چاك و خراپ، بەڵکوو پێناسەی بەکارهێنانی شەرعی (الإصطلاحي) لێرەدا شوێنی ڕای جیاوازی زانایانە.

✍ داهێنراو لە بنەما دینییەکاندا (أصول الدين) قەدەغە و گومڕاییە، بەڵام لە (فروع)دا شوێنی ڕای جیاوازە[(٢)].

## سێ ڕوانگەی زانایان لەسەر جۆری دابەشکردنی داهێنراو

**ڕوانگەی یەکەم: دابەشکردنی بۆ داهێنراوی چاك و خراپ (البدعة الحسنة والبدعة السيئة)**: ئەمەش لە ڕوانگەی تێڕوانینی سوننەتەوە، ئەوەی گونجا لەگەڵیدا چاکەیە و ئەوەی نەگونجا خراپەیە.

---

(١) "أقوم السنن في نقض تقسيم البدع إلى سيء وحسن" لدكتور: أحمد عبدالكريم نجيب ص١٧.

(٢) "أقوم السنن في نقض تقسيم البدع إلى سيء وحسن" لدكتور: أحمد عبدالكريم نجيب ص٢٠.

**ڕوانگەی دووەم: دابەشكردنی بۆ پێنج بەشە یاسا شەرعییەكان (الأحكام التكليفية: واجب، مندوب، حرام، مكروه، مباح): ئەمەش لە ڕوانگەی بەڵگە و بنەما شەرعییەكانەوە.**

**ڕوانگەی سێیەم: داهێنراو یەك جۆرە و ئەویش حەرام و تاوانە، چاكە و خێری تێدا نییە و دابەشیش نابێت بۆ هیچ بەشێك: ئەمەش لە ڕوانگەی دروستبوونی داهێنراوەكانەوە لەپاش سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ.**

## ڕوانگەی یەكەم: دابەشكردنی بۆ داهێنراوی چاك و خراپ

### ( البدعة الحسنة والبدعة السيئة )

**بەڵگەكانیان:**

١. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ»[(١)].

٢. «مَا رَآهُ الْمُسْلِمُونَ حَسَنًا فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ، وَمَا رَآهُ الْمُسْلِمُونَ سَيِّئًا فَهُوَ عِنْدَ اللهِ سَيِّئٌ»[(٢)].

---

(١) رواه مسلم (١٠١٧)، وابن ماجه (٢٠٣) بلفظ: "مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً"، والنسائي في "الكبرى" (٢٣٤٦)، وأحمد (١٩١٥٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٣٠٨)، والطبراني في "الكبير" (٢٣٧٢)، والبغوي في "شرح السنة" (٦/ ١٦٠)، والبيهقي في "الشعب" (٣٠٤٨)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢/ ٣٥٠)، والبزار في "المسند" (٢٩٦٣).

(٢) رواه أحمد موقوفا على ابن مسعود (١/ ٣٧٩)، والبزار في "المسند" (١٨١٦)، والطبراني في "الأوسط" (٣٦٠٢)، والحاكم في "المستدرك" (٤٤٦٥)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣٧٥)، ومالك في "الموطأ" (٣٧٨)، والبيهقي في "السنن الصغرى" (٨١٧)، وفي "المدخل" (٤٩)، وضعفه الألباني في "الضعيفة" (٥٣٣) وقال: لا أصل له مرفوعًا وإنما وردت موقوفا على ابن مسعود، ورواه الطيالسي في "المسند" (٢٣)، والخطيب في "الفقيه والمتفقه" (١/ ١٤٦)، وفي "التأريخ" (٤/ ١٦٥)، وابن الأعرابي في "المعجم" (٨٩١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٥)، والسخاوي في "المقاصد" (٩٥٩)، والهيثمي في "المجمع" (١/ ١٧٧)، وابن حجر في "الدراية" (٢/ ١٨٧)، وابن الجوزي في "الواهيات" (٤٥٢).

**٣.** قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه: «**نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ، ...**»[(١)].

**٤. کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی (ئەبو بەکری صدیق) رضي الله عنه دا و کورتکردنەوەی خوێندنەوەی لەسەر یەك جۆر، وە دانانی بانگی یەکەم بۆ (جومعە) لە سەردەمی (عوسمان) رضي الله عنه دا و نوێژی جەژن لە مزگەوت لە سەردەمی (عەلی کوڕی ئەبو تالب)دا رضي الله عنه.**

**٥. هەندێك کرداری هاوەڵان بە بۆچوونی خۆیان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا و دوای وەفاتی.**

**٦. بوونی تایبەتمەندی لە وشەی گشتی «کُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ».**

**٧. وتە و ڕاوبۆچوونی زانایان لەسەر دابەشکردنی داهێنراو بۆ داهێنراوی چاك و خراپ** (البدعة الحسنة والسيئة).

## وەڵامی بەڵگەکانیان:

**یەکەم: فەرموودەی:** «**مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، ...**».

**ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە بە شێوەی** «من ابتدع بدعة حسنة، ومن ابتدع بدعة سيئة»[(٢)]، **واتە بە مانای داهێنراوی چاك و خراپ.**

**أ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:** «**مَنْ سَنَّ**»، **نەیفەرمووە** «**مَنْ ابْتَدَعَ**»، **وە فەرموویەتی:** «**فِي الْإِسْلَامِ**»، **لە کاتێکدا داهێنراو لە ئیسلامدا نییە، وە فەرموویەتی:** «**حَسَنَةً**»، **لە کاتێکدا داهێنراو چاکە نییە**[(٣)].

**چاکە و** (حسنة) **ئەوەیە کە بەڵگەی لەسەر بێت، بیدعە ئەوەیە کە بەڵگەی لەسەر نییە، ئەمە**

---

(١) رواه البخاري (٢٠١٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٤/ ١١٩)، ومالك في "الموطأ" (٢٧٩)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (٢/ ٧١٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ١١٣)، والبيهقي في "السنن الصغير" (٨١٦)، وفي "الشعب" (٢٩٩٩)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٧٧٢٣).

(٢) "ذم البدع وخطر الابتداع" - البدع والشبهات للألباني ص١٧٦، و "البدعة الحسنة" لعيسى بن مانع الحميري ص٤٢.

(٣) "الابتداع في كمال الشرع وخطر الابتداع" لشيخ محمد بن صالح العثيمين ص٢٠.

کۆکردنەوەی دوو دژ بە یەکە (جَمْعُ بَيْنَ الْمُتَنَاقِضَيْنِ).

ب. یەك کەس لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان (الصحابة والتابعين) «الْسُنَّةً الحَسَنَةً»ی شی نەکردووەتەوە بە «الْبِدْعَة الحَسَنَةً»[١].

لە زمانەوانیدا سوننەت پێی ناوترێت (بیدعە)، وە هەروەها لە ماناشدا و لە هۆکار و مەبەست (العلة والغرض)یشدا یەك ناگرن، لە ڕووی زانستییەوە تێکەڵکردن نییە لە نێوانیاندا، وە سوننەتیش بەرامبەری (بیدعە)یە[٢].

ت. ئەوەی فەرموویەتی «مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً» هەر ئەوەیە کە فەرموویەتی «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة»، وە ناشێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەکانی دژ بەیەك بن[٣]، بەڵکوو دەبێت پاڵپشتی یەك بن.

ث. ئیمامی (الشاطبي) ﵀ دەڵێت: «فَلَيْسَ الْمُرَادُ بِالْحَدِيثِ الِاسْتِنَانَ بِمَعْنَى الِاخْتِرَاعِ، وَإِنَّمَا الْمُرَادُ بِهِ الْعَمَلُ بِمَا ثَبَتَ مِنَ السُّنَّةِ النَّبَوِيَّةِ»[٤].

واتە: مەبەست لە فەرموودەکە «سُنَّة» بە مانای داهێنان نییە، بەڵکوو مەبەست پێی کارکردنە بە ڕێ و شوێنەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

وە ئیمامی (الذهبي) ﵀ دەڵێت: «وليس المراد بقوله: "من سَنَّ سُنَّة" أنه يبتدع عبادة أو قولاً لم يأذن الله به»[٥].

واتە: مەبەست لە وتەی «من سَنَّ سُنَّة» ئەوە نییە کە عیبادەتێك یان وتەیەك دابهێنێت کە خوای گەورە ڕێی پێ نەدابێ.

---

(١) "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص٢١٨.

(٢) "حد البدعة واتجاهات العلماء" للحافظ الجعبري ص٣٩.

(٣) "حد البدعة واتجاهات العلماء" للحافظ الجعبري ص٣٩.

(٤) "الاعتصام" (١/ ٢٣٣).

(٥) "التمسك بالسنن والتحذير من البدع" للذهبي ص١٠٦.

لەبەر وتنی هۆکاری فەرمووده‌کە کە خێر و خێراتێکی ڕێپێدراوە، وەکوو (جرير بن عبد الله) دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: «كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَدْرِ النَّهَارِ، قَالَ: فَجَاءَهُ قَوْمٌ حُفَاةٌ عُرَاةٌ مُجْتَابِي النِّمَارِ أَوِ الْعَبَاءِ، مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ، عَامَّتُهُمْ مِنْ مُضَرَ، بَلْ كُلُّهُمْ مِنْ مُضَرَ فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمَا رَأَى بِهِمْ مِنَ الْفَاقَةِ، فَدَخَلَ ثُمَّ خَرَجَ، فَأَمَرَ بِلَالًا فَأَذَّنَ وَأَقَامَ، فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾ [النساء: ١] إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النساء: ١]، وَالْآيَةَ الَّتِي فِي الْحَشْرِ: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ [الحشر: ١٨]، «تَصَدَّقَ رَجُلٌ مِنْ دِينَارِهِ، مِنْ دِرْهَمِهِ، مِنْ ثَوْبِهِ، مِنْ صَاعِ بُرِّهِ، مِنْ صَاعِ تَمْرِهِ - حَتَّى قَالَ - وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ» قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ بِصُرَّةٍ كَادَتْ كَفُّهُ تَعْجِزُ عَنْهَا، بَلْ قَدْ عَجَزَتْ، قَالَ: ثُمَّ تَتَابَعَ النَّاسُ، حَتَّى رَأَيْتُ كَوْمَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَثِيَابٍ، حَتَّى رَأَيْتُ وَجْهَ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَهَلَّلُ، كَأَنَّهُ مُذْهَبَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ»»(١).

واتە: ئێمە لە سەرەتای ڕۆژەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، خەڵکانێك هاتن پێ پەتی و بەرگ دڕاو، ... دەم و چاوی پێغەمبەر ﷺ تێکچوو کە بینی بەو هەژارییە، ... پاشان وتاری بۆ دان و هانی دان بۆ خێرکردن، پیاوێکی شاری مەدینە ئەوەندەی شتومەك هێنا دەستی نەیدەتوانی هەڵی بگرێت، پاشان خەڵکی ئەمەیان بینی و شوێنکەوتەی بوون (چاویان لێکرد) و بەقەد دوو تەپۆڵکە خواردن و جل و بەرگیان بۆ هێنان، تا بینیم دەم و چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدرەوشایەوە وەکوو زاخاوی ئاڵتوون و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی کارێکی خێر بکات پاداشتی بۆ خۆی هەیە و ئەوانەی لە دوایەوە دەیکەن، بەبێ ئەوەی پاداشتیان لێ کەم بێتەوە، وە هەروەها بۆ کاری خراپیش ... .

---

(١) رواه مسلم (١٠١٧)، وسبق تخريجه ص٥٢.

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی داهێنان نییە بەڵكوو چاولێكردنە لە كارێكدا كە شەرع پێشی كەوتووەو دایڕشتووە؛ الشَیخ (الألباني) ﵀ دەڵێت: «فلما رأى ذلك سائر أصحاب النبي ﷺ وكان فيهم أبوبكر وعمر كما في رواية الطبراني في معجمه الكبير قام كل من هؤلاء ليعود أيضًا بما تيسر لكل منهم من صدقة»[(١)].

واتە: كاتێك هەموو هاوەڵان ئەمەیان بینی لە نێوانیاندا (ئەبو بەكر و عومەر) ﭭ وەكوو لە ڕیوایەتەكەی (الطبراني)دا هاتووە: هەموویان گەڕانەوە ئەوەی لە توانایاندا هەیە لە خێر و خێرات بیهێنن.

ئیمامی (الشاطبي) ﵀ دەڵێت: «فَتَأَمَّلُوا أَيْنَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً»، وَ «مَنْ سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً»، تَجِدُوا ذَلِكَ فِيمَنْ عَمِلَ بِمُقْتَضَى الْمَذْكُورِ عَلَى أَبْلَغِ مَا يَقْدِرُ عَلَيْهِ، حَتَّى بِتِلْكَ الصُّرَّةِ، فَانْفَتَحَ بِسَبَبِهِ بَابُ الصَّدَقَةِ عَلَى الْوَجْهِ الْأَبْلَغِ، ...فَدَلَّ عَلَى أَنَّ السُّنَّةَ هَاهُنَا مِثْلُ مَا فَعَلَ ذَلِكَ الصَّحَابِيُّ، وَهُوَ الْعَمَلُ بِمَا ثَبَتَ كَوْنُهُ سُنَّةً، وَأَنَّ الْحَدِيثَ مُطَابِقٌ لِقَوْلِهِ فِي الْحَدِيثِ الْآخَرِ: «مَنْ أَحْيَا سُنَّةً مِنْ سُنَّتِي قَدْ أُمِيتَتْ بِعْدِي»[(٢)] الْحَدِيثَ إِلَى قَوْلِهِ «وَمَنِ ابْتَدَعَ بِدْعَةً ضَلَالَةً»، فَجَعَلَ مُقَابِلَ تِلْكَ السُّنَّةِ الِابْتِدَاعَ، فَظَهَرَ أَنَّ السُّنَّةَ الْحَسَنَةَ لَيْسَتْ بِمُبْتَدَعَةٍ، ... ثُمَّ جَاءَ ذَلِكَ الْأَنْصَارِيُّ بِمَا جَاءَ بِهِ ... فَكَأَنَّهَا كَانَتْ سُنَّةً أَيْقَظَهَا رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ بِفِعْلِهِ، فَلَيْسَ مَعْنَاهُ: مَنِ اخْتَرَعَ سُنَّةً وَابْتَدَعَهَا وَلَمْ تَكُنْ ثَابِتَةً»[(٣)].

واتە: دەبینین كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو فەرموودەیەی فەرمووە كە ئەو هاوەڵە بەڕێزە بووەتە هۆكاری كردنەوەی دەرگای خێر و خێرات بۆ خەڵكی، ئەمە لەگەڵ ئەو فەرموودەیەدا

---

(١) "ذم البدع وخطر الابتداع" - البدع والشبهات للألباني ص١٧٥.

(٢) رواه ابن ماجه (٢١٠) وقال الألباني: ضعيف جدًا كما في "الظلال" (٤٢)، و "المشكاة" (١٦٨)، وفي "الاعتصام" (١/ ٢٦) بتحقيق (مشهور حسن)، ورواه الترمذي (٢٦٧٧)، وابن وضاح في "البدع" (٩٣)، والبزار في "المسند" (٣٣٨٥)، والطبراني في "الكبير" (١٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١١٠)، وفي "ضعيف الجامع الصغير" (٥٣٥٩)، و "ضعيف الترغيب والترهيب" (٤٢).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٣٤، ٢٣٥).

دەگونجێت کە هەرکەسێك سوننەتێکی مردوو زیندوو بکاتەوە، وە کاری ئەو هاوەڵەش وەکوو سوننەتێکی زیندوو کردبێتەوە وابوو.

وە لە بەرامبەر وشەی «مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً»دا فەرموویەتی «وَمَنِ ابْتَدَعَ بِدْعَةً ضَلَالَةً» بەرامبەر سوننەت بیدعەی باسکردووە، کەواتە «سُنَّةً حَسَنَةً» بیدعە نییە، گەرچی ڕیوایەتەکە لاوازە.

ئیمامی (النووي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «فِيهِ الْحَثُّ عَلَى الِابْتِدَاءِ بِالْخَيْرَاتِ وَسَنِّ السُّنَنِ الْحَسَنَاتِ وَالتَّحْذِيرُ مِنَ اخْتِرَاعِ الْأَبَاطِيلِ وَالْمُسْتَقْبَحَاتِ»[1].

واتە: ئەم فەرموودەیە هاندانە لەسەر سەرەتا کردنەوەی خێرەکان و کردنی کارە چاکەکان ئاگادارکردنەوە بەسەر داهێنانی بەتاڵ و خراپەکاندا.

ج. ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «لِأَنَّ كَوْنَهَا حَسَنَةً أَوْ سَيِّئَةً لَا يُعْرَفُ إِلَّا مِنْ جِهَةِ الشَّرْعِ؛ ... فَلَزِمَ أَنْ تَكُونَ السُّنَّةُ فِي الْحَدِيثِ إِمَّا حَسَنَةً فِي الشَّرْعِ وَإِمَّا قَبِيحَةً بِالشَّرْعِ، ... وَتَبْقَى السُّنَّةُ السَّيِّئَةُ مُنَزَّلَةٌ عَلَى الْمَعَاصِي، ... وَعَلَى الْبِدَعِ؛ لِأَنَّهُ قَدْ ثَبَتَ ذَمُّهَا وَالنَّهْيُ عَنْهَا بِالشَّرْعِ»[2].

واتە: کاری چاکەو شەڕ لە ڕوانگەی شەرعەوە نەبێت نازانرێت، نادرێتە دەست حەز و ئارەزووی خەڵك؛ چییان بەلاوە باش بێت باشە و خراپ بێت خراپە، ماوەتەوە سەر «السُّنَّةُ السَّيِّئَةُ» واتە: کاری خراپەکردن، بە مانای کارە تاوانەکان دێت، وە هەروەها داهێنراوەکان، لەبەر ئەوەی بەڵگە لەسەر خراپە و زەمیان هەیە.

وە ئیمامی (الذهبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «لكنهم لايكادون يضبطون الفرق بين البدعة الحسنة والبدعة السيئة، فهذا يستحسن ما يذمه الآخر»[3].

واتە: بەڵام دەگاتە ئەوەی بڕیاردەران لەسەر بیدعەی چاك و خراپ بۆیان سنووردار ناکرێت جیاوازی نێوان داهێنراوی چاك و خراپ، ئەم بە کارێکی چاکی دەزانێت و بەرامبەرەکەی بە خراپی دەزانێت.

---

(١) "شرح النووي على مسلم" (٧/ ١٠٤).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٣٦).

(٣) "التمسك بالسنن والتحذير من البدع" للذهبي ص٢٧.

وە لە عورف و شێوازی داڕشتن و بەکارهێنانی قورئان و سوننەتدا وشەی ڕێگای چاکە «سُنَّةً الحَسَنَةً»، یاخود ڕێگای خراپە «سُّنَّةُ السَّيِّئَةُ» بە لادان و دەرچوو لە بەڵگەکانی خۆی و ئەو یاسا و بەرنامەی دایڕشتووە ناو دەبات، بۆیە لە پاش وشەی «سُّنَّة» واتا ڕێگا «الحَسَنَة والسَّيِّئَةُ»ی دیاری کردووە، بەڵام وشەی «الْبِدْعَة» بەردەوام بە گومڕایی ناو براوە نەك بە چاکە و خراپە، دەرچوون لەم عورفە بەکارهێنانە بە گۆڕین و جێگۆڕکێ ناو دەبرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ﴾ [المَائِدَة : ٤١].

دووەم: «مَا رَآهُ الْمُسْلِمُونَ حَسَنًا فَهُوَ عِنْدَ اللهِّ حَسَنٌ، وَمَا رَآهُ الْمُسْلِمُونَ سَيِّئًا فَهُوَ عِنْدَ اللهِّ سَيِّئٌ»[(١)].

واتە: ئەوەی موسوڵمانان (لە ڕیوایەتێکی تردا ئیمانداران) بە چاکی بزانن ئەوە لای خوا چاکە و ئەوەی موسوڵمانان بە خراپی بزانن ئەوە لای خوا خراپە.

أ. لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر (ال) بچێتە سەر ناو (الاسم) ئەوا بۆ گرتنەوەی هەموو جۆرەکانی ئەو ناوەیە، کە پێی دەوترێت (الاستغراق)ە، گەر وا بێت واتە: (ئەوەی هەموو جۆرە موسوڵمانێك ...)، ئەمە گەر وا بێت ئەوا مەبەستی کۆدەنگە (الإجماع)، کۆدەنگیش بەڵگەی سێهەمە لەدوای قورئان و فەرموودە، واتە کۆدەنگی زانایان، کەواتە داهێنراو نابێت چونکە بەڵگەیە، (البدعة والإجماع) دوو بابەتی جیاوازن.

(عز بن عبدالسلام) ﷺ دەڵێت: «إِنْ صَحَّ الحَدِيثُ فَالْمُرَادُ بِالْمُسْلِمِينَ أَهْلُ الإِجْمَاعِ وَاللهُّ أَعْلَمُ»[(٢)].

واتە: گەر فەرموودە بێت ئەوا کۆدەنگی زانایانە.

بەڵام (ال) گەر بۆ سەردەم (عهد) بێت ئەوا مەبەستی کۆدەنگی کەسانی سەردەمی هاوەڵانە (إجماع الصحابة).

---

(١) رواه أحمد موقوفا على ابن مسعود (١/ ٣٧٩)، وسبق تخريجه ص٢٤٨.

(٢) "فتاوى العز بن عبدالسلام" رقم (٩).

بە گوێرەی داڕشتنەکە بێت مەبەستی پێی کۆدەنگی هاوەڵانە، ئەوا باشترین سەردەمن و کۆ نەبوونەتەوە و نابنەوە لەسەر بە چاك زانینی داهێنراو، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي»، وفي رواية: «خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي»، وفي رواية: «خَيْرُ الْقُرُنِ قَرْنِي»، وە دەفەرموێت: «خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي»[1].

وە تەواوی قسەکەی (ابن مسعود) رضي الله عنه دەڵێت: «إِنَّ اللهَ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَوَجَدَ قَلْبَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَاصْطَفَاهُ لِنَفْسِهِ، فَابْتَعَثَهُ بِرِسَالَتِهِ، ثُمَّ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ بَعْدَ قَلْبِ مُحَمَّدٍ، فَوَجَدَ قُلُوبَ أَصْحَابِهِ خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَجَعَلَهُمْ وُزَرَاءَ نَبِيِّهِ، يُقَاتِلُونَ عَلَى دِينِهِ، فَمَا رَأَى الْمُسْلِمُونَ حَسَنًا، فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ، وَمَا رَأَوْا سَيِّئًا فَهُوَ عِنْدَ اللهِ سَيِّئٌ»[2].

وە ئیمامی (الحاكم) لە "المستدرك"[3] زیادەیەکی هێناوە کە دەڵێت: «وَقَدْ رَأَى الصَّحَابَةُ جَمِيعًا أَنْ يَسْتَخْلِفُوا أَبَا بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ».

واتە: خوای گەورە سەیری دڵەکانی کرد، بینی دڵی (ﷺ) باشترین دڵە، هەڵی بژارد بۆ خۆی، وە پەیامەکەی پیادا نارد، پاشان خوای پەروەردگار سەیری دڵی بەندەکانی کرد، بینی دڵی هاوەڵانی باشترین دڵن، کردنی بە پشتیوانی پێغەمبەرەکەی لە پێناوی دینەکەیدا بجەنگێن، ئەوەی موسوڵمانان بە چاکی بزانن لای خوا چاکە، وە ئەوەی موسوڵمانان بە خراپی بزانن لای خوا خراپە.

وە لە زیادەکەی ئیمامی (حاکم) دا دەڵێت: هەموو هاوەڵان کۆدەنگ بوون بۆ جێنشینکردنی (ئەبو بەکر) رضي الله عنه لەپاش پێغەمبەر ﷺ.

---

(١) رواه البخاري (٣٦٥٠)، ومسلم (٢٥٣٣)، وأبو داود (٤٦٥٧)، والترمذي (٢٢٢٢)، والنسائي في "الكبرى" (١١٧٥٠)، وأحمد (٧١٢٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٢٣)، والطبراني في "الكبير" (٥٢٧)، والحاكم في "المستدرك" (٤٨٧١)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٥٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٦٠٠)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٢٤٠٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٦٨)، والبزار في "المسند" (٩٥٣٣)، والآجري في "الشريعة" (١١٤٨).

(٢) رواه أحمد موقوفا على ابن مسعود (١/ ٣٧٩)، وسبق تخريجه ص٢٤٨.

(٣) برقم (٤٤٦٥)، ورواه أحمد في "فضائل الصحابة" (٥٤١)، وابنه عبدالله في "السنة" (١٣٢٩).

ئەم زیادەیە ئەوە دەردەخات کە (ابن مسعود) ﷺ مەبەستی پێ (ئەوەی موسوڵمانان بە چاکی بزانن) دانانی ئیمامی (ئەبو بەکر)ە بە جێنشین، یاخود مەبەستی پێی کۆدەنگی هاوەڵانە لە هەر بابەتێکی دیندا، هەردوو ماناکە مەبەستی (ابن مسعود) ڕوون دەکاتەوە کە هەموو موسوڵمانانی دونیا و هەموو سەردەمێك نییە، بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «تَفْتَرِقُ هَذِهِ الْأُمَّةُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، كُلُّهُمْ فِي النَّارِ إِلَّا وَاحِدَةً» . قَالُوا: وَمَا تِلْكَ الْفِرْقَةُ؟ قَالَ: «مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَوْمَ وَأَصْحَابِي»»[١].

واتە: موسوڵمانان دەبنە حەفتاوسێ کۆمەڵەوە، هەموویان لە ئاگردان بێجگە یەکێکیان نەبێت.

واتە هەموو موسوڵمانان ناگرێتەوە، گەر وابێت ئەوا دژایەتی ئەم فەرموودەیەیە، کەواتە کۆدەنگی هاوەڵانە و بەس.

بۆیە (ابن کثیر[٢] وابن القیم[٣] وابن قدامة[٤] وابن تیمیة[٥] وابن حزم[٦]) هەموویان بە کردنە بەڵگەی کۆدەنگی هاوەڵان (اجماع الصحابة) ئەم قسەیەی (ابن مسعود) دەدەنە قەڵەم.

وە بێگومانین لەوەی (عبد الله ی کوڕی مەسعود) ﷺ لە توند و تیژترین هاوەڵان بووە لە دژایەتیکردنی داهێنراوەکان، چۆن گومانی ڕێگە خۆشکردنی پێ دەدرێت بۆ دروستکردنی داهێنراو لای بیدعەکارانەوە؟!

وەکوو لە چەند وتەیەکیدا دەڵێت: «الِاقْتِصَادُ فِي السُّنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الِاجْتِهَادِ فِي الْبِدْعَةِ»[٧].

واتە: مانەوە لەسەر سوننەت خێرترە لە کۆششکاری لە بیدعەدا.

---

(١) رواه ابن ماجه (٣٩٩٣)، وأبو داود (٤٥٩٧)، والترمذي (٢٦٤٠)، وأحمد (١٦٩٣٧)، والدارمي في "السنن" (٢٥٦٠)، والطبراني في "الأوسط" (٤٨٨٦) واللفظ له، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤٨)، والآجري في "الشريعة" (٢٤)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٠٤، ١٤٩٢)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٠٤٢).

(٢) في "البداية والنهاية" (١٠/ ٣٢٨).

(٣) في "الفروسية" ص٦٠، و "إعلام الموقعين عن رب العالمين" (٤/ ١٣٨).

(٤) في "روضة الناظر" ص٨٦.

(٥) في "منهاج السنة النبوية" (١/ ١٦٦).

(٦) في "الأحكام" (٦/ ١٩٤).

(٧) رواه الدارمي في "السنن" (٢٢٣)، والحاكم في "المستدرك" (٣٥٢)، والبيهقي في "الكبرى" (٤٧٤٥)، وابن بطة في "الإبانة" (١٦١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤)، والقرطبي في "الجامع" (٢٣٣٤)، وابن وضاح في "البدع" ص١٠، وانظر "صحيح الترغيب والترهيب" (٤١).

وە دەڵێت: «اتَّبِعُوا وَلَا تَبْتَدِعُوا؛ فَقَدْ كُفِيتُمْ كُلَّ ضَلَالَةٍ»(١).

واتە: شوێنکەوتە بن، داهێنراو مەکەن، بەستانە لە هەموو سەرلێشێواوییەك.

وە بە بیدعەکارانی وت: «لَقَدْ أَحْدَثْتُمْ بِدْعَةً ظُلْمًا، أَوْ قَدْ فَضَلْتُمْ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِلْمًا»(٢).

**واتە: داهێنراوێکتان دروستکردووە بە زۆر و ستەم، یاخود دەڵێن لە هاوەڵانی محمد ﷺ زیاتر زانستمان پێیە.**

الشَّيْخ (الألباني) رحمه الله دەڵێت: «**وإن من عجائب الدنيا أن يحتج بعض الناس بهذا الحديث على أن في الدين بدعة حسنة، ... وخفي عليهم، ... أن المراد به إجماع الصحابة واتفاقهم على أمر، كما يدل عليه السياق، ويؤيده استدلال ابن مسعود به على إجماع الصحابة على انتخاب أبي بكر خليفة**»(٣).

**ب. ناوترێت ئەم قسەی (صەحابە)یە (حكم الرفع)ی هەیە، واتە پلەی فەرموودەی پێ دەدرێت(٤).**

**لەبەر ئەوەی پلەکەی کاری پێ ناکرێت (سنده ضعيف)(٥)، پاشان پێچەوانەی کۆی قسە و بەرنامەی (عبد الله ی کوڕی مەسعود)ە لە دژایەتیکردنی توندی بیدعەکاراندا و پێداگرتنی توندوتۆڵی مانەوە لەسەر سوننەت.**

---

(١) رواه النسائي في "المدخل" (٢٠٤)، والدارمي في "السنن" (٢١١)، والطبراني في "الكبير" (٨٧٧٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٤)، والبيهقي في "الشعب" (٢٠٢٤)، وابن وضاح في "البدع" (١٣)، والمروزي في "السنة" (٧٨)، وابن بطة في "الإبانة" (١٧٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٤)، وفي "أصل صفة الصلاة" للألباني (٢/ ٦٢٤).

(٢) رواه ابن وضاح في "البدع" (١٦)، والهيثمي في "مجمع الزوائد" (٦/ ١٨١)، وابن الجوزي في "تلبيس إبليس" ص٢٥.

(٣) "سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة" (٢/ ١٧).

(٤) "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لمحمد يسرى ص٥٩.

(٥) "السلسلة الأحاديث الضعيفة" للألباني (٥٣٣)، و "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٣٠٥)، و "العلل المتناهية" لابن الجوزي (١/ ٢٨١)، وقال (ابن القيم) رحمه الله في "الفروسية" ص٢٨٦: أَن هَذَا لَيْسَ من كَلَام رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم وَإِنَّمَا يضيفه إِلَى كَلَامه من لَا علم لَهُ بِالْحَدِيثِ.

ت. قسەی هاوەڵان بەڵگەیە (قول الصحابي حجة) لای هەندێك لە زانایان بە مەرجێك پێچەوانەی دەقێك نەبێت[١]، وە ئەم قسەیەش پێچەوانەی فەرموودەکانی دژایەتی داهێنراوە، وەکوو «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»[٢]، وە «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»[٣].

ث. وە هەر لە هاوەڵاندا پێچەوانەی ڕووکەشی ئەم قسەیەی (عبد الله ی کوڕی مەسعود) هەیە، گەر مەبەستی پێی خەڵکی گشتی بێت لە داهێنانی بیدعەدا، وەکوو (عبد الله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ وَإِنْ رَآهَا النَّاس حَسَنَة»[٤].

واتە: هەموو داهێنراوێك گومڕاییە گەر هەموو خەڵکیش بە باشی بزانن، کەواتە (عبد الله ی کوڕی مەسعود) مەبەستی ڕێی داهێنراو نەبووە.

سێیەم: قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه عن الاجتماع لصلاة التراويح: «نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ»[٥].

دیارترین بەڵگەیان بۆ داهێنراوی چاك ئەم فەرموودەیەی ئیمامی (عومەر)ە رضي الله عنه، هۆکاری وتنەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وەکوو (عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ) لە (عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ القَارِيِّ)ەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: «خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، لَيْلَةً فِي رَمَضَانَ إِلَى المَسْجِدِ، فَإِذَا النَّاسُ أَوْزَاعٌ مُتَفَرِّقُونَ، يُصَلِّي الرَّجُلُ لِنَفْسِهِ، وَيُصَلِّي الرَّجُلُ فَيُصَلِّي بِصَلاَتِهِ الرَّهْطُ، فَقَالَ عُمَرُ: «إِنِّي أَرَى لَوْ جَمَعْتُ هَؤُلاَءِ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ، لَكَانَ أَمْثَلَ» ثُمَّ عَزَمَ، فَجَمَعَهُمْ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، ثُمَّ خَرَجْتُ مَعَهُ لَيْلَةً أُخْرَى، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ قَارِئِهِمْ، قَالَ عُمَرُ: «نِعْمَ البِدْعَةُ هَذِهِ، وَالَّتِي يَنَامُونَ عَنْهَا أَفْضَلُ مِنَ الَّتِي يَقُومُونَ» ...»[٦].

---

(١) أنظر "إعلام الموقعين" لابن القيم (٤/ ٩٢)، و "مختصر المنتهى" (٢/ ٢٨٧)، و "الأحكام" للآمدي (٣/ ١٩٥)، و "سلم الوصول" (٤/ ٤٠٨)، و "كشف الأسرار" (٣/ ١)، و "الموافقات" للشاطبي (٤/ ٤٤٦)، و "شرح الورقات" (١/ ١٨٨)، و "إرشاد الفحول" للشوكاني (٢/ ١٨٨)، و "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٣٢٠، ٣٣٦).

(٢) رواه مسلم (٢٦٠٦)، وابن ماجه (٤٦)، وسبق تخريجه ص٤٤.

(٣) رواه مسلم (١٧١٨)، وسبق تخريجه ص٤٦.

(٤) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢٠٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨/ ٤)، وسبق تخريجه ص٥٦.

(٥) (٦) رواه البخاري (٢٠١٠)، سبق تخريجه ص٢٤٩.

واتە: لەگەڵ (عومەری کوڕی خەتتاب)دا شەوێکی ڕەمەزان چووین بۆ مزگەوت، بینیمان خەڵکی بە جیاجیا نوێژ دەکەن، هەر یەکێك بۆ خۆی نوێژ دەکات، یەکێك نوێژ دەکات و کۆمەڵێك بەدوایەوە نوێژ دەکەن، (عومەری کوڕی خەتتاب) وتی: گەر ئەمانەم کۆبکردایەتەوە بە پشتی قورئانخوێنێکەوە باشتر بوو، پاشان یەکلا بووەوە لەسەری و هەموویانی بە پشتی (ئوبەی کوڕی کەعب)ەوە کۆکردەوە و بە جەماعەت نوێژی بۆ کردن، پاشان شەوێکی تر ڕۆیشتین بۆ مزگەوت، خەڵکی نوێژیان بە جەماعەت بەدوای (ئوبەی)یەوە دەکرد، (عومەری کوڕی خەتتاب) ﷺ وتی: باشترین داهێنراو ئەمەیە، گەرچی ئەو کاتەی دەخەون (واتە کۆتایی شەو بۆ شەونوێژ) باشترە تاوەکوو ئەم کاتەی نوێژ دەکەن (واتە سەرەتای شەو دوای نوێژی عیشا).

ئەم فەرموودەیەی ئیمامی (عومەر) ﷺ دەکرێتە بەڵگە لەسەر بوونی داهێنراوی چاك و خراپ (البدعة الحسنة والسيئة)، لەبەر ئەوەی ناوی «نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ» باشترین بیدعە ئەمەیەی بردووە، بەڵام زانایانی شیکار (التحقيق) بەم شێوەیە وەڵامیان دەدەنەوە:

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: « صَلَاةِ التَّرَاوِيحِ فِي رَمَضَانَ جَمَاعَةً فِي الْمَسْجِدِ، فَقَدْ قَامَ بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ، وَاجْتَمَعَ النَّاسُ خَلْفَهُ.

فَخَرَّجَ أَبُو دَاوُدَ عَنْ أَبِي ذَرٍّ ؛ قَالَ: «صُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَقُمْ بِنَا شَيْئًا مِنَ الشَّهْرِ حَتَّى بَقِيَ سَبْعٌ، فَقَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، فَلَمَّا كَانَتِ السَّادِسَةُ؛ لَمْ يَقُمْ بِنَا؛ فَلَمَّا كَانَتِ الْخَامِسَةُ؛ قَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ لَوْ نَفَّلْتَنَا قِيَامَ هَذِهِ اللَّيْلَةِ؟ قَالَ: فَقَالَ: "إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا صَلَّى مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ حُسِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ"، قَالَ: فَلَمَّا كَانَتِ الرَّابِعَةُ؛ لَمْ يَقُمْ، فَلَمَّا كَانَتِ الثَّالِثَةُ جَمَعَ أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ وَالنَّاسَ فَقَامَ بِنَا حَتَّى خَشِينَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلَاحُ، قَالَ: قُلْتُ: وَمَا الْفَلَاحُ؟ قَالَ: السَّحُورُ». ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا بَقِيَّةَ الشَّهْرِ[1].

---

(١) رواه ابن ماجه (١٣٢٧)، وأبو داود (١٣٧٥)، والنسائي في "الكبرى" (١٢٨٩)، وأحمد (٢١٤٤٧) وقال محققه (شعيب الأرنؤوط): إسناده صحيح على شرط مسلم، ورواه الدارمي في "السنن" (١٨١٨)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٧٧٠٦)، والبزار في "المسند" (٤٠٤٢)، والبغوي في "شرح السنة" (٩٩١)، والبيهقي في "الشعب" (٣٠٠٨)، وصححه الألباني في "صحيح أبي داود" (١٢٤٥)، و "الإرواء" (٤٤٧)، و "صلاة التراويح" ص١٤، و "المشكاة" (١٢٩٨).

لَكِنَّهُ عَلَيْهِ السَّلَامُ لَمَّا خَافَ افْتِرَاضَهُ عَلَى الْأُمَّةِ؛ أَمْسَكَ عَنْ ذَلِكَ، فَفِي الصَّحِيحِ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَصَلَّى بِصَلَاتِهِ نَاسٌ، ثُمَّ صَلَّى الْقَابِلَةَ، فَكَثُرَ النَّاسُ، ثُمَّ اجْتَمَعُوا اللَّيْلَةَ الثَّالِثَةَ أَوِ الرَّابِعَةَ؛ فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ؛ قَالَ: قَدْ رَأَيْتُ الَّذِي صَنَعْتُمْ، فَلَمْ يَمْنَعْنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَّا أَنِّي خَشِيتُ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْكُمْ»، وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ»[(١)].

فَتَأَمَّلُوا؛ فَفِي هَذَا الْحَدِيثِ مَا يَدُلُّ عَلَى كَوْنِهَا سُنَّةً؛ فَإِنَّ قِيَامَهُ أَوَّلًا بِهِمْ دَلِيلٌ عَلَى صِحَّةِ الْقِيَامِ فِي الْمَسْجِدِ جَمَاعَةً فِي رَمَضَانَ، وَامْتِنَاعَهُ بَعْدَ ذَلِكَ مِنَ الْخُرُوجِ خَشْيَةَ الِافْتِرَاضِ لَا يَدُلُّ عَلَى امْتِنَاعِهِ مُطْلَقًا؛ لِأَنَّ زَمَانَهُ كَانَ زَمَانَ وَحْيٍ وَتَشْرِيعٍ، فَيُمْكِنُ أَنْ يُوحَى إِلَيْهِ إِذَا عَمِلَ بِهِ النَّاسُ بِالْإِلْزَامِ، فَلَمَّا زَالَتْ عِلَّةُ التَّشْرِيعِ بِمَوْتِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؛ رَجَعَ الْأَمْرُ إِلَى أَصْلِهِ، وَقَدْ ثَبَتَ الْجَوَازُ فَلَا نَاسِخَ لَهُ.

وَإِنَّمَا لَمْ يُقِمْ ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لِأَحَدِ أَمْرَيْنِ: إِمَّا لِأَنَّهُ رَأَى أَنَّ قِيَامَ النَّاسِ آخِرَ اللَّيْلِ وَمَا هُمْ بِهِ عَلَيْهِ كَانَ أَفْضَلَ عِنْدَهُ مِنْ جَمْعِهِمْ عَلَى إِمَامٍ أَوَّلَ اللَّيْلِ، ذَكَرَهُ الطَّرْطُوشِيُّ، وَإِمَّا لِضِيقِ زَمَانِهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّظَرِ فِي هَذِهِ الْفُرُوعِ، مَعَ شُغْلِهِ بِأَهْلِ الرِّدَّةِ وَغَيْرِ ذَلِكَ مِمَّا هُوَ آكَدُ مِنْ صَلَاةِ التَّرَاوِيحِ.

فَلَمَّا تَمَهَّدَ الْإِسْلَامُ فِي زَمَنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَرَأَى النَّاسَ فِي الْمَسْجِدِ أَوْزَاعًا كَمَا جَاءَ فِي الْخَبَرِ قَالَ: لَوْ جُمِعَتِ النَّاسُ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ لَكَانَ أَمْثَلَ، فَلَمَّا تَمَّ لَهُ ذَلِكَ؛ نَبَّهَ عَلَى أَنَّ قِيَامَهُمْ آخِرَ اللَّيْلِ أَفْضَلُ.

ثُمَّ اتَّفَقَ السَّلَفُ عَلَى صِحَّةِ ذَلِكَ وَإِقْرَارِهِ، وَالْأُمَّةُ لَا تَجْتَمِعُ عَلَى ضَلَالَةٍ.

وَقَدْ نَصَّ الْأُصُولِيُّونَ أَنَّ الْإِجْمَاعَ لَا يَكُونُ إِلَّا عَنْ دَلِيلٍ شَرْعِيٍّ.

---

(١) رواه البخاري (١١٢٩)، ومسلم (٧٦١)، وأبو داود (١٣٧٣)، والنسائي في "الكبرى" (١٢٩٩)، وأحمد (٢٥٤٤٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٥٤٢)، والبغوي في "شرح السنة" (٩٨٩)، والبيهقي في "الشعب" (٢٩٩٧).

فَإِنْ قِيلَ: فَقَدْ سَمَّاهَا عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ بِدْعَةً وَحَسَّنَهَا بِقَوْلِهِ: نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ، وَإِذَا ثَبَتَتْ بِدْعَةٌ مُسْتَحْسَنَةٌ فِي الشَّرْعِ؛ ثَبَتَ مُطْلَقُ الِاسْتِحْسَانِ فِي الْبِدَعِ.

فَالْجَوَابُ: إِنَّمَا سَمَّاهَا بِدْعَةً بِاعْتِبَارِ ظَاهِرِ الْحَالِ؛ مِنْ حَيْثُ تَرَكَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاتَّفَقَ أَنْ لَمْ تَقَعْ فِي زَمَانِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، لَا أَنَّهَا بِدْعَةٌ فِي الْمَعْنَى، فَمَنْ سَمَّاهَا بِدْعَةً بِهَذَا الِاعْتِبَارِ؛ فَلَا مُشَاحَةَ فِي الْأَسَامِي، وَعِنْدَ ذَلِكَ فَلَا يَجُوزُ أَنْ يُسْتَدَلَّ بِهَا عَلَى جَوَازِ الِابْتِدَاعِ بِالْمَعْنَى الْمُتَكَلَّمِ فِيهِ؛ لِأَنَّهُ نَوْعٌ مِنْ تَحْرِيفِ الْكَلِمِ عَنْ مَوَاضِعِهِ:

فَقَدْ قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهَا: «إِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَدَعُ الْعَمَلَ وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ؛ خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ فَيُفْرَضَ عَلَيْهِمْ»[(١)] [(٢)].

واتە: نوێژی تەراویح بە کۆمەڵ لە مزگەوتدا پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی، خەڵکیش لەگەڵیدا کردوویانە، (ئەبو زەر) ﷺ دەڵێت: بەڕۆژوو بووین لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕەمەزان، هیچ شەوێك لە مانگەکەدا شەونوێژی پێ نەدەکردین، تا حەوتی کۆتایی ما (واتە شەوی بیست و سێ)، نوێژی پێ کردین تا سێیەکی شەو، لە شەشەمدا نوێژی بۆ نەکردین، لە شەوی پێنجەمدا (شەوی بیست و پێنج) تا نیوەشە و شەونوێژی پێ کردین، ... شەوی چوارەم پێی نەکردین، لە شەوی سێیەمدا (شەوی بیست و حەوت) خەڵکی و خێزانەکانی کۆکردەوە و نوێژی پێ کردین، تا ترساین فریای پارشێو نەکەوین، ... تا کۆتایی مانگەکە هیچ شەوێك نوێژی پێ نەکردین.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرئەوەی فەرز نەبێت لەسەر موسوڵمانان نوێژی پێ نەکردین، ... (عائیشە)ی خێزانی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی شەوێك لە مزگەوت کرد، هەندێك لە خەڵکی لەگەڵیدا کردیان، شەوێك دوای ئەوەی شەونوێژی بۆ کردن خەڵکی زیاتر بوون، لە شەوی سێیەمدا یان چوارەمدا بوو نەچوو بۆ مزگەوت، بەیانی کردەوە فەرمووی: کارەکەتانم بینی، هیچ هۆکارێك نەبوو لە نەهاتنم بۆ ناوتان بێجگە ترسی فەرزبوون نەبێت لەسەرتان. ئەمە لە ڕەمەزاندا بوو.

---

(١) الحديث رواه البخاري (١١٢٨)، ومسلم (٧١٨)، وأبو داود (١٢٩٣)، والنسائي في "الكبرى" (٤٨٢).

(٢) "الاعتصام" (١/ ٢٤٨ - ٢٥٠).

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر تەراویح کردن بە جەماعەت لە مزگەوتدا، نەکردنیشی بە بەردەوامی لە ترسی فەرزبوون بووە، سەردەمەکەی سەردەمی هاتنەخوارەوەی وەحی و شەریعەت بووە، کاتێك هۆکاری ترسی فەرزبوون نەما بە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ کارەکە گەڕایەوە بۆ بناغەی خۆی، بە دروستی و نەسڕینەوەی.

وە نەکردنیشی لە لایەن (ئەبو بەکر)ەوە رضي الله عنه دوو هۆکارە:

- لەبەر ئەوەی خەڵکی لە کۆتایی شەودا دەیانکرد.
- وە دەرفەت نەبوونی بە بۆنەی شەڕی هەڵگەڕاوەکانەوە.

بۆیە کاتێك بۆ (عومەری کوڕی خەتتاب) ڕەخسا کۆدەنگی هاوەڵانیش دروستی دان پیادانانە، وە ئوممەتی ئیسلام و زانایانی کۆ نابنەوە لەسەر گومڕایی.

گەر وترا (عومەری کوڕی خەتاب) ناوی ناوە (باشترین داهێنراو ئەمەیە)؛ وە گەر داهێنراوێك لە دیندا بە چاك زانرا؛ ئەوا بە چاك زانین بە بنەما دادەنرێت لە بەشەکانی تردا.

**وەڵام:** بە ڕووکەش کارەکە ناونراوە داهێنراو، لەبەر نەکردنی پێغەمبەر ﷺ و نەگونجاندنی لە سەردەمی (ئەبو بەکر)دا رضي الله عنه نەك بەگوێرەی مانا داهێنراو بێت، گەر بەو شێوە ناو نرابێت کێشە نییە لەسەر ناو، وە لەو کاتەشدا دروست نییە بکرێتە بەڵگە بە مانا شەرعییەکەی، گەر نا جۆرێکە لە گۆڕانکاری وشەکان لە شوێنی خۆیدا.

(عائیشە) رضي الله عنها دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد هەندێ کار بکات و نەیدەکرد لە ترسی فەرز بوونی لەسەر خەڵك.

ئەوەی ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه بە بیدعەی دانا نە لە ڕووی کردنییەوە بوو لە مزگەوتدا، وە نە لە ڕووی جەماعەتەوە بوو، بەڵکوو (ابن تیمیة) رحمه الله دەڵێت: «جمعهم على قارئ واحد، وأسرج المسجد، فصارت هذه الهيئة وهي اجتماعهم في المسجد على إمام واحد مع الإسراج عملا لم يكونوا يعملونه من قبل؛ فسمي بدعة؛ لأنه في اللغة يسمى بذلك، ولم يكن بدعة شرعية»(١).

واتە: کۆکردنەوەیان بەدوای قورئانخوێنێکەوە (واتە ئیمام) و چرا و ڕۆشنکردنی مزگەوت، ئەم

---

(١) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٩٧).

شێوازە بەم شێوەیە کارێك بووە نەکرابوو لەوەو پێش، بۆیە ناوی بردووە بە بیدعە، لەڕووی زمانەوانییەوە نەك بیدعەیەکی شەرعی بێت.

وە (عەلی کوڕی ئەبو تالب) ﵁ پاش وەفاتی ئیمامی (عومەر) کاتێك مزگەوتی دەبینی لە ڕەمەزاندا بە ڕۆشنی دەیوت: «نَوَّرَ اللهُ عَلَى عُمَرَ قَبْرَهُ كَمَا نَوَّرَ عَلَيْنَا مَسَاجِدَنَا»[(١)].

واتە: خوای گەورە گۆڕەکەی (عومەر) ڕووناك بکاتەوە وەکوو مزگەوتەکانمانی بۆ ڕووناك کردینەوە.

وە (ابن رجب) ﵀ دەڵێت: «وَمُرَادُهُ أَنَّ هَذَا الْفِعْلَ لَمْ يَكُنْ عَلَى هَذَا الْوَجْهِ قَبْلَ هَذَا الْوَقْتِ، وَلَكِنَّ لَهُ أُصُولٌ مِنَ الشَّرِيعَةِ يُرْجَعُ إِلَيْهَا»[(٢)].

واتە: وە مەبەستی ئیمامی (عومەر) لەو قسەیەدا ئەوە بووە کە ئەم کارە بەم شێوەیە نەبووە پێش ئەم کاتە، بەڵام بنەمایەکی شەرعی هەبوو بگەڕێتەوە سەری.

مادام کێشە لەسەر دارشتنە شەرعییەکە نییە؛ باش وایە لە سنووری وشەیەکی چەق بەستوودا نەوەستین و لێکۆڵینەوەکانمان خڕ نەکەینەوە لەپشت ڕووکەشە دارشتنەکانەوە، کارەکەی ئیمامی (عومەر) ﵁ لەوە بەدەر نییە یاخود سوننەتە یا بیدعەیە، وە بەڵگەکانیش لەسەر ئەوەیە کە سوننەتە[(٣)].

## بەڵگەکانی کردنی نوێژی تەراویح بە جەماعەت لە مزگەوتدا

✍ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[(٤)].

واتە: ئەوەی ڕەمەزان شەونوێژ بکات بە باوەڕ و چاوەڕێی پاداشتەوە؛ خوای گەورە لە تاوانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٨/٣٠٨)، و "جامع الأحاديث" للسيوطي (٣١٤٣٩)، و "الإبانة" لابن بطة (٨٠).

(٢) "جامع العلوم والحكم" لابن رجب (٢/١٢٨).

(٣) "أقوم السنن في نقض تقسيم البدع إلى سيء وحسن" لدكتور: أحمد عبدالكريم نجيب ص٦٠.

(٤) رواه البخاري (٣٧)، ومسلم (٧٥٩)، وأبو داود (١٣٧١)، والترمذي (٨٠٨)، والنسائي في "الكبرى" (١٢٩٧)، وأحمد (٧٧٨٧)، والدارمي في "السنن" (١٨١٧)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٢٠٢)، وابن حبان في "صحيحه" (١٤١)، والطبراني في "الأوسط" (٤٩٢٢)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٧٧١٩)، والبزار في "المسند" (٧٨٦١)، والبغوي في "شرح السنة" (٩٨٨)، والبيهقي في "الشعب" (٢٩٩٨)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٦٥٦).

✍ وە ڕێنموونیشی کردووە بە جەماعەت بیکات، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّهُ مَنْ قَامَ مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ كُتِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ»[(١)].

واتە: ئەوەی لەگەڵ ئیمامدا نوێژ دەست پێبکات، وە لەگەڵیدا لێبێتەوە، پاداشتی هەموو شەونوێژی بۆ دەنوسرێت.

کەواتە پاداشتی هەموو شەونوێژ پەیوەستە بە جەماعەتەوە لە مزگەوتدا لەگەڵ ئیمامدا، لەسەر ئەم هاندانە (ابن تیمیة) رحمه الله دەڵێت: «وذلك أوكد من أن يكون سنة مطلقة، وكان الناس يصلونها جماعات في المسجد على عهده صلى الله عليه وسلم ويقرهم، وإقراره سنة منه صلى الله عليه وسلم»[(٢)].

واتە: ئەمە دڵنیابوونە لەسەر ئەوەی سوننەتێکی گشتی بێت، خەڵکی بە جەماعەت دەیانکرد لە مزگەوت لە سەردەمی خۆیدا، وە ئەویش بێدەنگ دەبوو لەسەری، وە بێدەنگیش دەبێتە سوننەت لە لایەنی پێغەمبەری خواوە ﷺ.

✍ کۆکردنەوەی هاوەڵان بە پشتی ئیمامێکەوە بۆ نوێژی تەراویح لە شەوانی ڕەمەزاندا لە سەردەمی سێ خەلیفە (خلفاء الراشدين)دا بووە، وە کاری خەلیفە ڕاشدینەکان دەچێتە ژێر یاسای سوننەتەوە نەك داهێنراو، لەبەر ئەوەی فەرمانی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە کە دەفەرموێت: «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ فَتَمَسَّكُوا بِهَا»[(٣)].

---

(١) رواه الترمذي (٨٠٦)، وابن ماجه (١٣٢٧)، والنسائي في "الكبرى" (١٣٠٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٥٤٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٧٦٩٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٢٠٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٤٢٨١)، وصححه الألباني في "الإرواء" (٤٤٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (١١٠٠)، وفي "صلاة التراويح" ص١٥.

(٢) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٩٥).

(٣) رواه ابن ماجه (٤٢)، وأبو داود (٤٦٠٧)، والترمذي (٢٦٧٦)، وأحمد (١٧١٤٢)، والدارمي في "السنن" (٩٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٥)، والطبراني في "الكبير" (٦١٨)، والحاكم في "المستدرك" (٣٢٩)،والبزار في "المسند" (٤٢٠١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٢)، والبيهقي في "الشعب" (٧١١٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧٩)، والآجري في "الشريعة" (٨٦)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٥٥)، وابن وضاح في "البدع" (٧٣)، والمروزي في "السنة" (٧٢)، وابن بطة في "الإبانة" (٨/ ٣٠١)، والقرطبي في "الجامع" (١٧٥٨)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٩٣٧، ٢٧٣٥)، و "ظلال الجنة" (٢٦)، وفي "التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان" (٥)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٥٤٩).

واتە: پەیوەست بن بە سوننەتی من و خەلیفە کاملە هیدایەتدراوەکانەوە و پەیوەست بن پێوەی.

وە ماوەی ئەو خەلیفانەی دوای خۆی دیاری کردووە، وەکوو دەفەرموێت: «الْخِلَافَةُ بَعْدِي فِي أُمَّتِي ثَلَاثُونَ سَنَةً»[(١)].

واتە: جێنشینی لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرایەتی دوای من سی ساڵە.

ئاشکرایە کە چوار خەلیفە ناودارەکان دەگرێتەوە، یەکێك لەوانە ئیمامی (عومەر)ە ﷺ، وە بە تایبەت پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی دوو خەلیفەی سەرەتایی بردووە بە شوێنکەوتەیان، وەکوو دەفەرموێت: «اقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي مِنْ أَصْحَابِي أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ»[(٢)].

واتە: شوێنکەوتەی ئەوانە بن لەدوای من (ئەبو بەکر) و (عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا.

کارەکەی ئیمامی (عومەر) ﷺ لە دوو حاڵەت بەدەر نییە: یان سوننەتە و بنەمای هەیە، یاخود بیدعەیە و بێبنەمایە، گەر سوننەت بێت ئەوا هیچ قسەی لەسەر نییە، وە گەر بیدعە بێت ئایا چۆن دەق هەیە لەسەر شوێنکەوتەیان؟ وە وەسف دەکرێن بە هیدایەت دراو؟ وە ئایا چۆن ئیمامی عومەر ڕازی دەبێت بەر هەڕەشەی بیدعەکار و گومڕا و ئەهلی ئاگر «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ» بکەوێت؟!

کەواتە هەر دەبێت مەبەستی پێی بیدعە بێت لە ڕووی زمانەوانییەوە، نەك لە ڕووە شەرعییەکەیەوە، لەبەر ئەوەی لە ڕووە شەرعییەکەوە هەمووی گومڕاییە.

(ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَالْبِدْعَةُ عَلَى قِسْمَيْنِ: تَارَةً تَكُونُ بِدْعَةً شَرْعِيَّةً، كَقَوْلِهِ: فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ. وَتَارَةً تَكُونُ بِدْعَةً لُغَوِيَّةً، كَقَوْلِ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ جَمْعِهِ إِيَّاهُمْ عَلَى صَلَاةِ التَّرَاوِيحِ وَاسْتِمْرَارِهِمْ: نعْمَتْ البدعةُ هَذِه»[(٣)].

---

(١) رواه أبو داود (٤٦٤٦)، والترمذي (٢٢٢٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٤٣)، والطبراني في "الكبير" (١٣٦)، والبزار في "المسند" (٣٨٢٨)، والآجري في "الشريعة" (٤/ ١٧٥٩)، وابن بطة في "الإبانة" (٨/ ٢٠٥)، والطبراني في "الجامع" (٢٣١٣)، ونعيم بن حماد في "الفتن" (٢٤٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٥٣٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (٣٣٤١).

(٢) رواه ابن ماجه (٩٧)، والترمذي (٣٨٠٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٩٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٢٣٣)، و "صحيح الجامع الصغير" (١١٤٤).

(٣) "تفسير القرآن العظيم" (١/ ٣٩٨).

واتە: داهێنراو دوو جۆرە: جارێکیان داهێنراو لە ڕووە شەرعییەکەیەوە، کە هەمووی گومڕایی و سەرلێشێواوییە، وەك دەفەرموێت: «وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»، وە جارێك دەبێت داهێنراو لە ڕووی زمانەوانییەوە بێت، وەکوو قسەکەی ئیمامی (عومەر) ﷺ بۆ نوێژی تەراویح: «نعْمَتْ البدعةُ هَذِه».

وە (ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «أكثر ما في هذا تسمية عمر تلك: بدعة، مع حسنها، وهذه تسمية لغوية، لا تسمية شرعية، وذلك أن البدعة في اللغة تعم كل ما فعل ابتداء من غير مثال سابق. وأما البدعة الشرعية: فما لم يدل عليه دليل شرعي»[١].

واتە: ئەوپەڕی شیکردنەوە بۆ قسەکەی ئیمامی (عومەر) ﷺ "بیدعەیە و چاکە"، ناونانێکی زمانەوانییە نەك ناونانێکی شەرعی، لەبەر ئەوەی بیدعە لە زمانەوانیدا هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە سەرتادا دەکرێت بەبێ بوونی شێوەی پێشووی، بەڵام بیدعەی شەرعی هەموو ئەوانەیە کە بەڵگەی شەرعییان لەسەر نییە.

الشَيخ (العثيمين) ﷺ دەڵێت: « فلا يليق بعمر – رضي الله عنه– وهو من هو أن يخالف كلام سيد البشر محمد ﷺ وأن يقول عن بدعة «نعمة البدعة».

وتكون هذه البدعة هي التي أرادها رسول الله ﷺ بقوله: «كل بدعة ضلالة» بل لابد أن تنزل البدعة التي قال عنها عمر إنها «نعمت البدعة» على بدعة لا تكون داخلة تحت مراد النبي ﷺ ... بدعة اعتبارية إضافية وليست بدعة مطلقة إنشائية أنشأها عمر ﷺ؛ ... وبهذا التقعيد لا يمكن أبداً أن يجد أهل البدع من قول عمر هذا منفذاً لما استحسنوه من بدعهم»[٢].

واتە: شایستە نییە بە ئیمامی (عومەر)ەوە ﷺ قسەیەك بکات پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بێت؛ بلێت باشترین بیدعە وە مەبەستی بەو بیدعەیە بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (هەموو بیدعەیەك گومڕاییە)، بەڵکوو دەبێت ئەم قسەیەی ئیمامی (عومەر) لەو مەبەستەدا نەبێت

---

(١) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٩٥).

(٢) "الإبداع في بيان كمال الشرع وخطر الابتداع" لمحمد بن صالح العثيمين ص١٨.

... بەڵکوو بە شێوازی ڕەچاوکردن وە خستنەپاڵەوە پێی بوترێت بیدعە، نەك بە شێوەی بنیادنان و دروستکردن، بەم شێوە بنەماکردنە بیدعەکاران نابێت بە هیچ شێوەیەك قسەکانیان بکەنە ڕێگەیەك بۆ بەچاکزانینی داهێنراوەکانیان.

هەمان شێوە و مانای هەیە بۆ قسەی کوڕەکەی (عبد الله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «فَإِذَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، جَالِسٌ إِلَى حُجْرَةِ عَائِشَةَ، وَإِذَا نَاسٌ يُصَلُّونَ فِي المَسْجِدِ صَلاَةَ الضُّحَى، قَالَ: فَسَأَلْنَاهُ عَنْ صَلاَتِهِمْ، فَقَالَ: بِدْعَةٌ»[١].

واتە: پرسیاری لێ دەکەن لەسەر نوێژی چێشتەنگاو (صلاة الضحی) خەڵکی لە مزگەوت دەیکەن، دەڵێت: بیدعەیە.

یاخود وتی: «بِدْعَةٌ وَنِعْمَتِ الْبِدْعَةُ»[٢]، یاخود وتی: «وَمَا أَحْدَثَ النَّاسُ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْهَا»[٣].

واتە: باشترین بیدعەیە، خەڵکی شتێکی دانەهێناوە لەمە بەلای منەوە خۆشەویستتر بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا نوێژی چێشتەنگاو سوننەتە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکیشی بۆ هان داوە، وەکوو دەفەرموێت: «لَا يُحَافِظُ عَلَى صَلَاةِ الضُّحَى إِلَّا أَوَّابٌ، وَهِيَ صَلَاةُ الْأَوَّابِينَ»[٤].

واتە: کەسێك نوێژی چێشتەنگاو ناپارێزێت بێجگە لە (الأوابين) بەردەوام ڕوو لە خوا نەبێت.

وە دەفەرموێت: «مَنْ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ مُتَطَهِّرًا إِلَى صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْحَاجِّ الْمُحْرِمِ، وَمَنْ خَرَجَ إِلَى تَسْبِيحِ الضُّحَى لَا يَنْصِبُهُ إِلَّا إِيَّاهُ فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْمُعْتَمِرِ ...»[٥].

---

(١) رواه البخاري (١٧٧٥)، ومسلم (١٢٥٥)، وأحمد (٦١٢٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٩٤٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٣٠٧٠)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٨٨٣٦)، وفي "مسند اسحاق بن راهويه" (١١٨٧).

(٢) رواه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٧٧٧٥)، والطبراني في "الكبير" (١٣٥٦٣).

(٣) رواه عبدالرزاق في " المصنف" (٤٨٦٨).

(٤) رواه الطبراني في "الأوسط" (٣٨٦٥)، والحاكم في "المستدرك" (١١٨٢)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٢٢٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٧٠٣)، و "صحيح الجامع الصغير" (٧٦٢٨)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٦٧٦).

(٥) رواه أبو داود (٥٥٨)، وأحمد (٢٢٣٥٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٤٩٧٣)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٢٠)، و "صحيح الجامع الصغير" (٦٢٢٨)، وفي "المشكاة" (٧٢٨).

واتە: ئەوەی دەستنوێژ بگرێت و بچێت بۆ نوێژێکی فەرز پاداشتی وەکوو ئیحرام بە حەجەوە وایە، وە ئەوەی بچێت بۆ نوێژی چێشتەنگاو وە هۆکاری ڕۆشتنەکەی ئەوە بێت؛ ئەوا پاداشتی وەکوو عومرەکارێك وایە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو داهێنراوێکی شەرعی بە گومڕایی دەزانێت، وەکوو دەفەرموێت: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ وَإِنْ رَآهَا النَّاس حَسَنَة»[١].

واتە: هەموو داهێنراوێك گومڕاییە، گەر هەموو خەڵکیش بە باشی بزانن.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەبەستی خۆی و باوکی داهێنراوی شەرعی نەبووە، بەڵکوو لە ڕووی زمانەوانییەوە مەبەستی بووە.

(عبد المحسن العباد) دەڵێت: «المعنى اللغوية غالبًا أعمّ من المعاني في الشرع، والمعنى الشرعي غالبًا جزء من جزئيات المعنى اللغوي، ومن أمثلة ذلك: التقوى والصيام والحج والعمرة والبدعة»[٢].

واتە: مانای زمانەوانی زۆرجار فراوانترە لە مانا شەرعییەکان و مانا شەرعییەکان زۆر جار بەشێکن لە بەشەکانی مانا زمانەوانییەکان، وەکوو:

**التقوى:** مانای شەرعی واتە: خوا پەرستن، مانای زمانەوانی واتە: خۆپاراستن.

**الصيام:** لە شەرعدا: نەخواردن و خواردنەوەیە، لە زمانەوانیدا واتە: ڕێگری.

**الحج:** لە شەرعدا: عیبادەتێکی دیاریکراوە، لە زمانەوانیدا واتە: مەبەست.

**البدعة:** لە شەرعدا واتە: بێبنەمای دینی، لە زمانەوانیدا واتە: داهێنان بەبێ بوونی شێوازی پێشووی.

**الصلاة:** لە شەرعدا واتە: نوێژ، لە زمانەوانیدا واتە: دوعا.

---

(١) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢٠٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨/ ٤)، وسبق تخريجه ص٥٦.

(٢) "الحث على اتباع السنة والتحذير من البدع" لعبد المحسن العباد ص٤٥.

تەنانەت لە عورفی هاوەڵانیشدا ئەم شێوە بەکارهێنانە زمانەوانییە باو بووە، وەکوو (ئوبەی کوڕی کەعب) رضي الله عنه لە باسی سڵاواتدا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: «أفأجعل لك صلاتي كلها قال: (إذن يغفر لك ذنبك كله)»[(١)].

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا گەر هەموو دوعاکانم سڵاوات بێت بۆ تۆ، فەرمووی: کەواتە خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانت خۆش دەبێت.

هەروەك قنووت لە بەکارهێنانی هاوەڵاندا واتە (قورئان زۆر خوێندن و دوعا) نەك (دوعای قنووت)ی مەشهور لەناو خەڵکدا، ئەوە بووەتە شوێنی جیاوازی نێوان زانایان بۆ خوێندنی قنووتی بەیانی، کە مەبەست لە فەرموودەکە قورئان خوێندنە نەك دوعای قنووت.

وەکوو (ابن القيم) رحمه الله دەڵێت: «وَلَمَّا صَارَ الْقُنُوتُ فِي لِسَانِ الْفُقَهَاءِ وَأَكْثَرِ النَّاسِ هُوَ هَذَا الدُّعَاءَ الْمَعْرُوفَ «اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ» ... حَمَلُوا الْقُنُوتَ فِي لَفْظِ الصَّحَابَةِ عَلَى الْقُنُوتِ فِي اصْطِلَاحِهِمْ، وَنَشَأَ مَنْ لَا يَعْرِفُ غَيْرَ ذَلِكَ، فَلَمْ يَشُكَّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ كَانُوا مُدَاوِمِينَ عَلَيْهِ كُلَّ غَدَاةٍ»[(٢)].

چوارەم: کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی (ئەبو بەکری صدیق)دا رضي الله عنه و نووسینەوەی و کورتکردنەوەی خوێندنی لەسەر یەك جۆر خوێندنەوە لە (مصحف)ی ئیمامی (عوسمان)دا رضي الله عنه و دانانی بانگی یەکەم بۆ نوێژی (جومعە) لەسەر دەستی (عوسمانی کوڕی عەفان) رضي الله عنه و نوێژی جەژن لە مزگەوت لە سەردەمی (عەلی کوڕی ئەبو تالب) رضي الله عنه و نوسینەوەی زانستە شەرعییەکان.

### کۆکردنەوەی قورئان:

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اتَّفَقُوا عَلَى جَمْعِ الْمُصْحَفِ، ... فَرُوِيَ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ - رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ - رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - مَقْتَلَ (أَهْلِ) الْيَمَامَةِ، وَإِذَا عِنْدَهُ عُمَرُ - رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - قَالَ أَبُو بَكْرٍ: (إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ): إِنَّ

---

(١) "تحقيق فضل الصلاة على النبي ﷺ" للألباني رقم (١٤).

(٢) بڕوانە "زاد المعاد في هدي خير العباد" لابن القيم (١/ ٢٧٤).

الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ يَوْمَ الْيَمَامَةِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ فِي الْمَوَاطِنِ كُلِّهَا فَيَذْهَبَ قُرْآنٌ كَثِيرٌ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ الْقُرْآنِ. قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ ... فَقُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلُونَ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ ...»[(١)] [(٢)].

واته: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کۆدەنگ بوون لەسەر کۆکردنەوەی قورئان لە یەك (مصحف)دا، (زەیدی کوڕی ثابت) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (ئەبو بەکری صدیق) ﷺ ناردی بە دوامدا و وتی: (عومەر) هاتووەتە لام و دەڵێت: قورئانخوێنان لە شەڕی (یەمامە) زۆر کوژراون، من وای بە باش دەزانم فەرمان بدەیت بە کۆکردنەوەی قورئان، منیش (ئەبو بەکر) وتم: چۆن کارێك بکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە؟ (زەید)یش دەڵێت: منیش وتم: چۆن کارێك دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە؟ (ئەبو بەکر و عومەر) ئەم باسەیان لەگەڵ دەکردم، تاوەکوو خوای گەورە دڵی یەکلا کردمەوە لەسەری.

ئەم کارە کۆدەنگی هاوەڵانی لەسەرە، وە هیچ یەکێك بۆی نەقڵ نەکردووین کە یەك کەس لە هاوەڵان پێچەوانەی ئەم کارە بووبێت.

بە دڵنیایی گونجاو بووە کارەکەیان لەگەڵ مەبەستە شەرعییەکاندا و لەگەڵ ئەوەشدا لەخۆنەگرتن و پێچەوانە نەبوونی بنەمایەکی شەرعی و بەڵگەکانی لەخۆ نەگرتووە، قسەی (ئەبو بەکر و زەید) رضي الله عنهما کە دەڵێن: (چۆن کارێك بکەین کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردبێت)، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەیانزانی کارەکەیان پێچەوانەی شەرع نییە.

(ابن تیمیة) رحمه الله دەڵێت: «فإن المانع من جمعه على عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم كان أن الوحي كان لا يزال ينزل، فيغير الله ما يشاء ويحكم ما يريد، فلو جمع في مصحف واحد لتعسر أو تعذر تغييره كل وقت، فلما استقر القرآن بموته صلى الله عليه وسلم واستقرت الشريعة بموته صلى الله عليه وسلم أمن الناس من زيادة القرآن ونقصه»[(٣)].

---

(١) الحديث رواه البخاري (٤٦٧٩)، والترمذي (٣١٠٣)، والنسائي في "الكبرى" (٧٩٤١)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٥٠٦)، والطبراني في "الكبير" (٤٩٠١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢٣٠).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦١٢، ٦١٣).

(٣) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٩٧).

واتە: هۆكاری كۆنەكردنەوەی قورئان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چاوەڕێبوونی سڕینەوەی هەندێك ئەحكام و خوێندنەوەدا بوو، لەبەرئەوەی قورئان بەردەوام دادەبەزی و خوای پەروەردگار چی بویستایە دەیگۆڕی و ئالوگۆڕی یاساكانی دەكرد، گەر لە یەك (مصحف)دا كۆ بكرایەتەوە لە هەموو كاتێكدا سڕینەوە و گۆڕانكاری قورس دەبوو، كاتێك كۆتایی هاتنەخوارەوەی هات بە وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ شەریعەتی ئیسلامی جێگیر بوو، دڵنیا بوون لە نەمانی زیاد و كەمی لە قورئاندا.

ئەو كاتە خوای گەورە خستییە دڵی خەلیفەی ڕاشدینەوە بە كۆكردنەوەی قورئان، ئەمەش وادەی خواییە بۆ پاراستنی قورئانەكەی، وەكوو دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ [الحجر: ٩].

قورئان خۆی كۆمەڵ كۆمەڵ نوسرابووەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ٢﴾ [البينة: ٢].

واتە: پێغەمبەرێكی خوا پەڕاوە پاكەكان دەخوێنێتەوە.

بەڵام جیاجیا بووە، وە ئەمە وادەی خواییە بۆ كۆكردنەوەی، وەكوو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ١٧﴾ [القيامة: ١٧].

واتە: لەسەر ئێمەیە كۆكردنەوە و خوێندنەوەی.

ئەوە بوو لە سەردەمی (ئەبو بەكر)دا رضي الله عنه كۆكرایەوە لە یەك (مصحف)دا، وە لە سەردەمی (عوسمان)دا رضي الله عنه كورت كرایەوە لەسەر یەك جۆر خوێندنەوە، ئەویش لەهجەی (قوڕەیش) بوو.

وە كۆدەنگی هاوەڵانی لەسەر بوو (إجماع الصحابة) كە بەڵگەیەكی شەرعییە، كە وادەی كۆنەبوونەوەشیان هەیە لەسەر گومڕایی، وە ئەم كارەش لەژێر ناونیشانی ئەم یاسایەدایە: «مَا لَا يَتِمُّ الْوَاجِبُ إِلَّا بِهِ؛ فَهُوَ وَاجِبٌ»[1].

---

(١) "العدة في أصول الفقه" للقاضي أبو يعلى (٢/ ٤١٩)، "مذكرة أصول الفقه" للشنقيطي ص١٦، "المسودة في أصول الفقه" لمجد الدين عبدالسلام ص٦٠، "الأحكام في أصول الأحكام" للآمدي (١/ ١١٠)، "الأشباه والنظائر" للسبكي (٢/ ٨٨).

واتە: هەر کارێك واجبێکی پێ تەواو نەکرێت بەو نەبێت؛ ئەوا ئەو کارەش واجبە.

یا لەژێر یاسای: «دَرْءُ الْمَفَاسِدِ وَسَدُّ الزَّرَائِعِ»[١].

واتە: دوورخستنەوەی زەرەرۆمەندییەکان و داخستنی هۆکار و ڕێگا خراپەکان.

ئەمانە ئەو یاسا بنەماییانەن (القواعد الأصولية) کە لە قورئان و فەرموودەوە وەرگیراون.

(سليم الهلالي) دەڵێت: «إنَّ هذهِ الوَسائل غير مقصودة في ذاتها لكنها تؤدي إلى ما هو مشروع»[٢].

ئەم هۆکارانە مەبەست نین، بەڵام ڕێگایەکن بۆ کارە دروستەکان (کۆکردنەوە مەبەست و هۆکاری پاراستنە).

هەرچی کاری هاوەڵان هەیە (لە کۆکردنەوەی قورئان، شەڕی هەڵگەڕاوەکان، فەرموودە نووسینەوە، ...هتد) داهێنراو پێچەوانە و دژی ئەمانەیە، لەبەر ئەوەی داهێنراو لەگەڵ مەبەستە شەرعییەکاندا ناگونجێت، بەڵکوو گونجاوە لەگەڵ سوودمەندی بیدعەکاراندا، وە «والبدع ليست من باب الوسائل بل مقصودة التعبد بها» داهێنراوەکان وەکوو هۆکار مەبەست نین، بەڵکوو مەبەست پێیان پەرستنە، داهێنراوەکان خزمەتی ئیسلام ناکەن، بەڵکوو لە خزمەتی کۆمەڵێکی کەم و دیاریکراودان، وە لە مێژووشدا کۆدەنگی موسوڵمانانیان لەسەر نەبووە، بە پێچەوانەی کۆدەنگی هاوەڵانەوە لەسەر ئەو کارانە، کە دەیکەنە بەڵگە بۆ خۆیان[٣].

ئیمامی (الشاطبي) ﵀ دەڵێت: «أَنَّ الْمَصَالِحَ الْمُرْسَلَةَ مَقُولٌ بِهَا عِنْدَ السَّلَفِ مَعَ أَنَّ الْقَائِلِينَ بِهَا يَذُمُّونَ الْبِدَعَ وَأَهْلَهَا وَيَتَبَرَّؤُنَّ مِنْهُمْ؛ دَلَّ عَلَى أَنَّ الْبِدَعَ مُبَايِنَةٌ لَهَا، وَلَيْسَتْ مِنْهَا فِي شَيْءٍ»[٤].

(مصالح المرسلة): خوێندنەوەی سوودمەندییە بەردەوامەکان، یاسایەکی شەرعییە لەناو هاوەڵاندا خوێندراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی ئەو سوودمەندییانە ڕەچاو دەکات، کاریان

---

(١) "مذكرة أصول الفقه" للشنقيطي ص٢٠٢، "الأشباه والنظائر" لابن نجيم (١/ ٧٨).

(٢) (٣) "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع الرسائل لسليم الهلالي ص٢٣١.

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٤١).

دژایەتی بیدعەکاران و بەرپەرچدانەوەیان بووە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی داهێنراوەکان جیاوازن و هیچ پەیوەندییان پێیانەوە نییە.

ئەوەی هاوەڵان کردوویانە بنەمایەکی هەیە بەگشتی، ئەویش گەیاندنی دینە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾ [المائدة: ٦٧].

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الغَائِبَ»[(١)].

واتە: ئەوەی ئامادەیە بیگەیەنێت بە دوای خۆی، کەواتە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیش رضي الله عنهم دەبێت دین بگەیەنن.

گەیاندنیش شێوازی دیاریکراوی نییە، لە ڕووی تێگەیشتنەوە دەرکی پێ دەکرێت، بە هەموو شێوەیەك دەبێت لە نووسینەوە و لەبەرکردن، وە هەروەها پاراستنی لە گۆڕین و دەسکاریکردن، بۆیە کۆدەنگی هاوەڵانی لەسەر دروست بوو.

بەڵام بێجگە لە (مصحف) وەکوو زانستە شەرعییەکان (العلوم الشرعية) کارەکە ئاسانە، لەبەرئەوەی لە سوننەتدا هاتووە نووسینەوەی، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «اكْتُبُوا لِأَبِي شَاهٍ»[(٢)]. ئەو فەرموودانە بنووسنەوە بۆ (أبي شاه).

وە (أبو هريرة) رضي الله عنه دەڵێت: «مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْهُ مِنِّي، إِلَّا مَا كَانَ مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبُ»[(٣)].

---

(١) رواه البخاري (٦٧)، ومسلم (١٦٧٩)، والنسائي في "الكبرى" (٤٠٧٨)، وأحمد (٢٠٤١٩)، والدارمي في "السنن" (١٩٥٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٢٦٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٨٤٨)، والطبراني في "الأوسط" (٩٦٣)، والحاكم في "المستدرك" (٥٩٨٢)،والبزار في "المسند" (٣٦١٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٩٦٥)، والبيهقي في "الشعب" (٥١٠٢).

(٢) رواه البخاري (٢٤٣٤)، ومسلم (١٣٥٥)، وأبو داود (٢٠١٧)، والترمذي (٢٦٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (٥٨٢٤)، وأحمد (٧٢٤٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦٩٢١)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٧١٥)، والدارقطني (٣١٤٩)، والبيهقي في "الشعب" (٣٧١٩).

(٣) رواه البخاري (١١٣)، الترمذي (٢٦٦٨)، والنسائي في "الكبرى" (٥٨٢٢)، وأحمد (٧٣٨٩)، والدارمي في "السنن" (٥٠٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٧١٥٢)، والطبراني في "الأوسط" (٨٨٤٣)، والحاكم في "المستدرك" (٣٥٧).

واته: كەس لـه هاوەڵان هێندەی من فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ لا نەبوو جگە لـه (عبد الله ی كوڕی عەمر) نەبێت، چونكه ئەو دەینووسییەوە و من نەمدەنووسییەوە.

وە كاتب (نوسەرەوە)ی (وەحی) هەبوو، وە ئەمانە لـه ڕوانگەی «مَا لَا يَتِمُّ الْوَاجِبُ إِلَّا بِهِ؛ فَهُوَ وَاجِبٌ»یە، بەڵام پێشووەكان كه بە باشیان نەدەزانی زانست بنووسنەوە لەبەر هۆكارێكی تر بوو نەك (بیدعە)، هەركەسێك زانست و عیلـم ناو بنێت (بیدعە) زیادەڕەوە، یاخود بێئاگایە لـه وشەی (بیدعە) و بەكارهێنانی، ئەمانە بەڵگە نین لـەسەر بەچاكزانینی بیدعەكردن و پاساو بۆی[1].

وە كۆكردنەوەی خەڵكیش لـەسەر یەك جۆر خوێندنەوە (قراءة) لـه سەردەمی (عوسمانی كوڕی عەفان)دا ﷺ دەگێڕێتەوە بۆ (حوزەیفەی كوڕی یەمان) ﷺ كاتێك هەواڵی هێنا بۆ ئیمامی (عوسمان) ﷺ كه خەڵكی دووبەرەكایەتییان ناوەتەوە لـەسەر جۆری خوێندنەوە و وتی: «يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَدْرِكْ هَذِهِ الأُمَّةَ، قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الكِتَابِ اخْتِلاَفَ اليَهُودِ وَالنَّصَارَى»[2].

واته: فریای ئەم ئوممەته بكەوە پێش ئەوەی دووبەرەكایەتییان بۆ دروست بێت لـه قورئانەكەیاندا وەكوو گاوور و جوولـەكەكان.

ئەو كاته (عوسمانی كوڕی عەفان)یش ﷺ لـەسەر خوێندنەوەی قورەیش قورئانی نووسییەوە و بڵاوی كردەوە بە جیهانی ئەوكاتەی موسوڵمانانداو فەرمانیدا بە فەوتاندنی پاشماوەكانی تر.

ئەمەش كۆدەنگییەكی تری هاوەڵانە، وە كاری یەكێكه لـه (خلفاء الراشدين) كه فەرمان بە شوێنكەوتەی دراوە، وەكوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ فَتَمَسَّكُوا بِهَا»[3].

كاتی خۆشی ڕێگە درابوو بە چەند شێوەیەك قورئان بخوێندرێتەوە، بە لـەهجەكانی عەرەب بۆ بڵاوبوونەوەی قورئان و ئاسان لـەبەركردنی.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣١٠).

(٢) رواه البخاري (٤٩٨٧)، والترمذي (٣١٠٤)، والنسائي في "الكبرى" (٧٩٣٤)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (٣/ ٩٩١)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٥٠٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢٣٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٣٧٤).

(٣) رواه ابن ماجه (٤٢)، وأبو داود (٤٦٠٧)، والترمذي (٢٦٧٦)، وأحمد (١٧١٤٢)، وسبق تخريجه ص٢٦٤.

کاتێك ئەمە هاتە دی و قورئان بەناو هەموو عەرەبدا بڵاوبووەوە، ئەم ڕێپێدانە و کارئاسانییە بەکار هێنرا بۆ جیاوازی و دووبەرەکایەتی، (عوسمانی کوڕی عەفان) ﷺ خەلیفەی ڕاشید ئەو دەرگایەی داخست، لەبەر تێپەڕاندنی پێویستییەکە و نەمامی دووبەرەکایەتی و جیاوازی[١].

**🕋 ئەو بانگەی (عوسمانی کوڕی عەفان) ﷺ زیادی کرد بۆ نوێژی جومعە لە سەرەتای (زوال) کاتەکەیدا:**

(سائب بن یزید) ﷺ دەڵێت: «فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَكَثُرَ النَّاسُ زَادَ النِّدَاءَ الثَّالِثَ عَلَى الزَّوْرَاءِ»[٢].

واتە: لە سەردەمی ئیمامی (عوسمان)دا کاتێك خەڵکی شاری مەدینە زۆر بوون، بانگی سێهەمی زیاد کرد لەسەر (زەوراء) کە شوێنێك بوو لە ناوبازاڕدا.

بانگی سێهەم مەبەستی پێی (قامەت و دوو بانگەکەیە)، بۆ ئەوەی وەکوو ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «يُؤْذَنُ النَّاسُ فِيهِ بِذَلِكَ أَنَّ الصَّلَاةَ قَدْ حَضَرَتْ»[٣].

واتە: بانگ دەدرا بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگادار بن کە کاتی نوێژە.

ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «أَنَّ أَذَانَ الزَّوْرَاءِ وُضِعَ هُنَالِكَ عَلَى أَصْلِهِ مِنَ الْإِعْلَامِ بِوَقْتِ الصَّلَاةِ، وَجَعَلَهُ بِذَلِكَ الْمَوْضِعِ لِأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيُسْمَعَ إِذَا وُضِعَ بِالْمَسْجِدِ كَمَا كَانَ فِي زَمَانِ مَنْ قَبْلَهُ، فَصَارَتْ كَائِنَةً أُخْرَى لَمْ تَكُنْ فِيمَا تَقَدَّمَ، فَاجْتَهَدَ لَهَا كَسَائِرِ مَسَائِلِ الِاجْتِهَادِ، وَحِينَ كَانَ مَقْصُودَ الْأَذَانِ الْإِعْلَامُ؛ فَهُوَ بَاقٍ كَمَا كَانَ، فَلَيْسَ وَضْعُهُ هُنَالِكَ بِمُنَافٍ، إِذْ لَمْ تُخْتَرَعْ فِيهِ أَقَاوِيلُ مُحْدَثَةٌ»[٤].

واتە: بانگی سەر (زەوراء) وەکوو خۆی دانراوە بۆ ئاگادارکردنەوەی کاتی نوێژ، وە هۆکاری

---

(١) بڕوانە "الاعتصام" للشاطبي (٣/ ١٥) و (١/ ٣٠٩).

(٢) رواه البخاري (٩١٢)، وابن ماجه (١١٣٥)، والترمذي (٥١٦)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٣١١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٧١).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٩٢).

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٩٣).

دانانیشی لەو شوێنەدا بۆ ئەوەی بزانن کاتی نوێژە و بیبیستن، ئەمە بۆچوونێکی شەرعییە وەکوو هەموو بۆچوونەکان، مەبەست لە بانگدا ئاگادارکردنەوەی کاتی نوێژە، وە دانانیشی لەوێدا پێچەوانەی شەرعی تێدا بەدی ناکرێت، وە قسەی تازەیان تێدا دروست نەکردووە.

هۆکاری کۆدەنگی هاوەڵانیش خوێندنەوە و ڕەچاوکردنی هەمان بۆچوونی ئیمامی (عوسمان) بووە، لەگەڵ خەمخۆری هاوەڵانیش بۆ پاراستنی دین، بە بەکارهێنانی بەردەوامی وشەی (بیدعە) وەکوو ئەوەی ئاگامان لە بنەما دینییەکان هەیە کە نەکردنی (بیدعە)یە و ئەمەش نەچوونە ناو بیدعەکانەوەیە، وەکوو (عبد الله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «الْأَذَانُ الْأَوَّلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِدْعَةٌ»[١].

واتە: بانگی یەکەمی ڕۆژی جومعە بیدعەیە.

جا ئەگەر داهێنراوی زمانەوانی (اللغوي) بێت کاتێك کە پێویست بوو یاخود شەرعی کاتێك کە پێویست نەبوو، وەکوو کاتێك خەڵك گوێی لە بانگ بوو بە ڕێگەی بلندگۆکانی مزگەوت یاخود خەڵکەکە کەم بوو بە بانگی یەکەم هەمووی گوێی لێ دەبوو (ئەمە ڕاوبۆچوونی شێخ ئەلبانییە کە بیدعەیە گەر بێت و پێویست نەبوو)، وەکوو دەڵێت: «لا نرى الاقتداء بما فعله عثمان رضي الله عنه على الإطلاق ودون قيد ... إنما زاد الأذان الأول لعلة معقولة وهي كثرة الناس وتباعد منازلهم عن المسجد النبوي فمن صرف النظر عن هذه العلة وتمسك بأذان عثمان مطلقا لا يكون مقتديا به»[٢].

الشَّيخ (العثيمين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أما الأذان الأول فإنما حدث في زمن أمير المؤمنين عثمان بن عفان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ حين اتسعت المدينة وبَعُدَ الناس، جعل للجمعة نداءين من أجل أن يتهيأ الناس إلى الحضور، ... أن هذا من سنة الخلفاء الراشدين؛ لأن عثمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ منهم، وللخلفاء الراشدين سنة متبعة بسنة الرسول صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فقد قال: «عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٥٤٣٧)، وأبو طاهر المخلص في "الفوائد" (١/ ٢٢٩)، وفي "الأجوبة النافعة" للألباني ص٢٢.

(٢) "الأجوبة النافعة عن أسئلة لجنة مسجد الجامعة" للألباني ص٢٠.

بعدي»، ... لم يسنه إلا لسبب لم يكن موجوداً في عهد الرسول ﷺ، وهو سعة المدينة، ... وقد علم أن الرسول ﷺ شرع أذاناً في آخر الليل ليس لصلاة الفجر، بل من أجل إيقاظ النائم، وإرجاع القائم، فقد قال ﷺ: «إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ لِيُوقِظَ نَائِمَكُمْ، وَلِيَرْجِعَ قَائِمَكُمْ،...»[(١)].

... قد يكون الداعي إلى مشروعية الأذان الأول يوم الجمعة أقوى من ذلك، فعلى هذا تكون هذه السنة التي سنها أمير المؤمنين عثمان بن عفان رضي الله عنه سنة شرعية نحن مأمورون باتباعها»[(٢)].

واتە: بانگی یەکەم لە سەردەمی (عوسمانی کوڕی عەفان)دا رضي الله عنه بووە، کاتێك (مەدینە) فراوان بووە و خەڵك دوور بووە، بۆ ئەوەی خەڵك ئامادە بێت بۆ (جومعە)، ئەمە سوننەتی خەلیفە ڕاشیدەکانە کە فەرمان بە شوێنکەوتنیان دراوە، دانانی بە هۆکارێك بووە کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەو هۆکارە نەبووە؛ ئەویش فراوانی شاری (مەدینە)یە، ... ئاشکرایە کە پێغەمبەر ﷺ بانگێکی داناوە لە کۆتایی شەودا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «بیلال بانگ دەدات لە شەودا بۆ ئەوەی خەوتووەکان بەخەبەر بن، وە شەونوێژکاران لە مزگەوت بگەڕێنەوە»، ئەم بانگە پێش کاتی نوێژ بووە، ڕەنگە دانانی بانگی یەکەمی (جومعە) پێویستتر بێت، ئەمە سوننەتی کاربەدەستی موسوڵمانان بووە (عوسمانی کوڕی عەفان) رضي الله عنه، کە سوننەتێکی شەرعییە و ئێمە فەرمانی شوێنکەوتەییمان لەسەرە.

**نوێژی جەژن لە سەردەمی خەلیفەی چوارەمدا (عەلی کوڕی ئەبو تالب) رضي الله عنه لە مزگەوت کراوە لەبەر پێویستی:**

(ابن تیمیة) رحمه الله دەڵێت: «فَلَمَّا كَانَ عَلَى عَهْدِ عَلِيٍّ قِيلَ لَهُ: إِنَّ بِالْبَلَدِ ضُعَفَاءُ لَا يَسْتَطِيعُونَ الْخُرُوجَ إِلَى الْمُصَلَّى، فَاسْتَخْلَفَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا صَلَّى بِالنَّاسِ بِالْمَسْجِدِ»[(٣)(٤)].

---

(١) رواه البخاري (٦٢١)، ومسلم (١٠٩٣)، وابن ماجه (١٦٩٦)، وأبو داود (٢٣٤٧)، والنسائي في "الكبرى" (١٦١٧) واللفظ له، وأحمد (٣٧١٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٨٩٢٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٤٧٢)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٤٠٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٨٠٢١).

(٢) "الشرح الممتع على زاد المستقنع" للعثيمين (٨/ ١٨٨).

(٣) رواه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٢/ ١٨٤)، والبيهقي (٣/ ٣١٠).

(٤) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٦/ ٢٩١، ٢٩٢).

واتە: لە سەردەمی (عەلی كوڕی ئەبو تالب)دا ﷺ وتیان لەناو شاری (كوفە)دا خەڵكانێك هەن ناتوانن بۆ نوێژ بگەنە (مصلی) ئەو چۆڵەوانییەی كە نوێژی جەژنی لێ دەكەن، ئەویش پیاوێكی دانا لە مزگەوت نوێژی جەژنیان بۆ بكات، ئەمەش كارێكە لە كارەكانی خەلیفە ڕاشیدەكان.

لەسەر ئەمە الشَّيْخ (العثيمين) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «ذهب الإمام أحمد رَحِمَهُ اللهُ إلى أن صلاة الجمعة يجوز تعددها للحاجة، ... مثال الحاجة: إذا ضاق المسجد عن أهله، ولم يمكن توسيعه؛ لأن الناس لا يمكن أن يصلوا في الصيف في الشمس، ولا في المطر في أيام الشتاء. وكذا إذا تباعدت أقطار البلد»[(١)].

واتە: لەسەر ئەمە ئیمام (أحمدی كوڕی حەنبەل) ڕای وایە نوێژی (جومعە) دەتوانرێت لە چەند شوێنێك بكرێت بۆ پێویستی، وەكوو: گەر مزگەوتەكە بچووك بوو شوێنی نوێژخوێنانیان نەدەبووەوە، وە خەڵكیش نەیدەتوانی لە هاویندا لەبەر خۆر و لە زستاندا لەبەر باران نوێژ بكات، وە گەر شوێنەكان لەیەكەوە دوور بوون.

الشَّيْخ (الألباني) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وترجح أقوال العلماء الذين جزموا بأن الصلاة في المصلى هي السنة وأنه مشروع في كل زمان وبلد إلا لضرورة ... وقد روينا عن عمر وعثمان رضي الله عنهما: أنهما صليا العيد بالناس في المسجد لمطر وقع يوم العيد وكان رسول الله صلى الله عليه وسلم يبرز إلى المصلى لصلاة العيدين فهذا أفضل وغيره يجزيء لأنه فعل لا أمر»[(٢)].

واتە: ڕای ئەو زانایانە بەهێزە كە دەڵێن نوێژی جەژن دەبێت لە (مصلی)دا بكرێت بێجگە لە كاتی پێویست نەبێت، لە دوو خەلیفە (عومەر و عوسمان)ەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا گێڕدراوەتەوە كە نوێژی جەژنیان لە مزگەوت كردووە بە هۆی بارانەوە، بەڵام بزانە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانە و كاری خەلیفەكانیش دروستە، واتە هەڵوەشێنەرەوەی فەرمان نییە.

كەواتە ئەم بابەتە هەمان وەڵامی بانگی یەكەمی (جمعة)ی بۆ دەبێت كە ئیمامی (عوسمان) ﷺ زیادی كرد لەبەر پێویستی.

(١) "الشرح الممتع على زاد المستقنع" للعثيمين (٥/ ٧١، ٧٢).

(٢) "صلاة العيدين في المصلى هي السنة" للألباني ص٢٨.

پێنجەم: هەندێك کرداری هاوەڵان ﷺ بە بۆچوونی خۆیان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و لە دوای وەفاتی.

چەندەها ڕووداومان هەیە بیدعەکاران دەیکەنە بەڵگە بۆ جۆری داهێنراوی چاك و بوونی دەرفەت بۆ کارکردن بە هەر کارێك گەر بە چاك و خێر بزانرێت و دەرگا دانەخرێت بە ناوی «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة» هەموو داهێنراوێك گومڕاییە.

نمونەی ئەو کارانەی لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هاوەڵان کردوویانە لە بواری پەرستندا بەبێ ئەوەی بەڵگەی تایبەتی قورئان و فەرموودەیان پێبووبێت، وە پێغەمبەریش ﷺ بێدەنگی لە ئاستی کردووە، یاخود باسی خێر و هاندانی کردووە لەسەری، واتە پێشوەخت کارەکەیان کردووە و پاشان بەڵگە پشتیوانیان بووە، کەواتە بۆیە کردوویانە زانیویانە داهێنراو نییە و کارە خێرەکان ناچنە ژێر باری گومڕایی و داهێنراوەوە، گەر وا بوایە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری دەکردنەوە کە سەربەخۆ ئەم کارانە ناکرێت لە دیندا و داهێنراو و گومڕاییە، بەو شێوەیە زانراوە کە ئەمانە لەژێر باری مەبەستەکانی شەرع و بەڵگە گشتییەکانیدا جێگەی دەبێتەوە:

أ. دوو ڕکات نوێژی پێش کوشتن: کردنی ئەم کارە لەلایەن (خبيب بن عدي)ەوە ﷺ بوو، کاتێك بێبڕواکانی مەککە ویستیان بیکوژن، (خوبەیب) وتی: «ذَرُونِي أَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، ... فَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ سَنَّ الرَّكْعَتَيْنِ لِكُلِّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ قُتِلَ صَبْرًا»[1].

واتە: وازم لێ بێنن با دوو ڕکات نوێژ بکەم، ... (خوبەیب) یەکەم کەس بوو سوننەتی دوو ڕکات نوێژی دانا پێش کوشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بیست و دژایەتی نەکرد.

ب. پێغەمبەری خوا ﷺ بە (بیلال)ی فەرموو: «يَا بِلَالُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ، عِنْدَكَ فِي الْإِسْلَامِ مَنْفَعَةً، فَإِنِّي سَمِعْتُ اللَّيْلَةَ خَشْفَ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ» قَالَ بِلَالٌ: مَا عَمِلْتُ عَمَلًا فِي الْإِسْلَامِ أَرْجَى عِنْدِي مَنْفَعَةً، مِنْ أَنِّي لَا أَتَطَهَّرُ طُهُورًا تَامًّا، فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ وَلَا نَهَارٍ، إِلَّا

---

(١) رواه البخاري (٣٩٨٩)، وأبو داود (٢٦٦٠)، والنسائي في "الكبرى" (٨٧٨٨)، وأحمد (٧٩٢٨)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ١١٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٨٤٣٢).

صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ، مَا كَتَبَ اللهُ لِي أَنْ أُصَلِّيَ»[(١)].

واته: ئەی (بیلال) هەواڵم بدەرێ بە باشترین کردەوەیەك کردبێتت لە ئیسلامدا، من گوێم لە دەنگی نەعلەکانت بوو لە بەهەشتدا، (بیلال) وتی: هیچ کردەوەیەکم نییە لای من شوێنی ئاوات بێت ئەوە نەبێت هەرکاتێك لە شەو و ڕۆژدا دەستنوێژ بگرم بە دەستنوێژەوە چەندە خوا بۆی نوسیبێتم ئەوەندە نوێژم کردووە.

بەبێ هیچ بەڵگەیەك ئەم کارەی کردووە و پێغەمبەریش ﷺ بێدەنگ دەبێت لە ئاستیدا، وەکوو دان پێدانانێك.

ت. (عبد الله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: اللهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ للهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ الله بُكْرَةً وَأَصِيلًا، فَقَالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مِنَ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا؟» قَالَ رَجُلٌ مَنِ الْقَوْمِ: أَنَا، يَا رَسُولَ الله قَالَ: «عَجِبْتُ لَهَا، فُتِحَتْ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ» قَالَ ابْنُ عُمَرَ: «فَمَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ ذَلِكَ»»[(٢)].

واته: ئێمە نوێژمان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، پیاوێك لەناو ئەو خەڵکەدا وتی: «اللهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ للهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ الله بُكْرَةً وَأَصِيلًا»، لەدوای دابەستنی نوێژ کە پێی دەوترێت (أدعية الاستفتاح)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: کێ ئەو قسەیەی کرد؟ پیاوێك وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: سەرسام بووم، دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرایەوە، (عبد الله) دەڵێت: وازم لەو زیکرە نەهێناوە لەو کاتەوەی لە پێغەمبەرم بیستووە.

---

(١) رواه البخاري (١١٤٩)، ومسلم (٢٤٥٨)، والنسائي في "الكبرى" (٨١٧٩)، وأحمد (٨٤٠٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٠٨٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٢٠٨)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦١٠٤)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠١١)، والبيهقي في "الشعب" (٢٤٦٠).

(٢) رواه مسلم (٦٠١)، والترمذي (٣٥٩٢)، والنسائي في "الكبرى" (٩٦٢)، وأحمد (٤٦٢٧)، والطبراني في "الكبير" (٥٥)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٢٥٥٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٤/ ٢٦٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٢٦٧)، وفي "صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني ص٩٤.

ئەم پیاوە بەبێ ئاگاداری پێغەمبەر ﷺ ئەمەی وت، پێغەمبەریش دانی پێدا نا و وەسفیشی کرد.

ث. پیاوێك لە پاش سەرهەڵبڕین لە ڕکوع وتی: «رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ: «مَنِ المُتَكَلِّمُ» قَالَ: أَنَا، قَالَ: «رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلاَثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أَوَّلُ»»[1].

واتە: پیاوێك لە دوای «سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» وتی: «رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ»، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کێ بوو ئەو قسەیەی کرد؟ پیاوێك وتی: من، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بینیم سی و ئەوەندە فریشتە لەنێو خۆیاندا هەوڵی ئەوەیان دەدا کامیان یەکەم کەس بینووسێت.

ئەم کەسە لە بۆچوونی خۆیەوە ئەم زیکرەی کردووە و پێغەمبەریش ﷺ وەسفی دەکات.

ج. پێشنوێژ (إمام)ی مزگەوتی (القباء) لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەدوای سورەتی [الفَاتِحَة] و پێش خوێندنی سورەتێکی تر بەردەوام ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ دەخوێنێت، پێی دەڵێن و بەڵام وازی لێ ناهێنێت، ئەم باسە دەگاتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش پرسیاری لێ دەکات، لە وەڵام دا دەڵێت: «إِنِّي أُحِبُّهَا» من خۆشم دەوێت ئەو سورەتە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «حُبُّكَ إِيَّاهَا أَدْخَلَكَ الجَنَّةَ»[2].

واتە: خۆشەویستیت بۆ ئەو سورەتە دەتخاتە بەهەشتەوە.

---

(١) رواه البخاري (٧٩٩)، وأبو داود (٧٧٠)، والنسائي في "الكبرى" (٦٥٣)، وأحمد (١٨٩٩٦)، وابن حبان في "صحيحه" (١٩١٠)، والطبراني في "الكبير" (٤٥٣١)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٢٩١٨)، والحاكم في "المستدرك" (٨١٩)،والبزار في "المسند" (٢٤٤٦)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٦١٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٦٣٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٦١٠)، وفي "صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني ص١٣٧.

(٢) رواه البخاري (١/ ١٥٥) بَابُ الجَمْعِ بَيْنَ السُّورَتَيْنِ فِي الرَّكْعَةِ، والترمذي (٥/ ١٧٠)، وأحمد (١٢٤٣)، والدارمي في "السنن" (٣٤٧٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٩٢)، والبزار في "المسند" (٦٨٧٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢١٠)، وفي "صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني ص١٠٣.

ح. (ئەبو سەعیدی خودری) رضي الله عنه سورەتی [الفَاتِحَة] دەخوێنێت بەسەر کەسێکدا بۆ شیفا وەکوو دەرمان، شیفای بۆ دێت، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: «وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ»(١).

واتە: چۆن زانیت ئەوە دوعای شیفایە؟! پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ دەبێت لە ئاستی.

خ. پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێبوو پیاوێك لە نوێژدا لەدوای (تەحیات) ئەمەی دەخوێند: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ يَا أَللَّهُ بِأَنَّكَ الْوَاحِدُ الْأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، أَنْ تَغْفِرَ لِي ذُنُوبِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «قَدْ غُفِرَ لَهُ»، ثَلَاثًا»(٢).

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا لێی خۆش بوو. سێ جار.

یاخود پیاوێکی تر هەر لەدوای (تەحیات) وتی: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، وَحْدَكَ لَا شَرِيكَ لَك، الْمَنَّانُ، بَدِيعُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَام، يَا حَيُّ، يَا قَيُّومُ، إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «هَلْ تَدْرُونَ بِمَا دَعَا؟» فَقَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ دَعَا اللهُ بِاسْمِهِ الْعَظِيمِ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ، وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى»»(٣).

---

(١) رواه البخاري (٢٢٧٦)، ومسلم (٦٥)، وابن ماجه (٢١٥٦)، وأبو داود (٣٤١٨)، والترمذي (٢٠٦٤)، وأحمد (١١٤٧٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١١٢)، والحاكم في "المستدرك" (٢٠٥٤)، والدارقطني في "السنن" (٣٠٣٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١١٨٩)، والبيهقي في "الشعب" (٢٣٣٧).

(٢) رواه أبو داود (٩٨٥) وصححه الألباني، والنسائي في "الكبرى" (١٢٢٥)، وأحمد (١٨٩٧٤)، والطبراني في "الكبير" (٧٠٣)، والحاكم في "المستدرك" (٩٨٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٧٢٤)، وفي "صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني ص١٨٦.

(٣) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٧٠٥)، وابن ماجه (٣٨٥٨)، وأبو داود (١٤٩٥)، والنسائي في "الكبرى" (١٢٢٤)، وأحمد (١٢٢٠٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٩٣٦١)، وابن حبان في "صحيحه" (٨٩٣)، والطبراني في "الكبير" (٤٧٢٢)، والحاكم في "المستدرك" (١٨٥٦)، والبزار في "المسند" (٦٤٥٣)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢٥٨)، والبيهقي في "السنن الصغرى" (٤٦١)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٢٢٩٠)، وفي "صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني ص١٨٦.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ئەزانن بە چی دوعای کرد؟ وتیان: خوا و پێغەمبەری خوا زاناترن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، بە ناوە گەورەکەی خوای گەورە پاڕایەوە، کە هەرکەس دوعای پێ بکات وەڵام دەدرێتەوە، وە هەرکەس داوای شتێکی پێ بکات پێی دەدرێت.

ئەم دوو دوعایەی بیست لەو کەسە و بڕیاری لەسەردا.

ئەمانە و دەیان جۆر لەمانە بەڵگەی دەستی کەسانی دابەشکاری داهێنراون بۆ چاك و خراپ کە ڕوویانداوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و پاڵپشت کراون، ئەوەندە نموونە بەسە بۆ جۆری بەڵگەکارییان و شێوازی تێگەیشتنیان و بە مافی حەق وتن و ئینسافم زانی کە هەموو شێوازی بەڵگەکانیان باس بکەم، گەرچی لەگەڵ ڕا و جۆر و شێوازی تێگەیشتنیاندا نیم، بەڵام بۆ دڵنیا بوونی پێویستە.

**هۆکاری ڕێگەپێدان و دروستبوونی ئەم کارانە بەچاکزانینی خاوەنەکانیان نییە، وە بە شێوەی گشتی خێر خوێندنەوەیان بۆ ناکرێت لەژێر فەرموودەی** ﴿وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۩ ٧٧﴾ [الحَج : ٧٧]. **یا لەژێر بنەما گشتییەکاندا، بەڵکوو ڕا و بۆچوونێکە دەدرێتە بەر یاساکانی شەرع، گەر بڕیاری لەسەر دا؛ ئەوە شەرعە و گەر نا ئەوە گومڕاییە، وە ئەمانە لەژێر ناونیشانی بڕیاری هاوەڵان و کاریان ناخوێندرێتەوە، بەڵکوو هەموو زانایان لەسەر ئەم ڕیوایەتانەدا ناونیشانی سوننەت و فەرموودەیان نووسیوە، وە گەر ئەمانە بکرێتە بەڵگە؛ چی دەڵێن دەربارەی ئەوەی کە کۆمەڵە کارێکی زۆریش هەیە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەنجام دراوە و پێغەمبەری خواش ﷺ بەرپەرچی داونەتەوە و بە گومڕا و کێشە ناوی بردوون؟**

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پەرستن (عبادات) و هۆکارەکانی نزیکبوونەوە و دینداری وەستانە لەسەر سنووری بەڵگە و دەقە دیاریکراوەکانی شەرع، نەك هەرکەسێك بۆی هەیە لەناو بازنەی دیندا هەوا و ئارەزووەکانی بەناوی داهێنراوی خێر و چاکە بەتاڵ بکاتەوە و دەرگایەکی کراوە بێت و دینەکەمان وەکوو دینی گاوورو جوولەکە گۆڕڕاو و شێواو بێت، وە هیچ پاراستنێکی دینی وەکوو دینداری لە ئەستۆی کەس نەبێت.

# لەو کارانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانی خۆیدا بەرپەرچی داونەتەوە

١. لە (القضاء والقدر)دا: (ئەبو سەعیدی خودری) ﷺ دەڵێت: ئێمە لە بەردەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ باسی قەدەرمان دەکرد، ئەم ئایەتێکی دەهێنا، ئەو ئایەتێکی دەهێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ وەکوو دەنکە هەنار بە ڕوویا فلیقابێتەوە ئاوا سوور هەڵگەڕا بوو، فەرمووی: «يَا هَؤُلَاءِ أَبِهَذَا بُعِثْتُمْ؟ أَمْ بِهَذَا أُمِرْتُمْ؟ " أَوْ لِهَذَا خُلِقْتُمْ، تَضْرِبُونَ الْقُرْآنَ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ، بِهَذَا هَلَكَتِ الْأُمَمُ قَبْلَكُمْ" لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[(١)].

واتە: ئەی ئەمانە، بۆ ئەمە من نێردراوم؟ یا بەم شێوە فەرمانم پێ کردوون؟ بۆ ئەمە دروست بوون قورئان هەندێکی بدەن بەسەر هەندێکیدا؟ بەم شێوە گەلانی پێشوو تیاچوون، لەدوای من نەگەڕێنەوە سەر بێبڕوایی، هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان بدەن.

بەم شێوەیە بەرپەرچی ئەم جۆرە تێگەیشتن و وروژاندنی بابەتە هەستیار و وردەکاریانەی دایەوە کە لە ئاستێکی گشتی خەڵکدا باس دەکرێت، پشتگیری نەکردن لەسەر ڕیزکردنی بەڵگە و بیرکردنەوە و شێوازی کۆڕبەستن لەسەری وەکوو ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ.

لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا تاقمی (القدرية والجبرية)کان لەسەر قەزا و قەدەر دروست بوون.

٢. (ئەنەسی کوڕی مالیك) ﷺ دەڵێت: «جَاءَ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: «أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا،

---

(١) رواه ابن ماجه (٨٥)، وأحمد (٦٨٤٥)، والطبراني في "الكبير" (٥٤٤٢)، والبزار في "المسند" (١١)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٤٤٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٨٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٤٠٦)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٩٨، ٩٩)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (١٤٠)، وفي "الظلال" (٤٠٦).

أَمَا وَاللهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ للهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[(١)].

واتە: سێ کۆمەڵ هاتن بۆ ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ، پرسیاریان لە عیبادەتی پێغەمبەر کرد، کاتێك هەواڵیان پێدان بەلایانەوە کەم بوو، وتیان: ئێمە لە کوێین لە ئاستی پێغەمبەردا ﷺ، لە کاتێکدا خوا لە تاوانی ڕابردوو و داهاتووی خۆش بووە، یەکێکیان وتی: من شەو ناخەوم نوێژ دەکەم هەتا هەتایە، یەکێکی تریان وتی: من هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو دەبم بەردەوام، یەکێکی تریان وتی: من ژن ناهێنم هەتا هەتایە، پێغەمبەری خوا ﷺ هات و فەرمووی: ئێوە بوون ئەوانەتان وت؟ سوێند بە خوا من لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسم و خواپەرستی دەکەم، بەڵام من بەڕۆژوو دەبم و بەڕۆژووش نابم، نوێژ دەکەم و دەشخەوم، وە ژنیش دەهێنم، ئەوەی لە سوننەتی من دوور کەوێتەوە لە من نییە.

بەم شێوەیە دژایەتی ئەو ڕێگە هەڵانەی کرد بڕیاریان لەسەر دەدا، هەموو ئەم ڕێگایانە دەبن بە داهێنراو بەسەر خاوەنەکانیانەوە، لەبەر ئەوەی ئەو کارە دونیاییانەیان دەگرتە بەر وەکوو عیبادەت و خواپەرستی، پەیوەستکردنی کارە دونیاییەکان بە عیبادەت و دینەوە وەکوو ڕێگەی دینداری دەچێتە ژێر بواری داهێنراوەوە.

**٣.** پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، بینی پیاوێك بە پێوە وەستاوە، پرسیاری دەربارەی کرد، وتیان: (أبو اسرائیل)ە نەزری کردووە بەپێوە بێت و دانەنیشێت و نەچێتە بەر سێبەر و قسەش نەکات، وە بەڕۆژووش بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «مُرْهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ، وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ»[(٢)].

واتە: پێی بڵێن با قسە بکات و بچێتە بەر سێبەر و دابنیشێت، وە ڕۆژووەکەی تەواو بکات.

---

(١) رواه البخاري (٥٠٦٣)، ومسلم (١٤٠١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٣٠٥)، وأحمد (٦٤٧٧)، والدارمي في "السنن" (٢٢١٥)، وابن حبان في "صحيحه" (١٤)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٠٣٧٤)، والبزار في "المسند" (٦٨٠٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٩٦)، والبيهقي في "الشعب" (٥٠٩٣).

(٢) رواه البخاري (٦٧٠٤)، وابن ماجه (٢١٣٦)، وأبو داود (٣٣٠٠)، وأحمد (١٧٥٣٢)، ومالك في "الموطأ" (١٧٢٣)، والدارقطني في "السنن" (٤٣٢٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٣٨٥)، والطبراني في "الكبير" (١٠٩٣٠)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٥٨١٨)، وابن خزيمة (٢٢٤٢)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٤٤٣)، والبيهقي في "الكبرى" (٢٠٠٩٢).

(ئەبو بەکری صدیق) ﷺ لە حەجدا ئافرەتێکی بینی قسەی نەدەکرد، پرسیاری دەربارەی کرد، وتیان: دەیەوێت حەج بکات بە قسەنەکردن، فەرمووی: «تَكَلَّمِي، فَإِنَّ هَذَا لَا يَحِلُّ لَكَ، إِنَّمَا هَذَا مِنْ عَمَلِ الْجَاهِلِيَّةِ»[(١)].

واتە: قسە بکە، ئەمە دروست نییە بۆت، ئەمە لە کردەوەی سەردەمی نەفامییە.

**٤.** (مەعازی کوڕی جەبەل) ﷺ کاتێك گەڕایەوە لە شام سوجدەی بۆ پێغەمبەر ﷺ برد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «مَا هَذَا يَا مُعَاذُ؟» قَالَ: أَتَيْتُ الشَّامَ فَوَافَقْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِأَسَاقِفَتِهِمْ وَبَطَارِقَتِهِمْ، فَوَدِدْتُ فِي نَفْسِي أَنْ نَفْعَلَ ذَلِكَ بِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «فَلَا تَفْعَلُوا، ...»[(٢)]، «لَا يَصْلُحُ لِبَشَرٍ أَنْ يَسْجُدَ لِبَشَرٍ»[(٣)].

واتە: ئەمە چییە ئەی (مەعاز)؟ وتی: چوومە شام بینیم سوجدەیان بۆ قەشە و سەرکردەکانیان دەبرد، پێم خۆش بوو ئەمە بۆ تۆ بکرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاری وا مەکەن، شایستە نییە ئادەمیزاد کڕنووش بۆ ئادەمیزاد ببات.

**٥.** قسەوتن بە هاوەڵان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَا تَسُبُّوا أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِي، ...»[(٤)].

واتە: کەس قسە بە هاوەڵانی من نەڵێت.

یاخود وەصفکردنی یەکتر، پیاوێك وەصفی پیاوێکی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «قَطَعْتَ ظَهْرَهُ، إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا صَاحِبَهُ لَا مَحَالَةَ، فَلْيَقُلْ أَحْسَبُهُ وَاللهُ حَسِيبُهُ، وَلَا أُعْذِرُ عَلَى اللهِ

---

(١) رواه البخاري (٣٨٣٤)، والدارمي في "السنن" (٢١٨)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٢١٥٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٠٩٦).

(٢) رواه ابن ماجه (١٧٥٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٤١٧١)، والطبراني في "الكبير" (٧٢٩٤)، وصححه الألباني في "الإرواء" (١٩٩٨)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (١٩٣٩).

(٣) رواه ابن ماجه (١٨٥٣)، وابن حبان في "صحيحه" (١٢٩٠)، والبيهقي (٧/ ٢٩٢)، وحسنه الألباني في "الإرواء" (٧/ ٥٥) وقال: حسن صحيح، و "صحيح الترغيب والترهيب" (١٩٣٨).

(٤) رواه البخاري (٣٦٧٣)، ومسلم (٢٥٤١)، وأبو داود (٤٦٥٨)، والترمذي (٣٨٦١)، والنسائي في "الكبرى" (٨٢٥٠)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٩٤)، والطبراني في "الصغير" (٩٨٢).

أَحَدًا، أَحْسَبُهُ كَذَا وَكَذَا، إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهُ»[(١)].

واتە: پشتت شكاند، گەر كەسێكتان وەصفی هاوەڵەكەی كرد و ناچار بوو؛ با بڵێت وا گومان دەبەم خوا پشتیوان بێت.

یاخود پێغەمبەر ﷺ چووە مزگەوت حەبلێكی بینی لە نێوان دوو كۆڵەكەدا، فەرمووی: ئەوە چییە؟ وتیان: ئەوە حەبلی (زەینەبی كچی جەحش)ە خێزانی پێغەمبەر ﷺ، گەر هیلاك بوو لە نوێژدا پاڵی پێوە دەدات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «لاَ حُلُّوهُ لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ»[(٢)].

واتە: بیكەنەوە، هەر یەكەتان بە گوێرەی توانای خۆی نوێژ بكات، گەر هیلاك بوو با دانیشێت.

وە ئەو پیاوەی ڕەخنەی گرت لە پێغەمبەر ﷺ لەسەر شێوەی دابەشكردن، وتی: «اتَّقِ اللهَ يَا مُحَمَّدُ»[(٣)]، لە ڕیوایەتێكی تردا: «يَا مُحَمَّدُ اعْدِلْ»[(٤)].

واتە: لە خوا بترسە، دادپەروەر بە ئەی (محمد)، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەواڵیدا كە لە نەوەی ئەم پیاوە كۆمەڵێك دێن لە دین دەردەچن و نیشانەكانی باس كردن.

یاخود ڕێگەگرتن لە درێژەپێدانی ڕۆژوو (الوصال) بەبێ شكاندنی لە شەودا، فـەرمووی: «لَا

---

(١) رواه ابن ماجه (٣٧٤٤) وصححه الألباني، وأحمد (٢٠٤٦٨)، وقال محققه (شعيب الأرنؤوط): إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) رواه البخاري (١١٥٠)، ومسلم (٧٨٤)، وابن ماجه (١٣٧١)، وأبو داود (١٣١٢)، والنسائي في "الكبرى" (١٣٠٨)، وأحمد (١١٩٨٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٤٩٢)، والطبراني في "الأوسط" (٨٨٩٠)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١١٨٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٩٤٢).

(٣) رواه البخاري (٣٣٤٤)، ومسلم (١٠٦٤)، وأبو داود (٤٧٦٤)، والنسائي في "الكبرى" (٢٣٧٠)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٢٩٤٥)، وسعيد بن منصور في "السنن" (٢٩٠٣).

(٤) رواه مسلم (١٠٦٣)، والنسائي في "الكبرى" (٨٠٣٣)، وأحمد (١١٦٢١)، والطبراني في "الأوسط" (٩٠٦٠)، والحاكم في "المستدرك" (٢٦٤٤)، والآجري في "الشريعة" (٣٦)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩٤٤)، وفي "مسند الحميدي" برقم (١٣٠٨).

**تُوَاصِلُوا»[(١)]، وە ڕێگەی پێدان تا پارشێو نەیشکێنن و فەرمووی: «إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ ...»[(٢)].**

**واتە: من وەکوو ئێوە نیم.**

## وەڵام بۆ ئەم دوو جۆرە بەڵگانە

**١. گەر ئەوانە بەڵگە بێت بۆ داهێنراوی چاك؛ ئەوا ئەمانەش بەڵگەن بۆ ڕێگرتن لە هەموو جۆرە داهێنراوێك.**

**٢. بنەما لە دینداری و عیباداتدا وەستانە لەسەر بەڵگە و دەرنەچوونە لە سنووری «الأَصلُ في العِبَاداتِ التَّوقُّف والاتِّباعُ لا الإِبْتِدَاع»[(٣)].**

**٣. کاری هاوەڵان بەڵگە نین، بەڵکوو بێدەنگبوون یا دانپێدانانی پێغەمبەر ﷺ لەو کارانەدا بەڵگەیە.**

**لەبەر ئەوەی هاوەڵان (معصوم) نین، ئەکرێت هەڵە بکەن یا بپێکن، وەکوو هەموو کەس ئیجتیهاد بکەن.**

**٤. هاوەڵان گەر (معصوم)یش نەبن لە پلەوپایەیەکی ئیمانی و شارەزابوون و توانایەکی زانستی و ئیجتیهادی و دڵسۆزییەکی تەواوی دینی و بە زمانێکی پاراو و ئاشنا بەسەر قورئان و فەرموودەدا بوون.**

**ئەستەمە ئەوانەی دوای ئەوان بگەنە پلەیان، ئیتر چۆن دەرگا دەکرێتەوە بۆ دوای ئەوان داهێنراوی چاك دابهێنن لە سنووری مەبەست و یاسا گشتییەکانی دین دەرنەچێت؟! گەر پێوانەی ئیجتیهادەکانی هاوەڵان بکەین لەڕووی چەندی و چۆنێتییەوە لەگەڵ ئەو بەناو ئیجتیهادەی دوای**

---

(١) رواه البخاري (١٩٦١)، ومسلم (١١٠٢)، والنسائي في "الكبرى" (٣٢٥٠)، وأحمد (٤٧٢١)، والدارمي في "السنن" (١٧٤٦)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٩٥٨٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٥٧٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٨٣٧٤)، ومالك في "الموطأ" (١٠٥٩).

(٢) رواه البخاري (١٩٦٣)، ومسلم (١١٠٥)، وأبو داود (٢٣٦٠)، وأحمد (٦١٢٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٩٥٨٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٨٣٧٣)، ومالك في "الموطأ" (١٠٦٠).

(٣) "القواعد النورانية" لابن تيمية ص١٦٤، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٩/ ١٧).

ئەوان دایان هێناوە کە زۆریان بە داهێنراو دەردەچن، زیاتر دڵنیا دەبین لە داخستنی دەرگای چاك و خراپ لە داهێنراودا.

٥. ئەو کارانەی کە هاوەڵان کردوویانە بەشێکیان لە سەردەمی (تشریع) یاسا و بەرنامە و تەواوکاری دیندا بووە و لە ژیانی پێغەمبەری خوادا بووە ﷺ، بە مەرجی گەڕانەوە و ئیقرار بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ بووە، بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لای کێ بگەڕێنەوە بۆ بڕیار و ئیقراری دینی؟! لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کارانە لە زیکر و دوعا گشتییەکاندا بووە و هیچ کەس بە داهێنراوی دانانێ.

٦. وە بەشێکی تریان دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بووە، وەکوو (تەراویح و کۆکردنەوەی قورئان و بانگی جومعە ...)، ئەمانە لە سەردەمی (خولەفای ڕاشیدین)دا بوون و بە سوننەت و یاسای ئیسلام دادەنرێت بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە کۆدەنگی هەموو هاوەڵانی لەسەر بووە، ئەویش (الإجماع)ە، کە بەڵگەی چوارەمی ئیسلامە.

بەڵام دوای ئەوان چ کۆدەنگییەك هەبووە لەسەر دابەشکردنی داهێنراو بۆ چاك و خراپ و ئیقرارکردن لەسەر داهێنراوەکان؟! لە هیچ سەردەمێکدا کۆدەنگی زانایان نەبووە لەسەر یەك داهێنراو، نەك چەندەها، وە تەنانەت لە ئاستی جیهانی ئیسلامیش نییە، هەندێك ناوچە جۆرێك داهێنراو دەکەن هەندێك نایکەن.

٧. وە ئەو کارانەشی کە هاوەڵان کردوویانە (وسائل وطرق ومقاصد ليست عبادة ذاتية) هۆکار و ڕێگەیەك بووە بۆ مەبەستێکی خێر و سوودمەندی دینی، نەك وەکوو عیبادەتێکی سەربەخۆ و تەواو، وە ئەو کارانەش پێویستی بوونی لە ئارادا نەبووە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ.

٨. گەر بڕیار بدرێت لەسەر ئەو کارانەی کە هاوەڵان کردوویانە بە (البدعة الحسنة) بەبێ خوێندنەوەی ئیقراری پێغەمبەر ﷺ کە دەبێتە سوننەت و لە کاری هاوەڵان دەردەچێت، دەکەوینە ئەو گومڕاییەی کە شەیتانیش (البدعة الحسنة)ی داهێناوە، کاتێك (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه سەرپەرشتی ماڵی زەکات دەکات و تا سێ جار لە شەودا کەسێك بەسەر ماڵەکەوە دەگرێت و لە سێیەم شەودا پێی دەڵێت: «دَعْنِي أُعَلِّمْكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللهُ بِهَا، قُلْتُ: مَا هُوَ؟ قَالَ: إِذَا أَوَيْتَ

إِلَى فِرَاشِكَ، فَاقْرَأْ آيَةَ الكُرْسِيِّ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾ [البقرة : ٢٥٥]، حَتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ، فَإِنَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ، وَلاَ يَقْرَبَنَّكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ، فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ البَارِحَةَ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، زَعَمَ أَنَّهُ يُعَلِّمُنِي كَلِمَاتٍ يَنْفَعُنِي اللهُ بِهَا، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ، قَالَ: «مَا هِيَ»، قُلْتُ: قَالَ لِي: إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الكُرْسِيِّ مِنْ أَوَّلِهَا حَتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾ [البقرة : ٢٥٥]، وَقَالَ لِي: لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ، وَلاَ يَقْرَبَكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ - وَكَانُوا أَحْرَصَ شَيْءٍ عَلَى الخَيْرِ - فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ، تَعْلَمُ مَنْ تُخَاطِبُ مُنْذُ ثَلاَثِ لَيَالٍ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ»، قَالَ: لاَ، قَالَ: «ذَاكَ شَيْطَانٌ»»[(١)].

واته: وازم لێ بێنە چەند وشەیەکت فێر دەکەم خوا سوودت پێ بگەیەنێت، وتم چییە؟ وتی: گەر چویتە سەر جێگای خەوتن (آية الكرسي) بخوێنە هەتا بەیانی لای خواوە پارێزراوی، وە شەیتانیش نزیکت ناکەوێت تا بەیانی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەوە ڕاستی کرد ئەو درۆزنە، دەزانیت سێ شەوە لەگەڵ کێ قسە دەکەیت؟ وتم: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە شەیتان بوو.

ئەمە یاخود بیدعەیەکی شەیتانی (حسنة)یە یاخود ئیقرار و سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ کە شەوان (آية الكرسي) بخوێندرێت.

شەشەم: بوونی تایبەتمەندی لە وشەی گشتی: «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة».

بە ڕاوبۆچوونی هەندێك لە زانایان وایە کە: «كُلَّ ...» ئەم وشە گشتییە تایبەت دەکرێت (العام المخصوص) بەم بەڵگانە:

---

(١) رواه البخاري (٢٣١١، ٣٢٧٥)، والنسائي في عمل اليوم والليلة (٩٥٩)، والبغوي في "شرح السنة" (١١٩٦)، والبيهقي في "الشعب" (٢١٧٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٢٨١)، وفي "صحيح الترغيب والترهيب" (٦١٠)، و "المشكاة" (٢١٢٣).

**١.** فەرموودەی: «مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، ...» وەکوو ئیمامی (النووي) رحمه الله دەڵێت: «وَفِي هَذَا الْحَدِيثِ تَخْصِيصُ قَوْلِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ وَأَنَّ الْمُرَادَ بِهِ الْمُحْدَثَاتُ الْبَاطِلَةُ وَالْبِدَعُ الْمَذْمُومَةُ»[1].

واتە: لەم فەرموودەیەدا تایبەتکردنی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ «كُلَّ بِدْعَةٍ ...» مەبەست پێی دروستکراوە بەتاڵ و بیدعە خراپەکانە.

**٢.** فەرموودەی: «... وَمَنْ ابْتَدَعَ بِدْعَةً لَا يَرْضَاهَا اللهُ وَرَسُولُهُ، فَإِنَّ عَلَيْهِ مِثْلَ إِثْمِ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنَ النَّاسِ، لَا يَنْقُصُ مِنْ آثَامِ النَّاسِ شَيْئًا»[2].

واتە: هەرکەسێك داهێنراوێك بکات خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕازی نەبێت ئەوا تاوانی ئەوانەی کاری پێدەکەن دێتە گەردنی، مەبەست پێی (داهێنراوێك خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕازی نەبن)، کەواتە ئەبێت هەبێت بیدعەیەك خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕازی بن.

ئەم فەرموودەیە لاواز (ضعيف)ە و کاری پێ ناکرێت.

**٣.** بە فەرموودەکەی خەلیفەی موسوڵمانان (عومەری کوڕی خەتاب) رضي الله عنه: «نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ، ...»، وە کردەوەی هاوەڵان لە سەردەم و دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویانە، وەڵامی ئەمانە دراوەتەوە لەمەوپێش.

**٤.** وشەی: «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» لە وشە گشتییە تایبەتیکراوەکانە (العام المخصوص)[3]، وە بە وتەی هەندێك لە زانایانی پێشوو و دوای ئەوان، دوای ئەم بابەتە شیکردنەوەی لەسەرە.

بۆ وەڵامدانەوە لەسەر ئەم جۆرە بەڵگە و هاوشێوانە لەسەر ئەوەی «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» هەموو داهێنراوێك گومڕاییە، هەموو داهێنراوێك نییە، بەڵکوو وشەی: «كُلَّ» وشەیەکی گشتی تایبەتکراو

---

(١) "شرح النووي على مسلم" (٧/ ١٠٤).

(٢) رواه ابن ماجه (٢١٠)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٢٣١، وابن أبي عاصم في "السنة" (٤٢)، وابن وضاح في "البدع" (٩٣)، وضعفه الألباني في "الضعيفة" (٢٠٣١)، و "ضعيف الجامع الصغير" (٩٦٥، ٥٣٥٩)، و "ضعيف الترغيب والترهيب" (٤٢)، و "المشكاة" (١٦٨)، وفي ظلال الجنة (٤٢).

(٣) "الكواكب الدراري في شرح صحيح البخاري" للكرماني (٩/ ١٥٤).

(العام المخصوص)ە، بەو واتایەی هەندێك داهێنراو گومڕاییە نەك هەموو داهێنراوێك، بە پشتیوانی لە جۆری تێگەیشتنی ئەو بەڵگانەی پێشوو، وە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵە تێگەیشتنە زانایان دەڵێن:

١. بەڵگەکانی بەخراپ باسکردنی (بیدعە) بە شێوەی گشتی هاتوون، هیچ (الخاص، الإستثناء) بێجگە و لێدەرکردنێکی تێدا نەهاتووە بلێت هەموو داهێنراوێك گومڕاییە بێجگە لەمە و لەوە نەبێت، وەك دەفەرموێت: «فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»، «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»، «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»، «وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا».

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «جَاءَتْ مُطْلَقَةً عَامَّةً عَلَى كَثْرَتِهَا، لَمْ يَقَعْ فِيهَا اسْتِثْنَاءٌ أَلْبَتَّةَ، وَلَمْ يَأْتِ فِيهَا مَا يَقْتَضِي أَنَّ مِنْهَا مَا هُوَ هُدًى، وَلَا جَاءَ فِيهَا: كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ إِلَّا كَذَا وَكَذَا، وَلَا شَيْءَ مِنْ هَذِهِ الْمَعَانِي.

فَلَوْ كَانَ هُنَالِكَ مُحْدَثَةٌ يَقْتَضِي النَّظَرُ الشَّرْعِيُّ فِيهَا الِاسْتِحْسَانَ أَوْ أَنَّهَا لَاحِقَةٌ بِالْمَشْرُوعَاتِ؛ لَذُكِرَ ذَلِكَ فِي آيَةٍ أَوْ حَدِيثٍ، لَكِنَّهُ لَا يُوجَدُ، فَدَلَّ عَلَى أَنَّ تِلْكَ الْأَدِلَّةَ بِأَسْرِهَا عَلَى حَقِيقَةِ ظَاهِرِهَا مِنَ الْكُلِّيَّةِ الَّتِي لَا يَتَخَلَّفُ عَنْ مُقْتَضَاهَا فَرْدٌ مِنَ الْأَفْرَادِ»[(١)].

واتە: لەسەر ئەو هەموو ڕیوایەتەدا بە شێوەی داڕشتنی گشتی هاتووە، لێدەرکردنی بە هیچ شێوەیەك تێدا نەبووە، گەر ببوایە ئەوا لە ئایەت و فەرموودەیەکدا دەبوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو بەڵگانە هەموویان بە شێوەی ڕاست و ڕووکەشی شێوە گشتی هاتووە، تاکێك لە تاکەکانی لێ دەرناکات.

ئیمامی (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «فمن اعتقد أن بعض البدع مخصوص من هذا العموم، احتاج إلى دليل يصلح للتخصيص، وإلا كان ذلك العموم اللفظي المعنوي موجبا للنهي، ثم المخصص هو الأدلة الشرعية من الكتاب والسنة والإجماع، نصا واستنباطا»[(٢)].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٨٧).

(٢) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٨٨).

واته: ئەوەی باوەڕی وایه هەندێك لـه داهێنراو تایبەت کراوه به لێدەرکردن لـەو شێوه گشتییه پێویستی به بەڵگه هەیه بشێت بۆ تایبەتکردن، وه گەر نا ئەو وشه زارەکییه ناوەڕۆکییه «كُلَّ» هەموو جۆرێکی دەگرێتەوه، وه تایبەتکردنەکەش به بەڵگەیه و لـه قورئان و فەرمووده و کۆدەنگی زانایان، جا به دەق بێت یان لێوەرگرتن.

٢. ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «أَنَّهُ قَدْ ثَبَتَ فِي الْأُصُولِ الْعِلْمِيَّةِ أَنَّ كُلَّ قَاعِدَةٍ كُلِّيَّةٍ أَوْ دَلِيلٍ شَرْعِيٍّ كُلِّيٍّ، إِذَا تَكَرَّرَتْ فِي مَوَاضِيعَ كَثِيرَةٍ، وَأُتِيَ بِهَا شَوَاهِدُ عَلَى مَعَانٍ أُصُولِيَّةٍ أَوْ فُرُوعِيَّةٍ، وَلَمْ يَقْتَرِنْ بِهَا تَقْيِيدٌ وَلَا تَخْصِيصٌ، مَعَ تَكَرُّرِهَا وَإِعَادَةِ تَقَرُّرِهَا، فَذَلِكَ دَلِيلٌ عَلَى بَقَائِهَا عَلَى مُقْتَضَى لَفْظِهَا مِنَ الْعُمُومِ»[(١)].

واته: یەکێك لـه بنەما زانستییەکان دانراوه که هەر بنەما و یاسایەکی گشتی یا بەڵگەیەکی شەرعی گشتی گەر چەندباره بووەوه لـه زۆر شوێندا، وه پەیوەست نەکرابوو، وه تایبەت نەکرابوو لـەگەڵ ئەو هەموو چەندباره بووەوەدا سەرلـەنوێ داڕشتن؛ ئەوه بەڵگەیه لـەسەر مانەوەی گشتگیری ئەو داڕشتنه گشتییه.

فەرموودەکانی بەخراپ باسکردنی داهێنراو لـەم جۆرەیه، که پێغەمبەری خوا ﷺ لـەسەر مینبەر و کات و شوێنی جیاواز وتوویەتییەوه، به ئامادەبوونی زۆری موسوڵمانان بەبێ تایبەتکردن، ئەمه بەڵگەیه لـەسەر ئەوەی گشتگیره و تایبەتی تێدا نییه[(٢)].

تەنانەت لـه (خطبة الحاجة)دا هاتووه که پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەکی هەموو وتەیەکی پێ کردووەتەوه و (ابن مسعود) رضي الله عنه دەڵێت: «عَلَّمَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُطْبَةَ الْحَاجَةِ فِي النِّكَاحِ وَغَيْرِهِ»[(٣)].

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری وتاری پێشەکی کردووین لـه ژن مارەکردن و کاری تردا.

---

(١) "الاعتصام" (١/ ١٨٧).

(٢) "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص١٩٢.

(٣) رواه ابن ماجه (١٨٩٢)، وأبو داود (٢١١٨)، والترمذي (١١٣١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٥٠٢)، وأحمد (٣٧٢٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٧٢٢١)، وفي "خطبة الحاجة" للألباني ص٩ .

وە یاسایەکی بنەماییمان هەیە (القاعدة الأصولية) دەڵێت: «لَا يَجُوزُ تَأْخِيرُ الْبَيَانِ عَنْ وَقْتِ الْحَاجَةِ»(١).

واتە: دروست نییە دواخستنی شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی پێویست لەکاتی پێویستیدا.

گەر پێویست بوایە لێدەرکردنی یا تایبەتکردنی هەندێك (بیدعە) لە گشتییەکەی؛ ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی دەکردەوە و لێی دەردەکرد، لەبەر ئەوەی فەرمانی ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ [النحل : ٤٤]. ی بۆ هاتووەتە خوارەوە.

واتە: تاوەکوو بۆ خەڵکی ڕوون کەیتەوە ئەوەی بۆیان هاتووەتە خوارەوە.

**٣.** ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «أَنَّ مُتَعَقِّلَ الْبِدْعَةِ يَقْتَضِي ذَلِكَ بِنَفْسِهِ، لِأَنَّهُ مِنْ بَابِ مُضَادَّةِ الشَّارِعِ وَاطِّرَاحِ الشَّرْعِ، وَكُلُّ مَا كَانَ بِهَذِهِ الْمَثَابَةِ، فَمُحَالٌ أَنْ يَنْقَسِمَ إِلَى حَسَنٍ وَقَبِيحٍ، ... إِذْ لَا يَصِحُّ فِي مَعْقُولٍ وَلَا مَنْقُولٍ اسْتِحْسَانُ مُشَاقَّةِ الشَّارِعِ»(٢).

واتە: تێگەیشتن لە وشەی (بیدعە) ماناکەی لە خۆیدایە، مانا کراوە بە دژایەتیکردن و لادانی شەرع، وە هەرچییەك بەو شێوازە بێت مەحاڵە دابەشبێت بەسەر چاك و خراپدا، دروست نییە نە لە عەقڵدا و نە لە دەقە شەرعییەکاندا بەچاکزانینی دژە شەرعییەکان، سوننەت بەرامبەرەکەی بیدعەیە، بیدعەش هەمووی لادان و تاوانە، چاکەی تێدا نییە، بەڵام سوننەت هەمووی خێر و چاکەیە، تەنانەت لە بنەما یاسا عەقڵییەکاندا قبوڵ ناکرێت کە پێی دەوترێت: «الْجَمْعُ بَيْنَ النَّقِيضَيْنِ مُمْتَنِعٌ»(٣).

واتە: کۆکردنەوەی دوو دژ بەیەك قەدەغەیە.

لەبەرئەوەی داهێنراو (بیدعە): «لَمْ يَدُلَّ عَلَيْهِ دَلِيلٌ شَرْعِيٌّ»(٤)، بەڵام سوننەت بەڵگەدارە.

---

(١) "روضة الناظر" لابن قدامة (١/ ٥٣٤)، و "الموافقات" للشاطبي (٤/ ١٤٠)، و "إرشاد الفحول" للشوكاني (١/ ١٥٤)، و "المذكرة" للشنقيطي (١/ ١٠)، و "الفقيه والمتفقه" لخطيب البغدادي (١/ ٣٢٨)، و "قواعد الفقه" لمحمد البركتي (٧٢).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٨٨).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٥/ ٣٢٤)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٩/ ٢٩٨).

(٤) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٩٥).

٤. ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «إِجْمَاعُ السَّلَفِ الصَّالِحِ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ يَلِيهِمْ عَلَى ذَمِّهَا كَذَلِكَ، وَتَقْبِيحِهَا وَالْهُرُوبِ عَنْهَا وَعَمَّنِ اتَّسَمَ بِشَيْءٍ مِنْهَا، وَلَمْ يَقَعْ مِنْهُمْ فِي ذَلِكَ تَوَقُّفٌ وَلَا مَثْنَوِيَّةٌ، فَهُوَ بِحَسَبِ الِاسْتِقْرَاءِ إِجْمَاعٌ ثَابِتٌ، فَدَلَّ عَلَى أَنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ لَيْسَتْ بِحَقٍّ، بَلْ هِيَ مِنَ الْبَاطِلِ»[١].

واتە: کۆدەنگی هاوەڵان و شوێنکەوتوان و ئەوانەی دوای ئەوان لەسەر بەخراپ باسکردنی داهێنراون و ناشرینکردنی و ڕاکردنە لێی، وە ئەوەی پەیوەندی پێوەیەتی، ئەمە بۆخۆی کۆدەنگیێکی دڵنیابووە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەموو داهێنراوێك ڕاستی تێدا نییە و بەتاڵە.

بەتایبەت ئەو هەموو جۆرە دژایەتیەیان لەسەر بیدعەکاران، هەر لە ناو زراندن و پەیوەندی نەبوون پێیانەوەرو تەنانەت گوێ لێنەگرتن و زانست لێوەرنەگرتنیانەوە لەلایەن (التابعین والتابع التابعین) وە زانایانی پاش ئەوانیش، گەر پیاچوونەوەیەك بکەیت لەو بوارەدا سەرسام دەبیت لەو هەموو هەوڵەیان لە دژایەتیکردنیان بۆ بیدعە و بیدعەکاران.

٥. «لفظه "كل" للعموم، ولفظ العام يستغرق جميع أفراده، ولا يخرج فرد من الأفراد إلا بمخصص، ...» [٢].

«وبرهان ذلك:

١. لفظ "كل" من ألفاظ العموم، وقد جزم أهل اللغة بأن فائدة هذا اللفظ هو رفع احتمال التخصيص إذا جاء مضافًا إلى نكرة أو جاء للتخصيص.

٢. من أحكام لفظ "كل" عند أهل اللغة والأصول أن "كل" لا تدخل إلا على ذي جزئيات وأجزاء، و مدلولها في الموضعين الإحاطة بكل فرد من الجزئيات أو الأجزاء.

٣. ومن أحكامها إذا أضيفت إلى نكرة ... فإنها تدل على العموم المستغرق لسائر الجزئيات، وتكون نصًا في كل فرد دلت عليه تلك النكرة ... وعند تطبيق هذا الحكم اللغوي الأصولي على

---

(١) "الاعتصام" (١/ ١٨٨).

(٢) "تحذير المسلمين" لأحمد بن حجر آل بوطامي البنعلي ص١٢٢.

الحديث "كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة" تجد أن "كل" أضيفت إلى نكرة وهو لفظ "بدعة" ... وعليه فلا يمكن أن تخرج أي بدعة من وصف الضلال ... ﴿كُلُّ ٱمْرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾ [الطور: ٢١]، ﴿وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ﴾ [الإسراء: ١٣]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ [البقرة: ٢٠]»[1].

واتە: وشەی (كل) بۆ گشتگیرەكانە، وە وشە گشتییەكان هەموو جۆرە تاكەكانی دەگرێتەوە و هیچ تاكێكی لێ دەرناچێت بێجگە لە بەڵگەی تایبەت نەبێت لەسەر لێدەركردنی.

## بەڵگە لەسەر ئەوەی گشتگیرە لە زمانەوانیدا:

**یەكەم:** وشەی (كل) لە وشە گشتییەكانە لە بەكارهێناندا، زانایانی زمان دەڵێن سوودمەندی ئەم وشەیە نەهێشتنی تایبەتمەندییە گەر بدرێتە پاڵ نادیارێك، یاخود بەكار بهێنرێت بۆ دڵنیابوون.

**دووەم:** لە یاساكانی وشەی (كل) لای زانایانی زمان و (أصول الفقه): وشەی (كل) ناچێتە سەر شتێك خاوەنی چەند پەل و بەش نەبێت، وە ماناكەی لەخۆگرتنی هەموو بەشەكانە.

**سێیەم:** یەكێكی تر لە یاساكانی: گەر بخرێتە پاڵ نادیارێك (نكرة) دەبێتە بەڵگە لەسەر لەخۆگرتنی هەموو سەرتاپا بەشەكانی، وە دەبێتە بەڵگە بۆ هەموو تاكەكانی ئەو نادیارە، گەر ئەم یاسا زمانەوانییە جێبەجێ بكەین لەسەر فەرموودەی: «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة»؛ دەبینین ئەم وشەیە (كل) خراوەتە پاڵ نادیارێك «بِدْعَة»، بەم شێوەیە هیچ بەشێكی داهێنراوی لێ دەرناچێت، وەكوو:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ [البقرة: ٢٠].

واتە: خوای گەورە بەسەر هەموو شتێكدا بالادەستە.

ئەمە ناشێت هیچ شتێكی لێ دەركرێت، وە هەروەها داهێنراویش بەو شێوەیە.

(أبو اسحاق الحويني) دەڵێت: «وهذا القول كقوله ﷺ: "كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ"، فكما أنه لم يدخل على كل مسكر خمر أي تخصيص؛ فكذلك ما دخل على "كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة" أي تخصيص»[2].

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ١٤٤). (٢) "البدعة وأثرها في محنة المسلمين" (٦/ ٧).

واتە: فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةً» سیٚ وشەیە، وەکوو فەرموودەی: «كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ» وایە کە سیٚ وشەیە، بە واتای: هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە، وەکوو چۆن تایبەت و لێدەرکردن نییە لە عەرەقدا؛ ئاواش تایبەتکردن نییە لە (بیدعە)دا، چ جیاوازییەك هەیە لە ڕێگرییەکان (محرمات)دا؟

زۆر جار ئەو شەرحەی ئیمامی (نەوەوی) ؒ دەکرێتە بەڵگە کە دەڵێت: «وَلَا يَمْنَعُ مِنْ كَوْنِ الْحَدِيثِ عَامًّا مَخْصُوصًا قَوْلُهُ كُلُّ بِدْعَةٍ مُؤَكَّدًا بِكُلِّ بَلْ يَدْخُلُهُ التَّخْصِيصُ مَعَ ذَلِكَ كَقَوْلِهِ تَعَالَى تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ»[1].

واتە: ڕێگری نییە لەوەی ئەم فەرموودەیە گشتییەکی تایبەتکراوە گەر بە (کل)یش دڵنیا کرابێت، بەڵکوو هەر تایبەتمەندی تێدەکەوێت، وەکوو فەرموودەی خوا ﷻ: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا﴾ [الأحقاف: ٢٥].

واتە: ئەو بایەی خوای گەورە بۆی ناردن هەموو شتێکی گەلی (عاد)ی لەناو نەبرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەس خەڵکەکانی لەناو برد، ماڵ و شوێنەوارەکانیان مایەوە.

کەواتە ئەو (کل)ە تایبەتمەندی لیٚ دەردەکرێت، واتە مەبەستی پێی بەس خەڵکەکە بووە و وشەی هەمووی (کل)یشی بەکار هێناوە.

لە بەرامبەر ئەم بۆچوونەشدا هەندێك لە زانایان تەفسیری ئەو ئایەتە هەر بە گشتی دەکەن بەبیٚ ئەوەی تایبەتمەندی تێدا جێگە بکرێتەوە، وەکوو (ابن كثير) ؒ لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەڵێت: «"تُدَمِّرُ" أَيْ: تُخَرِّبُ "كُلَّ شَيْءٍ" مِنْ بِلَادِهِمْ، مِمَّا مِنْ شَأْنِهِ الْخَرَابُ»[2].

واتە: هەموو شتێکی وڵاتەکەی لەناو برد ئەوەی شایەنی لەناوبردنە.

وە (الطبري) ؒ دەڵێت: «"تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا" مما أرسلت بهلاكه»[3].

---

(١) "شرح النووي على مسلم" (٦/ ١٥٥).

(٢) "تفسير القرآن العظيم" لابن كثير (٧/ ٢٨٦).

(٣) "جامع البيان في تأويل القرآن" للطبري (٢٢/ ١٢٩).

وە (القرطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «"تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا" أَيْ كُلُّ شَيْءٍ مَرَّتْ عَلَيْهِ مِنْ رِجَالِ عَادٍ وَأَمْوَالِهَا»[١].

واتە: هەموو ئەو شتانەی لەناو برد کە فەرمانی لەناوبردنی پێ کرابوو.

واتە هیچی لێ دەرنەکرد لەوانەی بەسەریدا ڕۆشتووە و فەرمانی پێ کراوە، نەك هەموو شتێکی دونیا و بوون فەرمانی پێ کرابێت بە لەناوبردنی، واتە وشەی (كل) هەر بە گشتی ماوەتەوە.

گەر ڕاکەی ئیمامی (نەوەوی) رَحِمَهُ اللَّهُ بکرێت بە بەڵگە؛ ئەوا ئەم ڕایانەش بەرامبەری هەیە، کە ئەمانە بۆخۆی بەرپەرچدانەوەیەکی قسەکاری (إجتهادي)یە، نزیکترین پێناسەی بۆ بکرێت ئەمە چوونە ناو بەڵگەکاری (متشابهات)ەوەیە، کە خۆپاراستن و دەرچوون لێی پێویستە، وە یەکلابوونەوە لە بەڵگەدایە.

**٦.** بڕیاردان لەسەر داهێنراوی چاك (البدعة الحسنة) کردنەوەی دەرگا و بوارە بۆ هێنان و بردنی داهێنانەکان و نەمانی هیچ پاراستن و سنوورێکە بۆ پاراستنی دین و دەرنەچوون لێی، گەر «سد الزرائع»[٢] کە بابەتێکی سەربەخۆیە بۆ پاراستنی حەڵاڵ و حەرام هەبێت؛ ئەوا پاراستنی دین لەپێشترە بە داخستنی دەرگای داهێنانی چاك، ڕێگە خۆشکردنە بۆ دوژمنانی دین و سوك و کزبوونی دینە لەناو دەروونی خەڵکیدا، گەر هەمووی بۆی هەبێت بەشداری بڕیاری چاك و خراپ بکات چی بۆ دین دەمێنێتەوە؟ وە هەر لەم ڕێگایەوە فیرەقە گومڕاکانی ناو ئیسلام دروست بوون، وەکوو: (معتزلة، خوارج، رافضة، مرجئة، ...)[٣].

**٧.** چ سەرچاوە و ڕێکخستنێك و پێوەرێك هەیە بۆ بەچاکزانینی داهێنراو؟

**گەر شەرع بێت دەڵێین: «يقال: إن ما ثبت حسنه فليس من البدع، فيبقى العموم محفوظا لا خصوص فيه»[٤].**

---

(١) "الجامع لأحكام القرآن" للقرطبي (١٦/ ٢٠٦).

(٢) "معالم أصول الفقه عند أهل السنة والجماعة" لمحمد الجيزاني (١/ ٣٠٤)، "الموافقات" للشاطبي (٥/ ٤٤١).

(٣) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ١٤٣)، و "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص١٩٣، و "تحذير المسلمين" لأحمد بن حجر آل بوطامي البنعلي ص١٢٣.

(٤) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٨٨).

واتە: ئەوەی یەکلا بووەوە کە چاکەیە ئەوە داهێنراو نییە؛ ئەوا دارِشتنە گشتیەکە (کل) لەسەر (بیدعە)کە خراپە، چونکە ئەو دارِشتنە تایبەتمەندی چاکەی تێدا نییە، لەبەرئەوەی شەرع هەموو چاکەیەکی بنیاد ناوە و نەیپەڕاندووە.

**وە گەر عیبادات بێت ئەوا:** «الأَصلُ في العِبَاداتِ التَّوقِيف».

واتە: بنەما لە پەرستندا وەستانە لەسەر بەڵگە.

**وە گەر عەقڵ بێت ئەوا:** عەقڵەکان جیاوازن و ڕێژەیین و هەریەکە کاری خۆی بە چاك دەزانێت، دەبێت پێوەر چی بێت؟!

کەواتە: «تقسيم البدعة إلى: حسنة وسيئة تقسيم محدث لا يدل عليه دليل شرعي»[(١)].

واتە: خۆی بۆ خۆی هەر دابەشکردنی داهێنراو بۆ چاك و خراپ دابەشکردنێکی بیدعەیە، هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە، وە باسی لەسەر نەکراوە، نە لە سەردەمی هاوەڵان و نە دوای ئەوان بەم شێوە ڕوون و دابەشکردنە.

**٨.** گەر دروست بێت زیادە لە دیندا بەناوی داهێنراوی چاکەوە؛ ئەوا دروستە بەچاکزانینی لێدەرکردنی شت لە دیندا بەناوی چاکەوە، لەبەر ئەوەی جیاوازی زیاد و کەم نییە، هەردووکیان دەستکاریکردنی دینە، بۆیە گەر لێدەرکردن گومڕایی بێت ئەوا زیادکردنیش گومڕاییە گەر بە هەر پاساوێکەوە بێت[(٢)].

**٩.** گەر لە شەرعدا داهێنانی چاك هەبێت؛ ئەوا ئێمەش داهێنانی واز لێهێنانی (البدعة الحسنة) دەکەین و بەچاکی دەزانین بۆ سەلامەتی دین و پاراستنی یەکڕیزی موسوڵمانان، ئەمە مایەی سوودمەندی دونیا و دینمانە[(٣)].

---

(١) "البدع وآثارها السيئة" لعبدالكريم مراد ص١٠١.

(٢) بڕوانە "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ١٤٣)، و "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص١٩٣، و "تحذير المسلمين" لأحمد بن حجر آل بوطامي البنعلي ص١٢٤.

(٣) بڕوانە "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ١٤٤)، و "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص١٩٣، و "تحذير المسلمين" لأحمد بن حجر آل بوطامي البنعلي ص١٢٥.

**١٠.** گەر بڕوانیتە ئەو داهێنراوانەی کە لـە ژێر ناونیشانی (البدعة الحسنة) دایانهێناوە وەکوو (مەولود، سڵاواتی دوای بانگ، قەبر هەڵبەستن و هاوار لێکردن و ...)، بەڵام نوقمبوونی موسوڵمانان لـە شیرك و هەوا و ئارەزوو و کاڵبوونەوەی دین و ونبوونی ڕێگە ڕاستەکە ... بەسە بۆ خراپ زانینی.

گەر ئەم جۆرە قسەکردن و دابەشکردنە خێر و حەق بوایە؛ ئەو هەموو بەتاڵەی بەدوای خۆیدا نەدەهێنا، «والحق لا يلزمه الباطل وإنما يلزم الباطل الباطل، فدل على أن القول بالبدعة الحسنة في الإسلام باطل»[(١)].

واتە: حەق بەتاڵ و خراپ بەدوای خۆیدا ناهێنێت، بەڵکوو بەتاڵ بەتاڵ و ناحەق بەدوای خۆیدا دەهێنێت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە داهێنراوی چاك لـە ئیسلامدا نییە و بەتاڵە، لەبەرئەوەی ئەم جۆرە قسەکردن و دابەشکردنە ئەو هەموو بیدعە و خراپەیەی کردەوە بۆ خەڵك.

**١١.** «حمل لفظ البدعة على معناه الشرعي لا يحتاج إلى وجود قرينة، بل الذي يحتاج إلى القرينة إنما هو حمل لفظ البدعة على معناه اللغوي»[(٢)].

واتە: ناوبردن و باسکردنی وشەی (بیدعە) لەسەر مانا شەرعییەکەی پێویستی بە بەڵگە و پاڵپشت نییە، بەڵکوو ئەوەی پێویستی بە پاڵپشت و شیکردنەوە هەیە ئەوەیە کە ماناکەی بگێڕێتەوە بۆ سەر زمانەوانی.

بەڕاستی ئەو دوودڵی و هێنان و بردنە کە لای دابەشکاران هەیە لای ڕێگران لـە دابەشکردنیدا نییە، وە سەرەتا نووسینی دابەشکاران بڵاو بووەوە لەسەر دەستی (عز بن عبد السلام) ﷬، کە ساڵی (٦٦٠)ی کۆچی وەفاتی کردووە، تا ئەو مێژووە ئەم دابەشکردنە نەبووە، کە دەکاتە شەش سەد ساڵ و نیو لـە دوای هاتنی ئیسلام[(٣)].

**١٢.** «لا يصح أن يقال: إن لفظ البدعة أصبح من الألفاظ المجملة فقد يراد به المعنى اللغوي وقد يراد به المعنى الشرعي ، لأنه قد ورد في الكتاب والسنة بكل هذين المعنيين ، وذلك

---

(١) "تحذير المسلمين" لأحمد بن حجر آل بوطامي البنعلي ص١٢٦.

(٢) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٣٢.

(٣) "كل بدعة ضلالة" لعلوي بن عبد القادر السقاف ص٢٩.

لأن لفظ البدعة من الألفاظ الشرعية التي نقلها الشارع من معناها اللغوي إلى معناها الشرعي، وقد تقرر أن الأصل في ألفاظ الشريعة عند إطلاقها إرادة المعنى الشرعي دون المعنى اللغوي، وكثرة وروده دون قرينة ... بل إن حمل لفظ البدعة وصرفه إلى المعنى اللغوي يتوقف على وجود القرينة لأنه نوع من تأويل، ولا بد للتأويل من قرينة ودليل»[١].

واتە: ڕاست نییە بوترێت وشەی (بیدعە) لە وشە کورتە نادیارەکانە لە ڕووی ماناوە، دەشێت مەبەستی ڕووە زمانییەکەی بێت یان ڕووە شەرعییەکەی، لەبەرئەوەی بە هەردوو شێوەکە هاتووە لە قورئان و فەرموودەدا، بۆیە وا ناوترێت، بەڵکوو وشەی (بیدعە) وشەیەکی شەرعییە کە شەرع لە زمانەوانییەوە ماناکەی گۆڕیوە بۆ مانا شەرعییەکەی، بنەماش لە بەکارهێنانی وشە شەرعییەکاندا بە شێوەی گشتی مەبەست پێی مانا شەرعییەکەیە بێ لە مانا زمانەوانییەکەی، لەبەر زۆر هاتنی بەبێ پاڵپشتی مانایی، وە گەر مانا بکرێت (بیدعە) بە ڕووە زمانییەکەی ئەوا پێویستی بە بەڵگە و پاڵپشت هەیە، لەبەر ئەوەی جۆرێکە لە مانا گۆڕین، ئەم جۆرەش پێویستی بە بەڵگە هەیە.

١٣. ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «أَنَّ الْمُسْتَحْسِنَ لِلْبِدَعِ يَلْزَمُهُ عَادَةً أَنْ يَكُونَ الشَّرْعُ عِنْدَهُ لَمْ يَكْمُلْ بَعْدُ، فَلَا يَكُونُ لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ [المائدة: ٣]؛ مَعْنًى يُعْتَبَرُ بِهِ عِنْدَهُمْ، وَمُحْسِنُ الظَّنِّ مِنْهُمْ يَتَأَوَّلُهَا حَتَّى يُخْرِجَهَا عَنْ ظَاهِرِهَا»[٢].

واتە: بە چاکزانینی داهێنراوەکان وا دەگەیەنێت کە شەرعی خوا تەواو نەبووە، وە فەرموودەی خوا کە هەواڵ بە تەواوکردنی دین دەدات بەوەی کە دەفەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ [المائدة: ٣] هیچ مانا و بایەخێکی نییە لایان، وە باشترین کەسی گومانپێکراویان ماناکاری وای بۆ دەکات تا لە ڕووەکەی خۆی دەیگۆڕێت.

لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا لَا يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلَّا هَالِكٌ»[٣].

---

(١) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٣٢.

(٢) "الاعتصام" (١/ ١٤٧).

(٣) رواه ابن ماجة (٤٣) وقال (شعيب الأرنؤوط): حديث صحيح، وسبق تخريجه ص٤٠.

واتە: بەجێم هێشتوون لەسەر ڕووناکییەك شەوی وەکوو ڕۆژی وایە، لەدوای من کەسی لەسەر گومڕا نابێت بێجگە لە تیاچوو نەبێت.

**١٤.** پێغەمبەری خوا ﷺ زاناترین و کاملترین کەسە بەسەر حەقدا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «وَاللهِ، إِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَخْشَاكُمْ للهِ، وَأَعْلَمَكُمْ بِمَا أَتَّقِي»[(١)].

واتە: سوێند بە خوا ئاواتم ئەوەیە لە هەمووتان لەخواترس بم و زاناترینتان بم بە خواپەرستیدا.

وە لە حەجدا بە خەڵکی فەرموو: «أَبِاللهِ تُعْلِمُونِي أَيُّهَا النَّاسُ؟ قَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّي أَتْقَاكُمْ للهِ وَأَصْدَقُكُمْ وَأَبَرُّكُمْ، افْعَلُوا مَا آمُرُكُمْ بِهِ»[(٢)].

واتە: سوێندتان دەدەم بە خوا ئێوە من فێر دەکەن؟! خۆتان دەزانن من لە هەمووتان خواناسترو ڕاستگۆترو چاکترم، ئەوەی فەرمانتان پێدەکەم بیکەن.

وە خوای پەروەردگاریش وەصفی دەکات بە لانەدان لە ڕاستی و حەق پێکاندن و دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝﴾ [النجم: ٣ - ٤].

واتە: قسەیەك ناکات بە حەز و ئارەزووەکانی خۆی، بەڵکوو وەحییە لای خواوە.

هاوەڵان بە (عبد الله ی کوڕی عەمر)یان وت: تۆ هەموو شتێك دەنووسی لە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەو ئادەمیزادە قسە دەکات لە توڕەبوون و ڕازیبووندا، (عبد الله) ش وتی: لە نووسین وەستام تا بۆ پێغەمبەرم باس کرد، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی کرد بۆ دەمی بە پەنجەی و فەرمووی: «اكْتُبْ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ: مَا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلَّا حَقٌّ»[(٣)].

واتە: بنووسە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچی لێوە دەرناچێت بێجگە لە حەق نەبێت.

---

(١) رواه مسلم (١١١٠)، وأبو داود (٢٣٨٩)، والنسائي في "الكبرى" (٣٠١٣)، وأحمد (٢٤٣٨٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٤٩٥)، ومالك في "الموطأ" (١٠١٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٠١٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٧٩٨٩)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٧٦٦).

(٢) رواه البخاري (٧٣٦٧)، و مسلم (١٢١٦)، وفي "إرواء الغليل" للألباني (٤/ ٢٠٤)، و "حجة النبي ﷺ" للألباني ص٦٤.

(٣) رواه أبو داود (٣٦٤٦)، وأحمد (٦٨٠٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٦٤٢٨)، والطبراني في "الكبير" (١٤٢٦٤)، وابن عبدالبر في "الجامع" (٣٨٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٥٣٢)، و "صحيح الجامع الصغير" (١١٩٦).

وە یەکێك لەو شەش بەخشینەی کە بە پێغەمبەر ﷺ دراوە و بە پێغەمبەرانی تر عليهم السلام نەدرابێ ڕەوانبێژی و قسەی کورت و پڕ مانایە، وەك دەفەرموێت: «فُضِّلْتُ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ، ...»[١]، «أُعْطِيتُ فَوَاتِحَ الْكَلِمِ وَخَوَاتِمَهُ»[٢].

واتە: ڕەوانبێژی و شارەزابوون بە سەرەتاو کۆتایی قسەم پێ بەخشراوە.

پێغەمبەرێك ﷺ بەو کاملّییە لە هەموو بوارەکانی دین و گەیاندن و پێکاندن و بەرزترین پلەی دارِشتندا کە فەرموودەکانی سێبەری قورئانە بفەرموێت: «وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»[٣].

واتە: ئاگادار بن و خۆتان بپارێزن لە کارە دروستکراوەکان، هەموو دروستکراوێك داهێنراوە و هەموو داهێنراوێك گومڕاییە.

تۆ بڵێیت بڵێیت نەخێر هەمووی گومڕایی نییە، بەڵکوو تەنانەت نەك گومڕایی نییە بگرە هەندێکی چاك و خێرە! ئەمە بەرپەرچدانەوە و بەرامبەرکێیەتی نییە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ؟! کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ [النور: ٦٣].

واتە: با خۆیان بپارێزن ئەوانەی فەرمانی ئەو ﷺ دەشکێنن، تا تووشی بەلاّ و سزایەکی سەخت نەبنەوە، وە با بترسێت و خۆی بپارێزێت لەوانەی پێچەوانەی ڕێگاکەی و بەرنامەکەیەتی و دژایەتی شەریعەتەکەیەتی[٤].

وە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟﴾ [النور: ٥٤].

واتە: گەر گوێڕایەڵی بکەن هیدایەتدراون.

---

(١) رواه مسلم (٥٢٣)، والترمذي (١٥٥٣)، وأحمد (٩٣٣٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٣١٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٤٢٦٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤٤١)، والآجري في "الشريعة" (١٠٤٧).

(٢) رواه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٩٩٦)، وأبو يعلى في "المسند" (٧٢٣٨)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٤٨٣).

(٣) رواه ابن ماجه (٤٢) وقال (شعيب الأرنؤوط): حديث صحيح بطرقه وشواهده، وسبق تخريجه ص٤٤.

(٤) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٨٨).

ئەم بابەتە بە هەموو شێوەیەکی ڕێزمانی و ڕەوانبێژی بەستوویەتییەوە و ڕێی لێ گرتووە.

وەك: **(إياكم)**: شێوازی ئاگادارکردنەوەیە بە نەکردن، واتە: (ئاگادار بن).

**(محدثات)**: دروستکراوەکان، بە کۆ ناوی بردووە.

**(كُل)**: بەهێزترین وشەی شێوە گشتییە لەسەر دەربڕین بۆ گرتنەوەی هەموو بەشەکانی گشتی (أقوى ألفاظ العموم في الدلالة على العموم)[(١)].

کە **(بعض)** هەندێکی تێدا جێگا نابێتەوە، پاشان ناونیشانێکی دینی (بدعة) بە نادیار (نكرة) هاتووە لە دیندا، لێتێکچوونی ڕێگایە، وە نەدۆزینەوەیەتی وەکوو چۆن خوای گەورە گاوورەکان بە (الضالين) ناو دەبات، گاورەکانیش لە هەموو زیاتر بێ زانستی دینی بوون و پڕ لە داهێنراو بوون، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ﴾ [الحديد: ٢٧]. گۆشەگیری و خەمبارییەکیان دروست کرد، خوای گەورە زەمیان دەکات بە دوو شێوە:

**یەکەم:** داهێنراو لە دینی خوادا.

**دووەم:** پەیوەستنەبوون پێوەی و دانانی بە عیبادەت[(٢)].

پاشان «وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ» هەڕەشەی سزادانە بە ئاگر، وە بە شێوەی جیاوازتریش: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»[(٣)]، «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»[(٤)].

ئەبێت لەم شێوازانە زانستی تر و بەهێزتر هەبێت بۆ شیکردنەوە لەسەر ڕێگری لە بیدعە و ترسناکییەکانی؟!

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وإن كل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار، والتحذير من الأمور المحدثات: فهذا نص رسول الله ﷺ، فلا يحل لأحد أن يدفع دلالته على ذم البدع، ومن نازع في دلالته فهو مراغم ... فإن هذا إلى مشاقة الرسول أقرب منه إلى التأويل»[(٥)].

---

(١) "مجموعة الفوائد البهية" لصالح القحطاني ص١٠٦، و "المهذب في علم أصول الفقه" لعبدالكريم النمله (٤/ ١٤٩٣).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٦١).

(٣) رواه البخاري (٢٦٩٧)، ومسلم (١٧١٨) واللفظ له، وسبق تخريجه ص٤٥.

(٤) رواه مسلم (١٧١٨)، وسبق تخريجه ص٤٦.

(٥) "إقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٩٣).

واته: فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر بیدعە دەقێکن کەس بۆی نییە بەڵگەکارییەکەی لەسەر خراپی بیدعە لابدات، ئەوەی ئەمە بکات ئەوا دووبەرەکایەتیکار و لوت شکاوە، ... ئەمە لە دژایەتی پێغەمبەرەوە ﷺ نزیکترە تاوەکوو شەرح و شیکردنەوەی زانستی.

**١٥.** گەر تایبەتکردن دروست بکرێت لەم فەرموودەیەدا بەناوی چاکەوە و بەڵگەکاری بۆ بکرێت؛ ئەوە وەڵام بۆ ئەمە (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «إن ما ثبت حسنه فليس من البدع، فيبقى العموم محفوظا لا خصوص فيه.

وإما أن يقال: ما ثبت حسنه فهو مخصوص من العموم، والعام المخصوص دليل فيما عدا صورة التخصيص، فمن اعتقد أن بعض البدع مخصوص من هذا العموم، احتاج إلى دليل يصلح للتخصيص، ... فلا يجوز حمل قوله ﷺ: "كل بدعة ضلالة" على البدعة التي نهى عنها بخصوصها؛ لأن هذا تعطيل لفائدة هذا الحديث، ... وصار وصف البدعة عديم التأثير، لا يدل وجوده على القبح، ولا عدمه على الحسن، ... وهذا تعطيل للنصوص من نوع التحريف والإلحاد، وليس من نوع التأويل السائغ، وفيه من المفاسد أشياء:

**أحدها**: سقوط الاعتماد على هذا الحديث، فإنما علم أنه منهي عنه بخصوصه، فقد علم حكمه بذلك النهي، وما لم يعلم لا يندرج في هذا الحديث، فلا يبقى في هذا الحديث فائدة! مع كون النبي ﷺ كان يخطب به في الجمع، ويعده من جوامع الكلم.

**الثاني**: أن لفظ البدعة ومعناها يكون اسما عديم التأثير.

**الثالث**: أن الخطاب بمثل هذا، إذا لم يقصد إلا الوصف الآخر - وهو كونه منهيا عنه - كتمان لما يجب بيانه، وبيان لما لم يقصد ظاهره، ... إذ ليس كل بدعة عنها نهي خاص، وليس كل ما فيه نهي خاص بدعة، فالتكلم بأحد الاسمين وإرادة الآخر تلبيس محض، لا يسوغ للمتكلم، إلا أن يكون مدلسا.

الرابع: أن قوله «كل بدعة ضلالة»، وإياكم ومحدثات الأمور، إذا أراد بهذا ما فيه نهي خاص، كان قد أحالهم في معرفة المراد بهذا الحديث على ما لا يكاد يحيط به أحد، ولا يحيط بأكثره إلا خواص الأمة، ومثل هذا لا يجوز بحال.

الخامس: أنه إذا أريد به ما فيه النهي الخاص، كان ذلك أقل مما ليس فيه نهي خاص من البدع، فإنك لو تأملت البدع التي نهى عنها بأعيانها، وما لم ينه عنها بأعيانها، وجدت هذا الضرب هو الأكثر، واللفظ العام لا يجوز أن يراد به الصور القليلة أو النادرة.

فهذه الوجوه وغيرها: توجب القطع بأن هذا التأويل فاسد، لا يجوز حمل الحديث عليه، سواء أراد المتأول أن يعضد التأويل بدليل صارف، أو لم يعضد، فإن على المتأول بيان جواز إرادة المعنى الذي حمل الحديث عليه»[1].

واته: ئەوەی چاك و خێرە داهێنراو نییە، وە گەر چاك و خێر بێت ئەوە تایبەتکراوە لەم گشتییە، وە بەدەر لەم تایبەتییە هەر بە گشتی دەمێنێتەوە، ئەم تایبەتکردنە پێویستی بە بەڵگەیەکی تایبەتکارە، ئەم فەرموودەیە «كل بدعة ضلالة» ناکرێتە بەڵگە لەسەر قەدەغەکراوەکان بە بەڵگەی تایبەت، ئەمە هۆکاری لەکارخستنی سوود و وتنی فەرموودەکەیە، وە لەلایەکی تریشەوە وشەی (بیدعە) بێ کاریگەر دەمێنێتەوە، بوونی بەڵگە نابێت لەسەر خراپ و نەبوونی نابێتە بەڵگە لەسەر چاك، ئەمە لەکارخستنی دەقەکانە و گۆڕانکاری بێبڕواییە لە جۆری دەقەکاندا، نەك جۆرێکی شەرح و شیتەڵکردنەوەی گونجاو بێت، وە ئەم خراپانەش لەخۆ دەگرێت:

**یەکەم:** لەکارخستنی پشتبەستن بە فەرموودەکە، لەگەڵ ئەوەشدا بەم فەرموودەیەدا دەزانرێت داهێنراو قەدەغەیە بە تایبەت وە حوکمەکەشی بەو بەڵگەیە دەزانرێت، وە ئەوەشی نەزانرێت ناچێتە بواری ئەم فەرموودەیەوە، کەواتە سوودی ئەم فەرموودەیە نامێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری هەموو جومعەیەکی پێدەدا و بە فەرموودە پڕماناکانی دادەنرێت.

**دووەم:** وشەی (بیدعە) و ماناکەی ناوێکی بێ کاریگەر دەبێت.

---

(١) "إقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٨٨ - ٩٢).

**سێیەم:** گەر وشەی (بیدعە) تەنها بۆ قەدەغە کراوەکان بێت ئەوا شاراوەتەوە ئەوەی پێویستە ڕوون بکرێتەوە، وە ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەوەی مانا ڕووکەشەکەی مەبەستی نییە، هەموو (بیدعە)یەك فەرمانێکی نەکردنی لەسەر نییە، وە هەموو فەرمانێکی نەکردن تایبەتیش بیدعە نییە، قسەکردن بە یەکێك لە ماناکان و مەبەست پێی مانایەکی تر بێت شاردنەوەی تەواوە، قسەکەر لەم کاتەدا تێکەڵکارە.

**چوارەم:** «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة» گەر مەبەست پێی ئەو بیدعانە بێت کە بەتایبەت ڕەد دراونەتەوە؛ ئەوا بۆ زانینی ئەم فەرموودانە و مەبەستەکانی کەس نابێت هەموو نەهییە تایبەتەکان بزانێت، بێجگە لە کەسانی تایبەت نەبێت لەم گەلەدا، ئاگاداربوون بەسەر ئەمانەدا لەناو زانایانیشدا زۆر تایبەتە، ئەمەش نابێت مانای ئەم فەرموودەیە بێت بە هیچ شێوەیەك.

**پێنجەم:** گەر مەبەست پێی بیدعە دیاریکراوەکان بێت کە بە تایبەت دەقی لەسەرە؛ دەبینین کەمترە لەچاو ئەو داهێنراوانەی کە دەقی لەسەر نییە، کەواتە نابێت مەبەست بە وشە گشتییەکان چەند شێوەیەکی تایبەت بێت، یا دەگمەن بێت، بەم شێوانە بۆمان دەرکەوت ئەو جۆرە ماناکردنە بۆ فەرموودەی «كل بدعة ضلالة» کە یا چاکەکانە یا بیدعە ناوبراوە تایبەتەکانە کە گومڕایین، بۆچوونێکی هەڵەیە ناشێت مانای فەرموودەکەی لەسەر بێت، گەر بە هەر شێوەیەك مانای بۆ دروست بکات.

**حەوتەم:** وتە و ڕاوبۆچوونی زانایان لەسەر دابەشکردنی داهێنراو:

پێش ئەوەی بچینە سەر وتەی زانایان چەند بنەمایەکی شەرعی[1] پێویستە بخرێتە ڕوو:

١. ڕووکەشی دەقە شەرعیەکان ڕەچاو دەکرێت و مایەی کارپێکردنە، بە مەرجێك هیچ بەڵگەیەك نەبێت لە ڕووکەش لای بدات، دەقە شەرعییەکانی دژ بە بیدعە لەم شێوەیەدان، لانادرێت لە ڕووکەشی خۆیان.

٢. وتارە شەرعییەکان لە چەند پلەیەکدان، بەرزترینیان پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە و نزمترینیان پێویستی بە شیکردنەوەیەکە بۆ ڕەواندنەوەی کورتەکەی، دەقەکانی پشتبەستن بە

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٤٣٠)، بۆ سەیرکردنی خاڵی (٢، ٣، ٤) بڕوانە "الرسالة الإمام الشافعي" ص٢١ - ٣٥، ١٥٠ - ١٥٦، ٥٧٦.

سوننەت و دوورکەوتنەوە لە داهێنراو لە جۆری بەرزترینیانە، کە پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە.

**٣.** پێویستە لەسەر زانایان و فەتوادەران کار و یاسا بە ڕووکەشی بەڵگەکان بکەن، بۆیان نییە داهێنانی یاسا و دابەشکردنێك بکەن بنەمای نەبێت لە قورئان و سوننەت و کۆدەنگ (الإجماع)دا.

**٤.** هیچ قسە و کار و تێگەیشتنێك پشتی پێ نابەسترێت لە هەرکەسێکەوە بێت کە دژایەتی دەقەکان بکات، هیچ کەسێك بەڵگە نییە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، چ جای ئەوەی دژ بێت، وە بە بەڵگەبوون و بێ کەم و کورتی و پارێزراوی (معصومية)یش نەدراوە بە بێجگە لە (قورئان و فەرموودە).

بەم خاڵانە کێش و هێزی وتەی زانایانمان بۆ ڕوون بووەوە لە خزمەتکردنی دیندا، ئەوکات بەم پێشەکییە با تیڕوانینێکی وتەی زاناکان دەربارەی دابەشکردنی داهێنراو بۆ چاك و خراپ بکەین، گەر تیڕوانینەکە بە شێوەیەکی مەنهەجی و مێژوویی بێت ئەوا دەبن بە سێ بەشەوە[1]:

**بەشی یەکەم:** زانایانێك پلەوپایە و زانستیان و پێشەوایەتییان ناسراوە و ئاشکرایە، وە زانایان کۆدەنگن لەسەر بەرنامە پاکی و خۆشەویستییان بۆ سوننەت و دژایەتیکردنی (بیدعە) و تێوە نەگلانیان پێوەی، وەکوو ئیمامی (الشافعي والخطابي والقاضي عياض والنووي وابن حجر العسقلاني وابن حزم وعز بن عبدالسلام وابن العربي المالكي وابن الجوزي وابن الأثير وأبو شامة المقدسي، ...).

**بەشی دووەم:** جۆرێکی تر لەو زانایانەی ئەم دابەشکردنانەیان لێ وەشاوەتەوە خاوەنی پلەوپایەی زانستی و ئیمانییەکی پڕ چاکە و خواناسین، لەگەڵ خۆشەویستییان بۆ سوننەت و دژایەتیکردنی داهێنراوەکان بە شێوەیەکی دیار، بەڵام خۆبینینەوەیان لە چوارچێوەی شوێنکەوتەی مەزاهیبدا و ڕۆنەچوون و هەوڵنەدان لە بەدواداچوونی زانستی (التحقيق العلمي) و کاریگەری مامۆستا و بەرنامەی مەدرەسەکانیان هۆکاری کەوتنە ناو ئەم جۆرە بابەتانەوە بووە، وەکوو (الهيثمي، القرافي، السيوطي، السخاوي) زانایانی مەزاهیب بە گشتی پێیان دەوترێت (العلماء المتأخرين).

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٤٢٩).

**بەشی سێیەم:** ئەوانەی ناودار و بزوێنەری بابەتە بیدعییەکان و ڕێڕەوی زانستییان نییە بێجگە لە ناودارییان لە بەرنامەکانی تەسەوف بەتایبەت فەلسەفی و ئەشعەرییەت و پشتیوانی لە هەموو بەرنامەی تێکەڵی فیرەق و تەقلیدی مەزاهیبەکاندا نەبێت، قسەمان لەسەر بەشی یەکەم و دووەمە لە زانایاندا، سێیەمیان شایستەی پشتگوێ خستنە.

گەرچی لە بەشی یەکەم و دووەمیش خۆی بۆخۆی دەبنە دوو بەشی سەرەکی، (علماء المتقدمين، وعلماء المتأخرين) زانایانی پێشووان: کە ئەمانە کامڵی و تۆکمەیی بەرنامەی زانستی پڕ لە ووردبوو و پەیوەستی بە دەقە شەرعییەکان و خۆنەدان بەدەستەوە و دەرگانەکردنەوەی بابەتە هەستیارەکان پیشە و ڕێڕەوی زانستییان بووە، بە پێچەوانەی زانایانی دوای ئەوان ئەو توندوتۆڵی و دووربینیانەیان تێدا بەدی ناکرێت و کاریگەری مەزاهیب و مەدرەسە و تەقلید و گرنگیدان بە ڕاوبۆچوونەکانی زانایان بەبێ پشتیوانی بەڵگە و کورتکردنەوەی ڕێگاو نەچوونەوە سەر سەرچاوەی بوارە زانستیەکەیان کاریان بووە، یەکێك لەو ئاڵۆزی و سەرئێشانەی ئێمە تێی کەوتووین لە دابەشکردنی بیدعە و پێناسە و زۆر قسەکردنانە لەسەری هۆکاری (علماء المتأخرين)ە ئەم کۆمەڵە زانایانە بووە، بۆیە هەر لە کۆنەوە وتراوە:

وكلُّ خيرٍ في اتباعِ مَنْ سَلَفْ ... وكلُّ شرّ في ابتداع مَن خَلَفْ[1].

واتە: هەموو خێرێك لە شوێنکەوتەی پێشینە ساڵحەکانە، وە هەموو شەڕێك لە داهێنراوی پاشکۆیانە.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «أَنَّ طَرِيقَةَ السَّلَفِ أَعْلَمُ وَأَحْكَمُ وَأَسْلَمُ وَأَهْدَى إِلَى طَرِيقِ الأَقْوَام»[2].

واتە: ڕێگەی پێشینی صاڵح زاناتر و قایمکارتر و سەلامەتتر و هیدایەتترە بۆ ڕێگەی ڕاست و دروست.

---

(١) "شرح أصول اعتقاد" للالكائي (١٨/ ١٣)، و "منهج الأشاعرة في العقيدة" للحوالي (١/ ٩٣)، و "شرح الميسر للقواعد الأربعة" للحازمي (٢/ ٢٧)، و "التوضيح الرشيد في شرح التوحيد" لخلدون بن محمود (١/ ٢١٤)، و "اتباع لا ابتداع" لحسام الدين بن عفانة ص٩٨.

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٥/ ٣٧٩).

بۆچوونی زانایانی بەشی یەکەم لە دابەشکردنی داهێنراو بۆ دوو بەش؛ هەموویان بە شێوەیەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونەکەی ئیمامی (شافعی) رحمه الله، کە دەتوانرێت بڵێین پێشەنگە لەم دابەشکردنەدا، وە ئەوانەی لە دوای ئەوەوە هاتوون شوێنکەوتەین[1]، وە زۆری ئەوانەیش کە پشت دەبەستن بەم دابەشکردنە تەنها ناوی ئیمامی (شافعی) دەبەن، بەبێ شوێنکەوتووانی دوای ئەو، کەواتە پێویست دەکات قسەکەی (شافعی) رحمه الله بە تەواوی بنووسینەوە کە دەبێتە کورتەی قسەی هەمووان لەم دابەشکردنەدا:

أ. مَا رَوَاهُ أَبُو نُعَيْم بِسَنَدِهِ عَن الشَّافِعِي أَنَّهُ قَال: «الْبِدْعَةُ بِدْعَتَانِ بِدْعَةٌ مَحْمُودَةٌ، وَبِدْعَةٌ مَذْمُومَةٌ. فَمَا وَافَقَ السُّنَّةَ فَهُوَ مَحْمُودٌ، وَمَا خَالَفَ السُّنَّةَ فَهُوَ مَذْمُومٌ، وَاحْتَجَّ بِقَوْلِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ: نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هِيَ»[2].

واتە: داهێنراو دووانە: داهێنراوی چاك و خراپ، ئەوەی گونجا لەگەڵ سوننەت ئەوە چاکە، ئەوەی نەگونجا ئەوە خراپە، بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئیمامی (عومەر).

ب. عَن الرّبيع بن ميلمن قَالَ: قَالَ الشَّافِعِي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: «المحدثات من الْأُمُور ضَرْبَان أَحدهمَا مَا أحدث يُخَالف كتابا أَو سنة أَو أثرا أَو إِجْمَاعًا فَهَذِهِ الْبِدْعَة الضَّلَالَة وَالثَّانِي مَا أحدث من الْخَيْر لَا خلاف فِيهِ لوَاحِد من هَذَا فَهَذِهِ محدثة غير مذمومة وَقَدْ قَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ يَعْنِي أَنَّهَا مُحْدَثَةٌ لَمْ تَكُنْ وَإِذَا كَانَتْ فَلَيْسَ فِيهَا رَدٌّ لِمَا مَضَى»[3].

واتە: دروستکراوەکان دوو جۆرن: دروستکراوێك پێچەوانەی قورئان و فەرموودە و پاشماوە و کۆدەنگە، ئەمە داهێنراوێکی گومڕاییە، ئەو دروستکراوانەشی کە پێچەوانەی یەکێك نییە لەوانە ئەوە خراپ نییە، وەك ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه وتی: «نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ» باشترین داهێنراو ئەمەیە.

---

(١) "ضوابط البدعة وقواعد الأصولية والفقهية" لنزيه محمود عفون ص١٧.

(٢) رواه أبو نعيم في "الحلية" (٩/ ١١٣)، وابن رجب في "جامع العلوم" ص٢٥٣، وابن حجر في "الفتح" (١٣/ ٢٥٣)، والسيوطي في "الأمر بالاتباع" ص٣٧، وفي "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٤٣١).

(٣) رواه ابن عساكر في "تبيين كذب المفتري" (٩٧)، والذهبي في "السير" (١٠/ ٧٠)، والسيوطي في "الحاوي" (١١/ ١٩٢)، والبيهقي في "مناقب الشافعي" (١/ ٤٩٦).

**قسەکەی ئیمامی (شافعی) رحمه الله نابێتە پێچەوانە، یا تایبەتکردنی فەرموودەکە «کل بدعة ضلالة»، بەم ڕوونکردنەوانە[(١)]:**

**١. قسەکەی ئیمام دەبێتە دوو برگە: (الْبِدْعَةُ المَحْمُودَةُ، وَالْبِدْعَةُ الْمَذْمُومَةُ)، داهێنراوی چاك بەوە پێناسە دەکات بە گونجاو لەگەڵ سوننەتدا، وەکوو دەڵێت: (مَا وَافَقَ السُّنَّةَ)، (وَلَمْ يُخَالَفُ فِيهِ لِوَاحِدٍ) یا دژایەتی هیچ یەکێك لە بەڵگەکان نەکات، کەواتە مەبەستی پێی ئەو (وسیلة) و ڕێگا و هۆکارە دونیاییانەیە بگیرێتە بەر بۆ سوودمەندییە دینییەکان، ئەمانە وەکوو: (مَصْلَحَةُ الْمُرْسَلَة، مَا لَا يَتِمُّ الْوَاجِبُ إِلَّا بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)[(٢)]، تەواوکاری کارە واجبەکان وەکوو: کۆکردنەوەی قورئان و نووسینەوەی فەرموودە و زانستە شەرعییەکان، بە بەڵگەی ئەوەی ئیمام ئەمانەی مەبەستە، لە کۆتایی قسەکاندا نموونە بە فەرموودەکەی ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه بۆ تەراویح دێنێتەوە: «نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ»، کە ئەمە بنەمادار و پشتگیرکراوی بەڵگەی هەیە، وە داهێنراوی خراپ بە (مُخالف السنّة) یا (يُخَالف كتابا أَو سنة أَو أثرا أَو إِجْمَاعًا) پێچەوانە و دژبەیەکێك لەو جۆرە بەڵگانە ناو دەبات، ئەمە بۆ خۆی مەبەست پێی بیدعەی شەرعییە، هیچ بەڵگەیەك پشتگیری ناکات و گومڕاییە.**

**٢. وە مەبەستی لە بەکارهێنانی وشەی (البدعة) بۆ خۆی ناوێکی خراپ و زەمە لە دیندا و خستنە پاڵ چاکەوە (محمودة) ئەوە ناگەیەنێت مەبەست پێی ڕووە شەرعییەکە بێت بە شێوەیەکی گشتی بۆ پێچەوانە دینییەکان، بەڵکوو مەبەست پێی ڕووە زمانییەکەیە وەکوو ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه بەکاری هێناوە.**

**وەکوو (ابن رجب) رحمه الله دەڵێت: «وَمُرَادُ الشَّافِعِيِّ رَحِمَهُ اللهُ: أَنَّ الْبِدْعَةَ الْمَذْمُومَةَ مَا لَيْسَ لَهَا أَصْلٌ مِنَ الشَّرِيعَةِ يُرْجَعُ إِلَيْهِ، وَهِيَ الْبِدْعَةُ فِي إِطْلَاقِ الشَّرْعِ، وَأَمَّا الْبِدْعَةُ الْمَحْمُودَةُ فَمَا وَافَقَ السُّنَّةَ، يَعْنِي: مَا كَانَ لَهَا أَصْلٌ مِنَ السُّنَّةِ يُرْجَعُ إِلَيْهِ، وَإِنَّمَا هِيَ بِدْعَةٌ لُغَةً لَا شَرْعًا»[(٣)].**

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٤٣٢).

(٢) "الأشباه والنظائر" للسبكي (١/ ١٢٠)، و "شرح القواعد الفقهية" لأحمد الزرقا ص٤٨٦.

(٣) "جامع العلوم والحكم" (٢/ ١٣١).

واتە: مەبەستی (شافعی) رَحِمَهُ اللَّهُ لە داهێنراوی خراپ بێ بنەمای شەرعییە؛ ئەوە بیدعەیە بە بەکارهێنانە شەرعییەکەی، وە داهێنراوی چاك گونجاوە لەگەڵ سوننەتدا و بنەمادارە؛ ئەوە بیدعەی زمانەوانییە نەك شەرعی.

**٣**. دەبێت قسەی ئەم ئیمامە لە چوارچێوەی قسەکانی تریدا بخوێنرێتەوە بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی بەرنامە و بۆچوونە زانستییەکانی، ئیمام توندوتیژترین کەس بووە لە تێکەڵکردنی دین بە بەچاکزانینە عەقڵییەکان و قسەکردن بەبێ بەڵگە، وەك دەڵێت: «حراماً على أحد أن يقول بالاستحسان إذا خالف الاستحسانُ الخبر»[١]، «وإنما الاستحسان تلذُّذ»[٢]، «مَنِ اسْتَحْسَنَ فَقَدْ شَرَّعَ»[٣].

واتە: حەرامە لەسەر یەکێك بڕیاری بەچاکزانین بدات گەر دژایەتی بەڵگەکان بوو، ئەوەی کار بەچاکزانین دابنێت حەزەکانی خۆیەتی، بەچاکزانین بڕیاردانی شەرعییە.

بەم شێوەیە ئیمام دژایەتی ڕاوبۆچوون و حەزەکانی خەڵکی کردووە کە تێکەڵ بە شەرعی بکەن، چ جای گومانی ئەوەی پێببرێت پشتیوانی بیدعەکاران دەکات لە بیدعەکانیاندا.

وە بۆ زیاتر پەیوەستبوون بە بەڵگەوە دەڵێت: «إِذَا وَجَدْتُمْ فِي كِتَابِي خِلاَفَ سُنَّةِ رَسُوْلِ اللهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- فَقُوْلُوا بِهَا وَدَعُوا مَا قُلْتُهُ»[٤].

واتە: گەر لە کتێبەکەمدا پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەبوو؛ فەرموودەکە وەرگرن و قسەکەم واز لێبێنن.

وە دەڵێت: «إذا رأيتموني أقول قولا وقد صح عن النبي صلى الله عليه وسلم خلافه فاعلموا أن عقلي قد ذهب»[٥].

(١) (٢) (٣) "الرسالة" للشافعي ص٥٠٣، وفي "الأم" (٧/ ٣٠٩)، و "الاعتصام" للشاطبي (٣/ ٦٢).

(٤) "صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني ص٥٢، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٠/ ٣٥)، و "الحلية" لأبي نعيم (٩/١٠٦)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (١٠/ ٢٥٣)، و "الابهاج" (١٨٨٣).

(٥) "صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني ص٥٢، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٠/ ٣٥)، و "الحلية" لأبي نعيم (٩/١٠٦)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (١٠/ ٢٥٣)، و "الإبهاج" (١٨٨٣).

واتە: گەر بینیتان قسەیەکم کرد و لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێچەوانەکەی هەبوو، ئەوە بزانن کە عەقڵم لا نەماوە.

مێژووی ژیانی (شافعی) شاهیدە، ئیمام (ئەحمەد) ﷺ دەڵێت: «مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَتْبَعَ لِلأَثَرِ مِنَ الشَّافِعِيِّ»[(١)].

واتە: کەسم نەبینیوە شوێنکەوتەی سوننەت بێت بە هێندەی (شافعی).

ئیمامی (سُحْنُوْنُ) ﷺ دەڵێت: «لَمْ يَكُنْ فِي الشَّافِعِيِّ بِدْعَةٌ»[(٢)].

واتە: لە (شافعی)دا بیدعەکاری نەبووە.

**٤.** کردنە بەڵگەی قسەکەی ئیمامی (شافعی) بۆ ڕێگەپێدانی داهێنراو بەناوی چاکەوە پێچەوانەی بنەما زانستییەکانی ئیمام خۆیەتی:

یەکێك لە بنەماکانی: «وما نهى عنه رسولُ الله فهو على التحْرِيمِ، حتى تَأْتِيَ دلالةٌ عنه على أنه أراد به غَيْرَ التحْريم»[(٣)].

واتە: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ کردووە بەڵگەیە لەسەر حەرام تاوەکوو شێواز و بەڵگەیەکی تر لای ئەوەوە دێت لەسەر ئەوەی کە مەبەستی پێی حەرام نییە.

گەر سەیری «وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»[(٤)] بکەین دەبینین ڕێگرییەکە بۆ حەرامە، وە هیچ بەڵگەیەکی تر نییە لەسەر ئەوەی مەبەست لەم فەرموودەیەدا حەرام نییە، ئیتر چۆن ئیمام بە حەرامی نازانێت و بوار دەکاتەوە بۆ بیدعە؟!

وە یەکێکی تر لە بنەماکانی دەڵێت: «فكل كلام كان عاماً ظاهراً في سنة رسول الله فهو على ظهوره وعمومه، حتى يُعْلَمَ حديثٌ ثابِتٌ عن رسول الله - بأبي هو وأمي - يدل على أنه إنما أريد بالجملة العامة في الظاهر بعضُ الجملة دون بعض»[(٥)].

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٠/ ٢٦).

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٠/ ٩٥).

(٣) "الرسالة" ص٢١٦.

(٤) رواه ابن ماجه (٤٢) وقال (شعيب الأرنؤوط): حديث صحيح بطرقه وشواهده، وسبق تخريجه ص٤٤.

(٥) "الرسالة" ص٣٤١.

واتە: هەموو قسەیەکی گشتی ئاشکرا لە سوننەتدا بە گشتی و ئاشکرا دەخوێندرێتەوە تاوەکوو لە سوننەتدا بەڵگەیەکی تر دێت لەسەر مەبەست پێی کە هەندێکیەتی.

فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» لە بەڵگە گشتییە ئاشکراکانە، هیچ بەڵگەیەکی شەرعی نییە لەسەر تایبەتکردنی ئەم گشتییە.

بەم ڕوونکردنەوانە بۆمان دەرکەوت بەکارهێنانی وشەی (الْبِدْعَةُ الْمَحْمُودَةُ، وَالْبِدْعَةُ الْمَذْمُومَةُ) لایەنی ئیمامی (شافعی) رحمه الله مەبەست پێی یەکێکە لەم بەکارهێنانە:

❁ البدعة اللغوي - البدعة مقابلة السنة - البدعة بشكلها العام - المصلحة المرسلة[1].

واتە: لە ڕووە زمانەوانییەکەیەوە، یان خوێندنەوەی بەرامبەر سوننەت، یان شێوە گشتییەکەی زمانی و شەرعی، یان بنەمادارە شەرعییەکان.

واتە بە هیچ شێوەیەك مەبەستی ئیمام بە تایبەت پێناسە و واتا شەرعییەکە نەبووە لە بەکارهێنانی وشەی (بیدعە)دا.

لەبەرئەوەی (بیدعە) وشەیەکی زەم و بە خراپ ناوبردنە لە دیندا، هیچ وەصف و چاکەیەك لەخۆ ناگرێت، وەکوو دژە دین ناودەبرێت، چ جای ئەوەی پێناسەی چاك و بە شەرعیکردنی بۆ بکرێت.

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «أَنَّ كُلَّ رَاسِخٍ لَا يَبْتَدِعُ أَبَدًا، وَإِنَّمَا يَقَعُ الِابْتِدَاعُ مِمَّنْ لَمْ يَتَمَكَّنْ مِنَ الْعِلْمِ الَّذِي ابْتَدَعَ فِيهِ»[2].

واتە: کەسی ڕۆچوو و کامڵ لە زانستدا داهێنراو داناهێنێت بە هیچ شێوەیەك، بەڵکوو داهێنراو لە یەکێك دەوەشێتەوە کە شارەزای زانستی نەبێت لەو بوارەدا کە بیدعەی تێدا دەکات.

وە هەموو ئەو زانایانەی کە هەمان قسەی ئیمامی (شافعی) رحمه الله دادەڕێژنەوە بۆ داهێنراو، بەتایبەت ئەوانەی باسمان کرد؛ هەمان مەبەست و شێوازی ئیمامیان مەبەستە، بە بەڵگەی ئەوەی

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٤٣٦)، و "أقوم السنن في نقض تقسيم البدع إلى سيء وحسن" لدكتور: أحمد عبدالكريم نجيب ص٩٠، و "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص٢٤٣.

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٩٢).

کۆی نوسین و بەرنامەی زانستی و مێژووی خزمەتی دینییان پشتگیریکردنی سوننەت و دژایەتیکردنی بیدعەکاران بەتایبەتی فیرەقە گومڕاکان بووە، وە گەر سەیری نوسراوەکانیان بکەین؛ نوسراوەکانیان لە هیچ کاتێکدا بەڵگە و سەرچاوەی بیدعەکاران نەبووە، بگرە دژیان بووە، وەکوو: "تلبيس إبليس" ی أبو فرج الجوزي، وە "المحلى" ی ابن حزم، وە "الباعث على إنكار البدع" ی أبو شامة، وە "فتح الباري ی ابن حجر، ...هتد .

کەواتە پەنابردنە بەر وشەیەکی کورتی ئیمامی (شافعي) رحمه الله بۆ دەرگا کردنەوە و پاساوهێنانەوە بۆ بیدعەکاری، لەگەڵ ئەوەشدا پشتکردنە خوێندنەوەی بەرنامە و دینداری (شافعي) خۆی! کەواتە کەوتینە نێوان دوو بەرداشەوە بیدعە و بیدعەکاری و برەودان بە بەرنامەی بیدعەکاران، یاخود پێ هەڵگری شوێنەواری (شافعي) رحمه الله لە زیندووکردنەوەی سوننەت و دژایەتی بەرنامەی گومڕاکاران و شوێنکەوتەی بەڵگە!

ئەبێت کامیان ڕێڕەوی ئیمامی (شافعي) بێت رحمه الله ؟ نوسراوەکانی شایەتحاڵ و یەکلاکەرەوەی ئەم بابەتەیە.

ئەم زانایانە بە عورف و سەردەمی خۆیان کۆمەڵە وشە و داڕشتنێکیان بەکار هێناوە بە بەرنامەی زانستی خۆیانەوە، بەڵام لەدوای ئەوان کەسانی تر بە مانا و مەبەستی عورفی خۆیان شکاندوویانەتەوە و بەکاریان هێناوە، وەکوو (ابن القيم) رحمه الله دەڵێت: «حَمَلُوا الْقُنُوتَ فِي لَفْظِ الصَّحَابَةِ عَلَى الْقُنُوتِ فِي اصْطِلَاحِهِمْ»[1].

واتە: وشەی قنوت لە سەردەمی هاوەڵاندا بە (زۆرمانەوە لە نوێژدا و قورئان خوێندن) بەکاریان هێناوە، بەڵام دوای ئەوان بەس بە مانای قنووتی نوێژ وشەی هاوەڵانیان پێناسە کردووە.

دابەشکردنی داهێنراو بۆ (الحسنة والسيئة) داڕشتنی وشەییە نەك حەقیقی، بە گوێرەی ئەم خاڵانە[2]:

١. دابەشکردنی بیدعە بۆ چاکە و خراپە یا پێنج بەشە یاساییەکە دابەشکردنێکە لە ڕووە زمانەوانەییەکەوە (اللغوي)، ئەمە کۆدەنگی زانایانی لەسەرە و شاراوە نییە.

---

(١) "زاد المعاد في هدي خير العباد" (١/ ٢٧٤).

(٢) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٨١ - ٨٤.

**٢. بیدعەی حەقیقی شەرعی ناکرێتە هیچ بەشێکەوە لەو دوو جۆرە دابەشکردنە، ئەمەش زانایان کۆدەنگن لەسەری.**

**٣. ئەوانەی ئەم جۆرە دابەشکردنە بەکاردەهێنن لە ڕووە شەرعییەکەیەوە، مەبەستیان بەکارهێنانییەتی وەکوو پاساوێك بۆ بنەماداناني کۆمەڵێك لە بیدعەرو بەچاکزانینی و دروستکردنی ڕووپۆشێکی شەرعی بۆی.**

**ئەمە زیاتر لەوەدا بەدی دەکرێت کە پێشووەکان زانایانە دابەشکردنی بیدعەیان کردووە، وەکوو ئیمامی (شافعی) و (عزی کوڕی عبد السلام) و (نەوەوی) ... بەبێ ڕازیبوون و دروستکردنی بیدعە و سەر بن لە بیدعەکاریدا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان** (بمقسمي البدع لا بمحسني البدع) **دابەشکاری بیدعە بوون لە ڕووە زمانییەکەیەوە نەك ڕووە شەرعییەکەی، وە نەك بەچاکزانەری بیدعە بووبن.**

**بە پێچەوانەی زانایانی دوای ئەوانی مەزاهیب** (علماء المتأخرين المذاهب) **کە دابەشکردنە زمانەوانەییەکەی زانایانی پێشوویان قۆستووەتەوە و بەکاریان هێناوە بۆ سەلماندن و دانانی کۆمەڵێك لە بیدعە.**

**ئەمە خاڵی ووردی جیاکەرەوەکەیە، وە بەرهەمی قسەی** (المتأخرين) **لەکارخستنی هەڕەشەی فەرموودەکە «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» دەگەیەنێت، یا بەتایبەتکردنی و وشە گشتییەکەیەتی** (تخصيص العموم) **بەبێ بوونی بەڵگەی تایبەت.**

## ڕوانگەی دووەم: دابەشکردنی بۆ پێنج بەشە یاسا شەرعییەکان

### ( الأحكام التكليفية: واجب، مندوب، حرام، مكروه، مباح )

لە ڕوانگەی دابەشکردنی داهێنراوەوە بۆ (الحسنة والسيئة) بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی (عزالدين بن عبد السلام) رَحِمَهُ ٱللَّهُ داهێنراوی دابەشکرد بەسەر پێنج بەشە حوکمە شەرعییەکاندا، دەڵێت: «الْبِدْعَةُ فِعْلُ مَا لَمْ يُعْهَدْ فِي عَصْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ. وَهِيَ مُنْقَسِمَةٌ إلَى: بِدْعَةٌ وَاجِبَةٌ، وَبِدْعَةٌ مُحَرَّمَةٌ، وَبِدْعَةٌ مَنْدُوبَةٌ، وَبِدْعَةٌ مَكْرُوهَةٌ، وَبِدْعَةٌ مُبَاحَةٌ»[١].

واتە: داهێنراو ئەوەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەبووبێت و دابەش دەبێت بۆ: بیدعەی واجب و حەرام و مەندوب و مەکروە و حەڵاڵ.

ئیمامی (القرافي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ قوتابی (عز بن عبد السلام) بە هەمان شێوەی مامۆستاکەی دەیکات بە پێنج بەشەوە، بۆ هەر یەکێکی دەڵێت: «(قِسْمٌ) وَاجِبٌ، وَهُوَ مَا تَتَنَاوَلُهُ قَوَاعِدُ الْوُجُوبِ وَأَدِلَّتُهُ مِنْ الشَّرْعِ ...، (الْقِسْمُ الثَّانِي) : مُحَرَّمٌ، وَهُوَ بِدْعَةٌ تَنَاوَلَتْهَا قَوَاعِدُ التَّحْرِيمِ وَأَدِلَّتُهُ مِنْ الشَّرِيعَةِ ...، (الْقِسْمُ الثَّالِثُ) مِنْ الْبِدَعِ مَنْدُوبٌ إلَيْهِ، وَهُوَ مَا تَنَاوَلَتْهُ قَوَاعِدُ النَّدْبِ وَأَدِلَّتُهُ مِنْ الشَّرِيعَةِ ...، (الْقِسْمُ الرَّابِعُ) بِدَعٌ مَكْرُوهَةٌ، وَهِيَ مَا تَنَاوَلَتْهُ أَدِلَّةُ الْكَرَاهَةِ مِنْ الشَّرِيعَةِ وَقَوَاعِدُهَا ...، (الْقِسْمُ الْخَامِسُ) الْبِدَعُ الْمُبَاحَةُ، وَهِيَ مَا تَنَاوَلْته أَدِلَّةُ الْإِبَاحَةِ ...»[٢].

واتە: هەریەکە لەو بەشانە بەڵگەکانی ئەو بەشە دەیگرێتەوە.

ئیتر بەدوایدا (ابن حجر والنووي والسيوطي والسخاوي ...)[٣] ئەم شێوە دابەشکردنەیان وتووەتەوە و گەیەنراوە.

---

(١) "قواعد الأحكام في مصالح الأنام" لعز الدين بن عبد السلام (٢/ ٢٠٤).

(٢) "الفروق" للقرافي (٤/ ٢٠٣ - ٢٠٤).

(٣) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٤٣٨)، و "أقوم السنن في نقض تقسيم البدع إلى سيء وحسن" لدكتور: أحمد عبد الكريم نجيب ص٩٠.

## وەڵام بۆ ئەم بۆچوونە :

**١.** ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «أَنَّ هَذَا التَّقْسِيمَ أَمْرٌ مُخْتَرَعٌ، لَا يَدُلُّ عَلَيْهِ دَلِيلٌ شَرْعِيٌّ»[(١)].

واتە: ئەم جۆرە دابەشکردنە جۆرێکی داهێنراوە و هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە.

واتە لە سەردەمی هاوەڵانەوە تاوەکوو (عز بن عبد السلام) کە لە ساڵی (٦٦٠)ی کۆچیدا وەفاتی کردووە، واتە بە درێژایی شەش سەدە و نیوی پڕ لە زانایان ئەم جۆرە پێناسە و دابەشکردنانەیان نەبووە، ئەمە دوورە لە کۆدەنگی زانایانەوە (اجماع العلماء).

**٢.** بە پێناسەکەی (عز بن عبد السلام) رَحِمَهُ اللهُ بۆ بیدعە کە: «مَا لَمْ يُعْهَدْ فِي عَصْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ»[(٢)] واتە: ئەوەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەبوو بێت، ئەمە (بیدعەی دونیایی و دینی) دەگرێتەوە، وە بیدعەی زەمانەوانی و شەرعیش دەگرێتەوە.

گەر مەبەستی داهێنراوی زەمانەوانی بێت ئەوا لە ڕووی زەمانەوانییەوە بەڵێ دەتوانرێت پێنج بەش بێت، وەکوو (محمد رشيد رضا) دەڵێت: «أن الكلمة البدعة اطلاقين: اطلاقاً لغوياً بمعنى الشيء الجديد الذي لم يسبق له مثل، وبهذا المعنى يصح قولهم إنها تعتريها الأحكام الخمسة»[(٣)].

واتە: وشەی بیدعە دوو جۆر ناوبردنی هەیە: ناوبردنی زەمانەوانی بە مانای کارێکی تازە کە پێشوەختی نەبووە، بەم مانایە هەر پێنج حوکمە شەرعییەکان لەخۆ دەگرێت.

بەڵام گەر مەبەستی داهێنراوی شەرعی بێت ئەوا هەمووی گومڕاییە و دژایەتی دەقەکان دەکات، لە هەردوو حاڵەتەکەدا ناکرێتە بەڵگە بۆ دابەشکردنی داهێنراو، بەم پێناسەیەی «مَا لَمْ يُعْهَدْ فِي عَصْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ» ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەبوو بێت؛ بەڵگەی مەبەستی (عز بن عبد السلام)ە کە لەسەر داهێنراوی زەمانەوانییە[(٤)].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٤٦).

(٢) "قواعد الأحكام في مصالح الأنام" لعز الدين بن عبد السلام (٢/ ٢٠٤).

(٣) "تفسير المنار" لمحمد رشيد رضا (٩/ ٦٦٠).

(٤) "ضوابط البدعة وقواعد الأصولية والفقهية" لنزيه محمود عفون ص١٧.

**٣.** ناوبردنی کاره بەڵگەدارەکان بە یاسا شەرعییەکان و لـە هەمان کاتدا ناوبردنی بە داهێنراو و کۆکردنەوەی لـەگەڵ یەکدا؛ دوو دژبەیەکە.

ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «**بَلْ هُوَ نَفْسُهُ مُتَدَافِعٌ؛ ... إِذْ لَوْ كَانَ هُنَالِكَ مَا يَدُلُّ مِنَ الشَّرْعِ عَلَى وُجُوبٍ أَوْ نَدْبٍ أَوْ إِبَاحَةٍ؛ لَمَا كَانَ ثَمَّ بِدْعَةٌ، ... فَالْجَمْعُ بَيْنَ "كَوْنِ" تِلْكَ الْأَشْيَاءِ بِدَعًا، وَبَيْنَ كَوْنِ الْأَدِلَّةِ تَدُلُّ عَلَى وُجُوبِهَا أَوْ نَدْبِهَا أَوْ إِبَاحَتِهَا جَمْعٌ بَيْنَ مُتَنَافِيَيْنِ**»[1].

واتە: ئەمە خۆی بۆ خۆی بەرپەرچی خۆی دەداتەوە، گەر بەڵگە هەبێت لـەسەر واجبیەتی و سوننەتیەتی یا حەڵاڵێتی ئەوە چۆن بیدعەیە ... ئەمە کۆکردنەوەی دوو دژبەیەکن.

لـەبەر ئەوەی (واجب وسنة وحرام ومكروه ومباح) ئەمانە یاساکانی شەرعن بە بەڵگەوە، بەڵام داهێنراو هیچ بەڵگەیەك و بنەمایەکی دینی نییە، ئەم ناوانە وەصف و باسی دینییە، بەڵام داهێنراو وشەیەکی زەم و بە خراپ ناوبردنە، زەم و وەصف کۆ نابێتەوە.

**٤.** ئەو نموونانەی هێناویەتییەوە بۆ ئەم دابەشکردنە شێواندن و تێکەڵکردنێکی پێوە دیارە، دەبێتە هۆکار بۆ نەسەلماندنی ئەم بۆچوونە، وەکوو ئیمامی (الشاطبي) ﷺ ڕوونی دەکاتەوە و (سليم الهلالي) کورتی کردووەتەوە دەڵێت: «**قسم البدع الواجبة:** ليس كذلك إذ الأمثلة التي ذكرت فيه، كلها من قبيل (ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب)، أو قد دلت عليه النصوص عامة وعمل بها سلف الصالح، من باب مصالح المرسلة.

**قسم المندوب:** فليس من البدع الأمثلة التي مثل لها صلاة التراويح في رمضان ... فقد قام النبي ﷺ في المسجد.

**قسم التحريم:** فليس فيه ما هو بدعة هكذا باطلاق، بل ذلك كله مخالفة للأمر المشروع.

**قسم المكروه:** ذكرت فيه أشياء هي من قبيل البدع من الجملة أو من قبيل الاحتياط على العبادات، وذلك الصحيح.

---

(١) "الاعتصام" (١/ ٢٤٦).

قسم المباح: فليس داخلاً في البدع، الأمثلة من باب التنعم»[1].

واتە: **بەشی (واجب):** داهێنراو نییە، نموونەکان هەموویان لەوەدا کۆدەبنەوە (هەرشتێك واجبی پێ تەواو نەبوو واجبە)، یاخود بەڵگە گشتییەکان لەخۆی دەگرێت و هاوەڵ و شوێنکەوتووان کاریان پێ کردووە و لەژێر ناونیشانی (مصالح المرسلة) سوودمەندییە بەڵگەدارەکاندا جێگەی دەبێتەوە.

**بەشی (مندوب):** یەکێك لە نموونەکان نوێژی تەراویحە، داهێنراو نییە و پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی لە مزگەوتدا.

**بەشی (حرام):** نموونەکان بەڵگەن لەسەر حەرامیەت نەك بیدعە.

**بەشی (مکروە):** ئەو نموونانەی باسی کردووە ڕاستە بە شێوەی گشتی دەبێتە بیدعە یا لە بواری پاراستنی عیباداتدا، یا لە زیادوکەم، بەم شێوەیە تەواوە.

**بەشی (مباح):** نموونەکان ناچنە ژێر باری بیدعەوە، بەڵکوو حەڵاڵ و نیعمەتە دونیاییەکانە.

**٥.** دابەشکردنەکەی (عز بن عبد السلام) بۆ پێنج بەش و لەژێر ناونیشانە شەرعییەکاندا و نموونە هێنانەوە بۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جیاوازی نەکردووە لە نێوان «**البدعة الشرعية التي لا تكون إلا مذمومة، والبدعة اللغوية التي قد تكون مذمومة، وقد تكون محمودة، وقد تكون مباحة**»[2].

واتە: داهێنراوی شەرعی کە هەمووی گومڕاییە و داهێنراوی زمانەوانی دەشێت خراپ بێت یا چاك بێت یاخود حەڵاڵ بێت.

ئەم جیانەکردنەوەیەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری سەیرکردنی کارەکان لە ڕوانگەی سەرەتا دروستبوونیانەوە کە نەبوون، خوێندنەوەی شەرعیش لەم ڕوانگەیەوە نییە، لەبەر ئەوەی هەموو تازە دروستبوونێك لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە پێی دەوترێت بیدعە.

---

(١) "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص٢٣٨، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٤٧).

(٢) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٤٣٩).

٦. بە گوێرەی شێوازی نمونەکانی بۆ هەر پێنج یاساکانی شەرعی «أدخل المصالح المرسلة في مسمى البدع، بناء على أنها لم تدخل أعيانها تحت النصوص المعينة، وإن كانت تلائم قواعد الشرع. فلكونها داخلة تحت قواعد الشرع، حكم عليها بالوجوب أو الندب أو الإباحة، ولكونها حادثة غير معهودة في عصر الرسول صلى الله عليه وسلم سماها بدعاً، فيكون بذلك من القائلين بالمصالح المرسلة، وهي ليست بدعاً إلا في اللفظ»[(١)].

واتە: دیارە بنەمای (المصالح المرسلة) ئەو سوودمەندییانەی لە شەرعەوە وەرگیراوە خستوویەتییە ژێر ناونیشانی داهێنراوەوە، ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «فَإِنَّ كَلَامَ ابْنِ عَبْدِ السَّلَامِ ظَاهِرٌ مِنْهُ أَنَّهُ سَمَّى الْمَصَالِحَ الْمُرْسَلَةَ بِدَعًا»[(٢)]. لەسەر بنەمای ئەوەی ئەوانە هیچ دەقێکی دیاریکراو نییە لەسەریان ئەگەرچی بشگونجێت لەگەڵ بنەما شەرعییەکاندا، لەبەر ئەوەی دەچێتە ژێر باری بنەما شەرعییەکان حوکمی بە (واجب، مندوب، مباح) دراوە بەسەریا، وە لە لایەکی تریشەوە کارێك نەبووە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەو ناوی بردووە بە بیدعە، گەرچی بەس لە زماندا پێی دەوترێت بیدعە.

٧. هیچ بەشێك لەو پێنج بەشە داهێنراو ناگرێتەوە، بێجگە لە بەشی (حرام ومکروه) نەبێت، وەکوو ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «وَالْحَاصِلُ مِنْ جَمِيعِ مَا ذُكِرَ فِيهِ قَدْ وَضَحَ مِنْهُ أَنَّ الْبِدَعَ لَا تَنْقَسِمُ إِلَى ذَلِكَ الِانْقِسَامِ، بَلْ هِيَ مِنْ قَبِيلِ الْمَنْهِيِّ عَنْهُ: إِمَّا كَرَاهَةً، وَإِمَّا تَحْرِيمًا»[(٣)].

کورتەی ئەو باسانە ڕوون بووەوە داهێنراو نابێتە ئەو بەشانەی کە باس کراوە بێجگە لە گرتنەوەی (مەکروە و حەرام) نەبێت، ئەویش لە ڕووی قەدەغەکردنییەوە.

وە دەڵێت: «أَمَّا الْمَكْرُوهُ مِنْهَا وَالْمُحَرَّمُ؛ فَمُسَلَّمٌ مِنْ جِهَةِ كَوْنِهَا بِدَعًا لَا مِنْ جِهَةٍ أُخْرَى، إِذْ لَوْ دَلَّ دَلِيلٌ عَلَى مَنْعِ أَمْرٍ أَوْ كَرَاهَتِهِ؛ لَمْ يُثْبِتْ بِذَلِكَ كَوْنَهُ بِدْعَةً؛ لِإِمْكَانِ أَنْ يَكُونَ مَعْصِيَةً؛ كَالْقَتْلِ

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٤٤٠).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٤٦).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٧٠).

وَالسَّرِقَةِ وَشُرْبِ الْخَمْرِ وَنَحْوِهَا، فَلَا بِدْعَةَ يُتَصَوَّرُ فِيهَا ذَلِكَ التَّقْسِيمُ أَلْبَتَّةَ، إِلَّا الْكَرَاهِيَةَ وَالتَّحْرِيمَ»[١].

واتە: (مكروه وحرام) داهێنراو دەگرێتەوە لە ڕووی داهێنراوەوە، نەك ڕوویەكی تر لەو ڕووەوە داهێنراو یا حەرامە یا مەكروهە، گەر هەر بەڵگەیەك هەبێت لەسەر ڕێگریكردنی كارێك وەك (حرام یا مكروه) نابێتە بەڵگە لەسەر داهێنراو، لەبەرئەوەی تاوانە نەك بیدعە، بە بۆچوون بیدعە لەو دابەشكردنەدا تەنها بەشی (حرام ومكروه) دەگرێتەوە.

(سليم الهلالي) دەڵێت: «الإثم قدر مشترك بين البدع كلها، فلا يجوز أن نحكم على بدعة بأنها أقل إثماً من غيرها»[٢].

واتە: تاوان ڕێژەیەكی بەشداربووە لە نێوان هەموو داهێنراوەكاندا، دروست نییە حوكم بدەین بەسەر بیدعەیەكدا كەوا تاوانی لەوانی تر كەمتر بێت.

## تێبینی لەسەر (البدعة المكروهة)

لە پێشوودا زانیمان داهێنراو هەموو جۆرەكانی لە باسی گومڕاییدا كۆدەبێتەوە، ئەم وەصفە پەیوەستە پێوەی و لێی نابێتەوە، وەكوو فەرموودەكە دەفەرموێت: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» هەموو داهێنراوێك گومڕاییە، وە گومڕاییش پێچەوانەی هیدایەتە، وە داهێنراویش لە هاوشێوەی تاوان و لادراوەكاندایە، وەكوو چۆن تاوان لە یەك پلەدا نییە؛ ئاواش داهێنراو لە یەك پلەدا نییە.

لە قسەی زانایاندا داهێنراو بە جۆری حەرام و مەكروه ناو براوە، وەكوو (الطرطوشي) دەڵێت: «فألفيت ذلك ينقسم إلى قسمين: قسم يعرفه الخاصة والعامة أنها بدعة محدثة؛ إما محرمة، وإما مكروهة»[٣].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٤٦).

(٢) "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص٢٣٧.

(٣) "الحوادث والبدع" للطرطوشي ص٢١.

واتە: گەیشتووم بەوەی داهێنراو دەبێت بە دوو بەشەوە، جۆری ئەوەی کە خەڵکی تایبەت و گشتی دەیزانن داهێنراوە یا حەرامە یاخود مەکروهە.

وە (عز بن عبد السلام)یش لە دابەشکردنەکەیدا بە هەمان شێوە بەشی (حرام ومکروه)ی باس کردووە، وە (الشاطبي)یش لە "الاعتصام" دا پێداگری دەکات لەوەی داهێنراو لەو پێنج بەشە تەنها بەشی (حرام ومکروه) دەگرێتەوە.

**بەشی (حرام):** ئاشکرایە و هیچ پاساوێکی بۆ نییە.

**بەشی (مکروه):** لە قسەی زانایاندا مەبەست پێی پێناسەی (فقهاء) نییە کە دەڵێن: «ما لا يترتب على فاعله ذم شرعي ولا إثم ولا عقاب»، «ما يثاب تاركه ولا يعاقب فاعله»[1].

واتە: لەسەر خاوەنەکەی هیچ زەمێکی شەرعی و تاوان و سزا نادرێت.

وەك ئیمامی (الشاطبي) ﵀ دەڵێت: «إِثْبَاتَ قَسْمِ الْكَرَاهَةِ فِي الْبِدَعِ عَلَى الْحَقِيقَةِ مِمَّا يُنْظَرُ فِيهِ، فَلَا يَغْتَرُّ الْمُغْتَرُّ بِإِطْلَاقِ الْمُتَقَدِّمِينَ مِنَ الْفُقَهَاءِ لَفْظُ الْمَكْرُوهِ عَلَى بَعْضِ الْبِدَعِ، وَإِنَّمَا حَقِيقَةُ الْمَسْأَلَةِ أَنَّ الْبِدَعَ لَيْسَتْ عَلَى رُتْبَةٍ وَاحِدَةٍ فِي الذَّمِّ - كَمَا تَقَدَّمَ بَيَانُهُ - وَأَمَّا تَعْيِينُ الْكَرَاهَةِ الَّتِي مَعْنَاهَا نَفْيُ إِثْمِ فَاعِلِهَا وَارْتِفَاعُ الْحَرَجِ الْبَتَّةَ، فَهَذَا مِمَّا لَا يَكَادُ يُوجَدُ عَلَيْهِ دَلِيلٌ مِنَ الشَّرْعِ وَلَا مِنْ كَلَامِ الْأَئِمَّةِ عَلَى الْخُصُوصِ»[2].

واتە: بەکارهێنانی وشەی (مکروه) لە یەکێك لە بەشەکانی بیدعەدا ئەو پێناسە و بەکارهێنانەی (فقهاء)ی بۆ ناکرێت کە خاوەنەکەی تاوانبار و ڕێگریەکی لەسەر نابێت، بەکارهێنانی وشەی (مکروه) بۆ بیدعە بەم شێوەیە هیچ بەڵگە و قسەی زانایەك لەسەری بەردەست نایەت، بەڵکوو وشەی (مکروه) لە دابەشکردنی بیدعەدا مەبەست پێی ئەوەیە بیدعەکان لە یەك ئاست و پلەدا نین.

---

(١) "المذكرة للشنقيطي" ص٤، "الورقات" للجويني ص٨، "المستصفى" للغزالي ص٣٣.

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٣٣).

قسەی زانایانمان باس کرد بە شێوەیەکی کۆدەنگ لەسەر ئەوەی (بیدعە لای شەیتان باشترە تاوەکوو تاوانەکان)، بەدەر لەوەش خاوەن داهێنراو خۆی بە حەق دەزانێت و بانگەوازی بۆ دەکات و تەوبەی لەسەر ناکات.

ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی وشەی (مکروه) بۆ داهێنراو مەبەست پێی «وَإِنَّمَا حَقِيقَةُ الْمَسْأَلَةِ أَنَّ الْبِدَعَ لَيْسَتْ عَلَى رُتْبَةٍ وَاحِدَةٍ فِي الذَّم، والْذَّنْبُ فَمِنْهَا مَا هُوَ كُفْرٌ وَمِنْهَا مَا هُوَ كَبِيْرَةٌ وَمِنْهَا مَا هُوَ مَكْرُوهٌ»[1].

ئەوەیە داهێنراوەکان یەك پلەی تاوانیان نییە، بەڵکوو هەیانە دەرچوونە لە دین و هەیانە تاوانی گەورەیە و حەرامە، وە هەیانە (مکروه)ە.

وە (مکروه)یش دوو جۆرە: (الكراهة التحريمية والكراهة التنزيهية)، یەکەمیان مەبەست پێی حەرامە، دووەمیان مەبەست پێی خۆپاراستنە، کە باشترە لێی دوور بیت.

بەشی (خۆ پاراستن باشترە)مان نییە لە داهێنراودا، لەبەر ئەوەی (وشەی گومڕایی و هەڕەشەی ئاگر لەسەر هەموو داهێنراوێکە).

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ الله دەڵێت: «وَجَدْنَا بَيْنَ الطَّاعَةِ وَالْمَعْصِيَةِ وَاسِطَةً يَصِحُ أَنْ يُدْخَلُ تَحْتِهَا الْمَكْرُوهُ، ... بِخِلَافِ الْهُدَى وَالْضَّلَالُ؛ فَإِنَّهُ لَا وَاسِطَةٌ بَيْنِهِمَا فِي الْشَّرْعِ يَصِحُّ أَنْ يُنْسَبَ إِلَيْهَا لَفْظُ الْمَكْرُوهُ مِنَ الْبِدَعِ، وَقَدْ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ﴾ [يونس: ٣٢]، فَلَيْسَ إِلَّا حَقٌّ، وَهُوَ الْهُدَى، وَضَلَالٌ وَهُوَ الْبَاطِلُ، فَالْبِدَعُ الْمَكْرُوهَةُ ضَلَالٌ»[2].

واتە: لە نێوان عیبادەت و تاواندا لێکدانێك هەیە دەگونجێت لە ژێریدا (مکروه) جێگەی ببێتەوە، بە پێچەوانەی هیدایەت و گومڕاییەوە کە هیچ پەیوەندی و لێکدانێك لە نێوانیاندا نییە تاوەکوو (مکروه) بە پێناسەی (فقهاء) دابنرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ﴾ [يونس: ٣٢]. هیچ شتێك نییە لەدوای حەقەوە بێجگە لە گومڕایی نەبێت.

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٢٠٦)، و "الاعتصام" (٢/ ٥٣٣).

(٢) "الاعتصام" (٢/ ٥٣٢).

بوونی بەس حەق و هیدایەت هەیە یاخود گومڕایی کە ئەویش بەتاڵە، بۆیە بیدعەی (مکروە) گومڕاییە.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ هەڵسەنگاندنێك لە نێوانی (مكروە التنزيهي) لە حەرامەکاندا و (مكروە البدعي) دەکات، واتە (مکروهات)ی حەرام و (مکروە)ێك کە بۆ حوکمی بیدعە ناو دەبرێت بۆ زیاتر دڵنیا بوون لە جیاوازییەکانیان کە بیدعە بە هیچ شێوەیەك بەو مانایە نایەت زانایانی فیقهی مەبەستیانە لە پێناسەی (مکروە)دا، "(مکروە): ئەوەیە کە نەکردنی باشە، وە گەر بکرێت تاوان و سزای بەر ناکەوێت".

١. ئەوەی (مەکروهەکانی حەرام) دەکات مەبەستی پێی بەدیهێنانی شەهەوات و ئارەزووەکانییەتی و پشتی بە لێبوردنی خوایی بەستووە.

٢. باوەڕبوونی نەگۆڕاوە بەوەی مەکروهە، وە بە حەڵاڵی نازانێت، وە کاتێك ئەنجامی دەدات لە خوا دەترسێت چاوەڕێی لێخۆشبوونە، (خوف ورجاء)یش دوو بەشی ئیمانە.

٣. ئەوەی مەکروهات دەکات دەزانێت باشتر وایە نەیکات و نەفسی پاڵنەرە و ئاواتی نەکردنی بووە.

٤. وە بەردەوام دڵشکاوە و هەوڵی دوورکەوتنەوە دەدات گەر هۆکارەکانی گرتبێت یان نا.

بەڵام بیدعەکار لە کەمترین بیدعەدا بە پێچەوانەی ئەوانەوەیە (خۆی بە حەق دەزانێت و وا گومان دەبات ڕێگەی پڕ هیدایەت و کامڵییە و بانگەوازی بۆ دەکات و بەڵگە و شێوازە گومانا وییەکانی بۆ خڕ دەکاتەوە و نایەوێت و مەبەستی نییە بە هیچ شێوەیەك تەوبەی لەسەر بکات، وە سوورە لەسەر ئەنجامدانی و چاوەڕێی پاداشتیشە)[1].

وە تەنانەت لەلای زانایانی پێشووش (مکروە)یان بە مانای حەرام بەکارهێناوە لەسەر شێوەی داڕشتنی قورئان کە (مکروە)یان بۆ حەرام و مەکروە بەکارهێناوە، وەك لە دوای گوناهە گەورەکان (قەتل و زینا و ماڵی هەتیو خواردن و تەرازووبازی و خۆبەگەورە زانین ...)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ﴿٣٨﴾ ﴾ [الإسراء: ٢٧ - ٣٨].

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٣٧٣)، و "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٢٠٨).

ئەمانە هەموویان لای خوای گەورە کارێکی خراپ و حەرامن، خۆ ناشێت ئەو هەموو تاوانە گەورانە مەکروهێکی (تنزيهي) بێت، واتە خۆ پاراستن باشترە تیایدا.

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «وَأَمَّا كَلَامُ الْعُلَمَاءِ فَإِنَّهُمْ وَإِنْ أَطْلَقُوا الْكَرَاهِيَةَ فِي الْأُمُورِ الْمَنْهِيِّ عَنْهَا لَا يَعْنُونَ بِهَا كَرَاهِيَةَ التَّنْزِيهِ فَقَطْ، وَإِنَّمَا هَذَا اصْطِلَاحٌ لِلْمُتَأَخِّرِينَ حِينَ أَرَادُوا أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ الْقِبْلَتَيْنِ. فَيُطْلِقُونَ لَفْظَ الْكَرَاهِيَةِ عَلَى كَرَاهِيَةِ التَّنْزِيهِ فَقَطْ، وَيَخُصُّونَ كَرَاهِيَةَ التَّحْرِيمِ بِلَفْظِ التَّحْرِيمِ وَالْمَنْعِ، وَأَشْبَاهِ ذَلِكَ.

وَأَمَّا الْمُتَقَدِّمُونَ مِنَ السَّلَفِ فَإِنَّهُمْ لَمْ يَكُنْ مِنْ شَأْنِهِمْ فِيمَا لَا نَصَّ فِيهِ صَرِيحًا أَنْ يَقُولُوا: هَذَا حَلَالٌ وَهَذَا حَرَام ... فَإِذَا وُجِدَتْ فِي كَلَامِهِمْ فِي الْبِدْعَةِ أَوْ غَيْرِهَا: أَكْرَهُ هَذَا، وَلَا أُحِبُّ هَذَا، وَهَذَا مَكْرُوهٌ. وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، فَلَا تَقْطَعَنَّ عَلَى أَنَّهُمْ يُرِيدُونَ التَّنْزِيهَ فَقَطْ، فَإِنَّهُ إِذَا دَلَّ الدَّلِيلُ فِي جَمِيعِ الْبِدَعِ عَلَى أَنَّهَا ضَلَالَةٌ فَمِنْ أَيْنَ يُعَدُّ فِيهَا مَا هُوَ مَكْرُوهٌ كَرَاهِيَةَ التَّنْزِيهِ؟»[١].

واتە: وتەی زانایان لەم بارەیەوە بە گشتی وشەی (مكروه)یان بۆ کارە حەرامەکان بەکار هێناوە بەبێ مەبەستی تەنها (مكروه التنزيهية)، بەڵکوو بۆ هەردووکیانە (حرام ومكروه).

بەکارهێنانی (مكروه) بەس بۆ خۆ پاراستن نەك (حرام) بەکارهێنانی (متأخرين) زانایانی ئەم دواییە کاتێك ویستوویانە لە نێوان دوو هاوشێوەدا جیاوازییەك دروست بکەن، مەکروهیان بۆ پێشەکی حەرام بەکارهێناوە بە مەبەستی خۆ پاراستن، وە وشەی حەرامیان بۆ ڕێگرتن و حەرام بەکارهێناوە.

بەڵام زانایانی پێشووە صالحەکان کاریان وا نەبووە، هەرشتێك دەقێکی ئاشکرای لەسەر نەبێت بڵێن ئەمە حەرامە یا حەڵاڵە ... گەر لە قسەکانیاندا دەربارەی داهێنراو یا هەر شتێکی تر وتیان: (ئەمە بە باشی نازانم، ئەمەم پێ خۆش نییە، ئەمە مەکروهە)، بڕیار مەدە لەسەر ئەوەی مەبەستیان لە (مكروه) (الكراهة التنزيهية) بووە.

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٣٧٢).

که بەڵگه هەبێت لەسەر هەموو داهێنراوەکان که گومڕاییه؛ لەکوێ داهێنراو هەژمار دەکرێت بەوەی (كراهة التنزيهية) نەکردن و خۆپاراستن باشترە تیایدا.

به کورتی باسکردنی بیدعه به (مکروه) بۆ حوکمەکەی نییه، بەڵکوو بۆ پلەکەیەتی وەك (بیدعەیەکی گەورەیە یا بچووك، پێی دەردەچێت لە دین یا دەرناچێت، لایەنی باوەڕییه یا کردارییه "الاعتقادي والعملي"، لە بنەماکانی دینە یا لقەکانی "الأصول والفروع" ...).

**له کۆتاییدا:** ئەوەی داهێنراوی کردووە بە پێنج بەشەوە که (عز بن عبد السلام والقرافي)یە رَحِمَهُمَاٱللَّهُ به سەرکردەی کەسانی سەرەتایی ئەم دابەشکردنە دادەنرێت، سەرەڕای ئەوەی بەم شێوەیە زانایان ڕەتی دەکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گومانمان لەوەدا نییە که خاوەنی هەڵگر و بەرنامە و (منهج)ی ئەهلی سوننەتن و دژایەتی داهێنراو و لادانەکان کاریان بووە و لە بەرهەڵستی بەردەوامیاندا بوون، بۆیە (عز بن عبد السلام) قسەوێژ و بەرپەرچدەرەوەی دەسەڵاتەکانیش بووە لەم ئاستەدا بە نازناوی (سلطان العلماء) دەسەڵاتی زانایان ناوی دەرکردووە، وە گەر پیاچونەوەی نوسینەکانیشی بکەین دەبینین پێداگری کردووە لە وەستان لە سنووری سوننەتدا، وە لە کردەوەدا دەرگای بۆ داهێنراوی بەناو چاك نەکردووەتەوە، وەکوو:

🕮 دەربارەی نوێژی (صلات الرغائب) که سەنەدەکانی (ضعیف)ە دەڵێت: «فإن الشريعة لم ترد بالتقرب إلى الله بسجدة منفردة لا سبب لها فإن القرب لها أسباب وشرائط وأوقات وأركان لا تصح بدونها ... وكذلك لا يتقرب إلى الله عز وجل بالصلاة والصيام في كل وقت وأوان ...»[1].

واتە: لە شەریعەتدا نەهاتووە لە خوا نزیکبوونەوە بە کڕنووشێکی تاك کە هۆکاری نەبێت، نزیکبوونەوە لە خوا هۆکار و مەرج و کاتەکان و ڕوکنەکانی تایبەت بە خۆی هەیە، دروست نییە بەبێ بوونی ئەوانە، وە هەروەها نزیکبوونەوە لە خوا ﷻ بە نوێژ و ڕۆژوویەك لە هەموو کاتێکدا ناکرێت.

---

(١) "المساجلة العلمية بين الإمامين العز وابن صلاح" بتحقيق الألباني ص٨٠٧.

الشَّيخ (الألباني) رَحِمَهُ اللهُ پاش ئەم قسەیەی دەڵێت: «هذا مما يشعر أنه رحمه الله لا يرى البدعة الحسنة بمفهوم السائد عند المتأخرين»[(١)].

واتە: ئەمانەی هەمووی ئەوە دەگەیەنێت (عز بن عبد السلام) رَحِمَهُ اللهُ ڕای لەسەر داهێنراوی چاك نییە بەو تێگەیشتنەی زانایانی ئەم دواییە.

📖 دەربارەی سڵاوات خوێندن دوای دوعای قنوت دەڵێت: «ولم تصح الصلاة على رسول الله ﷺ في القنوت، ولا ينبغي أن يُزاد على صلاة رسول الله ﷺ بشيء ولا ينقص»[(٢)].

واتە: دروست نییە سڵاوات خوێندن لەدوای قنووت و نابێت هیچ زیاد بکرێت لە نوێژەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان کەم بکرێت.

📖 دەربارەی تەوقەکردن دوای نوێژی بەیانی و عەسر دەڵێت: «المصاحفة عقب الصبح والعصر من البدع»[(٣)].

واتە: تەوقەکردنی دوای نوێژی بەیانی و عەسر بیدعەیە.

📖 دەربارەی نوێژ لەسەر بەرماڵ دەڵێت: «فالأفضل اتباع الرسول ﷺ في دق أفعاله وأقواله وجلها ... والاقتداء بالسلف أولى من احداث البدع»[(٤)].

واتە: باشتر وایە شوێنکەوتەی پێغەمبەر کەیت ﷺ لە ووردترین کار و قسەدا بە گشتی ... شوێنکەوتەی هاوەڵانی پێشوو بیت باشترە لە دروستکردنی داهێنراو.

لەمانەدا بە ئاشکرا ڕوونە بەرنامە و شێوازی شوێنکەوتەی (عز بن عبد السلام) رَحِمَهُ اللهُ کە بریتییە لە بەرنامەیەکی زانستی شەرعی بە شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت، گەرچی هەندێك باس و دەربڕینی وەکوو ئەم بابەتە (دابەشکردنی بیدعە بۆ پێنج بەش) شێوازێك دەنوێنێت لە

---

(١) "المساجلة العلمية بين الإمامين العز وابن صلاح" بتحقيق الألباني ص٨٠٧، و "أصل صفة الصلاة" للألباني (٣/ ٩٧٧).

(٢) "الفتاوى عز بن عبد السلام" ص٤٧، و "أصل صفة الصلاة" للألباني (٣/ ٩٧٧).

(٣) "الفتاوى عز بن عبد السلام" ص١٧٣، و "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص٢٤١.

(٤) "الفتاوى عز بن عبد السلام" ص١٧٣، و "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص٢٤٠.

پەیوەستنەبوونی چواردەوری بەڵگە و مەبەستە شەرعییەکان، بەڵام «نحمل کلامه المطلق علی المقید» کۆی گشتی قسەکانی ڕەچاو دەکرێت و قسە پەیوەستەکانی ناخوێنرێتەوە و زاڵ ناکرێت بەسەر کۆی گشتی بەرنامە زانستییەکەیدا، وە ئادەمیزادیش بەدەر نییە لە هەڵە و کەم و کورتی، وە گەر واش نەبێت «شَيْخُ الْإِسْلَامِ حَبِيبُنَا، وَلَكِنِ الْحَقُّ أَحَبُّ إِلَيْنَا مِنْهُ»[١]. (عز بن عبد السلام) خۆشەویستمانە، بەڵام حەق خۆشەویسترە لامان تا ئەو.

وە تەنانەت قوتابییەکەی ئیمامی (القرافي) ﷺ کاتێك شوێنکەوتەی مامۆستاکەی دەبێت لە درێژەپێدانی ئەم بابەتەدا ئیمامی (الشاطبي) ﷺ ڕەخنەی لێ دەگرێت و دەڵێت: «اتَّبَعَ فِي هَذَا التَّقْسِيمِ شَيْخَهُ مِنْ غَيْرِ تَأَمُّلٍ ... أَنَّهُ مُنَاقِضٌ لِقَوْلِهِ فِي آخِرِ الْفَصْلِ: "الْخَيْرُ كُلُّهُ فِي الِاتِّبَاعِ، وَالشَّرُّ كُلُّهُ فِي الِابْتِدَاعِ"»[٢].

واتە: شوێنکەوتەی مامۆستاکەی بووە لەم دابەشکردنە دا بەبێ تێڕوانین ... وە پاشان ئەم دابەشکردنە پێچەوانە و هەڵوەشاندنەوەی کۆتا قسەیەتی لە بابەتەکەدا کە دەڵێت: "هەموو خێرێك لە شوێنکەوتەی سوننەتدایە، وە هەموو شەڕێك لە دروستکردنی داهێنراوەکاندایە".

ئەم ئیمامانە و هاوشێوەکانیان لە کوێ و ئەوانە لە کوێ کە نوقمی ڕێگەی پڕ بیدعە و گومڕایی و دونیایی بوون و بێئاگا لە زانستی شەرعی و بەرنامەی زانایانی ئەهلی سوننەت، کاتێك قسەکانیان بەتایبەت لەم بوارەدا دەقۆزنەوە بۆ مەبەستە دوور لە دین و زانستە شەرعییەکان «أين الثری من الثریا؟» خاکی دونیا لەکوێ و ئەستێرەی بڵندی سورەییا لەکوێ؟

بڕیاردان لەسەر بوونی داهێنراوی چاك هەموو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵکردنی مانای داهێنراو لە ڕووە زمانەوانی و پێناسە شەرعییەکەیەوە لە هەندێك وتەی (السلف الصالح) و زانایاندا، بە جیاکردنەوەی ئەم دوانە لە یەکتر هەموو گومانێك دەڕەوێتەوە[٣].

---

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٣/ ٣٦٦).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٢٣ - ٣٢٩).

(٣) "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص٢٤٠.

# ڕوانگەی سێیەم: داهێنراو هەمووی گومڕاییە

## ( البدعة كلها ضلالة )

داهێنراو یەك جۆرە، وە ئەویش گومڕاییە و حەرامە و تاوانە، هیچ بەشێك هەڵناگرێت، بە شێوەیەکی گشتی بەڵگەکان لە سەرەتای ئەم نوسینەدا خراونەتە ڕوو، بەڵام بە تێپەڕبوون بەسەریاندا دەینوسینەوە.

### بەڵگەکان:

### ئایەتەکان:

۩ خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ [المائدة : ٣].

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دونیا دەرنەچوو تا هەموو دین کامڵ بوو، پێویستی بە هیچ نەبووە، وە ئەمە یەکێکە لە پلەوپایەکانی ئیسلام بەسەر ئایینەکانی ڕابردوودا.

۩ خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣﴾ [الأنعام : ١٥٣].

ڕێگەی خوای پەروەردگار ڕاست و دروست و کارکردنە بە سوننەت، ڕێگەکانی تریش دووبەرەکایەتی و گومڕاییە و کارکردنە بە داهێنراوەکان.

۩ خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ١٥٩﴾ [الأنعام : ١٥٩].

تەبەڕڕا کردنی پێغەمبەری خوا و سوننەتەکانی مانای کەوتنە ناو داهێنراوەکان و ڕێگە گومڕاییەکانەوەیە.

## فەرموودەکان:

❁ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»(١).

واته: ئاگاداری دروستکراوەکان بن، هەموو دروستکراوێکی دینی بیدعەیه و هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییه.

❁ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»(٢).

❁ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «فَإِنَّ لِكُلِّ عَابِدٍ شِرَّةً، وَلِكُلِّ شِرَّةٍ فَتْرَةً، فَإِمَّا إِلَى سُنَّةٍ، وَإِمَّا إِلَى بِدْعَةٍ، فَمَنْ كَانَتْ فَتْرَتُهُ إِلَى سُنَّةٍ، فَقَدِ اهْتَدَى، وَمَنْ كَانَتْ فَتْرَتُهُ إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ فَقَدْ هَلَكَ»(٣).

واته: هەموو کارێك (خاوەن کارێك) گوڕێك و توانایەکی هەیە، وە هەموو توانایەکیش ماوەیەکی هەیە، هەرکەسێك ماوەی تواناکەی بە ڕێگەی سونەتەکەی من بێت؛ هیدایەتدراوە و هەرکەسێك ماوە و تواناکەی بێجگە لەوە بێت تیاچووە.

## وتەی هاوەڵان:

✍ قال ابن عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ وَإِنْ رَآهَا النَّاس حَسَنَة»(٤).

واته: هەموو داهێنراوێك گومڕاییه گەر هەموو خەڵکیش بە باشی بزانن.

✍ قال ابن مسعود رضي الله عنه: «اتَّبِعُوا آثَارَنَا، وَلَا تَبْتَدِعُوا؛ فَقَدْ كُفِيتُمْ»(٥).

واته: شوێنکەوتەی پاشماوە و کارەکانمان بن، خاوەنی داهێنراو مەبن، ئیتر بەستانه.

---

(١) رواه ابن ماجه (٤٢) وقال (شعيب الأرنؤوط): حديث صحيح بطرقه وشواهده، وسبق تخريجه ص٤٤.

(٢) رواه البخاري (٢٦٩٧)، ومسلم (١٧١٨) واللفظ له، وسبق تخريجه ص٤٥.

(٣) رواه أحمد (٦٤٧٧)، وقال (أحمد شاكر): إسناده صحيح، وابن حبان في "صحيحه" (١١)، وسبق تخريجه ص٥٠.

(٤) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢٠٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨/ ٤)، وسبق تخريجه ص٥٦.

(٥) رواه أحمد في "الزهد" (١٦٢)، والوكيع في "الزهد" (٣١٥)، وابن نصر في "السنة" (٧٨)، وسبق تخريجه ص٥٥.

✍ عن حذيفة ﷺ: «اتَّبِعُوا سُبُلَنَا، وَلَئِنِ اتَّبَعْتُمُونَا لَقَدْ سُبِقْتُمْ سَبْقًا بَعِيدًا، وَلَئِنْ خَالَفْتُمُونَا لَقَدْ ضَلَلْتُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا»(١).

واته: شوێنکەوتەی ڕێگەکانمان بن، گەر شوێنکەوتەمان بن ئەوا پێشکەوتنێك بەدەست دەهێنن زۆر لە پێش، وە گەر پێچەوانەمان بن ئەوا گومڕا دەبن بە گومڕاییەکی زۆر دوور.

✍ (عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص) ﵄ دەفەرمویێت: «مَا ابْتُدِعَتْ بِدْعَةٌ إِلَّا ازْدَادَتْ مُضِيًّا، وَلَا نُزِعَتْ سُنَّةٌ إِلَّا ازْدَادَتْ هَرَبًا»(٢).

واته: هەر داهێنراوێك دادەهێنرێت زیاتر بەردەوامی پێ دەدرێت، وە هەر سوننەتێك لادەبرێت زیاتر دەڕوا و نامێنێت.

✍ (عبدالله ی کوڕی عباس) ﵄ دەفەرمویێت: «عَلَيْكُمْ بِالِاسْتِقَامَةِ وَالْأَثَرِ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّبَدُّعَ»(٣).

واته: هەوڵی خواپەرستی و مانەوە بدە لەسەر بەرنامەکەی خوا و شوێنکەوتە بە و بیدعەکار مەبە.

✍ (مەعازی کوڕی جەبەل) ﷺ دەفەرمویێت: «... وَإِيَّاكُمْ وَالْبِدَعَ وَالتَّبَدُّعَ وَالتَّنَطُّعَ وَعَلَيْكُمْ بِأَمْرِكُمُ الْعَتِيقِ»(٤).

واته: خۆتان بپارێزن لە بیدعە و بیدعەکاری، پەیوەست بن بە کار و بەرنامە کۆنەکەتانەوە.

✍ (ئوبەی کوڕی کەعب) ﷺ دەفەرمویێت: «عَلَيْكُمْ بِالسَّبِيلِ وَالسُّنَّةِ، ...»(٥).

واته: پەیوەست بن بە ڕێگەی مەنهەج و سوننەتەوە.

---

(١) "البدع" لابن وضاح (١٥).

(٢) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢٢٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨/ ٧)، وسبق تخريجه ص٥٨.

(٣) "البدع" لابن وضاح (٦١).

(٤) رواه ابن وضاح في "البدع" (٦٢)، وفي "شرح لامية ابن تيمية" (١٩/ ١٢)، وسبق تخريجه ص٥٩.

(٥) رواه الإمام ابن المبارك في "الزهد" باب: لزوم السنة (٢/ ٢١)، وأحمد في "الزهد" (١٠٩٣)، وسبق تخريجه ص٥٩.

کۆدەنگی هاوەڵان لەسەر خراپی و دژایەتی هەموو داهێنراوێك «إِجْمَاعُ السَّلَفِ الصَّالِحِ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ يَلِيهِمْ عَلَى ذَمِّهَا كَذَلِكَ، وَتَقْبِيحِهَا وَالْهُرُوبِ عَنْهَا»[1].

## وتەی زانایان:

ئەمەش هەندێکە لە قسەی زانایان لەسەر داهێنراو کە گومڕاییە و دابەش ناکرێت بۆ هیچ بەشێك:

✎ (أبو حنيفة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «عَلَيْك بالأثر وَطَرِيقَة السّلف وَإِيَّاك وكل محدثة فَإِنَّهَا بِدعَة»[2].

واتە: پەیوەست بە بە فەرمودە و ڕێگەی پێشینە ساڵحەکانەوە و ئاگاداری دروستکراوەکان بە، هەموویان داهێنراون.

✎ (إمام مالك) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «مَنِ ابْتَدَعَ فِي الْإِسْلَامِ بِدْعَةً يَرَاهَا حَسَنَةً، زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَانَ الرِّسَالَةَ»[3].

واتە: هەرکەسێك لە ئیسلامدا بیدعەیەك بکات و بە باشی بزانێت؛ ئەوا وا دەری دەبڕێت کە (ﷺ) دینەکەی نەگەیاندووە.

✎ (إمام أحمد) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «أُصُولُ السُّنَّةِ عندَنَا التَّمَسُّكُ بِمَا كَانَ عَليهِ أَصحَابُ رَسُولِ اللهِ وَالإِقتِدَاءُ بِهِم وَتَركُ البِدَعِ وَكُلُّ بِدعَةٍ ضَلالَةٌ»[4].

واتە: بنەماکانی سوننەت لای ئێمە پەیوەستبوونە بەو ڕێگایەی کە هاوەڵانی لەسەر بووە و شوێنکەوتەیانە و نەکردنی بیدعەیە، وە هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە.

---

(١) "الاعتصام" (١/ ١٨٨)، "أقوم السنن في نقض تقسيم البدع إلى سيء وحسن" لدكتور: أحمد عبدالكريم نجيب ص٧٦، "موقف أهل السنة" لرحيلي ص١١٥، "البدعة وأثرها السيء على الأمة" جامع رسائل لسليم الهلالي ص١٩٢، "الإبداع" لعلي محفوظ ص١١٠.

(٢) "ذم التأويل" لابن قدامة المقدسي ص٣٣، و "أحاديث في ذم الكلام وأهله" لعبدالرحمن المقرىء ص٨٦.

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٦٥)، "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٣٧٣)، وسبق تخريجه ص٦٤.

(٤) رواه أحمد في "أصول السنة" ص١٤، واللالكائي "شرح أصول الاعتقاد" للالكائي (٣١٧)، وسبق تخريجه ص٦٥.

✍ (قاسم بن سلام) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «**البدع والأهواء كلها نوع واحد في الضلال**»[١].

**واته: هەموو داهێنراوەکان یەك جۆرن لـە گومڕاییدا.**

✍ (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «**[كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ] مُتَعَيِّنٌ وَأَنَّهُ يَجِبُ الْعَمَلُ بِعُمُومِهِ**»[٢].

**واته: گومڕابوونی هەموو داهێنراوەکان بنەمایەکە پێویستە کاری پێبکرێت.**

✍ (ابن رجب) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «**فَكُلُّ مَنْ أَحْدَثَ شَيْئًا، وَنَسَبَهُ إِلَى الدِّينِ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ أَصْلٌ مِنَ الدِّينِ يَرْجِعُ إِلَيْهِ، فَهُوَ ضَلَالَةٌ، وَالدِّيْنُ بَرِيءٌ مِنْهُ**»[٣].

**واته: هەرکەسێك گومڕاییەك بکات و بیخاتە پاڵ دینەوە و هیچ بنەمایەکی نەبێت؛ گومڕاییە و دین بەرییە لێی.**

✍ (الشاطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «**[كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ] محمول عند العلماء على عمومه لا يستثنى منه شيء ألبتة، وليس فيها ما هو حسن أصلاً**»[٤]، وە دەڵێت: «**أَنَّ الْبِدَعَ لَا تَنْقَسِمُ إِلَى ذَلِكَ الِانْقِسَامِ، بَلْ هِيَ مِنْ قَبِيلِ الْمَنْهِيِّ عَنْهُ: إِمَّا كَرَاهَةً، وَإِمَّا تَحْرِيمًا**»[٥].

**واته: فەرموودەی (هەموو بیدعەیەك گومڕاییە) لای زانایان بە گشتی کاری پێدەکرێت و هیچ لێدەرکردنێکی تێدا نییە، وە هیچی بە باش دانانرێت، وە هیچی قابیلی هیچ جۆرە دابەشکردنێك نییە، بێجگە لـە حەرام و مەکروە نەبێت.**

**کۆدەنگی زانایانی ئیسلامیش تا ڕێژەیەکی دوور کۆن لـەسەر خراپی و زیانەکانی داهێنراو[٦]، بە تایبەت (البدعة الحقيقية) داهێنراوە بێبنەماکان، گەرچی بۆچوونی جیایان هەبێت لـەسەر**

---

(١) "شرح صحيح البخاري" لابن بطال (٨/ ٥٨٨)، و "التوضيح لشرح الجامع الصحيح" لعمر بن علي المصري (٣١/ ٥٦٨).

(٢) "مجموع الفتاوى" (١٠/ ٣٧٠).

(٣) "جامع العلوم والحكم" بتحقيق (شعيب الأرنؤوط) (٢/ ١٢٨).

(٤) "فتاوى الإمام الشاطبي" ص١٨٠.

(٥) "الاعتصام" بتحقيق (سليم الهلالي) (١/ ٢٧٠).

(٦) **بڕوانە** "أقوم السنن في نقض تقسيم البدع إلى سيء وحسن" لدكتور: أحمد عبدالكريم نجيب ص٩٨، و "إثيار الحق" لابن الوزير ص١٠٩، و "السلفية" لبوطي ص١٤٥.

جۆرەکانی تری داهێنراو، وەکوو (البدعة الإضافية والترك والمصالح المرسلة والاستحسان في البدع)، (داهێنراوی بۆ زیادکراو، کارە نەکراوەکانی پێغەمبەر ﷺ و بە چاك و خێر زانینی وەرگیراوەکان لە دەقەکانەوە)، ئەمانە لەمەودوا باسیان دێت و شوێنی ڕای جیاوازی زانایانن، بەڵام وشەی (بیدعە) وشەیەکی بێزراو و بەخراپ زانین شوێنی و تۆمەتبارکردنی دینییە، وە تەنانەت لە فیرەقە گومڕا ناودارەکانیشدا.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی داهێنراوەکان و خاوەنەکانیان، ناتوانن پشت لە حەق هەڵکەن و هەوا و ئارەزووەکانی خۆشیان تێکەڵ کردووە، ئەم تێکەڵە هۆکاری بنەبڕنەکردن و جیانەکردنەوەیەتی لای خەڵکی.

(ابن تيمية) ﷬ دەڵێت: «وهذا منشأ ضلال من ضل من الأمم قبلنا، وهو منشأ البدع، فإن البدعة لو كانت باطلا محضاً لظهرت وبانت، وما قبلت، ولو كانت حقا محضا، لا شوب فيه، لكانت موافقة للسنة، فإن السنة لا تناقض حقاً محضاً لا باطل فيه، ولكن البدعة تشتمل على حق وباطل»[(١)].

وە دەڵێت: «إذ لو كانت كذلك لم تخف على الناس، ولكن تشتمل على حق وباطل، فيكون صاحبها قد لبس الحق بالباطل: إما مخطئاً غالطاً، وإما متعمداً لنفاق فيه وإلحاد»[(٢)].

واتە: بنەمای گومڕاکان گومڕایی گەلانی پێش ئێمەیە، ئەوەش بنەمای داهێنراوەکانە، گەر داهێنراو بەتاڵی تەواو بوایە دەردەکەوت و ڕوون دەبووەوە و وەریش نەدەگیرا، وە گەر حەقی تەواو بوایە ئەوا گونجاو بوو لەگەڵ سوننەتدا، وە سوننەتیش پێچەوانەی حەق نییە و بەتاڵی تێدا نابێت، بەڵام داهێنراو حەق و بەتاڵ لەخۆ دەگرێت، وە گەر وا نەبوایە لە خەڵك شاراوە نەدەبوو.

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٢٠٩).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٢/ ١٠٤).

## بەڵگە عەقڵییەکان:

بەڵگە عەقڵییەکانیش شاهیدحاڵێکی ترن بۆ بە گومڕازانینی هەموو جۆرێکی داهێنراوێك و دژایەتیکردنیان:

**١.** بڕیاردان لەسەر داهێنراو، ڕەخنەی ناڕاستەوخۆیە بۆ ئیسلام لە ڕووی:

**أ.** تەواو نەبوونی وەکوو دین و قبوڵی زیادە و کەمی تیایدا.

**ب.** شورای پۆلاّیینی ئیسلام و وشەی (شرك، بدعة)یە لە (توحید وسنة) دا لە حەقی خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ، چۆن لە شەریك (هاوبەش) بڕیارداندا دابەشکردنی بۆ چاك و خراپ نییە کە حەقی خوایە، ئاواش بۆ حەقی پێغەمبەرەکەی ﷺ دابەشکردن نییە وشەی (بیدعە) بۆ چاك و خراپ.

**ت.** سەرچاوە (مرجعیة) بۆ گەڕاندنەوە سەری وەکوو دین قورئان و سوننەتە نەك سەرچاوەی عەقڵ و کەسە ناودارەکان و بیدعەی چاکە و حەسەنە بێت بۆ کارکردن و کردنە بەڵگە.

**٢.** بیدعەکار بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دادەنێ، بەو مانایەی چۆن ئەو پێشەوا و ڕێگە و ڕێنموونی دەکات؛ ئەمیش بە هەمان شێوە ئەو حەقانە بە خۆی دەدات.

هەر ئەم هۆکارە بە دانانی وتنی ناوی خۆی لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ کاتێك باسی ڕێنموونی و ڕێگەی هیدایەت دەکات دەفەرموێت: «خَيْرُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[(١)]، باشترین و خێرترین ڕێگەی هیدایەت ڕێگەی (محمد)ە ﷺ، بە ناوی (الرسول أو النبي أو الإسلام أو سنتي ...) نەیبردووە، ئەگەرچی هەر خۆشی دەگرێتەوە، بۆ دڵنیابوون و لێتێکنەچوون، وە هێمایەك بۆ ئەوەی کەسانێك دێن بەرامبەرکێ و هاوشانییەتیم لەگەڵ دەکەن،

---

(١) رواه البخاري (٦٠٩٨) بلفظ: أَحْسَنَ الْهَدْيِ، ومسلم (٨٦٧)، وابن ماجه (٤٥)، والنسائي في "الكبرى" (١٢٣٥)، وأحمد (١٤٣٣٤)، والدارمي في "السنن" (٢١٢)، وابن حبان في "صحيحه" (١٠)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٢٤)، والحاكم في "المستدرك" (٣٥٣)، والبزار في "المسند" (٢٠٥١)، وابن بطة في "الإبانة" (١٧١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٢)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨٣)، والآجري في "الشريعة" (٨٤)، والمروزي في "السنة" (٧٣)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٤)، وابن وضاح في "البدع" (٥٣).

**وەکوو چۆن لە حەقی خوادا هەندێك هاوبەش لە کار و هاوشێوە لە سیفاتەکانی خوادا بۆ خۆیان بڕیار دەدەن، هەردوو لایان ستەمە لە مافی خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەیدا ﷺ، لەبەر ئەوە بیدعەکار بە عینادکەر و لادەر ناودەبرێت.**

**٣. بیدعەکار و داهێنراو ڕێگە خۆش دەکات بۆ خۆبەدەستەوە نەدان بەرامبەر دەقە شەرعییەکان و گێنەدان بە بەڵگە، تێڕوانین لە حاڵی بیدعەکاران دەبینێت ئەمە تایبەتترین وەصفەکانیانە، بۆیە ئیمامی (عومەر) ﷺ دەڵێت: «أَصْحَابَ الرَّأْيِ أَعْدَاءُ السُّنَنِ»[(١)].**

**واتە: خاوەنی بیروڕاکان دوژمنی سوننەتن.**

**بیدعەکاران بە (أهل الكلام والرأي المذموم وأهل الأهواء ...) خاوەن قسە و ڕا و هەوا و ئارەزوو ناوبراون، لەبەرئەوەی هەر ئایەتێك لەگەڵ بیر و بەرنامەیاندا نەگونجابێت بەناوی (مجاز وظني)یەوە کاریان پێ نەکردووە، وە هەر فەرموودەیەکیش نەگونجابێت بەناوی (خبر آحاد)ەوە لەکاریان خستووە.**

**٤. ڕێگەدان بە داهێنراو بەناوی چاکەوە کردنەوەی دەرگایەکی بێسنووری ڕەها و دوور لە هیچ متمانە و بنەما و یاسایەکی کۆدەنگە، ئەمە لە ئاستی زانایاندا، چ جای لە ئاستی خەڵکی گشتیدا.**

**ئیمامی (الذهبي) ﷬ دەڵێت: «وقوم قسموها إلى: محرم، ومكروه، ومباح، ومستحب، وواجب، ... لكنهم لا يكادون يضبطون الفرق بين البدعة الحسنة والبدعة السيئة، فهذا يَسْتَحسِنُ ما يَذُمُّه الآخر»[(٢)].**

**واتە: کەسانێك بیدعەیان دابەش کردووە بۆ حەرام و مەکروه و موباح و موستەحەب و واجب، ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەگەنە ئەو ئاستەی بۆیان ڕێك ناخرێت و جیا ناکرێتەوە جیاوازی نێوان داهێنراوی چاك و خراپ، ئەم بە چاکی دەزانێت ئەو بە خراپی دەزانێت.**

---

(١) رواه الدارقطني (٤/ ١٤٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٣٢٦)، والبيهقي في "المدخل إلى السنن الكبرى" (٢١٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٠١)، والأصبهاني في "الحجة" (١/ ٢٢١)، وابن عبدالبر في "الجامع" (١٩٢٤)، وفي "إعلام الموقعين" لابن القيم (١/ ٤٤).

(٢) "التمسك بالسنن والتحذير من البدع" للذهبي ص٣٠.

ئەم دەرگاکردنەوەیەش دوورە لە هەموو بەرنامەیەکی زانستی شەرعی و لەخۆگری پێناسە و مەرج و زانستێکی سەربەخۆی تۆکمەی پاڵپشت بە بەڵگە و هاوشێوە بنەماکان.

**٥.** دابەشکردن لە داهێنراودا مانای لەکارخستنی فەرموودەکەیە، وەکوو ئیمامی (الذهبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فلازم قولهم: تعطيل معنى قوله: "كل بدعة ضلالة" حيث قابلوا: التعميم بالتقسيم، والإثبات بالنفي، ولم يبق فائدة لقوله: "كل محدثة بدعة"»[1].

واته: مانا و پەیوەستی قسەکەیان لەکارخستنی مانای «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَة»یە هەموو داهێنراوێك گومڕاییە، لە بەرامبەر گشتی وشەی (كل) دابەشکردنیان کردووە و لە بەرامبەر جێگیرکردنی وشەی (بدعه) نەمانیان بۆ ئەم وشەیە جێگیر کردووە، واتە بیدعە نییە چاکەیە، کەواتە هیچ سودێك لە بوونی فەرموودەکەدا نەماوە «كُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة» هەموو تازەیەك لە دیندا داهێنراوە.

**٦.** گەر پیاچوونەوەی داهێنراوەکان بکەین دەبینین چ بەڵا و تاوان و دووبەرەکایەتیەکیان هێناوە بەسەر جیهانی موسوڵماناندا، هەر لە دروستبوونی فیرەقەکان و ڕێگەکانی سۆفیگەرێتی و دەروێشایەتی و هەڵبەستنی گۆڕ و خانەقا و تەکیە و مەراسیمی سەیروسەمەرەی پڕ گومڕایی، هەروەك دینێکی سەربەخۆی جیا لە ئیسلام پشان دەدەن.

بۆیە لە ووردبینینەوەدا دەبینین زۆری ئەوانەی پەنا دەبەنە بەر دابەشکردن بۆ داهێنراو بیدعەکارانن و خاوەن بەرنامەی لادراون لە ڕێڕەوی ڕاستی دین.

**٧.** حیکمەتی خوا وایە ڕێگە نادات بە داهێنراوی چاك لە دیندا، لەبەر جیاوازی و ئاست و ڕێژەی ژیری و عەقڵ لای ئادەمیزاد.

وەکوو دەوترێت:

وَالنَّقْصُ فِي أَصْلِ الطَّبِيعَةِ كَامِنٌ فَبَنُو الطَّبِيعَةِ نَقْصُهُمْ لَا يُجْحَدُ[2]

واته: ناتەواوی لە بنەمای سروشتدا جێگیر کراوە، بوونە سروشتیەکان ناتەواوییان نکوڵی ناکرێت.

---

(١) "التمسك بالسنن والتحذير من البدع" للذهبي ص٣١.

(٢) "مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين" لابن القيم (٣/ ٤٨٢).

پاشان دەرگای (تشريع) یاسا دارِشتنە لە ئیسلامدا، وە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ٢٦﴾ [الكهف: ٢٦]، ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾ [الأعراف: ٥٤]، ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ [المائدة: ٥٠].

واتە: تاکە کەسێك بەشداری لە یاسای خوا ناکات، وە دروستکردن و فەرمان هەر بۆ خوایە، وە دەفەرموێت: ئەوە یاسای سەردەمی نەفامێتیتان دەوێت؟!

بەدەر لەوەی داهێنراوەکان هۆکاری کات بەفیڕۆدانن و مانەوە لە هەڵە و بێبەشی لە هیدایەتدان.

**٨.** خاوەن ڕاوبۆچوونانی دابەشکاری داهێنراو جۆرێك لە بۆچونی جیاواز لەخۆ دەگرێت، لە لایەکەوە دەیکەنە دوو بەش و لە لایەکی تریشەوە دەیکەنە پێنج بەش و لەلایەکی تریش سوورن لەسەر دژایەتیکردنی بیدعە و بە گومڕا زانینی.

وەکوو (ابن حجر العسقلاني) ﷀ دەڵێت: «وَقَوْلُهُ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ قَاعِدَةٌ شَرْعِيَّةٌ كُلِّيَّةٌ بِمَنْطُوقِهَا وَمَفْهُومِهَا أَمَّا مَنْطُوقُهَا فَكَأَنْ يُقَالَ حُكْمُ كَذَا بِدْعَةٌ وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ فَلَا تَكُونُ مِنَ الشَّرْعِ لِأَنَّ الشَّرْعَ كُلَّهُ هُدًى»[1].

واتە: ئەو فەرموودەیە یاسایەکی گشتی وتراو و تێگەیشتووە لێی، وتراو وەکوو ئەوەی بلێت حوکمی ئەوە بیدعەیە و هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە، لە شەرعیشدا نییە لەبەر ئەوەی شەرع هەمووی هیدایەتە.

وە دەڵێت: «والمحدثات: الْمُرَادُ بِهَا مَا أُحْدِثَ وَلَيْسَ لَهُ أَصْلٌ فِي الشَّرْعِ وَيُسَمَّى فِي عُرْفِ الشَّرْعِ بِدْعَةً وَمَا كَانَ لَهُ أَصْلٌ يَدُلُّ عَلَيْهِ الشَّرْعُ فَلَيْسَ بِبِدْعَةٍ ... وَقَدْ تَنْقَسِمُ إِلَى الْأَحْكَامِ الْخَمْسَةِ»[2].

واتە: دروستکراوەکان مەبەست بەوانەیە کە بنەمایان لە شەرعدا نییە، ئەمە لە عورفی شەرعدا بیدعەیە، وە ئەوەی بنەمای هەبێت لە شەرعدا پێی ناوترێت بیدعە، وە دەشێت بکرێت بە پێنج

(١) "فتح الباري" (١٣/ ٣١٦).

(٢) "فتح الباري" (١٣/ ٢٥٣).

بەشە حوکمەکەوە.

وە هەروەها ئیمامی (النووي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «البِدعة ...هي منقسمة إلى: حسنة وقبيحة»[١].

وە دەڵێت: «وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ هَذَا عَامٌّ مَخْصُوصٌ وَالْمُرَادُ غَالِبُ الْبِدَعِ ... قَالَ الْعُلَمَاءُ الْبِدْعَةُ خَمْسَةُ أَقْسَامٍ وَاجِبَةٌ وَمَنْدُوبَةٌ وَمُحَرَّمَةٌ وَمَكْرُوهَةٌ وَمُبَاحَةٌ»[٢].

واتە: «وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» فەرموودەیەکی گشتی تایبەت لەخۆگرە، مەبەست پێی زۆری بیدعەکانە، زانایان دەیکەن بە پێنج بەشەوە.

وە ساتێك بە پێناسەی زمانی «فَالْبِدْعَةُ فِي عُرْفِ الشَّرْعِ مَذْمُومَةٌ بِخِلَافِ اللُّغَةِ فَإِنَّ كُلَّ شَيْءٍ أُحْدِثَ عَلَى غَيْرِ مِثَالٍ يُسَمَّى بِدْعَةً سَوَاءٌ كَانَ مَحْمُودًا أَوْ مَذْمُومًا»[٣].

واتە: بیدعە لە بەکارهێنانی شەرعدا خراپە، بە پێچەوانەی زمانەوانییەوە کە هەموو تازەیەك لەخۆ دەگرێت، خراپ بێت یان چاك.

کەوابوو ئەم دابەشکردنە ئەم جیاوازیانە بەدوای خۆیدا دێنێت بەڵگەیە لەسەر بەتاڵ: «إنّما يَلزم البَاطلُ البَاطل»[٤].

بە پێچەوانەی بە گومڕا زانین و دابەشنەکردنی، حەق لەدوای حەق بەدوای خۆیدا دەهێنێت و هەموو متمانە و هۆکارێکی دین پاراستن و پەیوەستبوون بە سوننەتەوە لەخۆ دەگرێت.



(١) "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (٣/ ٢٢).

(٢) "شرح النووي على مسلم" (٦/ ١٥٤).

(٣) "فتح الباري" لابن حجر (١٣/ ٢٥٣).

(٤) "تحذير المسلمين" للبنعلي ص١٢٦.

# بەشی دووەم

## جۆرەکانی داهێنراو ( أنواع البدعة )

١. داهێنراوی تەواو ( البدعة الحقيقية ).

٢. داهێنراوی بۆزیادکراو ( البدعة الإضافية ).

٣. داهێنراوی نەکردوو ( البدعة التركية ).

٤. داهێنراو لەژێر ناونیشانی سوودمەندییە ڕەچاوکراوەکانی شەرع ( المصالح المرسلة ).

## یەکەم : داهێنراوی ڕاستەوخۆ (البدعة الحقيقية)

داهێنراوی ڕاستەوخۆ ئەو داهێنراوەیە کە هیچ بنەمایەکی لە دیندا نەبێت و لەژێر هیچ جۆرە مەبەست و یاسایەکی شەرعیدا جێگەی نەبێتەوە.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ لە پێناسەکەیدا دەڵێت: «إِن الْبِدْعَةَ الْحَقِيقِيَّةَ هِيَ الَّتِي لَمْ يَدُلَّ عَلَيْهَا دَلِيلٌ شَرْعِيٌّ لَا مِنْ كِتَابٍ، وَلَا سُنَّةٍ، وَلَا إِجماعٍ، وَلَا قِيَاسٍ، وَلَا اسْتِدْلَالٍ مُعْتَبَرٍ عِنْدَ أَهل الْعِلْمِ، لَا فِي الْجُمْلَةِ، وَلَا فِي التَّفْصِيلِ، وَلِذَلِكَ سُمِّيَتْ بِدْعَةً؛ لأَنها شيءٌ مُخْتَرَعٌ عَلَى غَيْرِ مِثَالٍ سَابِقٍ»[1].

واتە: داهێنراوی تەواو ئەو داهێنراوەیە بێبنەمایە لە بەڵگەی شەرعی، نە لە قورئان و نە لە سوننەت و نە لە کۆدەنگی زانایان و نە لە قیاسدا، وە نە لە هیچ شێوازێکی جۆری بەڵگە هێنانەوەی زانایـاندا بە جۆری کورت یا شیکراوە نەبێت لەسەر ئەو داهێنراوە، بۆیە پێی دەوترێت

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ١٤١).




داهێنراو کارێکی دروستکراوە بەبێ بوونی شێوازی پێشووی.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وإِن كَانَ المبتَدِعُ يأْبى أَن يُنْسَبَ إِليه الخُرُوجُ عَنِ الشَّرْعِ، إِذ هُوَ مُدَّعٍ أَنه دَاخِلٌ بِمَا اسْتَنْبَطَ تَحْتَ مُقْتَضَى الْأَدِلَّةِ، لَكِنَّ تِلْكَ الدَّعْوَى غَيْرُ صَحِيحَةٍ»[(١)].

واته: گەر خاوەنەکەشی ڕازی نەبێت بەوەی (دەرچوو لە شەرع) بدرێتە پاڵی؛ گەرچی ئەو وا بڕیار دەدات کە لەژێر بنەمایەکی بەڵگەدا ئەم کارە دەکات؛ بەڵام ئەمانە هیچی ڕاست نییە لەبەر نامۆیی خۆی و نەبوونی بەڵگەی.

ئەم جۆرە داهێنراوە بوونی زۆرتر و فراوانتر و ناودارترە لەناو خەڵکیدا، لە زۆر ڕوون و ئاشکراییدا شاراوە نییە لەسەر هیچ کەس، وەکوو حەرام حەڵاڵکردن و پێچەوانەکەی و جۆرە بیرە گومڕاییەکانی وەکوو کارنەکردن بە سوننەت و عەقڵ و کەسە ناودارەکان کردنە بەڵگە و پێشخستنی بەسەر قورئان و سوننەتدا و (معصمومية)ی ئیمامەکان لای (شیعە) و بەرزکردنەوەی پلەی ئەولیاکانیان بەسەر پلەی پێغەمبەران و (خاتم الأولياء) لای سۆفییەکان و ڕەهبانییەت و خەڵوەت و تەواف بە دەوری گۆڕە هەڵبەستراوەکان و قورئان خوێندن بە کۆمەڵ بە یەك دەنگ و سڵاوات لەپێش بانگ و بانگدان و قامەتکردن بۆ نوێژی هەردوو جەژن و ڕۆژگیران و یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ و چلەی مردوو و نوێژی (صلاة الرغائب)ی ڕەجەب، ئەمانە هەموویان داهێنراوی بێبنەمای تەواون (بدعة الحقيقية)، لەبەر ئەوەی لە هەموو ڕوویەکەوە داهێنراوێکی ئاشکرا و زەقە و هیچ پەیوەندییەکی دوور و نزیکی نییە بە هیچ جۆرە بەڵگە و سوننەتێکەوە: «فهي بعيدة عن الشرع خارجة عنه من كل وجه إن كان المبتدع قد يتمسك فيها بما يزعمه شبهة وليس بها ...»[(٢)].

واته: دوورە لە شەرع و دەرچووە لێی لە هەموو ڕوویەکەوە، وە گەر بیدعەکاریش وا دەری بڕێت شتێکی بەدەستەوەیە لەسەری بەڵام هەمووی گومان (شبهات)ەکانە و نابنە بەڵگە.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ١٤١).

(٢) "الابداع" لعلي محفوظ (٢/ ١٤١).

بە کورتی و کۆکراوەیی پێناسەی داهێنراوی حەقیقی بریتییە لە: «والمعنى الجامع للبدعة الحقيقية: التقرب إلى الله بالعبادة المخترعة من جهة أصلها ومن جهة وصفها»[١].

واتە: نزیکبوونەوە و پەرستنی خوای پەروەردگار بە عیبادەتێکی دروستکراو، لە ڕووی بناغە و لە ڕووی وەصفییەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا هەر بانگەوازی بەڵگەکاریشی بۆ دەکرێت لەلای بیدعەکارانەوە، ئەمە کاری هەموویانە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ: «ولا يستطيع ترك التعلق بالأدلة لئلا ينسب إليه مضادة الشريعة، أو الخروج عليها صراحة هذا من جهة، ومن جهة أخرى حتى يثبت صلاحية هذه البدعة للتعبد والتقرب بها»[٢].

**یەکەم:** بۆ ئەوەی دژایەتی و دەرچوونی ڕاستەوخۆی دینی نەخرێتە پاڵیان.

**دووەم:** تاوەکوو هۆکاری بە عیبادەت و چاك و دین زانینی برازێنێتەوە لای خەڵکی و شایستەی وەرگرتن بێت.

## ئەو بەڵگانەی کە خاوەن بیدعەکاری حەقیقی پشتی پێ دەبەستێت

«الأول: أدلة غير شرعية فاسدة الأصل والدلالة، ويدخل في هذا الصنف كثير من أدلة أهل الأهواء كالرأي والنظر، والذوق، والكشف ....، الصنف الثاني: أدلة شرعية غير ثابتة، كالأحاديث المتفق على أنها ضعيفة أو موضوعة، أو لا أصل لها»[٣].

واتە: **یەکەم:** بەڵگەی بێبنەمای شەرعی شێواو لە ڕووی بنەما و بەڵگەکارییەوە، زۆری بیدعەکارانی گەورە لە فیرەقەکان دەچنە ژێر باری ئەم بوارەوە، وەکوو: کارکردن بە عەقڵ و پێشخستنی بەسەر قورئان و فەرموودەدا و کارنەکردن بەو دەقانەی ناگونجێت لەگەڵ بەرنامەیاندا بەناوی بەڵگەی گومانای (ظني الدلالة) و کارنەکردن بە فەرموودەی (آحاد) و خەو و

---

(١) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٣٢.

(٢) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٨).

(٣) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٨، ٩).

كەشف و كەراماتی وەلییەكانیان كە دەیكەنە بەڵگە و باوەڕبوون وەكوو بنەمای دینی بە پارێزراوی و بێتاوانی ئیمامەكانیان (عصمة الأئمة) و دارشتنی بنەمای دینی (أصول الدين) بۆ پێنج بەش لای موعتەزیلە و شیعەكان، دوور لە بەڵگەی شەرعی وەكوو (أصول الدين خمسة: التوحيد، المعاد، منزلة بين منزلتين، الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر، الإمامة والنبوة).

**دووەم:** بەڵگە شەرعییە یەكلانەبووەوە ناپەسندەكان، وەكوو ئەو فەرموودانەی كۆدەنگیان لەسەرە كە درۆ و هەڵبەستراو و لاوازن یا هیچ بنەمایەكیان نییە، ئەمانە زۆری ئەو بیدعەكارانە دەچنە ژێر باری ئەم بوارەوە و لە عیبادات و كارە دینییەكاندا كەوتوونەتە داهێنراوەكانەوە، لە چینی دوور لە زانست لە خەڵكیدا لە سۆفی و دەروێش و شوێنكەوتەی مەزاهیبەكان و بێئاگایانی خەڵك.

مەرجی (البدعة الحقيقية) داهێنراوی حەقیقی ئەوەیە كە هیچ بنەمایەكی دروستی نەبێت لە دیندا، بەڵام ئەگەر بنەمای دینی هەبێت یا بە هەڵە لێكدانەوە بێت یاخود بەڵگەكان یەكلانەبووەوە بێت وەكوو (حديث الضعيف)؛ ئەوا لە داهێنراوی حەقیقییەوە دەگۆڕێت بۆ (البدعة الإضافية) داهێنراوە بۆ زیادكراوەكان: «أما إن كان ثبوتها أو ضعفها مختلفاً فيه بين العلماء المعتبرين فالحديث عنها في البدع الإضافية»[(١)].

یاخود «بدعة حقيقية مآلاً لا ابتداء؛ إذ هي من حيث الابتداء بدعة إضافية»[(٢)].

واتە: لە بنەمادا بیدعەی (إضافية) بۆ زیادكراوە بەڵام بە بەردەوامبوون لەسەری پێوەلكاندنی وەصفێكی شەرعی زاڵ بوو بەسەردا دەبێتە بیدعەی حەقیقی، وەكوو: (بەردەوام هەموو كات دوعای خەتمی قورئان لە نوێژدا و قنووتی بەیانیان و دوعای بە كۆمەڵی بەردەوام لە دوای نوێژە فەرزەكان).

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٩).

(٢) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٤٦.

**داهێنراوی حەقیقی کاردانەوەکانی لەمانەی خوارەوەدا بەدی دەکرێت**[١]:

**١.** بیروبۆچوونی فیرەقە گومڕاکان، وەکوو: (خوارج، معتزلة، مرجئة، الرافضة، التصوف الفلسفي، قدرية ...).

**٢.** گۆڕانکاری لە دانان و بارودۆخە دینییەکاندا، وەکوو: میراتی و شایەتی ئافرەت وەکوو پیاو و حەددی زینا و دزی و تۆمەت بۆ بژاردنی ماڵیی ... .

**٣.** شێوەکاری بێبڕوایان لە جەژن و هێما دینییەکاندا (التشبه بالكفار).

**٤.** پەرستنی خوا بە کارە تاوانەکان (التقرب إلى الله بفعل المعاصي)، وەکوو: ڕەقصکردن بەناوی زیکرەوە، تەپڵ لێدان و زرگ وەشاندن، تێکەڵبوونی پیاوان و ئافرەتان لە کاری عیبادەتی و دینداریدا.

لە ڕووی تاوانبارییەوە: «فَإِنَّ الْحَقِيقِيَّةَ أَعْظَمُ وِزْرًا، لِأَنَّهَا الَّتِي بَاشَرَهَا الْمُنْتَهِي بِغَيْرِ وَاسِطَةٍ، وَلِأَنَّهَا مُخَالَفَةٌ مَحْضَةٌ وَخُرُوجٌ عَنِ السُّنَّةِ ظَاهِرٌ»[٢].

واتە: داهێنراوی حەقیقی تاوانەکەی گەورەیە، لەبەرئەوەی خاوەنەکەی بەبێ هیچ پەیوەندییەکی دینی کارەکەی کردووە و بە ئاشکرا دژایەتی و دەرچوونی لە سوننەت دەربڕیوە.

## دووەم : داهێنراوی بۆ زیادکراو
## (البدعة الإضافية)

داهێنراوی بۆ زیادکراو: «البدعة الإضافية: هي البدعة النسبية، وهي: ما كان الإحداث فيها من جهة صفتها وكيفيتها، مع كونها مشروعة من جهة أصلها، التقرب إلى الله بالعبادة الثابتة من جهة أصلها، المخترعة من جهة وصفها»[٣].

---

(١) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٤٨.

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٢١).

(٣) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٤٤، ٤٩.

واتە: ئەو داهێنراوە ڕێژەییەیە کە لەڕووی شێواز و چۆنێتییەوە داهێنانی تێدایە لەگەڵ ئەوەی لەڕووی بنەمای دینییەوە بنەمای هەیە، خواپەرستی و نزیکبوونەوە لە خوا بەم شێوازە.

ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «وَأَمَّا الْبِدْعَةُ الْإِضَافِيَّةُ؛ فَهِيَ الَّتِي لَهَا شَائِبَتَانِ:

إِحْدَاهُمَا: لَهَا مِنَ الْأَدِلَّةِ مُتَعَلَّقٌ، فَلَا تَكُونُ مِنْ تِلْكَ الْجِهَةِ بِدْعَةً.

وَالْأُخْرَى: لَيْسَ لَهَا مُتَعَلَّقٌ إِلَّا مِثْلَ مَا لِلْبِدْعَةِ الْحَقِيقِيَّةِ.

فَلَمَّا كَانَ الْعَمَلُ الَّذِي لَهُ شَائِبَتَانِ لَمْ يَتَخَلَّصْ لِأَحَدِ الطَّرَفَيْنِ؛ وَضَعْنَا لَهُ هَذِهِ التَّسْمِيَةَ، وَهِيَ "الْبِدْعَةُ الْإِضَافِيَّةُ".

أَيْ أَنَّهَا بِالنِّسْبَةِ إِلَى إِحْدَى الْجِهَتَيْنِ سُنَّةٌ؛ لِأَنَّهَا مُسْتَنِدَةٌ إِلَى دَلِيلٍ، وَبِالنِّسْبَةِ إِلَى الْجِهَةِ الْأُخْرَى بِدْعَةٌ؛ لِأَنَّهَا مُسْتَنِدَةٌ إِلَى شُبْهَةٍ لَا إِلَى دَلِيلٍ، أَوْ غَيْرِ مُسْتَنِدَةٍ إِلَى شَيْءٍ»[(١)].

واتە: ئەم داهێنراوە دوو شێوازی تێکەڵی لەخۆ دەگرێت:

**یەکەم:** پەیوەستییەکی بە بەڵگەوە هەیە، لەم ڕووەوە بیدعە نییە.

**دووەم:** لە ڕوویەکی ترەوە هیچ پەیوەندییەکی نییە بە بەڵگەوە وەکوو داهێنراوی حەقیقی.

کاتێك بەم شێوە بووە ئەم ناوەمان بۆ دانا (داهێنراوی بۆزیادکراو)، لە ڕوویەکەوە سوننەتە و لە ڕوویەکەوە بیدعەیە، لەبەر بێبنەمایی یا بەڵگەی گوماناوی.

نموونەی داهێنراوی بۆزیادکراو: (سڵاواتی دوای بانگ و وتنی "الصلاة خير العمل" و دوعاکردن بە کۆمەڵ دوای نوێژە فەرزەکان و تایبەتکردنی ڕۆژ و کات بۆ ڕۆژوو و خوێندنی زیکری تایبەت بە ڕۆژ و شەوەوە، وە نوێژکردنێك بە شێوازێکی بێبنەما لە بەڵگە، دەنگ بەرزکردنەوە بە قورئانخوێندن و زیکر لە پێش جەنازەوە و خوێندنی دوعا و زیکری تایبەت لە شەوی بەراتدا و کردنە بۆنە، وە خوێندنی "اللهم رب هذه الدعوة التامة" پێش نوێژ بە کۆمەڵ و دانانی مەجلیس و کۆبوونەوە بۆ تەعزیە ... .

هەر گۆڕانکارییەك لە عیباداتەکاندا بکرێت لە ڕووی کات و شوێن و ژمارەو چۆنێتییەوە دەبێتە (البدعة الإضافية) داهێنراوێکی بۆزیادکراو.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٦٧، ٣٦٨).

داهێنراوێکی بۆزیادکراو لە ڕووی پەیوەندیبوون و نەبوونی بە کارە شەرعییەکان و پشتبەستنی خاوەنەکەی بە بەڵگەوە دەبێتە دوو بەشەوە:

«الْإِضَافِيَّةَ أَوَّلًا عَلَى ضَرْبَيْنِ:

أَحَدُهُمَا: يَقْرُبُ مِنَ الْحَقِيقِيَّةِ، حَتَّى تَكَادَ الْبِدْعَةُ تُعَدُّ حَقِيقِيَّةً.

وَالْآخَرُ: يَبْعُدُ مِنْهَا حَتَّى (يَكَادَ) يُعَدُّ سُنَّةً مَحْضَةً»(١).

**یەکەم:** لە داهێنراوی حەقیقییەوە نزیك دەبێتەوە تاوەکوو بە داهێنراوێکی حەقیقی دادەنرێت.

**دووەم:** لە حەقیقییەوە دوور دەکەوێتەوە تاوەکوو بە سوننەتێکی تەواو دادەنرێت.

**نموونە بۆ یەکەم:** زیادەڕەوی لە عیبادەتدا، وەکوو شەونوێژکردن لە هەموو شەودا بەردەوام، بەڕۆژووبوون لە هەموو ڕۆژەکانی ساڵ، تایبەتکردنی ڕەهاکان و ڕەهاکردنی تایبەتەکان لە عیباداتدا (تقيد المطلق وإطلاق المقيد)، وەکوو تایبەتکردنی ژمارەیەکی دیاریکراوی نوێژ و زیکر و ڕۆژوو و دوعا بە چۆنێتییەکی تایبەتەوە لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا.

یاخود پەیوەستکردنی خۆی بە پۆشین و خواردن و ژیانێکی زبرەوە لەگەڵ توانا و بوونی پێویستییەکانی ژیان و خاوەنێتی بۆی، بە نیەتی ئازاردانی نەفس و قورسکردن لەسەری و نزیکبوونەوە و پەرستنی خوا ﷻ، وەکوو دوو ڕێگا لە بەردەستیایەتی هەردووکیان بۆ یەك مەبەست دەڕوات، یەکێکیان ئاسان و ئەویتریان قورسە، بەڵام ئەم ڕێگا قورسەکە هەڵدەبژێرێت.

وەکوو ئاوێکی سارد و گەرم لە بەردەستیا هەبێت بۆ دەستنوێژ، ئەم ئاوە ساردەکە هەڵبژێرێت لەکاتی سەرمادا، وا گومان دەبات ئەم شێوازە هەڵبژاردنە سوننەت و شەرعییە، بە تێگەیشتنی لەم فەرموودەیە: «أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ؟» قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، ...»(٢).

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٦٨).

(٢) رواه مسلم (٢٥١)، والترمذي (٥١)، والنسائي في "الكبرى" (١٣٨)، وابن ماجه (٤٢١)، وأحمد (١٠٩٩٤)، وابن حبان في "صحيحه" (١٠٣٨)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٥)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٢٤٨)، والبغوي في "شرح السنة" (١٤٩)، والبيهقي في "الشعب" (٢٤٨٣).

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەواڵتان بدەمێ لەسەر ئەوانەی تاوانەکان دەسڕێتەوە و پلەکانی پێ بەرز دەبێتەوە! دەستنوێژگرتن لەسەر ناخۆشییەکان.

وا گومان دەبات بەزۆر پێکردنی نەفس لەسەر ئەم کارانە ئەو پلانە بەدەست دێت.

ئەم شێوە بە بەڵگەکردنە ڕاست نییە، بەڵکوو مەبەست لە فەرموودەکە دەستنوێژگرتن بە ناچاری لەسەر ئەو کارە شوێنی پاداشتە، نەك بە دەست ئەنقەست دروستکردن.

وەکوو کەسێك لە زستاندا ئاوی گەرمی دەست ناکەوێت بۆ دەستنوێژ بێجگە لە سارد نەبێت، ئەم هۆکاری ساردییە نەبێتە ڕێگر لە جوان و تەواو حەقپێدانی گرتنی دەستنوێژەکەی: «لَا دَلِيلَ فِي الْحدِيثِ عَلَى مَا قُلْتُمْ، وإنما فِيهِ أَنَّ الإسباغ مَعَ وُجُودِ الْكَرَاهِيَةِ، ... وأَما الْقَصْدُ إِلى الْكَرَاهِيَةِ فَلَيْسَ فِي الْحدِيثِ مَا يَقْتَضِيهِ، بَلْ فِي الأَدلة الْمُتَقَدِّمَةِ مَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ مَرْفُوعٌ عَنِ الْعِبَادِ، ... وَمِنْ ذَلِكَ: الِاقْتِصَارُ مِنَ المأْكول عَلَى أَخْشَنِه وأَفْظَعِهِ لمجرَّد التَّشْدِيدِ، لَا لِغَرَضٍ سِوَاهُ»[1].

**نموونە بۆ دووەم:** لە داهێنراوی حەقیقییەوە دوور دەکەوێتەوە تاوەکوو بە سوننەتێکی تەواو دادەنرێت.

هۆکارەکەشی: «قَدْ يَكُونُ أَصل الْعَمَلِ مَشْرُوعًا، وَلَكِنَّهُ يَصِيرُ جَارِيًا مَجْرَى الْبِدْعَةِ مِنْ بَابِ الذَّرَائِعِ»[2].

واتە: لە بنەمادا کارەکە ڕێی پێدراوە لە شەرعدا، بەڵام کارپێکردنی بە ڕێگاکارێکی بیدعەکاری دێت، ئەمەش ڕێی لێ دەگرێت بەم شێوەکارە بۆ ئەوەی بەدوایدا هیچی تر نەیەت، کە پێی دەوترێت (سد الزرائع).

(الشاطبي) ﵀ نموونەی بۆ دەهێنێتەوە بە کەسێك نوێژە سوننەتە گشتییەکان بە شێوەی سوننەتە (الرواتب) بەردەوامەکانی پێش و پاشی نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدات، بە شێوازی دەرکەوتن لە مزگەوت و کاتی دیاریکراو ... هۆکاری دانانی بە داهێنراو «وَوَجْهُ دُخُولِ الِابْتِدَاعِ هُنَا: أَنَّ كُلَّ مَا وَاظَبَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ النَّوَافِلِ وَأَظْهَرَهُ فِي الْجَمَاعَاتِ؛

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٤١).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٤٥).

فَهُوَ سُنَّةٌ، فَالْعَمَلُ بِالنَّافِلَةِ الَّتِي لَيْسَتْ بِسُنَّةٍ عَلَى طَرِيقِ الْعَمَلِ بِالسُّنَّةِ إِخْرَاجٌ لِلنَّافِلَةِ عَنْ مَكَانِهَا الْمَخْصُوصِ بِهَا شَرْعًا، ثُمَّ يَلْزَمُ مِنْ ذَلِكَ اعْتِقَادُ الْعَوَامِّ فِيهَا وَمَنْ لَا عِلْمَ عِنْدِهِ أَنَّهَا سُنَّةٌ»[(١)].

واتە: دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەر سوننەتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کردبێتی و دەرکەوتبێت لە چواردەوری نوێژە جەماعەتەکاندا ئەوە سوننەتە، بەڵام هەر سوننەتێکی تر کاری لەگەڵدا پێبکرێت بەم شێوەیە ئەوە ترازانی سوننەتەکانە لە شوێنی تایبەتی شەرعی خۆی کە بۆی دیاری کراوە، ئەمە ئەبێتە هۆکاری تێگەیشتنی ئەوەی بەو شێوە کارە سوننەت بێت لای خەڵکی بێئاگا و نەزان.

وەکوو نوێژی (صلاة التسبيح) بە جەماعەت و تایبەتکردنی بە شەوی (**٢٧**)ی ڕەمەزاندا بە دوو ڕکاتی کردن، کە هیچ لەمانە لە سوننەتدا نییە، یا بەردەوامی لەسەر ئەو سوننەتانەی بەردەوام ناکرێت و بکرێتە بەردەوام، وەکوو خوێندنی سورەتی [السجدة] لە نوێژی بەیانیانی جومعەدا، (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «لَا يَنْبَغِي الْمُدَاوَمَةُ عَلَيْهَا بِحَيْثُ يَتَوَهَّمُ الْجُهَّالُ أَنَّهَا وَاجِبَةٌ وَأَنَّ تَارِكَهَا مُسِيءٌ بَلْ يَنْبَغِي تَرْكُهَا أَحْيَانًا لِعَدَمِ وُجُوبِهَا»[(٢)].

واتە: نابێت بەردەوام بێت لەسەری، تاوەکوو نەزانەکان وا گومان ببەن کە واجبە، وە ئەوەی نەیکات تاوانبارە، پێویستە نەکرێت هەندێك جار لەبەر واجب نەبوونی.

هەر لەم بوارەدا کەسانێك چاویان لێ کراوە، لەبەر ناوداری و پێشەوایەتییان لە دیندا هەندێك کاری شەرعیان واز لێهێناوە لەبەر ئەوەی وا گومان نەبەن واجبە تاوەکوو حوکمێکی وای نەدەنێ کە شەرع پێی نەدابێت.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وَمِنْ هُنَا ظَهَرَ عُذْرُ السَّلَفِ الصَّالِحِ فِي تَرْكِهِمْ سُنَنًا قَصْدًا؛ لِئَلَّا يَعْتَقِدَ الْجَاهِلُ أَنَّهَا مِنَ الْفَرَائِضِ؛ كَالْأُضْحِيَّةِ وَغَيْرِهَا»[(٣)].

واتە: وەکوو هاوەڵان قوربانییان نەکردووە هەندێك جەژن، تا گومان نەبەن فەرزە.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٤٧).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٤/ ٢٠٥).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٤٨).

(حُذَيْفَةُ بْنُ أُسَيْد) ﷺ دەڵێت: «مَا أَدْرَكْتُ أَبَا بَكْرٍ أَوْ رَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا كَانَا لَا يُضَحِّيَانِ كَرَاهِيَةَ أَنْ يُقْتَدَى بِهِمَا»[١].

واتە: (ئەبوبەکر و عومەر)م رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا بینی قوربانییان نەکرد، تاوەکوو خەڵك وا نەزانێت واجبە و چاویان لێ بکەن.

وە (أَبُو مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيّ) ﷺ دەڵێت: «إِنِّي لَأَدَعُ الْأَضْحَى، وَإِنِّي لَمُوسِرٌ مَخَافَةَ أَنْ يَرَى جِيرَانِي أَنَّهُ حَتْمٌ عَلَيَّ»[٢].

واتە: من توانام هەیە و قوربانیش ناکەم، تاوەکوو دراوسێکانم وا نەزانن واجبە لەسەرم.

ئەمە شێوازی تێگەیشتن و جێبەجێکردنی کارە دینییەکان بووە لای هاوەڵان، هەموو کارێك مافی شەرعی خۆیان داوەتێ بێ زیادەڕەوی و کەمڕەوی، هەموو ڕێگرییەکیان داناوە بۆ دەرنەچوون لە سنووری شەرع و پاراستنی، ئەمە لای زانایان پێی دەوترێت (سد الزرائع).

وەکوو بڕینی ئەو دارەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی (الحديبية)ی لە ژێردا وەرگرت لە هاوەڵان، کاتێك بینرا خەڵك دەچوون لە ژێریدا نوێژیان دەکرد، (عومەری کوڕی خەتاب) ﷺ فەرمانیدا بە بڕینی ئەو دارە: «أَمَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بِقَطْعِ الشَّجَرَةِ الَّتِي بُويِعَ تَحْتَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَقَطَعَهَا لِأَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَذْهَبُونَ فَيُصَلُّونَ تَحْتَهَا ، فَخَافَ عَلَيْهِمُ الْفِتْنَةَ»[٣].

ئەمانە هەمووی تایبەتکردنێکە بەبێ تایبەتکردنێکی شەرعی و تێکەڵکردن بە کارە شەرعییەکانەوە و هۆکارە بۆ بوونە بیدعە و باوەڕبوون بە بەسوننەتکردنی، گەرچی وەصفێکی پەیوەستبوو نییە پێوەی، بەڵام ڕێگایەکە بۆ ئەو هۆکارە پێویستە دابخرێت و سنووری شەرع نەبەزێنرێت.

---

(١) رواه البيهقي في "السنن الكبرى" (١٩٠٣٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٤٨/٤)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٦٢١١)، وصححه الألباني في "الإرواء" (١١٣٩).

(٢) رواه البيهقي في "السنن الكبرى" (١٩٠٣٨)، وفي "الصغرى" (١٨١٥)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٨١٤٩)، وصححه الألباني في "الإرواء" (١١٣٩).

(٣) "البدع والنهي عنها" لابن وضاح (١٠٢).

**دەشێت ئەو کارانەی کە دەلکێت بە بیدعەوە بەم شێوەیە بێت[١]:**

**١. بیدعەکە جیا بێت لە کارە شەرعییەکە.**

**٢. بیدعەکە لکابێت بە کارە شەرعییەکەوە.**

**٣. بیدعە لکاوەکە وەصفێکی جیانەکراوە بێت لە سوننەتەکە.**

**٤. وەصفەکە جیاکراوە بێت لە سوننەتەکە.**

تاوەکوو بیدعە و وەصفەکانی جیاکراوە بێت لە شەرعییەکان و بەڵگەکانیش یەکلا و دڵنیاکراوە بێت لە پشتیوانی نەکردنی بیدعەکە لای بیدعەکار؛ ئەوا بیدعەکان بە گشتی بیدعەی حەقیقین، وە بە پێچەوانەشەوە تا وەصفەکان تێکەڵاو و پێوەلکاو بێت و بە شێوازێك لە شێوازەکان پەیوەستی و بەڵگەداری بۆ کرابێت؛ ئەوا داهێنراوی جۆری بۆزیادکراوە (الإضافية)، لەبەر زاڵنەبوونی بیدعەکارییەکە بەسەر لایەنە شەرعییەکەدا و توانای جیاکردنەوەی لایەنی شەرعی و لایەنە بۆزیادکراوەکە.

«لما كانت البدعة الإضافية واسعة المجال وقع التفاوت في درجاتها، وذلك أنها قد تقترب من الأمر المشروع تارة، وقد تقترب تارة أخرى من البدعة الحقيقية، وبين هاتين الدرجتين درجات كثيرة تفاوت قرباً وبعداً»[٢].

واتە: داهێنراوی بۆزیادکراو بەرفراوانە، لەبەر ئەوە جیاوازی لە پلەکانیشیدا هەیە، بە هۆکاری نزیکبوونەوەی لە لایەنی شەرعی و بیدعە، لە نێوانی ئەم دوانەدا پلەکاریەکی زۆر هەیە بەگوێرەی نزیکبوونەوە و دوورکەوتنەوە.

## ڕووە جیاوازەکانی نێوان داهێنراوی حەقیقی و بۆزیادکراو
## (وجوه الإختلاف بين البدعة الحقيقية والإضافية)

١. داهێنراوی حەقیقی هەڵگری بەڵگە نییە لە هیچ ڕوویەکەوە، نە بە کورتی و نە بە درێژی، بەڵام داهێنراوی بۆزیادکراو ڕوویەکی پەیوەستکارە بە بەڵگەوە.

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ١٠).

(٢) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٤٥.

٢. داهێنراوی حەقیقی پێچەوانەی تەواوی بەڵگەیە و دەرچووی ئاشکرایە لە سوننەت، بە پێچەوانەی (الإضافي)یەوەیە کە لە ڕوویەکەوە شەرعییە و لە ڕوویەکەوە دەرچووە.

٣. داهێنراوی حەقیقی تاوانی زیاترە، لەبەر لادانی ئاشکرای، بەڵام بۆزیادکراو بەپێی دوور و نزیکی لادانەکە تاوانبارە.

٤. داهێنراوی (الإضافي) بەرفراوان و پلە جیاوازە، دەشێت ببنە داهێنراوێکی حەقیقی یا کەوتن بەلای سوننەتدا.

٥. داهێنراوی حەقیقی زۆرتر و ناودارتر و گشتیترە لەناو خەڵکیدا، کاری ئاشکرا و شاراوەی تێدا نییە، سەرەتا و پێشەکی ناوبردن و باسە لای زانایان.

بە پێچەوانەی (الإضافي)یەوە لەبەر ووردەکاری دەرکپێکردن و شاراوەیی بەڵگەکاری، دەکەوینە لێتێکچوون و هەڵە لە دیاریکردن و جیاکردنەوەیدا.

٦. پێویستە پلەکانی داهێنراوی (الإضافي) پێناسە بکرێت و لێك جیابکرێتەوە، هەموو پلەیەك ماف و حوکمی خۆی پێبدرێت، وە زۆر دانایانە دژایەتی ئەم جۆرە داهێنراوە بکرێت، وە ڕووی دژایەتی بکاتە ئەو وەصف و لکاوە زیادەی کە پێوەی لکێنراوە، نەك ئەو ڕووەی کە بنەمای شەرعییە، بە شێوازێکی نەرم و نیان و نەبوونە هۆکاری دووبەرەکایەتی، وە ئەم کارەش بە سروشتی خۆی ئەمە پێویست دەکات، لەبەر لەخۆگرتنی بەشێك لە حەق کە ئەستەمە جیاکردنەوەی لە بەشە زیادکراوەکە، بەتایبەت لای کۆی گشتی خەڵی دوور لە تێگەیشتنی زانستە شەرعییەکان.

وردەکاری لەسەر ئەم جیاوازیانەو ناسینی حوکمەکانی پێویستییەکییەکجار زۆرە بەتایبەت لای بانگەواز خوازان و خاوەن عیلمە شەرعییەکان و ناسراوو کەسایەتیە دینییەکان، تاوەکوو کار بۆ چاککردن و لابردنی و حوکم دان بەسەریاندا بە چاوکراوەیی و شارەزاییەکی تەواوەوە بێت، واتە لە شوێنی خۆیدا بێت.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَأَمَّا إِنْ لَمْ يَصِحَّ بِمِسْبَارِ الْعِلْمِ أَنَّهُ مِنَ الْمُجْتَهِدِينَ ؛ فَهُوَ الْحَرِيُّ بِاسْتِنْبَاطِ مَا خَالَفَ الشَّرْعَ كَمَا تَقَدَّمَ، إِذْ قَدِ اجْتَمَعَ لَهُ مَعَ الْجَهْلِ بِقَوَاعِدِ الشَّرْعِ الْهَوَى الْبَاعِثُ عَلَيْهِ فِي الْأَصْلِ، وَهُوَ التَّبَعِيَّةُ، إِذْ قَدْ تَحْصُلُ لَهُ مَرْتَبَةُ الْإِمَامَةِ وَالِاقْتِدَاءِ، وَلِلنَّفْسِ فِيهَا مِنَ

اللَّذَّةِ مَا لَا مَزِيدَ عَلَيْهِ»[(١)].

واتە: ئەگەر هەڵگری زانستی تەواو نەبێت و نەگەیشتبێتە پلەی ئیجتیهاد و ناوداریيەکی دینی بۆ دروست بووبێت، لەگەڵ پاڵپشتی حەز و ئارەزووە نەفسییەکانی لە خەڵك دواکەوتنی؛ ئەوا گومان نییە پێچەوانەی شەرع بڕیار نەدات، هەروەکوو ئیمامی (مالك) ﵀ ئامۆژگاری (ابْنِ فَرُّوخَ) دەکات لە وەڵامدانەوەی بیدعەکاراندا دەڵێت: «لَا يَرُدُّ عَلَيْهِمْ إِلَّا مَنْ كَانَ ضَابِطًا عَارِفًا بِمَا يَقُولُ لَهُمْ، ... وَأَمَّا غَيْرُ ذَلِكَ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَلِّمَهُمْ فَيُخْطِئَ فَيَمْضُوا عَلَى خَطَئِهِ، أَوْ يَظْفَرُوا مِنْهُ بِشَيْءٍ فَيَطْغَوْا وَيَزْدَادُوا تَمَادِيًا عَلَى ذَلِكَ»[(٢)].

واتە: کەس بەرپەرچی بیدعەکاران نەداتەوە، مەگەر زۆر زانا و وردەکار و ئاشنا بێت بە بەڵگە و گوفتاریان، ... بێجگە لەوە دەترسم قسەیان لەگەڵدا بکرێت و هەڵە بکات، وە لە شتێك دا بیگرن و ئەمانە ببێتە هۆکاری یاخیبوونی زیاتریان و بەردەوامی لە کارەکانیان.

## ڕووە هاوشێوەکانی نێوان داهێنراوی حەقیقی و بۆزیادکراو
## (وجوه الإتفاق بين البدعة الحقيقية والإضافية)

ئەم دوو جۆرە داهێنراوە کۆ دەبنەوە لەم خاڵە هاوبەشانەدا[(٣)]:

١. بڕیاری (حەرام)دان بەسەر هەردووکیاندا.
٢. بە بەتاڵ زانینیان و بەرپەرچدانەوەیان.
٣. لکاندنی وەصفی گومڕایی بە هەردووکیانەوە.

بە شێوازێکی گشتی سەیری هەردوو جۆری داهێنراوەکە دەکرێت بەم شێوازانە و بە داهێنراو دەدرێتە قەڵەم، ئەگەر چی لە ڕووی حوکم و شێوازی دژایەتیدا سەیری بەهێز و لاوازی پلەی داهێنراوەکە دەکرێت، بەڵام وەصف و خاڵبەندیکردنی داهێنراوی (الإضافي) لە چوارچێوەی

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٩٧).
(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٤).
(٣) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٤٧.

وەصفکاری بە بیدعە و گومڕایی و بیدعەکاران دەرناچێت، لەبەر ئەو بنەما شەرعییە: «الإِبْتِدَاعُ مَذْمُومٌ عَلَى الْإِطْلَاقِ وَالْعُمُوم»[1].

واتە: هەموو داهێنراوێك بە چاوی زەم و خراپەوە ناو دەبرێت بە گشتی.

وشەکاری (العموم اللفظي) بە ڕەها و بەبێ تایبەتکردنی وشەی «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»، وە لێجیانەکردنەوەی هیچ جۆرە بەشێکی، وە لەکارنەخستنی وشەی (بدعة) و دەقە هەڕەشاوییەکان لەسەری، وە لەلایەکی ترەوە پێشخستن و خوێندنەوەی (الخوف) بەسەر (الرجاء) تیایاندا کارێکی زانستییە و پێویستە.

وە لە هەمووی گرنگتر «أن لفظ البدعة لفظ شرعي، والأصل في الألفاظ الشرعية أن تحمل على معانيها الشرعية لا على معانيها اللغوية»[2].

واتە: وشەی بیدعە وشەیەکی شەرعییە و بنەما لە بەکارهێنانەکانی وشە شەرعییەکان گەڕانەوە و هەڵگرتنی مانا شەرعییەکانە، نەك ڕووە زمانییەکەی.

## تێبینی:

زانایان لە چەندەها ڕووی جیاواز و پەیوەندی جۆراوجۆرەوە بۆ زیاتر جیاکردنەوەیان لە یەکتری و تێگەیشتنی تەواو، داهێنراوەکانیان دابەشکردووە بە چەند جۆرێکەوە و هەریەکەی بە ناوێك، بەڵام بە گشتی هەموویان لەژێر ئەم دوو ناونیشانانەدا جێگەیان دەبێتەوە، وەکوو:

١. الاعتقادية والعملية (باوەڕی و کرداری).

٢. الكلية والجزئية (گشتی و بەش بەش).

٣. المركبة والبسيطة (لێکدراو و سادە).

٤. المكفرة وغير المكفرة (پێدەرچوو لە دین و پێدەرنەچوو).

٥. التعبدية والعادية (عیبادات و ساکاری).

---

(١) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٥٣، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٨٩).

(٢) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٤٥.

بە شێوەیەکی گشتی سەرەتاکانی ئەم داهێنراوانە دەکەونە ژێر باری داهێنراوی حەقیقییەوە (البدعة الحقيقية)، لەبەر نەگونجاندنێکی زۆر ئاشکرا و دیاریان لەگەڵ بنەما و بەڵگە شەرعییەکاندا، وە دووری تەواویان لە بەڵگە و یاسا گشتییە شەرعییەکان، بە شێوەیەك تا ڕێژەیەکی زۆر کۆدەنگی زانایان بەتایبەت پەیوەست و پێداگر لەسەر (منهج) و بەرنامەی ئەهلی سوننەت کۆن لەسەر پێناسەکردنیان بە (بدعة) و بە گومڕا و لادەر لە دین دەیدەنە قەڵەم، لەگەڵ ڕەچاوکردنی نەزانین و پاساو هێنانەوە بۆ خاوەنەکانیان.

وە بە شێوەیەکی گشتی بەشی دووهەمەکانی جۆری داهێنراوەکان دەچنە ژێر باری پێناسە و چۆنێتی داهێنراوە بۆزیادکراوەکان (البدعة الإضافية) بە هەموو شێوەکانیەوە[١].

## حوکمی بیدعە نادرێت بەسەر بابەتە ئیجتیهادییەکاندا

## (لا تبديع في مسائل الإجتهاد)[٢]

بابەتە ئیجتیهادییەکان شوێنی تۆمەتبارکردنی خاوەنەکانیان بە بیدعەکار نییە، لەبەرئەوەی ئیجتیهاد لەسەر بنەمای بەڵگەیە، بەڵام بیدعە بێ بنەمایە لە هیچ جۆرە بەڵگەیەك، کەواتە دروست نییە حوکم بە بیدعە بدرێت بەسەر هیچ جۆرە قسەو کارێکدا، گەر شوێنی ئیجتیهادی زانایان بوو.

مەگەر ئیجتیهادەکە زۆر دوور بوو لە هەموو جۆرە پەیوەستییەکی شەرعی و بەڵگەیی و هەڵگری هیچ جۆرە بنەما و بەڵگەیەك نەبێت: «متى أمكن ردُّ قولٍ ما من الأقوال إلى دليل معتبر شرعاً فإن هذا القول لا يعدُّ بدعة»[٣]. هەرکاتێك توانرا قسەیەك لە قسەکان بگێڕدرێتەوە بۆ بەڵگەیەکی ڕەچاوکراوی شەرعی؛ ئەوا ئەو قسەیە بە بیدعە نادرێتە قەڵەم.

هەر ئیجتیهادێك بکرێت پشتگیری جۆرێك لە جۆرەکانی سوننەت و بۆچوون و ڕای زۆرێك لە زانایانی لەسەر بێت و تا ڕێژەیەکی زۆر پشتیوانی بەڵگەیی لەسەر ئاراستە کرابێت و لە

---

(١) بڕوانە "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٣٤).

(٢) بۆ ئەم بابەتەو بەرەو دوا بڕوانە "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص١٠١ – ١٣٢.

(٣) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص١٠٤.

چوارچێوەی ئیجتیهادێکی فیقهیدا جێگەی ببێتەوە؛ ئەوا ئەو کارە ئەم یاسایە پشتگیری دەکات کە دەڵێت: (لا تبديع في مسائل الإجتهاد) لەسەر ئەوەی ئەو کارە بە بیدعە ناناسرێت و خاوەنەکەشی بەرییە لە تۆمەتی بیدعە، لەبەرئەوەی: «أَنَّ كُلَّ رَاسِخٍ لَا يَبْتَدِعُ أَبَدًا، وَإِنَّمَا يَقَعُ الِابْتِدَاعُ مِمَّنْ لَمْ يَتَمَكَّنْ مِنَ الْعِلْمِ الَّذِي ابْتَدَعَ فِيهِ»[(١)].

واتە: هیچ زانایەکی ڕۆچوو لە زانستدا نیەتی بیدعەکردنی نییە بە هیچ شێوەیەك، بەڵکوو بیدعە لەوانە دەوەشێتەوە کە توانای تەواویان لەو زانستەدا نییە کە بیدعەی تیادا ئەنجام داوە.

بەڵام بابەتە خیلافییەکان؛ ئەوانەی کە هیچ بنەمایەکیان نییە و زۆر دوورن لە هەموو جۆرە شێوازێکی بەڵگە و پەیوەستبوون پێوەی، بەڵکوو ڕاوبۆچوونەو بەس: «الخلاف الواقع في المسائل غير الاجتهادية فإنه لا يمنعُ من إطلاق لفظ البدعة ... أن وقوع الخلاف ليس دليلاً على الحق»[(٢)].

واتە: ئەو بابەتە خیلافیانەی کە لە ئیجتیهادا جێگەی نابێتەوە، هیچ ڕێگرییەك نییە وشەی بیدعە لە ئاستیدا بەکار نەهێنرێت ... بوونی خیلاف بەڵگە نییە لەسەر حەق.

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «وَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يَحْتَجَّ بِقَوْلِ أَحَدٍ فِي مَسَائِلِ النِّزَاعِ، ... فَإِنَّ أَقْوَالَ الْعُلَمَاءِ لَهَا بِالْأَدِلَّةِ الشَّرْعِيَّةِ، لَا يُحْتَجُّ بِهَا عَلَى الْأَدِلَّةِ الشَّرْعِيَّةِ»[(٣)].

واتە: کەس بۆی نییە قسەی هیچ کەسێك بکات بە بەڵگە لە بابەتە خیلافییەکاندا، قسەی زانایان بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە، نەك بکرێت بە بەڵگە بەسەر دەقە شەرعییەکانەوە.

ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «فَيُجْعَلُ الْخِلَافُ حُجَّةً فِي الْجَوَازِ لِمُجَرَّدِ كَوْنِهَا مُخْتَلَفًا فِيهَا، ... وَهُوَ عَيْنُ الْخَطَأِ عَلَى الشَّرِيعَةِ»[(٤)].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٩٢).

(٢) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص١٢٧.

(٣) "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (١/ ٤٦١).

(٤) "الموافقات" للشاطبي (٥/ ٩٣).

واته: ئەبێته هۆکاری ئەوەی خیلافات بکاته بەڵگه لەسەر ڕێگەپێدان و دروستی، لەبەر بوونی هۆکاری خیلاف تیایدا، ئەوە چاوگی هەڵەی تەواوه له شەرعدا.

ئەمەش دەبێته پاساو و ڕێگه خۆشکەر بۆ ئەوەی: «أن جعل الخلاف بمجرده مانعاً من إطلاق لفظ البدعة يفضي ألا توجد بدعة أصلاً ... صلاة الرغائب إذ الخلاف الواقع في بدعيتها، إلا أن وقوع هذا الخلاف لم يمنع من إطلاق لفظ البدعة عليها، ... وسر الفرق بين الخلاف الواق في مسألة غير اجتهادية إنما هو النظر إلى شيء واحد، ألا وهو قوة المأخذ وقربه»[(١)].

واته: بوونی خیلاف بێته ڕێگر له ئاستی بەکارهێنانی وشەی بیدعه هۆکاره بۆ ئەوەی هیچ بیدعەیەك بوونی نەبێت، نوێژی پێویستییەکان (صلاة الرغائب) نوێژێکه چەندان ڕیوایەتی (ضعیف)ی لەسەره، هەندێك زانا وەك (ابن صلاح) ڕێگەی پێ داوه، بەڵام (عز بن عبد السلام) و زانایانی تر ڕێگرن و به بیدعه ناوی دەبەن، ئەم خیلافه هۆکار نییه بۆ ئەوەی به بیدعه ناونەبرێت، لەبەر بێ بەڵگەیی (صحیح) و بێ بنەمایی بوونی، گەر زانایەکیش ڕێگەی پێدابێت جیاوازییەکەی نێوان ئیجتیهادێکی بنەمادار و خیلافێکی بێبنەما خوێندنەوەی بەهێزی و دوور و نزیکی بەڵگەکەیه، چۆن ناتوانین ئەو حەقەی که لای موجتەهیدە پەیوەست نەبین پێوەی؛ ئاواش ناتوانین ئەو حەقەی که لای فەرموودەی «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» و هەرەشه ئامێزەکانی تری بیدعەیه نەخوێنینەوە، ئەوە ئەو کێشانەیەیه که فەرمانمان پێ کراوه پەیوەست بین پێوەی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَ ﴾ [الشورى: ١٧].

وه گەر بابەتێك وەستا له نێوان ئەوەی بیدعەیه یا شوێنی ئیجتیهاده و یەکلا نەبووەوە؛ بنەما له بیدعەدا پارێزراوبوونه لێی و بڕیاری خۆپاراستن دەدرێت بەسەریدا.

ئەگەر کەوتنه ناو شوبوهاتی نێوان حەڵاڵ و حەرام؛ کەوتنه ناو حەرامەوە بێت: «وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ»[(٢)]. که زیانی دونیایه بۆ موسوڵمان؛ ئەوا کەوتنه ناو بابەتێکی خیلافی و بیدعەوە لەپێشتره کەوتنه ناو بیدعەوە بێت، لەبەر ئەوەی زیانی بیدعەکاری له دیندا لەپێشتره.

---

(١) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص١٢٨ – ١٢٩.

(٢) رواه مسلم (١٥٩٩)، وابن ماجه (٣٩٨٤)، وأبو داود (٣٣٣٠)، والدارمي في "السنن" (٢٥٧٣)، وابن أبي شيبة في =

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَيُمْكِنُ أَنْ يَدْخُلَ فِي الْبِدَعِ الْإِضَافِيَّةِ كُلُّ عَمَلٍ اشْتَبَهَ أَمْرُهُ فَلَمْ يَتَبَيَّنْ: أَهُوَ بِدْعَةٌ فَيُنْهَى عَنْهُ؟ أَمْ غَيْرُ بِدْعَةٍ فَيُعْمَلُ بِهِ؟ فَإِنَّا إِذَا اخْتَبَرْنَاهُ بِالْأَحْكَامِ الشَّرْعِيَّةِ؛ وَجَدْنَاهُ مِنَ الْمُشْتَبِهَاتِ الَّتِي قَدْ نُدِبْنَا إِلَى تَرْكِهَا؛ حَذَرًا مِنَ الْوُقُوعِ فِي الْمَحْظُورِ، وَالْمَحْظُورُ هُنَا هُوَ الْعَمَلُ بِالْبِدْعَةِ»[1].

واتە: دەکرێت بکەوێتە داهێنراوی بۆزیادکراوەوە هەر کارێك یەکلا نەبووەوە، ئایا بیدعە رێی لێ بگرێت یا بیدعە نییە و کاری پێ دەکرێت، گەر ئەمە پێوانە بکەین بە یاسا شەرعییەکانەوە دەبینین دەکەوێتە بەشە گوماناویەکانەوە کە داوامان لێ کراوە نەیکەین و دوورەپەرێز بین لێی، لەبەر هۆکاری نەکەوتنە ناو قەدەغە کراوەکانەوە، قەدەغەکراوەکانیش لێرەدا کارکردنە بە بیدعە.

وەکوو تەسبیحاتکردن بە تەسبیح بۆ کەسێك کە ئەم کارەی بۆ یەکلا نەبووەوە بیدعەیە یان نا.

## ئەو شوێنانەی ئیجتیهادی تێدا بەکاردەهێنرێت بۆ بیدعەکردن

## (مواطن الإجتهاد في باب البدعة)

زۆری ئەو شوێنانەی ئیجتیهادی بابەتە بیدعییەکانی تێدا بەکاردەهێنرێت چوار شوێنە:

(باب سد الذرائع، الحديث الضعيف، المتشابهات، إختلاف التنوع)[2].

١. **سد الزرائع:** **بەناوی رێگری لە هاتنە ناوەوەی بیدعەکان:** ئەمە ناکرێتە پاساوێك بۆ بەبیدعەکردنی ئەو بابەت و شتانەی وا گومانی پێ دەبرێت کە هۆکارە بۆ برەودانی بیدعە و دروستبوونی.

لەبەرئەوەی شوێنی ئیجتیهادی زانایانە لە رێگریکردنی یا رێپێدانی، وە حوکمدان بەسەر شتێکدا کە دەبێتە هۆکاری هێنانی خراپەیەك بەدوای خۆیدا زۆری کات گومانە، وە لە زۆر

= "المصنف" (٢٢٠٠٣)، والطبراني في "الكبير" (٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٨/ ١٣)، والبيهقي في "الشعب" (٥٣٥٥)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٧٥٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ١٣٦).

(١) "الاعتصام" (١/ ٤٧٩).

(٢) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص١١٨.

کاتیشدا شوێنێکی ئیجتیهادییە، وە خوێندنەوەی ئەو کارانە لە ڕووە خۆییەکانەوە دەشێت دروست بن و شەرعی بن، بەڵام لە ڕووی کۆتایی و بەرهەمەکانیانەوە هۆکاری دروستبوونی حەرام و کارە ڕێگرەکانە، وەکوو قسەنەوتن بە بتەکانی موشریکەکان، تاوەکوو قسەی هەڵە نەکەن بەرامبەر پەروەردگار: ﴿وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾ [الأنعام: ١٠٨].

یا وەکوو نێوانخستن یا نەکردنی لە مزگەوتدا نوێژی (جومعە) و سوننەتی دوای، لەبەرئەوەی هەندێك لە بیدعەکاران نوێژی نیوەڕۆ لەدوای (جومعە) دەکەن، یا نەکردنی سوننەت لەکاتی هەستانیان بۆ کردنی بەناو سوننەتی جومعە.

**مەرجەکانیشی:** کاتێك بڕیار دەدرێت لەسەر ئەوەی کە ئەو کارە بەرەو بیدعە دەڕوات دەبێت ڕێی لێ بگرێت لەژێر ناونیشانی (سد الذرائع) دا:

أ. دەبێت ئەو کارە هۆکاری بیدعە بێت.

ب. وە ئەو هۆکارەش بە شێوازێکی گشتی یا زۆربەیی بێت.

ت. وە دەبێت خراپەیەك لە بیدعەکە زیاتر بەدوای خۆیدا نەهێنێت[(١)].

٢. **الحديث الضعيف: فەرموودە لاوازەکان:** ئەو فەرموودانەی شوێنی بۆچوونی زانایانی فەرموودەیە، هەندێك بە (ضعیف)ی دادەنێت و کاری پێ ناکرێت، وە هەندێك پلەی (حسن لغیره) دەداتێ و ڕێگەی کارپێکردنی پێ دەدات وەك: ئەو فەرموودانەی باس لە دەستهێنان دەکەن بە دەم و چاودا لەدوای دوعاکردن، وە یادکردنی (صلاة التسبیح)، ئەمانە بڕیاری بە بیدعەکردن نادرێت بەسەریاندا.

٣. **المتشابهات:** ئەو بابەتە لێکچوو و تێکەڵانەی کە لەمەو پێش باسمان کرد.

هەموو ئەو کارانە دەگرێتەوە کە لێکچوونێکی تیادایە و یەکلا نەبووەتەوە ئایا بیدعەیە یا بیدعە نییە و کاری پێ دەکرێت.

٤. **اختلاف التنوع: شوێنی ڕاوبۆچوونی زانایان:** وەکوو (صلاة الخوف، أنواع الاستسقاء، الجهر بالبسملة)، دەستگرتن لەدوای بەرزبوونەوە لە ڕکوعدا.

---

(١) "إعمال قاعدة سد الزرائع" لمحمد الجيزاني ص٢١.

مەگەر ئەو بابەتە ئیجتیهادیانە ببێتە هۆکاری دووبەرەکایەتی و جیاوازی نێوان موسوڵمانان، یاخود ببێتە ناونیشان بۆ بیدعەکاران، لەو کاتەدا ڕێگری لێ دەکرێت و بە بیدعە ناودەبرێت.

(ابن تیمیة) ﷬ دەڵێت: «فَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعُدُّ مِنْ بِدَعِهِمُ الْجَهْرَ بِالْبَسْمَلَةِ، وَتَرْكَ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ ... وَالْقُنُوتَ فِي الْفَجْرِ، وَمُتْعَةَ الْحَجِّ، ... لَكِنَّ الْمَسْأَلَةَ اجْتِهَادِيَّةٌ، فَلَا تُنْكَرُ إِلَّا إِذَا صَارَتْ شِعَارًا لِأَمْرٍ لَا يُسَوَّغُ، فَتَكُونُ دَلِيلًا عَلَى مَا يَجِبُ إِنْكَارُهُ»[(١)].

واتە: ئەو کارانەی بە بیدعە دادەنرێت لای هەندێك لە خەڵکی دەنگ بەرزکردنەوە بە (بِسم الله الرَّحْمَن الرَّحِيم) لە نوێژدا و مەسح نەکردنی خوفەکان و قنووتی بەیانیان ... بابەتەکە ئیجتیهادییە ڕێی لێ ناگیرێت، مەگەر ببێتە ناونیشانێك بۆ بیدعەکاران، ئەوکاتە دەبێتە بەڵگەیەك بۆ ڕێگە لێگرتن.

لەبەر ئەم تێڕوانینە زانایانی پێشوو کۆمەڵێك لە کارە پەلەکان (فروع)یان لکاندووە بە بابەتە عەقیدەییەکانەوە لە نوسینەکانیاندا بۆ جیاکارییەکی نێوان (أهل السنة وأهل البدعة)، وەکوو:

* کارکردن بە مەسحی خوفەوە: بۆ دژایەتیکردنی شیعەکان.

* ڕیزبەندکردنی خولەفای ڕاشیدین: بۆ دژایەتیکردنی خەواریجەکان و شیعەکان، وە (عدالة الصحابة) بۆ دژایەتیکردنی (معتزلة وخوارج).

* نوێژکردنی مەغریب پێش دەرکەوتنی ئەستێرەکان: بۆ دژایەتی جولەکە و شیعەکان.

* نوێژکردنی تەراویح: بۆ دژایەتیکردنی شیعەکان.

## ئیجتیهادی زانایان لە دیاریکردنی داهێنراوەکاندا

تێڕوانینی زانایان بۆ بڕیاردان لەسەر بیدعە و ناوبردنی کارەکان جیاوازی لەخۆ دەگرێت، بە گوێرەی دوور و نزیکی و بەهێزی و لاوازی بەڵگەکە و خوێندنەوەی بوونی سوودمەندی شەرعی تیایدا، وە لە لایەکی تریشەوە ڕەچاوکردنی دروستبوونی زیان و لادانە شەرعییەکان.

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (١/ ٤٤).

بۆیە کارێکی ئاساییە زانایەك بە بیدعەی دابنێت و یەکێکی تریش بە بیدعەی نەداتە قەڵەم، ئەمە کارێکی ئیجتیهادییە، قابیلی پێکاندن و نەپێکاندن دەکات، بە هەمان شێوەی کارە ئیجتیهادییەکانی حەڵاڵ و حەرام.

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَهَذِهِ مَسَائِلُ الِاجْتِهَادِ الَّتِي تَنَازَعَ فِيهَا السَّلَفُ وَالْأَئِمَّةُ، فَكُلٌّ مِنْهُمْ أَقَرَّ الْآخَرَ عَلَى اجْتِهَادِهِ»(١).

واتە: ئەمانە بابەتێکی ئیجتیهادین، پێشووە صاڵحەکان و ئیمامە بەرزەکان جیاوازییان تیایدا هەبووە، هەریەکە دانی ناوە بەسەر ئیجتیهادی بەرامبەردا.

الشَّيخ (ابن باز) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فلا ينبغي لأحد من المسلمين أن يتخذ من الخلاف في هذه المسألة وأشباهها وسيلة إلى النزاع والتهاجر والفرقة»(٢).

واتە: نابێت بۆ هیچ موسوڵمانێك ئەم جیاوازیانە لەم بابەتە و هاوشێوەکانیاندا بکاتە هۆکارێك بۆ دووبەرەکایەتی و جیاوازی.

(إمام السمعاني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَكل مَسْأَلَة حدثت فِي الْإِسْلَام فَخَاضَ فِيهَا النَّاس فَتَفَرَّقُوا وَاخْتلفُوا فَلم يُورث ذَلِك الِاخْتِلَاف بَينهم عَدَاوَة وَلَا بغضا وَلَا تفرقا وَبقيت بَينهم الألفة والنصيحة والمودة وَالرَّحْمَة والشفقة علمنَا أَن ذَلِك من مسَائِل الْإِسْلَام يحل النّظر فِيهَا وَالْأَخْذ بقول من تِلْكَ الْأَقْوَال لَا يُوجب تبديعا وَلَا تكفيرا كَمَا ظهر مثل هَذَا الِاخْتِلَاف بَين الصَّحَابَة وَالتَّابِعِينَ مَعَ بَقَاء الألفة والمودة»(٣).

واتە: هەموو بابەتێك لە ئیسلامدا قسەی لەسەر کراوە و جیاوازی لەسەر دروست بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جیاوازیانە نەبوونەتە هۆکاری ڕق و دژایەتی و دووبەرەکایەتی، بەڵکوو لە نێوانیاندا خۆشەویستی و ئامۆژگاری و بەزەیی ماوەتەوە، زانراوە ئەمە بابەتە دینییەکانە کە دروستە تێڕوانین تیایاندا بەبێ بوونە هۆی تۆمەتبارکردنی یەکتری بە بیدعەکار و بێبڕوایی، وەکوو لە نێوان

(١) "مجموع الفتاوى" (٢٠/ ٢٩٢)، و "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٤/ ٤٤٩).

(٢) "مجموع فتاوى ابن باز" (١١/ ١٤١).

(٣) "الانتصار لأصحاب الحديث" لأبو مظفر السمعاني ص٨٥.

هاوەڵاندا بووە.

**ئەم جیاوازیانەش هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەمانەی خوارەوە:**

١. جیاوازی تێگەیشتنیان بۆ دەقە شەرعییەکان.

٢. ئاگالێبوونی هەندێکیان بەسەر هەندێك لە دەقەکان و بێئاگالێبوونی ئەوانی تر.

٣. بەکارهێنان و جێبەجێکردنی یاسای (سد الزرائع) بەربەست لە ئاستی زیانەکاندا.

٤. بۆچوونی جیای زانایان لەسەر ئەو کارە: ئایا بیدعەیەکی دونیاییە یا پەیوەستیەکی دینییە.

٥. لەخۆگرتنی هەندێك کار بە کارە شەرعییەکانەوە، پێناسینەوەیان پێی.

بۆ ڕوونتر دەرکەوتنی ئەم خاڵانە و ئاشنابوونی ئەو بابەتە جیاوازیانەی نێوان زانایان و نامۆ نەمانیان و وەرگرتنی وەکوو ئیجتیهادێکی زانستی لە چوارچێوەی ئەدەب و بەها ئیسلامییەکاندا؛ هەندێك لەو ڕاوبۆچوونە جیاوازانەی زانایان دەخەینە ڕوو، لەگەڵ دڵنیابوونی بەهێزی زانستی لایەك بەسەر لایەکی تردا و نزیکبوون و زیاد خوێندنەوەی بۆ حەق:

**١. تەسبیحاتکردن بە تسبیح:**

الشَّيخ (العثيمين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أولاً: التسبيح بالمسبحة تركه أَولى وليس ببدعة؛ لأن له أصلاً»[1].

واتە: تەسبیحاتکردن بە تەسبیح باشتر وایە نەکرێت و داهێنراو نییە، لەبەرئەوەی بنەمایەکی هەیە.

بەلام الشَّيخ (الألباني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أن السبحة بدعة ... ولولم يكن في السبحة إلا سيئة واحدة وهي أنها قضت على سنة العد بالأصابع أو كادت، مع اتفاقهم على أنها أفضل، لكفى! فإني قلما أرى شيخا يعقد التسبيح بالأنامل!»[2].

واتە: تەسبیح داهێنراوە، ئەگەر هیچ خراپەیەك لە تەسبیحدا نەبێت بێجگە لەوەی هۆکاری لەناوبردنی تەسبیحات بێت بە پەنجە بەس دەبێت، زۆر کەم کەسێکم بینیبێت لەوانە تەسبیحاتی بە پەنجە کردبێت.

---

(١) "لقاء الباب المفتوح" للعثيمين، الشريط رقم (٣).

(٢) "سلسلة الأحاديث الضعيفة" للألباني (١/ ١٨٥ - ١٩٢).

**٢. دروستکردنی میحراب بۆ نوێژکردنی ئیمام تیایدا لە مزگەوت:**

الشَّيخ (ابن باز) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «ليس المحراب بدعة، بل فعله السلف الصالح من آخر القرن الأول إلى يومنا هذا ...»[(١)].

واتە: میحراب داهێنراو نییە، بەڵکوو پێشووە صاڵحەکان لە کۆتایی سەدەی یەکەمدا کردوویانە تا ئەمڕۆی ئێمە.

وە الشَّيخ (العثيمين) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «والذي أرى أن اتخاذ المحاريب مباح ...»[(٢)].

واتە: ئەوەی من دەیبینم میحراب ڕێگەپێدراوە.

وە الشَّيخ (صالح الفوزان) دەڵێت: «لا ليست بدعة، اتخاذ المحاريب معروف عند المسلمين من قديم الزمان»[(٣)].

واتە: میحراب داهێنراو نییە، هەر لەناو موسوڵمانانەدا ناسراوە لە دێر زەمانەوە.

بەڵام الشَّيخ (الألباني) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وأما المحراب في المسجد فالظاهر أنه بدعة»[(٤)].

واتە: میحراب لە مزگەوتدا ئەوەی تێدا دەردەکەوێت کە داهێنراوە.

**٣. خەت و پەت ڕاکێشان بۆ ڕێکبوونی ڕیزەکانی مزگەوت:**

الشَّيخ (العثيمين) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «...ما أحدث من أمور الدنيا ينظر فيه هل هو حلال أم حرام ولا يقال إنه بدعة ... ومن ذلك ما حدث أخيراً في مساجدنا من الفرش التي فيها خطوط من أجل إقامة الصفوف وتسويتها فإن هذا وإن كان حادثاً ولكنه وسيلةٌ لأمرٍ مشروع»[(٥)].

واتە: ئەو کارە دونیاییانەی کە داهێنراوە سەیر دەکرێت ئایا حەڵاڵە یا حەرامە، ناوترێت بیدعەیە، لەوانەی لەم دواییانەدا لە مزگەوتەکانمان دروست کراوە ، لە خەتی سەر فەرشەکان بۆ

---

(١) "فتاوى نور على الدرب" رقم (٢٣٨).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (١٢/ ٤١٢).

(٣) "الفتوى" رقم (١٢٠٥٤).

(٤) "الثمر المستطاب" للألباني (١/ ٤٧٢).

(٥) "فتاوى نور على الدرب" (٥/ ٢).

ڕێکبوونی ڕیزەکان، ئەمە هۆکارێکە بۆ کارێکی دروست (لە هۆکارە دونیاییەکان).

وە الشَّيخ (الفوزان) دەڵێت: «**لا بأس بذلك لأنها تعين على إقامة الصفوف**»[١].

وە الشَّيخ (الألباني) رَحِمَهُ الله دەڵێت: «**... إذاً الخط في المساجد أو الخطوط في المساجد هذه يجب أن تكون بدعة ضلالة باجماع العلماء**»[٢].

**واتە: ئەو خەتانەی لە مزگەوتەکاندا دەکێشرێت ئەمە بیدعەیەکی گومڕاییە بە کۆدەنگی زانایان.**

**٤. سمێڵ تاشین:**

(ابن حجر) رَحِمَهُ الله دەڵێت: «**وَقَالَ أَشْهَبُ سَأَلْتُ مَالِكًا ... وَقَالَ لِمَنْ يَحْلِقُ شَارِبَهُ هَذِهِ بِدْعَةٌ ظَهرت فِي النَّاس ... قَالَ الطَّحَاوِيُّ الْحُلْقُ هُوَ مَذْهَبُ أَبِي حَنِيفَةَ وَأَبِي يُوسُفَ وَمُحَمَّدٍ**»[٣].

**واتە: ئیمامی (مالیك) رَحِمَهُ الله پرسیاری لێ دەکرێت دەربارەی سمێڵ تاشین، دەڵێت: بیدعەیەکە لەناو خەڵکدا بڵاو بووەتەوە، ئیمامی (الطحاوي) رَحِمَهُ الله دەڵێت: سمێڵ تاشین ڕای (ئەبو حەنیفە) و دوو قوتابییەکەیەتی (ئەبو یوسف و محمد).**

وە الشَّيخ (الألباني) رَحِمَهُ الله دەڵێت: «**والمراد المبالغة في قص ما طال على الشفة لا حلق الشارب كله فإنه خلاف السنة العملية الثابتة**»[٤].

**واتە: مەبەست بە فەرموودەکان کورتکردنەوەیە ئەوەی لە لێو زیاترە، نەك تاشینی سمێڵ کە هەمووی پێچەوانەی سوننەتی کردارییە بوونەکانە.**

**٥. دەستگرتنی دوای ڕکوع لە (سمع الله لمن حمده)دا:**

الشَّيخ (العثيمين) رَحِمَهُ الله دەڵێت: «**الذي يظهر أن السُّنَّة وَضْعُ اليد اليُمنى على ذراع اليُسرى؛ لعموم حديث سهل بن سعد ... تبيَّن لك أن القيام بعد الرُّكوع يُشرع فيه الوضع**»[٥].

---

(١) "الفتاوى" رقم (٤٥٦١) في موقع الشيخ.

(٢) الشريط رقم (٦٤٢) من "سلسلة الهدى والنور".

(٣) "فتح الباري" لابن حجر (١٠/ ٣٤٧).

(٤) "آداب الزفاف" للألباني، في هامشه ص١١١.

(٥) "الشرح الممتع على زاد المستقنع" للعثيمين (٣/ ١٠٤).

واتە: ئەوەی دەردەکەوێت بە تێگەیشتنی گشتی فەرموودەکەی (سهل)؛ دەستگرتنی دوای ڕکوع دروستە.

وە الشَّيْخ (ابن باز) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «**والأفضل جعلهما على الصدر ... أن إرسال اليدين ... ومخالف للسنة لا ينبغي فعله**»[(١)].

واتە: باشتر وایە دەست بگیرێت دوای ڕکوع، دەست بەردان پێچەوانەی سوننەتە، نابێت بکرێت.

وە الشَّيْخ (صالح الفوزان) دەڵێت: «**من السنة وضع الكف اليمنى على الكف اليسرى وقبضهما على الصدر حالة القيام في الصلاة ... وهذا من سنن الأفعال الثابتة في الصلاة**»[(٢)].

واتە: سوننەتە دەستگرتنی دوای ڕکوع لەسەر سنگ، یەکێکە لە سوننەتەکانی نوێژ.

وە الشَّيْخ (الألباني) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «**ولست أشك في أن وضع اليدين على الصدر في هذا القيام بدعة ضلالة**»[(٣)].

واتە: گومانم نییە دەستگرتنی دوای ڕکوع لەسەر سنگ داهێنراوێکی گومڕاییە.

**٦. پیرۆزباییکردنی سەری ساڵی کۆچی:**

ڕای الشَّيْخ (العثيمين وابن باز والجبرين) رَحِمَهُمُ ٱللَّهُ وایە کە: «**إن هنأك أحد فرد عليه، ولا تبتدئ أحداً بذلك**»[(٤)].

واتە: ئەگەر یەکێك پیرۆزبایی سەری ساڵی کۆچی لێ کردی وەڵامی بدەرەوە، دەسپێشخەری مەکە، وە نابێت بکرێت بە عادەت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ١٤٥٤).

(٢) "الفتاوى" رقم (٧٧٥٩).

(٣) "أصل صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني (٢/ ٧٠١).

(٤) شريط "اللقاء الشهري" رقم (٤٤).

الشَيْخ (صالح الفوزان) دەڵێت: «**هذا بدعة يشبه تهاني النصارى بالعام الميلادي**»[(١)].

واتە: ئەمە بیدعەیەکە لە شێوازی پیرۆزبایی سەری ساڵی لەدایکبوونی (مسیح) عليه السلام دا دەکرێت.

هەموو ئەم زانا بەرزانەی ئەهلی سوننەت یەك بەرنامە و (المنهج العلمي) یان هەیە لە پەیوەستبوون بە قورئان و سوننەت و شێوازی تێگەیشتنی هاوەڵان و پێشووە صاڵحەکان و دەرنەچوون لە چوارچێوەی بەڵگە و دژایەتیکردنی هەموو جۆرەکانی لادان و دوورکەوتنەوە لە قورئان و سوننەت و بەتایبەت بوارەکانی (الشرك والبدعة) هاوبەش بڕیاردان و داهێنراوەکان کە هەردووکیان لە (حق الله وحق الرسول) دا کۆدەبێتەوە.

وە هیچ سازشێکیان نییە لەسەر (البدعة الحقيقية) داهێنراوە ڕوون و ئاشکراکان، وە کۆدەنگن لە دژایەتی و بنەبڕکردنی.

ئەمانە هەمووی پێی دەوترێت (التأصيل) واتە: بنەماداری لە بەرنامەدا.

بەڵام لەسەر بابەتی (التنزيل) واتە دابەزینی حوکمەکان بۆ جۆراوجۆری کارەکان دەشێت بۆچوونەکان جیاوازیان هەبێت و ڕای جیاواز بەدی بکرێت.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆر دڵسۆزی و خەمخواردن و خوێندنەوەی هەموو لاکانی ئەو بابەتە و ئابلۆوقەدانی بە هەموو خوێندنەوە شەرعییەکان.

ئەگەرچی لە هەندێکیاندا تا ڕێژەیەکی زۆر لایەکیان نزیکترە لە حەقەکە و دڵنیابوونی زیاتری تێدایە و پێداگری لەسەر بنەمای کارەکە دەکات، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە دژایەتی ئەویتری پێ بکرێت، وە یاخود بکرێتە بەڵگە و نموونە بۆ دوودڵی زانایان و نەبوونی کۆدەنگییان و کردنەوەی ڕەواج بۆ بیدعە.

ئەمە لە هەموو ئیجتیهادە دینییەکاندا هەیە ، وەکوو بوارە شەرعییەکان لە حەڵاڵ و حەرامدا،

---

(١) "الفتاوى" رقم (١٠٠٢٢).

زانایانی پایه بەرز بێبەش نابن لـه پاداشتی خۆیان لـه هۆکاری ئەو هەموو تەمەن و کار و دڵسۆزییانەیان بۆ خزمەتکردنی دین و پاراستنی شەرعی خوا، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ»(١).

واته: ئەگەر حاکم و موجتەهیدێك ئیجتیهادیان کرد و پێکایان؛ ئەوا دوو پاداشتیان هەیه، وه گەر هەڵەیان کرد یەك پاداشتیان هەیه.

کەواته ئەوان لـه نێوان پاداشتێك و دوو پاداشتدان به هەر شێوەیەك بێت، لـەبەرئەوه نابێت ئەم جیاوازییانه ببێته هۆکاری به سوك و بێ قەدر ناوبردنی زانایان و تانەدان لـێیان و بەکارهێنانی فەتواکانیان بۆ پێکدادانیان و ناشرینکردنیان، ئەمه کاری بێ (منهج) و بیدعەکارانه، بۆ ڕەواجی بیدعەکانیان و کارئاسانی بۆ ڕزگاربوونیان لـه تۆمەتی بیدعەکاری.

ئەم جیاوازیانەمان بۆیه خسته ڕوو تا قوتابیانی ئەهلی عیلـم ئاشنا بن لـەسەر ووردەکاری عیلـمی و لـه خۆ تەقلیدکردنی لایەك دەرچن، ڕێگەی توێژینەوەی زانستی بگرنه بەر و ئەم خیلافانه لـه نامۆیی دەرچێت و هۆکاری فراوان بیرکردنەوه بێت بۆیان، وه بیدعەکاران نەیقۆزنەوه بۆ مەبەستەکانی خۆیان و قەدر و ڕێزی زانایان پارێزراو بێت، گەرچی هەر لـه کۆنەوه شا دەماری کاری بیدعەکاران و فیرەقەکان لـێدانی زانایانی ئەهلی سوننەت بووه.

وەکوو (ابن عساکر) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وَاعْلَم يَا أخي وفقنَا الله وَإِيَّاك لمرضاته مِمَّن يخشاه ويتقيه حق تُقَاته إِن لُحوم الْعلمَاء رَحْمَة الله عَلَيْهِم مَسْمُومَة وَعَادَة الله فِي هتك أَسْتَار منتقصيهم مَعْلُومَة لِأَن الوقيعة فيهم بِمَا هم مِنْهُ برَاء ...»(٢).

واته: ئەی برام خوای گەورە یارمەتیمان بدات لـەگەڵتانا بۆ ڕەزامەندی و لـێترسان و پەرستنی تەواوی خۆی، گۆشتی زانایان ڕەحمەتی خوایان لـێبێت ژەهراوییه، وه سوننەتی خوای پەروەردگار لـه زڕاندنی ناوی کەسانی به کەم ناوبردنی ئەوان ئاشکرایه، لـەبەر ئەوەی ئەوان بەرین لـەوەی که دوژمنانیان دەیڵێن.

---

(١) رواه البخاري (٧٣٥٢)، ومسلم (١٧١٦)، وأحمد (١٧٨١٦)، والطبراني في "الأوسط" (٣١٩٠)، وابن عبدالبر في "الجامع" (١٦٦٢).

(٢) "تبيين كذب المفتري" لابن عساكر ص٢٩.

# سێیەم: داهێنراوی نەکردوو

# (البدعة التركية)

داهێنراوی ڕاستەوخۆ و حەقیقی ئەو داهێنراوەیە کە هیچ بنەمایەکی لە دیندا نەبێت و لەژێر هیچ جۆرە مەبەست و یاسایەکی شەرعیدا جێگەی نەبێتەوە.

کارەکانی پێغەمبەر ﷺ پێی دەوترێت (السنة الفعلية) سوننەتە کردارییەکان، لەبەرامبەردا ئەگەر داهێنراوی تێدا ئەنجام بدرێت پێی دەوترێت (البدعة الفعلية) داهێنراوە کردارییەکان، وە ئەو کارانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی نەداوە پێی دەوترێت (السنة التركية) سوننەتە نەکراوەکان، بەو مانایەی سوننەتە نەکرێت، کەواتە لە بەرامبەر ئەمەشدا گەر بکرێت ئەوکارانە ئەوا پێی دەوترێت (البدعة التركية) داهێنراوە نەکراوەکان، وە ئەگەر دابەشکردنێکی جیاکردنەوەیی بە شێوەی سوننەت و بیدعە بکەین بەم شێوەش دەبێت: «البدعة على قسمين: بدعة فعلية، وبدعة تركية، ... فكما كلفنا الله باتباع النبي صلى الله عليه وسلم في فعله ... كذلك طالبنا باتباعه في تركه، فيكون الترك سنة، والفعل سنة»[(١)].

واتە: داهێنراو دوو بەشە: داهێنراوی کرداری و داهێنراوی نەکردوو، وەکوو چۆن سوننەت دوو جۆرە: سوننەتی کرداری و سوننەتی نەکردوو، چۆن خوای پەروەردگار داوای لێکردووین شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەی بین لە کردارەکانیدا؛ ئاواش داوای لێکردووین شوێنکەوتەی نەکردووەکانیشی بین، بەم شێوەیە نەکردن سوننەتە و کردن سوننەتە.

«وكما لا نتقرّب إلى الله بترك ما فعل، لا نتقرّب إليه بفعل ما ترك، فالفاعل لما ترك، كالتارك لما فعل»[(٢)].

**واتە: هەروەکوو چۆن خواپەرستی ناکرێت بە نەکردنی ئەوکارانەی کە پێغەمبەر ﷺ**

---

(١) "نور السنة وظلمات البدعة في ضوء الكتاب والسنة" للدكتور سعيد بن علي بن وهف القحطاني ص٤٤.

(٢) "نور السنة وظلمات البدعة في ضوء الكتاب والسنة" للدكتور سعيد بن علي بن وهف القحطاني ص٤٤، و "الإبداع في مضار الابتداع" لعلي محفوظ ص١١٠.

**کردوویەتی؛ ئاواش خواپەرستی ناکەین بە کردنی ئەو کارانەی کە نەیکردووە، جیاوازی نییە لە نێوان کارکردن بە نەکراوەکان و نەکردنی کراوەکان.**

(ابن القیم) ﷺ دەڵێت: «فَإِذَا اسْتَحْبَبْنَا فِعْلَ مَا تَرَكَهُ كَانَ نَظِيرَ اسْتِحْبَابِنَا تَرْكَ مَا فَعَلَهُ، وَلَا فَرْق»[1].

واتە: گەر پێمان خۆشبێت ئەو کارانە بکەین کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە؛ ئەوە هاوشێوەی ئەوەیە کە پێمان خۆشبێت ئەوەی کردوویەتی نەیکەین، ئەمە هیچ جیاوازی نییە.

**پێناسەی داهێنراوی نەکردوو (البدعة الترکیة):** «هو أن يترك الشارع الفعل مع وجود مقتضاه وعدم المانع منه، أو أن يسكت الرسول صلى الله عليه وسلم عن الفعل غير الجبلي، مع قيام المقتضى وعدم المانع»[2].

واتە: داهێنراوی نەکردوو بریتییە لە نەکردنی کارێك لەلایەنی پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ بوونی پێویستییەکانی ئەو کارە و نەبوونی هیچ ڕێگرێك لە کردنیدا، یان بێدەنگبوونی پێغەمبەر ﷺ لەو کارانەی کە سروشتی نییە لە ئادەمیزاددا، لەگەڵ پێویستی و نەبوونی هیچ ڕێگرییەك.

واتە هەموو کارێکی عیبادەتی کە مەبەست پێی نزیکبوونەوە بێت لە خوا ﷻ، وە بە گشتی پێویستی ئەم کارە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبووبێت، وە هیچ ڕێگرییەك لە بەردەم کردنی ئەم کارەدا نەبووبێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردبێت و کەسی فێر نەکردبێت، ئائەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی داواکاری لەسەر نەکردنییەتی، وە ئەم نەکردنە پێی دەوترێت سونەت و کردنەکەشی کارێکی ڕێپێنەدراوە و پێی دەوترێت بیدعە، وەکوو دوعاکردن بەکۆمەڵ لەدوای نوێژە فەرزەکان.

ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «أَنْ يَسْكُتَ عَنْهُ وَمُوجِبُهُ الْمُقْتَضِي لَهُ قَائِمٌ، فَلَمْ يُقَرَّرْ فِيهِ حُكْمٌ عِنْدَ نُزُولِ النَّازِلَةِ زَائِدٌ عَلَى مَا كَانَ فِي ذَلِكَ الزَّمَانِ؛ فَهَذَا الضَّرْبُ السُّكُوتُ فِيهِ كَالنَّصِّ عَلَى أَنَّ قَصْدَ الشَّارِعِ أَنْ لَا يُزَادَ فِيهِ وَلَا يُنْقَصَ؛ لِأَنَّهُ لَمَّا كَانَ هَذَا الْمَعْنَى الْمُوجِبُ لِشَرْعِ الْحُكْمِ

---

(١) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (٢/ ٢٨١).

(٢) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٤٣، ٤٤)، و"الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٦١).

الْعَمَلِيِّ مَوْجُودًا ثُمَّ لَمْ يُشْرَعِ الْحُكْمُ دَلَالَةً عَلَيْهِ؛ كَانَ ذَلِكَ صَرِيحًا فِي أَنَّ الزَّائِدَ عَلَى مَا كَانَ هُنَالِكَ بِدْعَةٌ زَائِدَةٌ، وَمُخَالَفَةٌ لِمَا قَصَدَهُ الشارع؛ إذا فُهِمَ مِنْ قَصْدِهِ الْوُقُوفُ عِنْدَ مَا حَدٍّ هُنَالِكَ، لَا الزِّيَادَةُ عَلَيْهِ وَلَا النُّقْصَانُ مِنْهُ»[(١)].

واته: بێدەنگبوون لەسەر کارێك کە پێویستبوونی هەبووە لەو سەردەمەدا، وە هیچ حوکمێکی بۆ زیاد نەکراوە لە کاتی پێویستبووندا زیاد لە حوکمی ئەو سەردەمە، ئەم شێوە بێدەنگییە وەکوو دەق وایە، مەبەستی شەرعی تیایدا نە زیادکردنە وە نە کەمکردنە، وەکوو (بانگ و قامەت بۆ نوێژی جەژن و ڕۆژگیران و نوێژە بارانە)، لە کاتێکدا پێویستی ئەم کارانە ئاشکرایە و لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کارێك لەمانە ئەنجام نەدراوە، ئەمە ئاشکراییەکی ڕاست و ڕوونە کە زیادکردن تیایدا بیدعەیەکی زیادەیە و پێچەوانەی مەبەستی شەرعییە، داواکاری شەرعی تیایدا وەستانە لە سنووردا بەبێ زیاد و کەم.

(ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «بل يقال: ترك رسول الله صلى الله عليه وسلم مع وجود ما يعتقد مقتضيا، وزوال المانع، سنة، كما أن فعله سنة. فلما أمر بالأذان في الجمعة، وصلى العيدين بلا أذان ولا إقامة، كان ترك الأذان فيهما سنة، فليس لأحد أن يزيد في ذلك، بل الزيادة في ذلك كالزيادة في أعداد الصلوات أو أعداد الركعات، ... وليس له أن يقول: هذه بدعة حسنة، بل يقال له كل بدعة ضلالة.

ونحن نعلم أن هذا ضلالة قبل أن نعلم نهيا خاصا عنها، أو نعلم ما فيها من المفسدة ... فإن كل ما يبديه المحدث لهذا من المصلحة، أو يستدل به من الأدلة، قد كان ثابتا على عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم، ومع هذا لم يفعله رسول الله صلى الله عليه وسلم، فهذا الترك سنة خاصة، مقدمة على كل عموم وكل قياس»[(٢)].

واته: بەڵکوو دەوترێت: نەکردنێکی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ بوونی ئەوەی کە بە پێویست دانەنرێت بۆی و نەبوونی ڕێگرییەك لە کردنیدا سوننەتە، وەکوو چۆن کارەکانی سوننەتە، کاتێك

---

(١) "الموافقات" (٣/ ١٥٧)، "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٦٠)، "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٤٦).

(٢) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" (٢/ ١٠٣)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٦/ ١٧٢).

فەرمان دەدات بە بانگ بۆ جومعە، وە لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو نوێژی جەژنەکە دەکات بەبێ بانگ و قامەت؛ ئەوا نەکردنی بانگ تیایاندا سوننەتە، کەس بۆی نییە زیادی کات تیایاندا، بەڵکوو زیادکردن تیایاندا وەکوو زیادکردنی ژمارەی نوێژ و ڕکاتەکانە ... وە بۆشی نییە بڵێت بیدعەی چاکەیە، بەڵکوو دەوترێت هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، ئێمە دەزانین ئەمە گومڕاییە پێش ئەوەی بزانین ڕێگرییەکی تایبەتی لەسەرە، یاخود خراپەیەکی زۆری تێدایە، هەرچییەك داهێنەر بە چاکی بزانێت بۆی و بەڵگەی لەسەر بێنێتەوە، وە هەموو ئەو چاکانەش بوونی هەبووە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە، ئەم نەکردنە سوننەتێکی تایبەتە و لەپێش خوێندنەوەی هەموو جۆرە دارِشتنێکی گشتی وقیاسێکەوەیە.

## ئایا نەکردن کارە؟

## ( هل الترك فعل؟ )

ئیمامی (الشنقيطي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ بۆ ئەم بابەتە دەڵێت: «كَوْنُ الْكَفِّ فِعْلًا دَلَّتْ عَلَيْهِ آيَتَانِ كَرِيمَتَانِ مِنْ سُورَةِ «الْمَائِدَةِ» ، دَلَالَةً وَاضِحَةً لَا لَبْسَ فِيهَا، وَلَا نِزَاعَ. أَمَّا الْأُولَى مِنْهُمَا، فَهِيَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾﴾ [المائدة: ٦٣]. فَتَرْكُ الرَّبَّانِيِّينَ وَالْأَحْبَارِ نَهْيَهُمْ عَنْ قَوْلِ الْإِثْمِ وَأَكْلِ السُّحْتِ سَمَّاهُ اللهُ جَلَّ وَعَلَا فِي هَذِهِ الْآيَةِ الْكَرِيمَةِ صُنْعًا فِي قَوْلِهِ: ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ﴾، أَيْ: وَهُوَ تَرْكُهُمُ النَّهْيَ الْمَذْكُورَ، وَالصُّنْعُ أَخَصُّ مِنْ مُطْلَقِ الْفِعْلِ، ... وَأَمَّا الْآيَةُ الثَّانِيَةُ، فَهِيَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾﴾ [المائدة: ٧٩]. فَقَدْ سَمَّى جَلَّ وَعَلَا فِي هَذِهِ الْآيَةِ الْكَرِيمَةِ تَرْكَهُمُ التَّنَاهِيَ عَنِ الْمُنْكَرِ فِعْلًا، وَأَنْشَأَ لَهُ الذَّمَّ بِلَفْظَةِ بِئْسَ ... فِي قَوْلِهِ: ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾. أَيْ: وَهُوَ تَرْكُهُمُ التَّنَاهِيَ، عَنْ كُلِّ مُنْكَرٍ فَعَلُوهُ، ... وَقَدْ دَلَّتْ أَحَادِيثُ نَبَوِيَّةٌ عَلَى ذَلِكَ؛ كَقَوْلِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»، فَقَدْ سَمَّى صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا الْحَدِيثِ تَرْكَ أَذَى الْمُسْلِمِينَ إِسْلَامًا، وَمِمَّا

يَدُلُّ مِنْ كَلَامِ الْعَرَبِ عَلَى أَنَّ التَّرْكَ فِعْلٌ قَوْلُ بَعْضِ الصَّحَابَةِ فِي وَقْتِ بِنَائِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمَسْجِدِهِ بِالْمَدِينَةِ:

لَئِنْ قَعَدْنَا وَالنَّبِيُّ يَعْمَلُ ... لَذَاكَ مِنَّا الْعَمَلُ الْمُضَلِّلُ»[(١)].

وە دەڵێت: «وَالصَّحِيحُ أَنَّ الْكَفَّ فِعْلٌ، كَمَا دَلَّ عَلَيْهِ الْكِتَابُ وَالسُّنَّةُ وَاللُّغَةُ ؛ كَمَا تَقَدَّمَ»[(٢)].

واتە: نەکردن کارە یان نا؟ دوو ئایەتی سوورەتی [المائدة] بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەکردن کارە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا، یەکەم ئایەت سەرزەنشتی قەشە و عابیدەکانی گاوورەکان دەکات لە ئەنجامنەدانی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، کە ڕێگر نەبوون لە تاوان و حەرام خواردنەکانی خەڵکی، بۆیە لە ئاستی ئەمەدا خوای پەروەردگار پێیان دەفەرموێت: ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾﴾ [المَائِدَة : ٦٣]. واتە: خراپترین کارە کە کردوویانە، نەکردنی کارەکانیانی بە کردن ناو بردووە، بۆیە وشەی دروستکردن (صنع) تایبەتترە تا کارکردن (فعل).

ئایەتی دووەمیش بە هەمان شێوە سەرزەنشتی گاوورەکان دەکات، بەوەی کە ڕێگر نەبوون لە بەربەستکردنی خراپەکاندا، بە هەمان شێوە دەفەرموێت: ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾﴾ [المَائِدَة : ٧٩]. واتە: خراپترین کارە کە کردوویانە، بە وشەی (بئس) کە بە تایبەت بۆ بەخراپ باسکردن بەکاردەهێنرێت.

هەردوو ئایەتەکە لە ئاستی نەکردنی کارەکانیان بە کردەوە و کردن ناو دەبات، وە فەرموودەکەش پێغەمبەری خوا ﷺ وازلێهێنانی ئازاردانی موسوڵمان بە موسوڵمانبوون ناو دەبات، وە لە قسەی عەرەبیشدا بە هەمان بەکارهێنانە، وەکوو هاوەڵان لە کاتی مزگەوت کرنەوەکەی مەدینەدا دەیان وت: گەر دابنیشتینایە و پێغەمبەر ﷺ کاری بکردایە ئەوا کارێکی گومڕایی بوو ئێمە دەمان کرد، بەم شێوەیە ڕای دروست ئەوەیە کە نەکردن کارە، وەك بەڵگەی قورئان و سوننەت و زمان ڕوونی کردەوە.

---

(١) "أضواء البيان" للشنقيطي (٦/ ٤٨).

(٢) "أضواء البيان" للشنقيطي (٦/ ٥٠).

ئیمامی (الشوكاني) رَحِمَهُ اللَّهُ ده‌ڵێت: «تركه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلشَّيْءِ، كَفِعْلِهِ لَهُ فِي التَّأَسِّي بِهِ فِيهِ، قَالَ ابْنُ السَّمْعَانِيِّ: إِذَا تَرَكَ الرَّسُولُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا وَجَبَ عَلَيْنَا مُتَابَعَتُهُ فِيهِ»[١].

واته‌: نه‌كردنی كارێك لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ وه‌كوو كرداری وایه‌، پێویسته‌ شوێنكه‌وته‌ی بین، ئیمامی (ابن السمعاني) رَحِمَهُ اللَّهُ ده‌ڵێت: گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كارێكی نه‌كرد واجبه‌ شوێنكه‌وته‌ی بین تیایدا.

وه‌ ئیمامی (القسطلاني) رَحِمَهُ اللَّهُ ده‌ڵێت: «وتركه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سنة كما أن فعله سنة»[٢].

الشَّيْخ (الألباني) رَحِمَهُ اللَّهُ ده‌ڵێت: «لأن السنة على قسمين: سنة فعلية وسنة تركية»[٣].

**مه‌رجه‌كانی ئه‌م یاسایه‌:** «أن يترك الشارع الفعل مع وجود مقتضاه وعدم المانع منه»، **یاخود به‌م جۆره‌:** «إذا ترك الرسول ﷺ فعل عبادة من العبادات مع كون موجبها وسببها المقتضي لها قائماً ثابتاً، والمانع منها منتفياً فإن فعلها بدعة»[٤].

واته‌: ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ جۆرێك له‌ عیباده‌تی نه‌كرد له‌گه‌ڵ بوونی هۆكار و پێویستییه‌كانی له‌و كاته‌دا، وه‌ نه‌بوونی هیچ ڕێگرییه‌ك له‌ كردنیدا؛ ئه‌وا كردنی ئه‌و كاره‌ بیدعه‌یه‌.

**ئه‌م یاسایه‌ له‌ دوو مه‌رج پێكهاتووه‌:**

**یه‌كه‌م: (وجود مقتضاه)**: هۆكار و پێویستییه‌كانی بوونی هه‌بووبێت له‌ سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا ﷺ، له‌گه‌ڵ ئه‌م بوونانه‌شدا نه‌یكردبێت پێغه‌مبه‌ر ﷺ.

**دووه‌م: (انتفاء الموانع)**: نه‌بوونی هیچ جۆره‌ ڕێگرییه‌ك له‌ كردنیدا له‌ سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا ﷺ.

---

(١) "إرشاد الفحول إلى تحقيق الحق من علم الأصول" للشوكاني (١/ ١١٩).

(٢) "الإبداع في مضار الابتداع" لعلي محفوظ ص٤٢.

(٣) "حجة النبي ﷺ" للألباني ص١٠٠.

(٤) "قواعد معرفة البدع" لمحمد حسين الجيزاني ص٧٧.

بەم دوو مەرجە نەكردنەكانی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە و واجبە شوێنكەوتەی بین، وە بە نەكردنی دەبێتە كارێكی سونەت، وە بە كردنی دەبێتە كارێكی داهێنراو بەسەر خاوەنەكەیەوە.

«يشترط لاعتبار الترك سنة مواظبة الرسول ﷺ على الترك»[1].

واتە: مەرجی ڕەچاوكردن لە نەكردندا كە دەبێتە سوننەتی نەكردن، بەردەوامی نەكردنی پێغەمبەرە ﷺ لەو كارە.

نەكردنی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە كە (عمر بن عبد العزيز) رحمه الله دەڵێت: «فَإِنَّ السُّنَّةَ إِنَّمَا سَنَّهَا مَنْ قَدْ عَلِمَ مَا فِي خِلَافِهَا مِنْ الْخَطَإِ وَالزَّلَلِ وَالْحُمْقِ وَالتَّعَمُّقِ»[2].

واتە: ئەوەی سوننەتی دارِشتووە زانا بووە بەسەر پێچەوانەكەی و بەرامبەریدا كە هەڵە و نەزانین و زیادەڕەویی وكەم عەقڵییە، واتە نەكردنەكانی پێغەمبەر ﷺ.

## جۆرەكانی نەكردنی كارەكان لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ

**نەكردنی كارێك لە كارەكان لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ لەم جۆرانە بەدەر نییە[3]:**

١. **نەكردنی پێغەمبەر ﷺ لەبەر پێویستنەبوونی لەو كاتەدا (وە نەبوونی هیچ ڕێگرییەك لە كردنیدا):** كردنی ئەم كارە سوننەت نییە، بەڵكوو ڕێگەپێدراوە ئەگەر هەركاتێك پێویستی بۆ دروست بوو، وە بەڵگەی شەرعیش پشتگیری كرد، وەكوو (مصالح المرسلة أو القياس) بەتایبەت لەو كارانەی كە دەرك بە سوودەكانی دەكرێت، وەكوو: شەڕكردن لەگەڵ ئەوانەی كە زەكاتیان نەدەدا لە هەڵگەڕاوەكان، بەڵام ئەگەر عیبادەت بوو وە دەرك بە هیچ شتێك نەدەكرا تیایدا؛ ئەوا كردنی دەبێتە بیدعە، لەبەرئەوەی گەر عیبادەت بوایە دەبوو.

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٣٢٠)، "القواعد النورانية" لابن تيمية ص١٠٢، "المستصفى" للغزالي (٢/ ٢٢٣).

(٢) "سنن أبي داود" (٤٦١٢)، "البدع" لابن وضاح (٧٤)، "القدر" للفريابي (٤٤٦)، "الشريعة" للآجري (٥٢٩)، "الابانة الكبرى" لابن بطة (١٦٤)، "القضاء والقدر" للبيهقي (٥٣٩).

(٣) "قواعد معرفة البدع" لمحمد حسين الجيزاني ص٧٨، "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٤٤).

**٢. نەکردنی کارێك لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بە هۆکاری ڕێگرییەك لەکردنیدا، لەگەڵ بوونی پێویستیشدا بۆی:** وەکوو: نوێژی تەراویحی شەوانی ڕەمەزان بە جەماعەت لە مزگەوتدا، لە ترسی فەرزنەبوون لەسەر موسوڵمانان، وە کۆکردنەوەی قورئان لە یەك (مصحف)دا، لەبەر هۆکاری دابەزینی زیاتری قورئان و ئەگەری سڕینەوە (نسخ) و گۆڕانکاری لە قورئاندا لە لایەن خواوە ﷻ.

**٣. نەکردنی کارێك لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ لەگەڵ بوونی پێویستی و نەبوونی ڕێگریدا:** ئەم نەکردنە لەم حاڵەتەدا سوننەتە، وەکوو: بانگدان بۆ نوێژی تەراویح و جەژنەکان و دواخستنی وتاری جەژن بۆ دوای نوێژی جەژن، ئەم جۆرە تەرکنەکردنە سوننەتە، وە بە کردنی گۆڕانکارییە لە دینی خوادا ﷻ «فوضعه تغيير لدين الله»[(١)].

## تێبینی:

١. نەکردنی کارە حەڵاڵەکان و عیبادەتەکان دوو جۆرە:

**یەکەم:** گەر کاروبارە حەڵاڵەکان لە خواردن و جل و بەرگ و خەوتن و ژنهێنان ... یاخود جۆرێك لە جۆرەکانی عیبادەت نەکات لە ڕووی نەتوانین و تەمەڵی و کارە خۆییەکانەوە، وە بەبێ مەبەستبوونی تیایدا وەکوو عیبادەت و دینداری؛ ئەوا ئەم کارنەکردنەی نابێتە بیدعە.

گەر عیبادەتنەکردن بێت بەگوێرەی داواکاری کارەکە و بوون و نەبوونی پاساو؛ تاوان دەدرێت بەسەریدا، وە ئەگەر کارە حەڵاڵەکان بێت لەبەر زیان و زەرەرۆمەندی بۆ لاشەی یان حەزلێنەکردنی بە سروشتی خۆی، یاخود بە هۆکاری گومان (شبه) تیایدا؛ ئەوا حەڵاڵە و تاوانی تیایدا نییە.

**دووەم:** نەکردنی کارە حەڵاڵ و ڕێگە پێدراوەکان بەڵام بە نیەتی دینداری و عیبادەت: گەر ئەم کارە لە هەر بوارێکی (عبادات ومعاملات وعادات) بێت، پێی دەوترێت داهێنراو و بە بیدعە لەسەر خاوەنەکەی دەنووسرێت، وەکوو ئەو کەسانەی کە هاتن بۆ لای خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری عیبادەتەکانی پێغەمبەریان ﷺ کرد و بەلایانەوە کەم بوو، پاشان هەریەکەی بڕیاری

---

(١) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" لابن تيمية (٢/ ١٠٢).

حەرامكردن و واجبكردنی كارێكی لەسەر خۆی دا: «قَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: «أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا، أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ للهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[١].

واتە: یەكێكیان وتی: ناخەوم و هەموو شەو شەونوێژ دەكەم، یەكێكی تریان وتی: هەموو ساڵەكە بەڕۆژوو دەبم و نایشكێنم، یەكێكی تریان وتی: هەتا هەتایە ژن ناهێنم، پێغەمبەر ﷺ هاتوو فەرمووی: من بەڕۆژوو دەبم و هەندێك كات نایگرم و نوێژ دەكەم و دەشخەوم و ژنیش دەهێنم، ئەوەی پشت لە سوننەتی من دەكات لە من نییە.

یاخود وەكوو ئەو پیاوەی ناوی (أبو اسرائیل) بوو، نەزری كردبوو كە بەپێوە بێت و دانەنیشێت، وە نەچێتە بەر سێبەر و قسەش نەكات و بەڕۆژووش بێت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «مُرْهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ، وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ»[٢].

واتە: فەرمانی پێ بكەن با قسە بكات و بچێتە ژێر سێبەر و دانیشێت و ڕۆژووەكەی بگرێت.

هەروەك پیاوێك گۆشتی لەسەر خۆی حەرام كرد و پرسی بە پێغەمبەر ﷺ كرد، پاشان ئەم ئایەتەی لەسەر هاتە خوارەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَـٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾﴾ [المائدة: ٨٧].

واتە: ئیمانداران حەڵاڵەكان لەسەر خۆتان حەرام مەكەن و سنوور مەبەزێنن.

كێشانەی تەواو لێرەدا ئەوەیە كە هەر كارێك لە هەر بوارێكی دیندا بێت یاخود دونیا گەر گۆڕانكاری تیادا بكات و لە شێوازی خۆی بیترازێنێت بە نیەتی عیبادەت و ڕەزامەندی خوا و

(١) رواه البخاري (٥٠٦٣)، ومسلم (١٤٠١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٣٠٥)، وأحمد (١٣٥٣٤)، وابن حبان في "صحيحه" (١٤)، والبزار في "المسند" (٦٨٠٧)، والبيهقي في "الشعب" (٥٠٩٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٣٨)، والآجري في "الشريعة" (٩٦).

(٢) رواه البخاري (٦٧٠٤)، وابن ماجه (٢١٣٦)، وأبو داود (٣٣٠٠)، وسبق تخريجه ص٢٨٥.

دینداری و بەرگی دینی بەبەردا بپۆشێت؛ دەبێتە بیدعە و خاوەنەکەی بیدعەکار و تاوانبار دەبێت.

ئەمە ئەو کارانەیە خوای گەورە ڕەخنەی لە گاوورەکان گرت کاتێك لەسەر خۆیان کۆمەڵێك کاریان بە نیەتی عیبادەت و دینداری ئەنجام دەدا و پاشان پەیوەست نەبوون پێوەی: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾ [الحديد: ٢٧].

الشَّيخ (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) ﵀ دەڵێت: «**فهم ابتدعوا من عند أنفسهم عبادة، ووظفوها على أنفسهم، ... قصدهم بذلك رضا الله تعالى، ... وما قاموا بها ولا أدوا حقوقها، فقصروا من وجهين: من جهة ابتداعهم، ومن جهة عدم قيامهم بما فرضوه على أنفسهم**»[(١)].

واتە: عیبادەتیان لەسەر خۆیان دانا و بەرنامەڕێژییان کرد بۆ خۆیان و مەبەستیشیان ڕەزامەندی خوا بوو ﷻ، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەست نەبوون پێوەی، لە دوو لاوە کەمتەرخەم بوون: لە لایەك بیدعەیان داهێنا و لە لایەکی تریش هەڵنەستان بە جێبەجێکردنی و بردنە سەری.

**٢. نەکردنەکانی پێغەمبەر ﷺ دوو جۆرە:**

**یەکەم: کارێکی ڕانەهاتوو لەسەری (الفعل بغير الجبلي): واتە کارە دینییەکان.**

**دووەم: کارێکی ڕاهاتوو لەسەری (الفعل الجبلي): واتە کارە سروشتییەکانی دونیا.**

**یەکەم: کارێکی ڕانەهاتوو لەسەری (الفعل بغير الجبلي):** ئەوکارانەیە وەکوو عیبادەت و ئاداب و پێویستییەکانی گەیاندنی دین، ئەمانە هەمووی دەبێتە شەریعەت و یاسا یاخود سوننەت، وەکوو دین ڕەچاو دەکرێت.

**دووەم: کارێکی ڕاهاتوو لەسەری (الفعل الجبلي):** ئەو کارانەی کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی یان نەیکردووە (الفعل والترك) دەرکەوتووە ڕاهاتنێکی سروشتی ئادەمیزادە، وەکوو: خواردنی لەکاتی برسێتیدا، وە خواردنەوەی لەکاتی تینوویەتیدا، وە خەوتنی لەکاتی هیلاکیدا، لەمانەدا شێوازی چۆنێتی ئەنجامدانی ئەم کارانە پێی دەوترێت سوننەت، ناچێتە ژێر باری ئەم بابەتەوە، وەکوو: بە دەستی ڕاست خواردن و لەسەر لای ڕاست خەوتن و بە دەست نوێژەوە و ... .

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" ص٨٤٢، "تفسير ابن كثير" (٨/ ٢٧).

ئەو کارە سروشتیانەی ئادەمیزاد لای زانایان پێی دەوترێت (ما فعله وتركه اتفاقاً)[١]. ئەوەی کردوویەتی و نەیکردووە وا گونجاوە بەبێ مەبەست، ئەوەی کردوویەتی وەکوو نموونەکانی پێشووی لە خواردن و ... ، ئەوەی نەیکردووە بە شێوەی واگونجاو: نەخواردنی ئاو لەکاتی تەوافدا لەبەر نەبوونی پێویستی بۆ خۆی، جۆری حەزلێکردنی خواردنەکان، چەند سەردانی خەڵکی و چەند خەوتن ... ، هاوەڵان زانیویانە کارە خۆییەکانی پێغەمبەر ﷺ پەیوەندی بە خودی پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە وەکوو دونیایی و جیایان کردۆتەوە لە کارە دینی و پێویستییەکانی، وە گەر ڕووداوێکیش بووبێت پرسیان پێکردووە، وەکوو خواردنی گۆشتی (ضب) جۆرێکە لە گیانلەبەران (شێوەی وەکوو مارمێلکە وایە) جارێك دایان نا لەسەر سفرەی پێغەمبەر ﷺ هەوڵیاندایە و: فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ عَنِ الضَّبِّ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ: أَحَرَامٌ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: «لاَ، وَلَكِنْ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ»[٢].

واتە: دەستی هەڵبڕی و وتیان: حەرامە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکوو لەو شوێنەی من و قەومەکەمی لێبووە نەخوراوە، لەبەر ئەوە حەزم ناچێتە سەری.

وَعَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَكْلِ الثُّومِ، قَالَ: «وَلَوْلَا أَنَّ الْمَلَكَ يَنْزِلُ عَلَيَّ لَأَكَلْتُهُ»[٣].

واتە: ئیمامی (عەلی) رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بەخواردنی سیر و فەرمووی: ئەگەر فریشتە نەهاتایە بۆ لام دەمخوارد.

وەکوو الشَّيْخ (العثيمين) رحمه الله دەربارەی چوونە ناو شاری مەککە و چوونە ناو مزگەوتی (المسجد الحرام)، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەری سەرەوەی مەککە چووەتە ناو شاری مەککە

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٤٤).

(٢) رواه البخاري (٥٣٩١)، ومسلم (١٩٤٥)، وابن ماجه (٣٢٤١)، وأبو داود (٣٧٩٤)، والنسائي في "الكبرى" (٤٨٠٩)، وأحمد (١٦٨١٥)، والدارمي في "السنن" (٢٠٦٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٢٦٣)، والطبراني في "الكبير" (٣٨١٥)، وأبو نعيم في "الطب النبوي" (١٧٢)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٧٩٩)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٢٨٥).

(٣) رواه الطبراني في "الأوسط" (٢٥٩٩)، والبزار في "المسند" (٧٤٨)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٣٥٧)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٦٦٢٦)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٤٤٩٣).

و لە بەری خوارەوە چووەتە دەرەوەی مەککە، وە لە دەرگای (بني شيبة)وە چووەتە مزگەوتی حەرەمەوە، لێی دەپرسن ئایا ئەمانە سونەتن بەم شێوەیە؟ دەڵێت: «وهل هذا سنة مقصودة، أو وقع اتفاقاً؟ بمعنى هل يتعمد الإنسان أن يذهب ليدخل من أعلاها، أو نقول إذا كان طريقه من أعلاها، فالأفضل ألا يعدل عنه إلى مكان آخر؟

ولكن الذي يظهر أنه يسن إذا كان ذلك أرفق لدخوله، ودليل هذا أن النبي صلّى الله عليه وسلّم لم يأمر أن يدخل الناس من أعلاها ... وهل الدخول من باب بني شيبة، ... من السنن المقصودة أو التي وقعت اتفاقاً؟

الجواب: يقال فيه ما يقال في دخول مكة»[1].

واتە: چوونە شاری مەککە و مزگەوتی حەرەمەوە ئەگەر ڕێگەکەی لەو شوێنەوە بوو کارئاسان بوو ئەوە سوننەتە، وە ئەگەر نا نابێت بیگۆڕێت، لەبەرئەوەی بەو شێوازە سروشتییە کارەکەی بۆ گونجاوە و ڕێکەوتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەداوە بەو شێوانە ئەنجام بدرێت.

وە لەسەر قژدرێژکردن و هێشتنەوە بۆ پیاوان پرسیار لە الشَّيخ (العثيمين) رحمه الله دەکرێت:

«هل اتخاذ الشعر عادة أو عبادة؟

ويرى آخرون أن هذا من الأمور العادية، بدليل قول الرسول صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الذي رآه قد حلق بعض رأسه وترك بعضه، فنهاهم عن ذلك، وقال: «احلقوا كله أو ذروا كله»، وهذا يدل على أن اتخاذ الشعر ليس بعبادة، وإلا، لقال: أبقه، ولا تحلق منه شيئا!»[2].

واتە: هێشتنەوە و درێژکردنی قژ ئایا عیبادەتە یان عادەتە؟ هەندێك لە زانایان دەڵێن کارە عادەتییەکانە، بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بینی کەسێك هەندێك لە سەری تاشیوە و هەندێکی تری نەتاشیوە فەرمووی: یان هەمووی بتاشە یان واز لە هەمووی بێنە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هێشتنەوەی قژ عیبادەت نییە، وە ئەگەر نا دەیفەرموو: بیهێڵەوە و هیچی مەتاشە، یاخود (موعظة)

---

(١) "الشرح الممتع على زاد المستقنع" للعثيمين (٧/ ٢٢٨، ٢٢٩).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٨/ ٦٣٨).

ئامۆژگاریکردنی خەڵکی لەسەر گۆڕستان سوننەت نییە لەگەڵ دفنکردنی هەموو مردوویەکدا، وەکوو الشَّیخ (محمد صالح المنجد) دەڵێت: «غير مشروع؛ لأن الرسول صلى الله عليه وسلم ما قصد الجلوس للموعظة وإنما قصد الجلوس حتى ينتهوا من إلحاد القبر، فرق بين ما يحدث اتفاقا وما يحصل قصدا؛ ولهذا ما فعلها في غير هذا الموضع. والله أعلم»[(١)].

واتە: ئەم کارە سوننەت نییە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی دانیشتن نەبووە بۆ ئامۆژگاری، بەڵکوو مەبەستی تا لێبوونەوە بووە لە هەڵکەندنی گۆڕەکە، جیاوازی هەیە ئەوەی ڕوی داوە بە ڕێکەوت و ئەوەی ڕوی داوە بە مەبەست، لەبەرئەوە بێجگە لەو جارە هیچ جارێکی تر نەیکردووە.

## یاسایەك بۆ زانینی نەکردنەکانی پێغەمبەر ﷺ

ئیمامی (ابن القیم) ﵀ دەڵێت: «فَصْلٌ [نَقْلُ التَّرْكِ]. وَأَمَّا نَقْلُهُمْ لِتَرْكِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهُوَ نَوْعَانِ، وَكِلَاهُمَا سُنَّةٌ؛ أَحَدُهُمَا: تَصْرِيحُهُمْ بِأَنَّهُ تَرَكَ كَذَا وَكَذَا وَلَمْ يَفْعَلْهُ، كَقَوْلِهِ فِي شُهَدَاءِ أُحُدٍ: «وَلَمْ يُغَسِّلْهُمْ وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ» وَقَوْلِهِ فِي صَلَاةِ الْعِيدِ «لَمْ يَكُنْ أَذَانٌ وَلَا إقَامَةٌ وَلَا نِدَاءٌ» وَقَوْلِهِ فِي جَمْعِهِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ «وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا وَلَا عَلَى أَثَرِ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا» وَنَظَائِرُهُ.

وَالثَّانِي: عَدَمُ نَقْلِهِمْ لِمَا لَوْ فَعَلَهُ لَتَوَفَّرَتْ هِمَمُهُمْ وَدَوَاعِيهِمْ أَوْ أَكْثَرُهُمْ أَوْ وَاحِدٌ مِنْهُمْ عَلَى نَقْلِهِ؛ فَحَيْثُ لَمْ يَنْقُلْهُ وَاحِدٌ مِنْهُمْ أَلْبَتَّةَ وَلَا حَدَّثَ بِهِ فِي مَجْمَعٍ أَبَدًا عُلِمَ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ، وَهَذَا كَتَرْكِهِ التَّلَفُّظَ بِالنِّيَّةِ عِنْدَ دُخُولِهِ فِي الصَّلَاةِ، وَتَرْكِهِ الدُّعَاءَ بَعْدَ الصَّلَاةِ مُسْتَقْبِلَ الْمَأْمُومِينَ وَهُمْ يُؤَمِّنُونَ عَلَى دُعَائِهِ دَائِمًا بَعْدَ الصُّبْحِ وَالْعَصْرِ أَوْ فِي جَمِيعِ الصَّلَوَاتِ، وَتَرْكِهِ رَفْعَ يَدَيْهِ كُلَّ يَوْمٍ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ (أي: القنوت).

وَمِنْ الْمُمْتَنِعِ أَنْ يَفْعَلَ ذَلِكَ وَلَا يَنْقُلُهُ عَنْهُ صَغِيرٌ وَلَا كَبِيرٌ وَلَا رَجُلٌ وَلَا امْرَأَةٌ أَلْبَتَّةَ ... وَمِنْ هَا هُنَا يُعْلَمُ أَنَّ الْقَوْلَ بِاسْتِحْبَابِ ذَلِكَ خِلَافُ السُّنَّةِ؛ فَإِنَّ تَرْكَهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُنَّةٌ كَمَا أَنَّ

(١) "موقع الاسلام سؤال وجواب" لمحمد صالح المنجد (٥/ ٤٠٧٢).

فِعْلَهُ سُنَّةٌ »[١].

واتە: ڕێگە بۆ زانینی (الترك) نەکردنەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕێگەیە:

**یەکەم:** باسکردنی لەلایەن هاوەڵانەوە ڕاستەوخۆ کە ئەو کارە و ئەو کارەی نەکردووە، وەکوو: وتنیان بۆ شەهیدانی ئوحود کە نەیشۆردن، وە بۆ نوێژی جەژن نە بانگ و نە قامەتی نەکرد، وە لە نوێژی کۆکردنەوەدا هیچ سوننەتێکی لە نێوانیاندا نەکرد.

**دووەم:** نەگەیاندنی هاوەڵان بۆ کارێك: پێغەمبەری خوا ﷺ گەر بیکردایە ئەوا هەوڵ و خەمخۆری دینی زۆریان یان یەکێکیان دەبووە هۆکاری گەیاندنی، کاتێك کەسێك نەیگەیاندووە بە هیچ شێوەیەك و قسەی لەسەر نەکراوە لە هیچ کۆڕ وکۆمەڵێکدا، بەمەدا دەزانرێت کە نەبووە و نەکراوە، وەکوو: نەکردنی وتنی نیەت بۆ نوێژەکان، یان نەکردنی دوعا و پاڕانەوەی دوای نوێژە فەرزەکان بە کۆمەڵ، یاخود نەکردنی قنووتی بەیانیان بەردەوام، لێرەدا دەزانرێت بە باشدانانی ئەمانە پێچەوانەی سوننەتە، لەبەرئەوەی کارە نەکراوەکانی پێغەمبەر ﷺ سوننەتە، هەروەکوو چۆن کردنەکانی سوننەتە.

## تەواوکاری یاساکەی پێشوو

بۆ تەواوکردنی یاسا و بنەماکەی پێشوو، هەر کارێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردبوو لەگەڵ بوونی پێویستیدا بۆی و نەبوونی هیچ ڕێگرییەك؛ ئەوا کردنی داهێنراوە: «إذا تَرَكَ الرسول صلى الله عليه وسلم فعل عبادة من العبادات مع كون موجبها وسببها المقتضي لها قائمًا ثابتًا، والمانع منها منتفيًا؛ فإن فعلها بدعة»[٢]، یاسایەکی ترمان پاڵپشت و تەواوکاریەتی ئەویش: «كل عبادة من العبادات ترك فعلها السلف الصالح من الصحابة والتابعين وتابعيهم أو نقلها أو تدوينها في كتبهم أو التعرض لها في مجالسهم فإنها تكون بدعة بشرط أن يكون المقتضي لفعل هذه العبادة قائمًا والمانع منه منتفيًا»[٣].

---

(١) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (٢/ ٢٨١).

(٢) أنظر "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٥٩١ – ٥٩٧)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٦/ ١٧٢)، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٦١)، و "الإبداع في مضار الابتداع" لعلي محفوظ ص٣٤ – ٣٥. "قواعد معرفة البدع" للجيزاني ص٧٥.

(٣) "قواعد معرفة البدع" للجيزاني ص٧٩.

واتە: هەموو عیبادەتێك لە عیبادەتەكانی پێشینە صالّحەكان لە هاوەڵان و دوو چینی دوای ئەوان لە شوێنكەوتووان نەیان كردبوو، وە نە گەیاندبوویان، وە نە نوسیبێتیانەوە لە سەرچاوەكانیاندا، یان باسێكی نەكرابێت لە كۆڕ و كۆمەڵەكانیاندا؛ ئەوا كردنی بیدعەیە، بەمەرجێك بوونی پێویستی ئەم عیبادەتە هەبووبێت و ڕێگرییەك لە كردنیدا نەبوبێت لەو كاتەدا.

**بەڵگەی بنەمابوونی ئەم یاسایە:** (حذيفة بن اليمان) ﷺ دەڵێت: «كُلُّ عِبَادَةٍ لَمْ يَتَعَبَّدْهَا أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَا تَعَبَّدُوهَا ...»[(١)]، وە دەفەرموێت: «يَا مَعْشَرَ الْقُرَّاءِ! اسْلُكُوا الطَّرِيقَ، فَلَئِنْ سَلَكْتُمُوهَا؛ لَقَدْ سَبَقْتُمْ سَبْقًا بَعِيدًا، وَلَئِنْ أَخَذْتُمْ يَمِينًا وَشِمَالًا، لَقَدْ ضَلَلْتُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا»[(٢)].

واتە: هەر عیبادەتێك هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نەیانكردبێت مەیكەن، ئەی خاوەن شارەزاییە دینییەكان ڕێگاكە بگرن، گەر بیگرنەبەر پێشكەوتنێكی گەورە بەدەست دەهێنن، وە گەر بەلای ڕاست و چەپدا بڕۆن گومڕاییەكی دوورتان توش دەبێت.

(عبد الله ی كوڕی مەسعود) ﷺ دەفەرموێت: «اتَّبِعُوا آثَارَنَا، وَلَا تَبْتَدِعُوا؛ فَقَدْ كُفِيتُمْ»[(٣)].

واتە: شوێنكەوتەی پاشماوە و كارەكانمان بن، خاوەنی داهێنراو مەبن، ئیتر بەستانە.

ئیمامی (مالك ابن أنس) ﷺ دەڵێت: «لَنْ يُصْلِحَ آخِرَ هَذِهِ الْأُمَّةِ إِلَّا مَا أَصْلَحَ أَوَّلَهَا»[(٤)].

واتە: كۆتایی ئەم ئومەتە چاك نابێت تاوەكوو بە شێوازی چاكبوونی سەرەتایی ئەم ئومەتە نەبێت.

---

(١) "الحوادث والبدع" للطرطوشي ص١٤٩، وفي"الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٣٠)، وسبق تخريجه ص٥٨ .

(٢) رواه البخاري (٧٢٨٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٩٦)، وابن وضاح في "البدع" (١٣)، سبق تخريجه ص٥٨.

(٣) رواه أحمد في "الزهد" (١٦٢)، والوكيع في "الزهد" (٣١٥)، وابن نصر في "السنة" (٧٨)، وسبق تخريجه ص٥٥.

(٤) صحيح ثابت عن مالك، وقد نقلها عنه القاضي عياض في "الشفا" (٢/ ٨٧ – ٨٨)، وقال شيخ الإسلام ابن تيمية في "مجموع الفتاوى" (١/ ٣٥٣): "الثابت المنقول عنه – يعني: مالكًا – بأسانيد الثقات، في كتب أصحابه، كما ذكره إسماعيل بن إسحاق القاضي، وغيره" ثم ذكرها؛ وانظر أيضًا: "مجموع الفتاوى" (٢٧/ ١١٨)، و "الفتاوى الكبرى" (٤/ ٣٦٢)، و "اقتضاء الصراط المستقيم" (٢/ ٢٨٥)، و "منهاج السنة" (٢/ ٤٤٤)، و "أحكام الجنائز" للألباني ص٢٢٢، وكتاب "الشفا" للقاضي عياض (٢/ ٨٨)، وذكرها الشاطبي في "الاعتصام" (١/ ١١١) بلفظ: "لن يأتيَ آخر هذه الأمة بأهدى مما كان عليه أولها".

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَأَمَّا مَا تَرَكَهُ مِنْ جِنْسِ الْعِبَادَاتِ مَعَ أَنَّهُ لَوْ كَانَ مَشْرُوعًا لَفَعَلَهُ أَوْ أَذِنَ فِيهِ وَلَفَعَلَهُ الْخُلَفَاءُ بَعْدَهُ وَالصَّحَابَةُ: فَيَجِبُ الْقَطْعُ بِأَنَّ فِعْلَهُ بِدْعَةٌ وَضَلَالَةٌ وَيَمْتَنِعُ الْقِيَاسُ فِي مَثَلِهِ»(١).

واتە: ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نەیکردووە لە جۆری عیبادەتەکان، لەگەڵ ئەوەشدا گەر دروست بوایە دەیکرد، وە ڕێگەی پێدەدا و خەلیفە ڕاشیدەکان و هاوەڵان دەیانکرد، ئەمە گومان دەبڕێت کە کردنی بیدعەیە و گومڕاییە، بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نادرێت قیاسی لەسەر بکرێت.

ئیمامی (تقی الدینی السبکی) رَحِمَهُ اللَّهُ لە وەڵامی هەندێك بیدعەدا دەڵێت: «الْحَمْدُ لِلَّهِ هَذِهِ بِدْعَةٌ لَا يَشُكُّ فِيهَا أَحَدٌ وَلَا يُرْتَابُ فِي ذَلِكَ، وَيَكْفِي أَنَّهَا لَمْ تُعْرَفْ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا فِي زَمَنِ أَصْحَابِهِ وَلَا عَنْ أَحَدٍ مِنْ عُلَمَاءِ السَّلَفِ»(٢).

واتە: ئەمە بیدعەیە و گومانی تێدا نییە لای هیچ کەسێك و شوێنی دوودڵیش نییە، بەسە بۆ ئەوەی کەسێ ئەمەی نەزانیوە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، وە لە سەردەمی هاوەڵان و لای هیچ کەسێك لە زانایانی سەلەف.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لِأَنَّ تَرْكَ الْعَمَلِ بِهِ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَمِيعِ عُمُرِهِ، وَتَرْكَ السَّلَفِ الصَّالِحِ لَهُ عَلَى تَوَالِي أَزْمِنَتِهِمْ؛ قَدْ تَقَدَّمَ أَنَّهُ نَصٌّ فِي التَّرْكِ، وَإِجْمَاعٌ مِنْ كُلِّ مَنْ تَرَكَ؛ لِأَنَّ عَمَلَ الْإِجْمَاعِ كَنَصِّهِ»(٣).

واتە: نەکردنی ئەم کارە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ لە هەموو تەمەنیدا، وە نەکردنی پێشینە ساڵحەکان بە درێژایی سەردەمیان؛ ئەمە دەبێتە دەقێك لەسەر نەکردن و دەبێتە کۆدەنگێکی ئەوانەی نەیانکردووە، وە ئەم کۆدەنگییەش دەبێتە بەڵگە.

ئیمامی (الحافظ ابن رجب الحنبلي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فأما ما اتفق على تركه فلا يجوز العمل به لأنهم ما تركوه إلا على علم أنه لا يعمل»(٤).

---

(١) "مجموع الفتاوی" لابن تيمية (٢٦/ ١٧٢).

(٢) "فتاوی السبكي" (٢/ ٥٤٩).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٧٢).

(٤) "فضل علم السلف على الخلف" لابن رجب ص٤.

واتە: ئەوانەی هاوەڵان و شوێنکەوتوانی کۆدەنگن لەسەر نەکردنی؛ دروست نییە کاری لەسەر بکرێت، لەبەر ئەوە نەیان کردووە کە زانستیان هەبووە لەسەر ئەوەی کە ناکرێت.

(عبد الله ی کوڕی مسعود) ﷺ دەڵێت: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّكُمْ لَعَلَى مِلَّةٍ هِيَ أَهْدَى مِنْ مِلَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ مُفْتَتِحُو بَابِ ضَلَالَةٍ»[١].

واتە: بەوانەی کە تەسبیحاتیان بە بەرد دەکرد وت: وای دەگەیەنن لەسەر ڕێگای گەلێکن کە لە گەلی محمد ﷺ هیدایەت دراوتر بێت؟!

## چەند ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ئەم یاسایە

چەند گومان و پرسیارێك لەسەر ئەو دوو یاسایە لای کەسانێك دروست دەبێت، بۆ لابردنی ئەم ئالۆزییە چەند ڕوونکردنەوەیەك دەخەینە ڕوو بە شێوەی پرسیار و وەڵام[٢]:

**پرسیاری یەکەم:** (ابن القیم) ﷬ دەڵێت: «فَإِنْ قِيلَ: مِنْ أَيْنَ لَكُمْ أَنَّهُ ﷺ لَمْ يَفْعَلْهُ، وَعَدَمُ النَّقْلِ لَا يَسْتَلْزِمُ نَقْلَ الْعَدَمِ؟ فَهَذَا سُؤَالٌ بَعِيدٌ جِدًّا عَنْ مَعْرِفَةِ هَدْيِهِ وَسُنَّتِهِ، وَمَا كَانَ عَلَيْهِ، وَلَوْ صَحَّ هَذَا السُّؤَالُ وَقُبِلَ لَاسْتَحَبَّ لَنَا مُسْتَحِبٌّ الْأَذَانَ لِلتَّرَاوِيحِ، وَقَالَ: مِنْ أَيْنَ لَكُمْ أَنَّهُ لَمْ يُنْقَلْ؟ وَاسْتَحَبَّ لَنَا مُسْتَحِبٌّ آخَرُ الْغُسْلَ لِكُلِّ صَلَاةٍ، ... وَاسْتَحَبَّ لَنَا آخَرُ صَلَاةَ لَيْلَةِ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ ... وَانْفَتَحَ بَابُ الْبِدْعَةِ»[٣].

واتە: ئەگەر وترا لەکوێ زانیتان پێغەمبەر ﷺ ئەم کارەی نەکردووە، نەگەیاندنی دەق لەسەری مانای نەبوونی دەق نییە؟ لە وەڵامدا: ئەم پرسیارە زۆر دوورە لە ئاستی کەسێك کە زانست و زانیاری هەبێت بەسەر هیدایەت و سوننەت و کارەکانی پێغەمبەردا ﷺ، ئەگەر ئەم پرسیارە بە ڕاست دابنرێت و وەرگیرێت ئەوا کەسێك دەڵێت سوننەتە بانگدان بۆ تەراویح و دەڵێت لەکوێ زانیتان نەبووە؟ یەکێکی تریش بە سوننەتی دادەنێ خۆشۆردن بۆ هەموو نوێژێك و دەڵێت لەکوێ زانیتان نەبووە؟ وە یەکێکی تر بە سوننەتی دادەنێت نوێژکردنی شەوی نیوەی

(١) رواه الدارمي في "السنن" (٢١٠) وقال محققه: إسناده جيد، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٥/ ١٢).

(٢) بۆپرسیارەکان و وەڵامەکان بڕوانە "قواعد معرفة البدع" لمحمد حسين الجيزاني ص٨٦ - ١٠٣.

(٣) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (٢/ ٢٨١، ٢٨٢).

شەعبان، بەم شێوەیە دەرگای بیدعە والآ دەبێت.

لە لایەکی تریشەوە بەم دووانە وەڵام دەدرێتەوە[(١)]:

**یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ دینەکەی گەیاندووە بە تەواوی و بێ هیچ ناتەواوییەك، وە موسوڵمانانیش شایەتییان بۆ داوە فەرمانی خوای تیا جێبەجێ کردووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ [المائدة: ٦٧].

**دووەم:** خوای پەروەردگار متمانەی پاراستنی دینەکەی داوە، هەموو هۆکارێکی پاراستنی بۆ ڕەخساندووە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ [الحجر: ٩]. وە ئەگەر نا نەگەیەنراوە و نەپارێزراوە.

**پرسیاری دووەم:** وتمان مەرجێك لە مەرجەکان (مع وجود مقتضاه) پێویستی پێی بووبێت، کاتێك دەڵێین پێغەمبەر ﷺ نەیکردووە پێویستی پێ نەبووە، لەبەرئەوەی خوای گەورە لە تاوانی سەرەتا و کۆتایی خۆشبووە و پلەوپایەی بەرزە، بەڵام خەڵکان بە گشتی تاوان و هەڵە و ناتەواوییان زۆرە، بۆیە پێویستیان بە هەموو جۆراوجۆری عیبادەت هەیە، هەریەکە بە گوێرەی ویست و بۆچوونی خۆی، واتە بۆیە نەقڵ نەکراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەیکردووە لەبەر نەبوونی پێویستی بۆ خۆی، بەڵام ئێمە پێویستمانە لەبەر ئەوە نابێت ڕێگری بکرێت لە کردنی هەموو جۆرێك.

**وەڵام:** بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەڵامی ئەمانەی داوەتەوە بەو سێ کۆمەڵەی کە چوون بۆ لای خێزانەکانی و پرسیاری عیبادەتەکانی لێکردوون و پاشان بە کەمیان زانیوە و وتویانە ئێمە کەی دەگەینە پلەی پێغەمبەر ﷺ، ئەو خوای گەورە لە هەموو تاوانێکی خۆشبووە: «كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: «أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا، أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ،

---

(١) "قواعد معرفة البدع" لمحمد حسين الجيزاني ص٨٦.

وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»»[١]. لە وەڵامیاندا فەرمووی: سوێند بە خوا لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسم و عیبادەتی دەکەم، واتە ئەگەر ئەم کارانەی ئێوە لەخواترسان و عیبادەت بێت ئەوا ناگەنەوە بە من.

**کەواتە هەر کارێك لە عیبادەتەکان پێویستی موسڵمانان بێت؛ ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لەپێشترە بۆی کە کردبێتی، لەبەر کامڵی لەخوا ترسانی و عیبادەتی، وە هەروەها هاوەڵانیشی لەپێشترن تا ئێمە، لەبەر زۆر خێرومەندی و خواپەرستی و پێشبڕکێیان لەو بوارەدا.**

**پرسیاری سێیەم:** هاوەڵان و پێشووە صاڵحەکان دەشێت بە شێوەیەکی گشتی چەند کارێکیان نەکردبێت، بەڵام ڕەنگە لە ئاستی تاکە کەس و کۆڕ و کۆمەڵێکی تایبەتی داخراودا دەرنەکەوتبێت و کرابێت، ئایا ئەم جۆرە کردنانە لە لایەنی هاوەڵانەوە نابێتە بەڵگە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەکردنە گشتییە؟

**وەڵام:** نەکردنی گشتی هاوەڵان بەڵگەیە لەسەر ڕێ پێنەدان و نەکردن (الترك)، وە ئەو ئەگەر و بۆدانانە کە ئەشێت کەسێك کردبێتی دەرگای بیدعە دروستکردن دەکاتەوە، کە لە بنەماشدا ئەو دەرگایە داخراوە، وە ئەگەر نەقڵێش کرابێت لە یەکێك لە هاوەڵانەوە وەکوو (عبد الله کوڕی عمر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا شوێنی پاشماوەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکەوت، وەکوو لە کوێدا خەوتبێت یان دەستنوێژی گرتبێت یان نوێژی کردبێت لەوێدا دەیکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کۆی هاوەڵان ئەم کارانەیان نەدەکرد، لێرەدا ئەوە لەپێشترە شوێنکەوتەی کۆی گشتی هاوەڵان بیت، ئەمە بۆ خۆی متمانەدار و ڕێگریترە لە داهێنراو، وە بۆچوونی هاوەڵێك زۆر شت لەخۆ دەگرێت، پاشان قسەی هاوەڵێك ئەگەر پێچەوانەی هاوشێوەی هاوەڵێکی تر بێت نابێتە بەڵگە، چ جای پێچەوانەی کۆدەنگی هاوەڵان بێت[٢].

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ»[٣].

---

(١) رواه البخاري (٥٠٦٣)، ومسلم (١٤٠١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٣٠٥)، وأحمد (١٣٥٣٤)، وسبق تخريجه ص٥٠.

(٢) بروانە "الموافقات" للشاطبي (٣/ ٥٦ - ٧١).

(٣) رواه ابن ماجه (٤٢) وقال (شعيب الأرنؤوط): حديث صحيح بطرقه وشواهده، وسبق تخريجه ص٤٤.

واتە: پەیوەست بن بە سوننەتی من و ڕێوشوێن و کاری خەلیفە ڕاشیدینەکانەوە، دەستی پێوە بگرن و قەپی لێبگرن بە خرێکانتان.

(ابن تیمیة) رحمه الله دەڵێت: «فهذا لم ينقل عن غير ابن عمر من الصحابة، بل كان أبو بكر وعمر وعثمان وعلي، وسائر السابقين الأولين، من المهاجرين والأنصار يذهبون من المدينة إلى مكة حجاجا وعمارا ومسافرين، ولم ينقل عن أحد منهم أنه تحرى الصلاة في مصليات النبي صلى الله عليه وسلم. ومعلوم أن هذا لو كان عندهم مستحبا لكانوا إليه أسبق، فإنهم أعلم بسنته وأتبع لها من غيرهم»[(١)].

واتە: ئەم کارانە بێجگە لە (ابن عمر) لە هاوەڵان نەگێڕدراوەتەوە، بەڵکوو هەر چوار خەلیفەی ڕاشیدین (مهاجرين وأنصار) هەموویان لە مەدینەوە دەچوونە مەککە بۆ حەج و عومرە لە هیچیان نەگێڕدراوەتەوە شوێنکەوتەی ئەو کارانە بن، وە ئەگەر ئەوانە سوننەت بوایە لایان پێشەنگ بوون لە کردنیدا لەبەر شارەزاییان بەسەر سوننەت و شوێنکەوتەییدا تا خەڵکی، وە ئەگەر کار بەم کەمانە بکرێت ئەمانە لەخۆ دەگرێت:

١. پێچەوانەی کۆدەنگی هاوەڵان.
٢. پەیوەستبوون بە کارێك کە هاوەڵان بەردەوام بوون لەسەر نەکردنی.
٣. هۆکاری نەمانی کارە دەرکەوتووە بەردەوامەکانیان دەبێت، لەگەڵ هۆکاری دەرکەوتنی پێچەوانەکانیان.

**پرسیاری چوارەم:** دەتوانین بلێین ئەو کارە لەژێر مانای بەڵگە گشتییەکاندا و ڕاکێشانی لەسەر هاوشێوەی کارە شەرعییەکان جێگەی دەبێتەوە: (الأدلة العامة والقياس على المشروع)، گەرچی ئەو کارانە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەکراوە و کۆی کارنەکردنی هاوەڵانیش لەسەر نەکردنی بووە.

وەڵام: نەکردن بەڵگەیەکی تایبەتە (الترك دليل خاص)، پێش هەموو بەڵگە گشتی و قیاسەکان دەکەوێت.

---

(١) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٢٧٨).

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «فإن كل ما يبديه المحدث لهذا من المصلحة، أو يستدل به من الأدلة، قد كان ثابتا على عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم، ومع هذا لم يفعله رسول الله صلى الله عليه وسلم، فهذا الترك سنة خاصة، مقدمة على كل عموم وكل قياس»[1].

واتە: هەرچی بیدعەكار دەری ببڕێت لە سوودەكانی بیدعەكەی یاخود بەڵگەكاری لەسەر بكات؛ ئەوانە هەمووی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبوون و لەگەڵ ئەوەشدا نەیكردوون، ئەم نەكردنە سوننەتێكی تایبەتە، پێشی هەموو بەڵگە گشتی و قیاسەكان دەكەوێت لە بەڵگە هێنانەوەدا، هەر نەكردنێك لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و بە درێژایی سەردەمی هاوەڵان نەكرابێت؛ بەڵگەیەكی بڕاوەیە لەسەر ئەوەی دەبێتە بیدعە گەر بكرێت، وەكوو: زیكرەكانی دوای نوێژ بخرێتە پێش نوێژە فەرزەكان، وە نوێژی نیوەڕۆ بكرێتەوە دوای نوێژی جومعە، یان خوێندنی «اللهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي أَنْتَ وَعَدْتَهُ» دوای قامەت، یاخود كردنی دوو ڕكات نوێژ لەدوای تەواوبوونی سەعی سەفا و مەروە وەك قیاس لەسەر تەواف، یان وەكوو زیندووكردنەوەی شەوی نیوەی شەعبان و دەست پێداهێنانی دوو ڕوكنی شامی ... وەكوو (عبد الله كوڕی عباس) رضي الله عنهما بینی ئیمامی (معاوية) رضي الله عنه دەست بەو دوو ڕوكنەدا دەهێنێت، وتی: «لَمْ أَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَلِمُ مِنَ البَيْتِ إِلَّا الرُّكْنَيْنِ اليَمَانِيَيْنِ ... لَقَدْ كانَ لَكُمْ في رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ... فَرَجَعَ إِلَيْهِ مَعَاوِيَة»[2].

واتە: نەمبینیوە پێغەمبەر ﷺ دەست بهێنێت بە كەعبەدا بێجگە لە ڕوكنی یەمانی و (حجر الأسود) نەبێت، وە لە شوێنكەوتەی پێغەمبەردا ﷺ باشترین چاكە هەیە، بەمە (معاوية) رضي الله عنه گەڕایەوە بۆ قسەكەی (ابن عباس)، خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت.

دوو ڕكاتی دوای مەروە: (ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «وَقَدْ أَنْكَرَ ذَلِكَ سَائِرُ الْعُلَمَاءِ ... وَرَأَوْا

---

(١) "اقتضاء الصراط المستقيم" (٢/ ١٠٣).

(٢) رواه البخاري (١٦٠٩)، ومسلم (١٢٦٧)، وأبو داود (١٨٧٤)، والترمذي (٨٥٨)، والنسائي في "السنن" (٢٩٤٩)، وأحمد (٥٩٤٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٨٢٧)، والطيالسي في المسند (٢٠٤٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١٩٠٢)، وفي مسند الشافعي (٨٨٧).

أَنَّ هَذِهِ بِدْعَةٌ ظَاهِرَةُ الْقُبْحِ»[(١)].

واتە: زانایان دژایەتییان کردووە و بەلایانەوە داهێنراوێکی ڕوون و ئاشکرا و خراپ و ناشرینە.

**پرسیاری پێنجەم:** سەلماندمان ئەوا ئەو کارە داهێنراوێکی گومڕاییە، بە مەرجێك خاوەنەکەی نیەتی پێ ئەوە بێت، ئەم کارە پلەوپایەیەکی تایبەتی پڕ خێری دینی هەیە و بە نیەتی عیبادەت و نزیکبوونەوە لە خودا بیکات، بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی نیەتی ئەمانەی نەبوو هەر بۆ خۆی دەیکرد ئایا دەبێتە داهێنراو؟ وەکوو شەوێك تایبەت بکات بە عیبادەتەوە، یاخود بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ مەولوود و بۆنەی ئیسرا و میعراج و شەڕی بەدر بکاتەوە بەبێ نیەتی بەدین و عیبادەتکردن بێت.

**وەڵام:** ئەم جۆرە قسە و پاگەندانە ڕاست نییە، لەبەرئەوەی بۆنە و ئیش و کارەکان خۆی بۆ خۆی دین دروستی کردوون و دینین، لەبەرئەوە هۆکار و سەرەتای باوەڕی دڵی بۆ ئەو شت و دیاریکردنانە قەدر و ڕێزێکی دینی هەیە بۆی و ئەمەش هۆکاری پاڵنەرە بۆ ئەو جۆرە کارە دیاریکراوانە، بە دڵنیاییەوە گەر ئەو شعوور و باوەڕ و بۆچوونە دینییەی لێ دەرکەین کەواتە دروست نەدەبوو، وەکوو چۆن لای کەسێکی ناموسوڵمان ڕێز و باسی ئەو کارانە نییە، کەواتە ئەمانە فێڵن و لە دین دەکرێت و بەناوی دینەوە دەکرێت، یاخود خۆگێلکردنە لە ڕاستی کارەکە.

کەواتە ئەو شعوورە دینییە بۆ ئەو شتانە پەیوەستە پێوەی و لێك جیا نابنەوە، ئەم هەستە دینییانە بەڵای شاراوەیە بۆ بیدعەکاران.

لابردنی ناوی عیبادەت بە نیەتی دینی بۆ نەکردنی و خستنە ناونیشانی عادەت و کارە دونیاییەکانەوە سەپاندنێکی خەیاڵییە و گومان بە بوونی ناکرێت، هەموو ئەوکارانە تیایدا دەکرێت دینییە و خاوەنی کارەکانیش دینین، کارە عادەتییە دونیاییەکان ئەوانەیان دەکرێنە عیبادەت کە بۆ پێویستی ژیان پێیان هەڵدەستن، هەر ئەو سێ کۆمەڵە نەبوون دوای پرسیارکردن لە عیبادەتی پێغەمبەر ﷺ بڕیاریاندا کە: «لَا أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، لَا آكُلُ اللَّحْمَ، لَا أَنَامُ عَلَى فِرَاشٍ»[(٢)].

کارە دونیاییەکان نەکەن بە نیەتی عیبادەت، ژنهێنان و خەوتن و گۆشت خواردن، کەواتە هەر کـارێـکی دونیایی بگۆڕدرێت بەرگی دینی لەگەڵدایە ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «فَمَنْ رَغِبَ

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٦/ ١٧١).

(٢) رواه البخاري (٥٠٦٣)، ومسلم (١٤٠١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٣٠٥)، وأحمد (١٣٥٣٤)، وسبق تخريجه ص٥٠.

عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي» ئەوەی لابدات لە سوننەتم لە من نییە.

## نموونەیەك لە تەرك:

## بیدعەی جەژنی لەدایكبوونی پێغەمبەر ( محمد ) ﷺ

## (بدعة عيد المولود النبوي)

نموونەیەكی زۆر بڵاو و زیندوو لەناو خەڵكدا لەو بیدعە و داهێنراوانەی لە جیهانی ئیسلامیدا خەڵك سەرقاڵ دەبن پێوەی و بە عیبادەت و دینداری و سیمایەكی ڕەسەنی ئیسلامی دەزانن و پارە وماڵێكی یەكجار زۆری لە پێناودا سەرف دەكەن بە هۆكاری چاوەڕێی پاداشت و وەفاداری بۆ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەیكەن، یادی لەدایكبوونی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی ئەم یادە و دەركەوتنی ڕووی پەیوەندی بە ئیسلامەوە و هەڵسەنگاندنی بە پێوانە زانستە شەرعییەكان لای زانایانی ئەهلی سوننەت؛ ڕوونی دەكەینەوە بە ڕێگەی ئەم خاڵانە:

### خاڵەكانی ڕەتكردنەوەی ئەم بۆنەیە:

١. ئەم یادە جۆرێكە لە جۆرەكانی داهێنراوە بێبنەما حەقیقەكان (البدعة الحقيقية)، لەبەر:

«ماكان الإحداث فيها من جميع وجوهها؛ إذ لم يدل عليها دليل شرعي لا من كتاب ولا سنة ولا إجماع ولا استدلال معتبر عند أهل العلم، لا في الجملة ولا في التفصيل»[(١)].

ئەم داهێنراوە لە هەموو ڕووەكانەوە بێبنەمایە و هیچ بەڵگەیەكی قورئان و فەرموودە و كۆدەنگی زانایان و ڕێگەیەكی جۆری بەڵگە هێنانەوەی ڕەچاوكراوی لەسەر نییە لای زانایان، نە بە شێوازی كورت و نە بە شێوازی شیكراوە.

هەر لە كۆنەوە بیدعەكاران لە ئاستی بەڵگە هێنانەوە بۆ مەولوود نەیان توانیوە بەڵگەیەكی قورئانی، یاخود فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ كە بە ڕوون و ئاشكرا باسی ئەو بۆنەگێڕانەی لەدایكبوونی خۆی بكات و موسوڵمانانی لەسەر هان بدات و پاداشتی دیاریكراوی لەسەر باس بكات، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ وادەی باسكردنی هەموو ڕێگە خێرەكانی بە

(١) "معيار البدعة" لمحمد الجيزاني ص٤٤.

موسوڵمانان داوە و تەنانەت متمانەی نەپەڕاندن و باس نەکردنی کارێکی خێری بە موسوڵمانان داوە، جا ئەگەر ببوایە باسی دەکرد، وەك دەفەرموێت: «إنه ليس شيء يقربكم إلى الجنة إلا قد أمرتكم به، وليس شيء يقربكم إلى النار إلا قد نهيتكم عنه»[1].

واتە: بە دڵنیاییەوە شتێك نەماوە نزیکتان بخاتەوە لە بەهەشت هەر فەرمانم داوە پێتان بەسەریدا، وە شتێك نەماوە نزیکتان بخاتەوە لە ئاگر هەر ڕێگریم کردووە لێتان.

بە دڵنیاییەوە کۆدەنگی زانایانیش (إجماع) کە بنەمای سێهەمی بەڵگەیە بە هیچ جۆرێك بوونی نییە لەسەر مەولوود.

**٢.** یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ یەکێکە لە جۆرەکانی داهێنراوە نەکراوەکان (البدعة التركية)، هەروەك (ابن تيمية) ﵀ دەربارەی مەولوود دەڵێت: «إتخاذ مولود النبي صلى الله عليه وسلم عيداً فإن هذا لم يفعله السلف، مع قيام المقتضي له وعدم المانع منه لو كان خيرًا. ولو كان هذا خيرًا محضا، أو راجحًا لكان السلف رضي الله عنهم أحق به منا، فإنهم كانوا أشد محبة لرسول الله صلى الله عليه وسلم وتعظيمًا له منا، وهم على الخير أحرص. وإنما كمال محبته وتعظيمه في متابعته وطاعته واتباع أمره، وإحياء سنته باطنًا وظاهرًا، ... فإن هذه طريقة السابقين الأولين، من المهاجرين والأنصار، والذين اتبعوهم بإحسان»[2].

واتە: (مەولوود): ئەم کارە هاوەڵان نەیان کردووە لەگەڵ بوونی پێویستی و نەبوونی هیچ ڕێگرییەك، ئەگەر ئەمە خێری تەواو و لەپێشتر بوایە؛ ئەوان هاوەڵان و پێشووان لە ئێمە لەپێشتر بوون بۆ کردنی، ئەوان خۆشەویستی و ڕێزی پێغەمبەر ﷺ لایان زیاتر بوو تاوەکوو ئێمە، وە پایەدارتر بوون لەسەر خێر، تەواوترین خۆشەویستی و ڕێز و شوێنکەوتەیی و گوێڕایەڵییان هەبووە، وە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و زیندووکردنەوەی سوننەتەکانی بە ڕووکەش و ناوەڕۆکەوە ...؛ ئەمە ڕێگەی پێشووە سەرەتاکانی کۆچەری و مەدینەییەکانە و شوێنکەوتووانیانە بە چاکە.

(١) "سلسلة الأحاديث الصحيحة" للألباني (٢٨٦٦).

(٢) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" لابن تيمية (٢/ ١٢٣، ١٢٤).

ئەم بۆنەی مەولوودە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها ڕۆژی لەدایکبوونەکەی دیاری کردووە، بەبێ یادکردنەوە و بۆنەگێڕان و باسکردنی لە هەموو درێژایی تەمەنی پێغەمبەرایەتیدا ﷺ، لە پێغەمبەریان ﷺ پرسی: وَسُئِلَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الِاثْنَيْنِ؟ قَالَ: «ذَاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ، وَيَوْمٌ بُعِثْتُ أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهِ»(١).

واتە: پرسیاریان کرد لە ڕۆژووی ڕۆژی دووشەممە، فەرمووی: ئەو ڕۆژەیە کە لەدایك بووم تیایدا، وە بووم بە پێغەمبەری خوا، وە قورئانم بۆ هاتە خوارەوە.

بە سەرتاپای تەمەنی هاوەڵان و شوێنکەوتووانی بە دوو چین لە پاش پێغەمبەر ﷺ کە دەکاتە سەدەیەك؛ لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ باسی نەبووە و نەکراوەتە یاد و جەژن و بۆنەگێڕان بۆی، کە ئەم سێ نەوەیە سەنگی مەحەکن بۆ کۆدەنگی و بەدەستهێنانی هەموو خێرێك، گەر لەناو ئەواندا نەبووبێت؛ ئەوا بوونی نییە لە هیچ دیوانێکی خێردا، بە شایەتیدانی پێغەمبەر ﷺ بۆیان: «خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»(٢).

واتە: باشترین خەڵکی ئەوانەن کە لە سەردەمی مندان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان.

٣. چەند تێبینییەك لەسەر فەرموودەی: «ذَاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ، وَيَوْمٌ بُعِثْتُ أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهِ»:

مەبەست لە دووشەممە بەڕۆژووبوون بووە تیایدا، وەکوو لای ئیمامی (مسلم وأحمد): «سُئِلَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الِاثْنَيْنِ»، وە بەڕۆژووبوونەکەش وەکوو سوپاسگوزارییەك لەسەر هاتنە دونیا و بوون بە پێغەمبەرایەتی بووە، ئەمە سوننەتی پێغەمبەرانە عليهم السلام لە ئاستی نیعمەتە گەورەکانی

(١) رواه مسلم (١١٦٢)، وأبو داود (٢٤٢٦)، والنسائي في "الكبرى" (٢٧٩٠)، وأحمد (٢٢٥٥٠)، والحاكم في "المستدرك" (٤١٧٩)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢١١٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٧٩٧)، والبيهقي في "الشعب" (١٣٢٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ٥١).

(٢) رواه البخاري (٢٦٥٢)، ومسلم (٢٥٣٣)، والترمذي (٢٢٢١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٩٨٦)، وأحمد (٣٥٩٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٧٢٧)، والطبراني في "الكبير" (٢١٨٧)، والحاكم في "المستدرك" (٤٨٧١)، والبزار في "المسند" (١٧٧٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠/ ١٣٨)، والآجري في "الشريعة" (١١٥١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٦٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٧٨)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٤٦٥).

خوادا، وەکوو (١٠ی عاشورا "محرم"): «يَوْمٌ نَجَّى اللهُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ عَدُوِّهِمْ، فَصَامَهُ مُوسَى»[(١)].

واتە: ڕۆژێکە خوای پەروەردگار (موسا) و قەومەکەی لە دوژمنانی ڕزگار کرد، پێغەمبەر (موسا) ﷺ بەڕۆژوو بوو تیایدا.

وە ڕۆژووەکەی پێغەمبەریش ﷺ بە هۆکاری: «تُعْرَضُ الأَعْمَالُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَالخَمِيسِ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ»[(٢)]. وفي رواية النسائي: «ذَانِكَ يَوْمَانِ تُعْرَضُ فِيهِمَا الْأَعْمَالُ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ».

واتە: کردەوەکان ڕۆژی دووشەممە و پێنج شەممە دەگاتە لای خودا ﷻ، پێم خۆش بوو ئەو ڕۆژەی کردەوەکانم پشان دەدرێت من بەڕۆژوو بم.

ئەم دووشەممەیەش هەموو هەفتەیەك دووبارە بووەتەوە، کەواتە هۆکارە سەرەکییەکە بەرزبوونەوەی کردەوەکانە و بەڕۆژووبوون بووە بەو هۆکارەوە، پاشان دانایی خوایی وا بووە لەو ڕۆژەدا لەدایکبوون و بوون بە پێغەمبەرایەتی تیایدا ڕووی داوە، نەك مەبەست پێی تیایدا بۆنە و هۆکاری لەدایکبوونەکە بێت.

باشە بۆچی بەس هۆکاری لەدایکبوونەکە دەخوێندرێتەوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەو ڕۆژەدا سێ هۆکاری تری تێدایە، ئەوانیش: «وَيَوْمٌ بُعِثْتُ أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهِ». واتە پێغەمبەرایەتی و قورئان خوێندنەوە، وە سێیەمیان ڕووداوی وەفاتکردنی، وە لە کاتێکیشدا کە (عائیشە) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا باوکی پرسیاری لێ دەکات: پێغەمبەری خوا ﷺ کەی وەفاتی کردووە؟ وتی: ڕۆژی دووشەممە: «فِي أَيِّ يَوْمٍ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: «يَوْمَ الاِثْنَيْنِ»»[(٣)].

---

(١) رواه البخاري (٢٠٠٤)، ومسلم (١١٣٠)، وابن ماجه (١٧٣٤)، والنسائي في "الكبرى" (٢٨٤٨)، وأحمد (٢٦٤٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٦٢٥)، والبيهقي في "الشعب" (٣٤٩٨).

(٢) رواه الترمذي (٧٤٧)، والنسائي في "الكبرى" (٢٦٧٩)، وأحمد (٢١٧٥٣)، والبزار في "المسند" (٢٦١٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٧٩٩)، والبيهقي في "الشعب" (٥/٣٥٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/١٨)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٣٣٢٢)، وصححه الألباني في "مختصر الشمائل" (٢٥٩)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٥٨٣).

(٣) رواه البخاري (١٣٨٧)، ومسلم (٤١٩)، وأحمد (٢٤٨٦٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٦١٥).

ئەی بۆچی بەس لەدایکبوونەکەی بۆ ئەو ڕۆژە دادەنرێت لەگەڵ ئەوەشدا بوون بە پێغەمبەر ﷺ و هاتنە خوارەوەی قورئان و وەفاتەکەی باس ناکرێت؟! لە لایەکی تریشەوە دوو ڕووداوی زۆر جیاواز لە یەکتر ڕوویان داوە: لەدایکبوون و وەفات، کە دەبوایە وەفات کە باس نەکراوە لەدایکبوونیش باس نەکرایە، بەڵام کاریگەری سەرەکی لە باسی لەدایکبوون و کردنە بۆنە بۆ ئەو ڕۆژە ڕوونکردنەوەی لەم خاڵانەی تردایە.

**٤.** ئەم یادە چاولێکردن و شوێنکەوتەیی گاوور و جوولەکەکانە لەسەر موسڵمانان، لەبەر ئەوەی گاوورەکان ڕۆژی لەدایکبوونی (عیسا)یان عليه السلام کردووەتە سەری ساڵی تازە و بۆنەگێڕان.

هەر لە کۆنەوە کاری ئەوانە بە بۆنەکردنی ئەو کارانە بووە کە پێیان پەسەندە، وەکوو: «عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، أَنَّ رَجُلًا، مِنَ اليَهُودِ قَالَ لَهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا، لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ اليَهُودِ نَزَلَتْ، لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ اليَوْمَ عِيدًا. قَالَ: أَيُّ آيَةٍ؟ قَالَ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ [المَائِدَة: ٣].»[١].

واتە: پیاوێکی جوولەکە بە (عومەری کوڕی خەتاب)ی رضي الله عنه وت: ئەی پێشەوای موسڵمانان ئایەتێك هەیە دەیخوێننەوە گەر بەسەر ئێمەی جوولەکەدا دابەزیایە ئەو ڕۆژەمان دەکردە جەژن، فەرمووی: چ ئایەتێکە؟ وتی: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ [المَائِدَة: ٣].

بۆ جیابوونەوە لەوان و تووشی گومڕایی نەبوونیان پێغەمبەری ئیسلام ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ»[٢].

---

(١) رواه البخاري (٤٥)، ومسلم (٣٠١٧)، والترمذي (٣٠٤٣)، والنسائي في "السنن" (٥٠١٢)، وأحمد (١٨٨)، والحميدي في "المسند" (٣١)، وابن بطة في "الإبانة" (٨١٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٥٦٢٢)، وفي "الشعب" (٣٣)، و "فضائل الأوقات" (١٧٩)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٦٠١)، وابن عساكر في "المعجم" (٣٣٦)، وابن منده في "الإيمان" (٢٠٢)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٥٠٠).

(٢) رواه أبو داود (٤٠٣١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٣٠١٦)، والطبراني في "الأوسط" (٨٣٢٧)، والبزار في "المسند" (٢٩٦٦)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٤٣٤٧)، وفي "الإرواء" (١٢٦٩)، و "صحيح الجامع الصغير" (٦١٤٩).

واتە: هەر کەسێك شێوەکاری هەر گەلێك لەخۆ بگرێت ئەوە لەوانە.

ئەم بابەتە گرنگییەکی زۆری پێدراوە لە ئیسلامدا بۆ خۆپاراستنی موسوڵمانان لە هەموو کار و سیما دینی و دونیاییەك کە نیشانە و هێمای تایبەتی خۆیانە، بۆ هەستنەکردنی موسڵمانان بە لاوازی و پلەخوارتر و زۆرکردنی ڕێژەی ئەوانە و نەتوانەوە لەواندا و هۆکاری لەدەستدانی سیما دینییە حەقەکانی خۆت و ڕووخانی دەروونی لە ئاستیاندا.

لەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کردن بە بۆنە و جەژن و یاد چاولێکردن و شوێنکەوتنی کاری جوولەکە و گاوورەکانە، کە مایەی ترسی پێغەمبەر ﷺ بوو لە موسوڵمانان و بەردەوام ئاگاداری دەکردنەوە و دەیفەرموو: «لَتَتْبَعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، شِبْرًا شِبْرًا وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا جُحْرَ ضَبٍّ تَبِعْتُمُوهُمْ»، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، اليَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: «فَمَنْ»[(١)].

واتە: شوێنکەوتەی ڕێوشوێنی گەلانی پێش خۆتان دەبن بست بە بست و هەنگاو بە هەنگاو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گاوور و جوولەکە؟ فەرمووی: کێی تر هەیە لەوان زیاتر؟!

(عومەری کوڕی خەتاب) ﷺ دەڵێت «اجْتَنِبُوا أَعْدَاءَ اللهِ فِي عِيدِهِمْ»[(٢)].

واتە: دوورکەونەوە لە دوژمنانی خوا لە بۆنەکانیاندا.

وە (عبد الله ی کوڕی عەمەر) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەڵێت «مَنْ بَنَى بِبِلَادِ الْأَعَاجِمِ وَصَنَعَ نَيْرُوزَهُمْ وَمِهْرَجَانَهُمْ وَتَشَبَّهَ بِهِمْ حَتَّى يَمُوتَ وَهُوَ كَذَلِكَ حُشِرَ مَعَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[(٣)].

---

(١) رواه البخاري (٧٣٢٠)، ومسلم (٢٦٦٩)، وابن ماجه (٣٩٩٤)، وأحمد (٩٨١٩)، والطبراني في "الكبير" (٥٩٤٣)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٣٧٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٧٠٣)، والروياني في "المسند" (٢/ ٢١٨)، والبزار في "المسند" (٨٤١١)، والبيهقي في "معرفة السنن والآثار" (٢٣١)، والمروزي في "السنة" (٤٤)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٧٣)، والآجري في "الشريعة" (٣٢)، وابن بطة في "الإبانة" (٧١١)، والحاكم في "المستدرك" (١٠٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٠٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٤١٩٦)، وابن عساكر في "المعجم" (٦٧٥).

(٢) رواه البيهقي في "السنن الكبرى" (٩/ ٣٩٢) برقم (١٨٨٦٢)، والبخاري في "التأريخ الكبير" (١٨٠٤)، وفي "الثقات ممن لم يقع في الكتب الستة" للسودوني (٥/ ١٠٨) برقم (٤٧٦١).

(٣) رواه البيهقي في "السنن الكبرى" (١٨٨٦٣)، وفي "الشعب" (١٢/ ١٩)، وفي "الكني والأسماء" للدولابي (١٨٤٣)، وفي "جلباب المرأة المسلمة" للألباني ص٢٥٦.

واتە: ئەوەی لە وڵاتی عەجەمەکاندا بژی بە شداری بۆنەکانیان بکات؛ لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێت لە قیامەتدا.

**٥.** سەردەمی پێش هاتنەخوارەوەی وەحی بە سەردەمی نەفامی ناو دەبرێت، لەبەر بڵاوبوونی (شیرك و بیدعە) و هاوبەشی دانان لە بتپەرستیدا لە حەقی خوادا و داهێنراوێکی زۆر لە مەراسیمە دینییەکاندا لە سەر دینی (ابراهیم) ﷺ، وەکوو حەج و عیبادەتەکان، ئەمەش بۆتە هۆکاری ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێش هاتنە خوارەوەی وەحی هیچ جۆرە بەشدارییەکی نەبووە لە حەج و عومرە و عیبادەتەکاندا.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە (عام الفیل)دا لەدایك بووە، وە ئەو سەردەمەش پێغەمبەری خوا ﷺ بە نەفامی (جاهلي) ناوی بردووە و بە سەردەمێکی ڕێزدار ناوی نەبردووە، وەکوو لە چەند فەرموودەیەکدا ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێت: «مَا بَالُ دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ»[١]، «فَخِيَارُكُمْ فِي الجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الإِسْلاَمِ إِذَا فَقِهُوا»[٢]، وە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴾ [الأحزاب: ٣٣].

کەواتە هیچ ڕێزێك بۆ سەردەمەکەی نییە تاکوو بکرێت بە یاد و جەژن، وە ڕووداوەکانیش ڕووداوێکی دینی نین، وە ئەگەر مەبەستیشی لە پێغەمبەر ﷺ بێت و بە هۆکاری لەدایکبوونی ئەوەوە بێت؛ ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەردەمی دوای هاتنە خوارەوەی وەحی و بوون بە پێغەمبەر کامڵتر بووە تاوەکوو پێشووتری، لەگەڵ ئەوەشدا باسی هیچ جۆرە عیبادەتێك و ڕووداوەکانی تیادا ناکات، وە تەنانەت چوونە ئەشکەوتی (حراء) و مانەوەی بە حەزلێکردنی دوورە پەرێزی ناو دەبات، نەك عیبادەتکردن، چ جۆرێك هێشتا هیچ وەحیەکی بۆ نەهاتووەتە خوارەوە؟ «ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ»[٣].

---

(١) رواه البخاري (٤٩٠٥)، ومسلم (٢٥٨٤)، والترمذي (٣٣١٥)، والنسائي في "الكبرى" (٨٨١٢)، وأحمد (١٥١٢٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٩٩٠)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٨٠٤١)، وأبو يعلى في "المسند" (١٨٢٤)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٢١٠).

(٢) رواه البخاري في "صحيحه" (٣٣٧٤، ٤٦٨٩)، وفي "الأدب المفرد" برقم (١٢٩)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٥٤٦).

(٣) رواه البخاري (٣)، ومسلم (١٦٠)، وأحمد (٢٥٩٥٩)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٩٧١٩)، والحاكم في "المستدرك" =

بەڵام لایەنە دونیاییەکەی وەکوو ئینسان لە هەموو کەس کامڵتر بووە، لە ڕەوشت و ئاداب و هەست و کارەکانیدا، بۆیە کاتی سەرەتای وەحی لەخۆی دەترسێت، دەفەرموێت: «لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي» واتە: دەترسم لەسەر نەفسی خۆم، مەبەست پێی دەستی جنییەکان بێت، لەبەرئەوەی ئاشنا نەبووە لەگەڵ دونیای فریشتەکان (عالم الملائكة) کە هاتبوون بۆ لای، بۆیە (خديجة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێت: «كَلَّا وَاللهِ مَا يُخْزِيكَ اللهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الكَلَّ، وَتَكْسِبُ المَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الحَقِّ»[(١)].

واتە: نەخێر سوێند بەخوا خوای پەروەردگار تووشی خراپەت ناکات هەتا هەتایە، لەبەرئەوەی تۆ پێ لە کەس وکار دانابڕیت و هەڵگری ناخۆشییەکانی خەڵکیت و یارمەتی بێ نەوایان دەدەیت، ڕێزی میوان دەگریت و پشتیوانی ماف خوراوانی. (دڵخۆشی دەداتەوە بەوەی کە ڕێگەی خێرگرتن شەڕ زاڵ نابێت بەسەریدا).

٦. چوار ڕووداو پەیوەندی بە تەمەنی پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە: (لەدایکبوون، بوون بە پێغەمبەر، کۆچکردن بۆ مەدینە، وەفات)، دوانیان ڕووداوی دونیایین: لەدایکبوون و وەفات، وە دوانیشیان ڕووداوی دینین: هاتنەخوارەوەی وەحی و کۆچکردنەکەیەتی لە پێناوی گەیاندنی دیندا بۆ مەدینە.

لەناو ئەمانەدا (عومەری کوڕی خەتاب) رضي الله عنه خەلیفەی موسوڵمانان و بە کۆدەنگی هاوەڵان (کۆچکردنەکەی) هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی بیکاتە مێژووی موسوڵمانان، لەبەرئەوەی سەرەتای سەرکەوتنی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی دین بوو، زیاتر لە هاتنەخوارەوەی وەحی و بوون بە پێغەمبەرایەتی، چ جای ئەوەی باسی لەدایکبوون و وەفاتی هەبێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی تەواوی هاوەڵان بۆ دین و بنەماکانی و بیرکرنەوەیان لە چوارچێوەی قورئان و فەرموودەدا، بەبێ گرنگیدان بە ڕووکەش و ساکارییەکی شێوەکاری بنەمای دینی دوور لە

= (٤٨٤٣)، وابن منده في "الإيمان" (٦٨١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣/ ٣١٧)، والآجري في "الشريعة" (٩٦٩).

(١) رواه البخاري (٣)، ومسلم (١٦٠)، وأحمد (٢٥٨٦٥)، والطيالسي (١٥٧٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٣)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٩٧١٩)، والحاكم في "المستدرك" (٤٨٤٣)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣/ ٣١٧)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٣٣٣٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤٠٩)، والآجري في "الشريعة" (٩٦٩)، وابن منده في "الإيمان" (٦٨١).

عەقیدەیەکی پاك و تێگەیشتن و کار و عیبادەتێکی پوخت، کە پێچەوانەی ئەمانە هەمووی بەدی دەکرێت لە پشتیوانانی مەولوودگێڕدا.

وە ئەگەر خێر بوایە هاوەڵان لەپێش ئێمەوە بوون بۆ وەرگرتنی، لەبەر پڕخێریێتی خۆیان: «خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ...» و کاملێ وەرگرتنی دینییان: «... أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانُوا خَيْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ، أَبَرَّهَا قُلُوبًا، وَأَعْمَقَهَا عِلْمًا، وَأَقَلَّهَا تَكَلُّفًا، قَوْمٌ اخْتَارَهُمُ اللهُ لِصُحْبَةِ نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَنَقْلِ دِينِهِ، ... فَهُمْ كَانُوا عَلَى الْهُدْيِ الْمُسْتَقِيمِ»[(١)].

واته: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خێرترین کەسانی ئەم ئومەتەن، خاوەنی خێروەمەندترین دڵن و قوڵترین زانستن، کەسانێکن خوای پەروەردگار هەڵی بژاردوون بۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرەکەی و گەیاندنی دینەکەی، ئەوان لەسەر ڕێگای ڕاست و هیدایەت بوون.

**٧**. لە مێژووی لەدایکبوونی پێغەمبەردا ﷺ بەس ناوی ساڵ و ڕۆژەکەی دیارە (عام الفيل، يوم الإثنين)، بەڵام مێژووی ڕۆژەکە و مانگەکەی دیار نییە و جیاوازییەکی زۆری زانایانی لەسەرە: «الأكثرون على أن ولادته ﷺ كانت في عام الفيل قيل بعد حادثة الفيل بخمس وخمسين يوماً وقيل بشهرين وقيل بأربعين يوماً وقبل الفيل بعشر للسنين وقيل قبل الفيل بخمس عشرة سنة وقيل غيره.

واختلفوا في الشهر الذي ولد فيه فقيل في شهر صفر وقيل في ربيع الآخر وقيل في رجب وقيل في رمضان، واختلفوا في يوم ولادته قيل في ربيع الأول ... وقيل لثمان ليال مضين منه وقيل التسع ... وقيل لعشر وقيل لاثنتي عشرة ... وقيل لسبع عشرة وقيل لثماني عشرة مضين منه ...»[(٢)].

واته: دەڵێن: لەدایکبوونی ﷺ دوای (عام الفيل) بە (٥٥) ڕۆژ یان دوو مانگ یا چل ڕۆژ،

---

(١) قول ابن مسعود وابن عمر رضي الله عنهما، رواه البغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٤)، و أبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣٠٥)، وابن تيمية في "منهاج السنة" (١/ ١٦٦).

(٢) "المولود النبوي هل نحتفل" لشحاتة محمد صقر ص١٦، "تفسير القرطبي" (٢٠/ ١٩٤).

یا پێش (عام الفیل) بووە بە (١٠) ساڵ یا (١٥) ساڵ ... وە مانگەکەشی مانگی (صَفَر) یا (ربیع الثانی) یا (رجب) یا (رمضان) بووە، وە ڕۆژەکەشی دەڵێن: (٨) ڕۆژ لە ربیع الأول تێپەڕیوە، یا نۆ ڕۆژ یا دە ڕۆژ یا دوانزە ڕۆژ یا حەڤدە ڕۆژ یا هەژدە ڕۆژ بووە.

«أولاً: اختلفوا في ولادته ﷺ، الأكثرون على أن ولادته كانت في عام الفيل، وهو قول ابن عباس، وقيل بعد حادثة الفيل بخمسين يوماً، وهو قول السهيلي المالكي، وقيل بخمس وخمسين يوماً، حكاه الحافظ الدمياطي الشافعي، وقيل بشهر وقيل بأربعين يوماً، حكاهما مغلطاي الحنفي وابن سيد الناس الشافعي، وقال الإمام الزهري: بعد الفيل بعشر سنين وقيل بخمس عشرة سنة.

ثانياً: اختلفوا في الشهر الذي ولد فيه ﷺ، فقيل في شهر صفر وقيل في ربيع الآخر حكاهما مغلطاي الحنفي، وقيل في رجب وقيل في رمضان حكاهما اليعمري االشافعي ومغلطاي الحنفي.

ثالثاً: اختلفوا في يوم ولادته ... قيل لليلتين مضتا من ربيع الأول، قالهُ ابن عبدالبر المالكي ورواه الواقدي، وقيل لثماني ليال مضين منه، روى ذلك عن ابن عباس وجبير بن مطعم واختاره ابن حزم وقطع به الخوارزمي ورجحه الحافظ ابن دحية وعليه جمع أهل التأريخ، وقال القطب القسطلاني هو اختيار أكثر أهل الحديث وهو اختيار أكثر من له معرفة بهذا الشأن ... وقيل لتسع خلون منه وهذا ما ذهب إليه الباشا الفلكي المصري وله رسالة علمية في هذا ورجحه الشيخ على الطنطاوي وقيل لعشر مضين منه وهو قول الشعبي ومحمد الباقر وصححه الحافظ الدمياطي الشافعي، وقيل لاثنتي عشرة مضت منه وقول ابن اسحاق، وقيل لسبع عشرة مضت منه، نقله ابن دحية عن بعض الشيعته، وقيل لثاني عشرة وقيل لثمان بقين رواه أبو رافع عن ابن حزم الظاهري ...»[1].

---

(١) "حقائق حول المولد النبوي" لأحمد بن سليمان الحمدان ص٢ – ٣.

الشَيْخ (العثيمين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أولاً: ليلة مولد الرسول صلى الله عليه وسلم ليست معلومة على الوجه القطعي، بل إن بعض العصريين حقق أنها ليلة التاسع من ربيع الأول، وليست ليلة الثاني عشر منه»[١].

واتە: ڕۆژی لەدایکبوونی دیار نییە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە، هەندێك لە هاوچەرخان بەدواداچوونێکیان کردووە دەڵێن شەوی (٩ ی رَبِيعُ الأَوَّل) بووە نەك (١٢)ی ئەو مانگە.

الشَيْخ (الألباني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «والأصح أنه ولد صلى الله عليه وسلم في التاسع من ربيع الأول، كما حققه بعض العلماء المعاصرين»[٢].

واتە: ڕای دروست ئەوەیە لە (٩ ی رَبِيعُ الأَوَّل)دا لەدایك بووە، وەکوو هەندێك لە زانایانی سەردەم دەڵێن.

بەم شێوەیە دەبینین بێجگە لە ڕۆژی دوو شەممە نەبێت نە مانگ و نە ساڵ هیچ بەڵگەیەك و کۆدەنگیێکی زانایانی لەسەر نییە، وە هاوەڵانیش پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ نەکردووە لەسەر لەدایکبوون و وردەکاریەکانی، وە ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەمە بابەتێکی شەرعی نییە، بەڵکوو شوێنکەوتەی و ئیمانهێنانی کاری پێویستە.

وە هاوەڵان و شوێنکەوتووانی باسی (ئەم بۆنەیە و زیندووکردنەوەی) هیچ گرنگییەکی نەبووە لایان، وەکوو الشَيْخ (أبو بكر الجزائري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «المولود النبوي ... والذي لم يعرف المسلمون غيره طيلة ستة قرون وربع قرن، أي من يوم نزول الوحي إلى مطلع القرن السابع الهجري ثم بعد سقوط الخلافة الإسلامية الراشدة وانقسام بلاد المسلمين وتمزقها وما تبع ذلك من ضعف وانحراف في العقائد، والسلوك، وفساد في الحكم والإدارة ظهرت بدعة المولود النبوي الشريف كمظهر من مظاهر الضعف والانحراف»[٣].

---

(١) "فتاوى أركان الإسلام" ص١٧٣ سؤال رقم (٨٩).

(٢) تحقيق "إصلاح المساجد من البدع والعوائد" للقاسمي ص١١٤.

(٣) "الإنصاف فيما قيل في المولد من الغلو والإجحاف" لشيخ أبو بكر الجزائري ص٥٠.

واتە: بە درێژایی شەش سەدە و چارەکێك موسوڵمانان لەدایکبوونی پێغەمبەریان ﷺ نەزانیوە، تا سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچی لە دوای ڕووخاندنی خەلافەتی ئیسلامی و دابەشکردنی موسوڵمانان و پارچەپارچە کردنیان بووە هۆکاری لاوازی و لادان لە بواری باوەڕ و ئاداب و حوکمڕانی و بەڕێوەبردندا، بیدعەی مەولوود سەری هەڵدا، وەکوو سەرهەڵدانی دەرکەوتێکی لاوازی ئیمانی و لادان و گۆڕانکارییەکی دینی.

**٨.** لە هەمووی وێرانتر بۆ ئەم بابەتە بناغەدانەر و دروستکاری یەکەمی ئەم مەولوودە دەوڵەتی فاتیمییەکان بوو لە میسر، لەسەر دەستی (بني عبيد القداح) دامەزرا لە نیوەی سەدەی چواری کۆچی تاوەکوو نیوە سەدەی شەشەمی کۆچی تەمەنی ئەم دەوڵەتە بوو، ئەم دەوڵەتە بانگەوازی بۆ شیعە دەکرد و پاشماوەیشی (تصوف)ی بەجێهێشت[1].

بانگەوازی بنەماڵەی ئەهل و بەیتیان دەرکرد و (ابن ديصان القداح) باپیرەیان خۆی بە کوڕی ئیمام (جعفر الصادق) ناو دەبرد، لەگەڵ ئەوەشدا بەندەیەکی بوو لە ژیانیدا، وە لە (مەغریب) وای بانگەواز بۆ دەکرد کە لە بنەماڵەی (عقيل بن أبي طالب) برای ئیمامی (عەلی)یە رضي الله عنه، تا خەڵکێکی زۆر دوای کەوتن، ئەمانە هەمووی درۆ بوون.

(ابن خلكان) رحمه الله دەڵێت «وأهل العلم بالأنساب من المحققين ينكرون دعواه في النسب»[2].

واتە: زانایانی ئاشنا بە بنەماڵەیەتی و شیکەرەوان بەرپەرچی ئەم بانگەوازییە و خۆدانە پاڵ ئەم بنەماڵەیەی دەدەنەوە.

ئەمانە پێیان دەوترا (عوبەیدی)ەکان، وایان دەردەبڕی لە ڕووکەشدا کە هەڵگری مەزهەبی ڕافیزەن، وە شیعە و لایەنگری ئیمامی (عەلی)ن، بەلام لە ڕاستیدا: «بَلْ يَجْعَلُونَهُمْ "مِنْ الْقَرَامِطَةِ الْبَاطِنِيَّةِ" الَّذِينَ مِنْهُمْ الْإِسْمَاعِيلِيَّة وَالنُّصَيْرِيَّة وَمِنْ جِنْسِهِمْ الخرمية الْمُحَمِّرَةُ وَأَمْثَالُهُمْ مِنْ الْكُفَّارِ الْمُنَافِقُونَ الَّذِينَ كَانُوا يُظْهِرُونَ الْإِسْلَامَ وَيُبْطِنُونَ الْكُفْرَ؛ وَلَا رَيْبَ أَنَّ اتِّبَاعَ هَؤُلَاءِ بَاطِلٌ؛ وَقَدْ

---

(١) بۆ زیاتر ئاشنا بوون بڕوانە کتێبی "الدولة الفاطمية" لدكتور علي محمد الصلابي.

(٢) "وفيات الأعيان" لابن خلكان (٣/ ١١٧).

وَصَفَ الْعُلَمَاءُ أَئِمَّةَ هَذَا الْقَوْلِ بِأَنَّهُمْ الَّذِينَ ابْتَدَعُوهُ وَوَضَعُوهُ؛ وَذَكَرُوا مَا بَنَوْا عَلَيْهِ مَذَاهِبَهُمْ؛ وَأَنَّهُمْ أَخَذُوا بَعْضَ قَوْلِ الْمَجُوسِ وَبَعْضَ قَوْلِ الْفَلَاسِفَةِ؛ ... بَلْ مَا ظَهَرَ عَنْهُمْ مِنْ الزَّنْدَقَةِ وَالنِّفَاقِ وَمُعَادَاةِ مَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ...»[1].

واته: ئەمانە (قەرامیتە باتنی)یەکانن، ئەوانەی دەڵێن قورئان مانای ڕووکەش و ناوەڕۆکی هەیە، لە (ئیسماعیلی)ەکان و (نوسەیری)ەکان و هاوشێوەکانیان لە بیروبڕوا و دووڕووەکان، ئەوانەی بە ڕووکەش ئیسلامیان دەوێت و لە ناوەڕۆکیشدا بێبڕوا بوون، تێکەڵ بوون لە هەندێك قسەی ئاگرپەرستەکان و هەندێك قسەی فەلاسیفەکان، بەڵام ئەوەی لێیان دەرکەوت هەمووی دەرچوون لە دین و دووڕوی و دژایەتی ئیسلام بوو.

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «فَهُمْ مِنْ أَفْسَقِ النَّاسِ. وَمِنْ أَكْفَرِ النَّاسِ ... وَهَؤُلَاءِ الْقَوْمُ يَشْهَدُ عَلَيْهِمْ عُلَمَاءُ الْأُمَّةِ وَأَئِمَّتُهَا وَجَمَاهِيرُهَا أَنَّهُمْ كَانُوا مُنَافِقِينَ زَنَادِقَةً يُظْهِرُونَ الْإِسْلَامَ وَيُبْطِنُونَ الْكُفْرَ. فَإِذَا قُدِّرَ أَنَّ بَعْضَ النَّاسِ خَالَفَهُمْ فِي ذَلِكَ صَارَ فِي إيمَانِهِمْ نِزَاعٌ مَشْهُورٌ. فَالشَّاهِدُ لَهُمْ بِالْإِيمَانِ شَاهِدٌ لَهُمْ بِمَا لَا يَعْلَمُهُ؛ إذْ لَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ يَدُلُّ عَلَى إيمَانِهِمْ مِثْلَ مَا مَعَ مُنَازِعِيهِ مَا يَدُلُّ عَلَى نِفَاقِهِمْ وَزَنْدَقَتِهِمْ وَكَذَلِكَ " النَّسَبُ " قَدْ عُلِمَ أَنَّ جُمْهُورَ الْأُمَّةِ تَطْعَنُ فِي نَسَبِهِمْ وَيَذْكُرُونَ أَنَّهُمْ مِنْ أَوْلَادِ الْمَجُوسِ أَوْ الْيَهُودِ. هَذَا مَشْهُورٌ مِنْ شَهَادَةِ عُلَمَاءَ الطَّوَائِفِ: مِنْ الْحَنَفِيَّةِ وَالْمَالِكِيَّةِ وَالشَّافِعِيَّةِ وَالْحَنَابِلَةِ وَأَهْلِ الْحَدِيثِ وَأَهْلِ الْكَلَامِ وَعُلَمَاءِ النَّسَبِ وَالْعَامَّةِ وَغَيْرِهِمْ ... حَتَّى صَنَّفَ الْعُلَمَاءُ فِي كَشْفِ أَسْرَارِهِمْ وَهَتْكِ أَسْتَارِهِمْ كَمَا صَنَّفَ الْقَاضِي أَبُو بَكْرٍ الْبَاقِلَانِي كِتَابَهُ الْمَشْهُورَ ... وَذَكَرَ أَنَّهُمْ مِنْ ذُرِّيَّةِ الْمَجُوسِ وَذَكَرَ مِنْ مَذَاهِبِهِمْ مَا بَيَّنَ فِيهِ أَنَّ مَذَاهِبَهُمْ شَرٌّ مِنْ مَذَاهِبِ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى؛ بَلْ وَمِنْ مَذَاهِبِ الْغَالِيَةِ الَّذِينَ يَدَّعُونَ إلَهِيَّةَ عَلِيٍّ أَوْ نُبُوَّتَهُ فَهُمْ أَكْفَرُ مِنْ هَؤُلَاءِ؛ ... وَكَذَلِكَ ذَكَرَ أَبُو حَامِدٍ الْغَزَالِيُّ فِي كِتَابِهِ الَّذِي سَمَّاهُ " فَضَائِلُ المستظهرية وَفَضَائِحُ الْبَاطِنِيَّةِ " قَالَ: ظَاهِرُ مَذْهَبِهِمْ الرَّفْضُ وَبَاطِنُهُ الْكُفْرُ الْمَحْضُ.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣٥/ ١٣١)، و "البدع الحولية" لعبد الله بن عبد العزيز التويجري ص١٤٤.

وَكَذَلِكَ الْقَاضِي عَبْدُ الْجَبَّارِ بْنُ أَحْمَد وَأَمْثَالُهُ مِنْ الْمُعْتَزِلَةِ»[(١)].

واتە: (فاتیمی)یەکان و (عوبەیدی)یەکان بێبڕوا و تاوانبارترین کەس بوون، زانایانی ئیسلام هەموویان شایەتی دووڕووی و دەرچوون لە دین دەدەن بەسەریاندا، کە بە ڕووکەش ئیسلام و بە ناوەڕۆك بێبڕوا بوون، وە بنەماڵەیان هەموو زانایانی ئەو ئوممەتە بە درۆیان دەخەنەوە و دەڵێن بنەماڵەی ئاگر پەرستەکان و جوولەکەن، ئەمە شایەتی هەموو زانایانی مەزهەب و ئەهلی فەرموودە و کەلامن، وە زانایانی نەسەب ناسن، تەنانەت زانایان نوسراوی سەربەخۆیان هەیە لەسەریان، وەکوو (أبوبکر الباقلاني) لە کتێبەکەیدا دەڵێت: لە بنەماڵەی ئاگر پەرستن، وە دەڵێت: بەرنامەیان پیسترین بەرنامەیە، وە ئیمامی (غەزالی) دەڵێت: ڕووکەشیان ڕافیزەن، بە ناوەڕۆك بێبڕوان.

کارەکانیان بریتی بوو لە: زۆر بەسۆز و بەڕەحم بوون بۆ گاوور و جوولەکەکان و زۆر لە پلە و دەسەڵاتەکانی دەوڵەتیان دەدا بەدەست ئەوانەوە، ئەوانیش بەکاریان دەهێنا بۆ زۆرترین خزمەتی گاوور و جوولەکەکانی ناو موسوڵمانان، پەرەدان بە دینەکانیان و گەشەکردنی ژیانی قەشە و حاخامەکان، وە لەولاشەوە دژایەتیکردنی سیمای دینی موسوڵمانان لە قەدەغەکردنی نوێژی تەراویح و سزادانی جێبەجێکاریان و نەفرەتکردن لە خولەفای ڕاشیدین و هەموو هاوەڵان لەسەر مینبەرەکانی میسر و نووسینی بەسەر دەرگا و دیوارەکانی مزگەوتەکانی میسر و قەدەغەکردنی کتێبەکانی فەرموودە.

لە ساڵی (٣٨١)ی کۆچی کتێبی "الموطأ"ی ئیمام (مالیك) بە یەکێك گیرا لە میسر، لێی درا و دەیان گێڕا بەناو خەڵکدا، وە تەنانەت بەسەر گۆڕستان و بازاڕ و دووکانەکانەوە قسەی ناشیرین و نەفرەت لە هاوەڵان و خولەفاکان و ناوداران دەنووسرا و زەردباو دەکرا، وە تەنانەت یەکێك لە زانایانی ئەهلی سوننەت (إبراهيم بن محمد الضبي)یان هەر بە زیندوویی کەوڵ کرد.

تا ئەو ئاستەی: «كَتَبَت امْرَأَة إِلَى الْعَزِيز: بِالَّذِي أَعَزَّ الْيَهُودَ بِمَنْشَا وَالنَّصَارَى بِعِيسَى بْنِ نَسْطُورَسَ، وَأَذَلَّ الْمُسْلِمِينَ بِكَ إِلَّا كَشَفْتَ ظُلَامَتِي»[(٢)].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣٥/ ١٢٧ - ١٢٩).

(٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (١١/ ٣٥٨)، و "المنتظم في تاريخ الملوك" لابن الفرج الجوزي (٧/ ١٩٠)، "الكامل في التأريخ" لابن الأثير (٧/ ٤٧٥).

واتە: ئافرەتێك ستەمی لێ کرابوو، هیچ کەس تۆڵەی بۆ نەدەکردەوە لەبەرئەوەی موسوڵمان بوو، کاربەدەستەکانیش گاوور و جوولەکە بوون، نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفەی عوبەیدییەکان (نزار بن المعز العبيدي): بەو کەسەی کە جوولەکەکانت بالأدەست کردووە "بە کاربەدەستەکەیان کە ناوی (منشأ بن ابراهيم اليهودي)" وە گاوورەکانیشت بالأدەست کردووە بە کاربەدەستەکەیان کە ناوی (عيسى بن نسطورس) بوو، وە موسوڵمانانی زەلیل کردووە بە تۆ؛ ئەم ستەم و زوڵمەم لەسەر لابە.

(المقريزي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وكان للخلفاء الفاطميين في طول السنة أعياد ومواسم وهي: موسم رأس السنة ويوم عاشوراء ومولود النبي ﷺ ومولود علي ابن أبي طالب ومولود الحسن ومولود الحسين ومولود فاطمة ... وعيد الغدير ويوم النوروز ويوم الميلاد وخميس العدسى»[(١)].

واتە: دەوڵەتی فاتیمییەکان ئاهەنگ و بۆنەگێڕانیان بە درێژایی ساڵ زۆر بووە، وەکوو سەری ساڵی تازە و عاشورا و لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ و ئیمامی عەلی و سێ منداڵەکانی و (غديرالخم) و نەورۆز و لەدایکبوونی مەسیح عَلَيْهِ السَّلَامُ و پێنج شەممە عەدەسی گاوورەکان.

فاتیمیەکان یەکەم کەس بوون بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەریان ﷺ دروست کرد لە سەدەی چواری کۆچی بەدواوە تاوەکوو سەدەی شەشی کۆچی[(٢)].

بەڵام هەندێك دەڵێن یەکەم کەس کاربەدەستی هەولێری ئەو کاتە بووە بەناوی (أبو سعيد كوكبري بن بكتكين الملقب الملك مظفرالدين صاحب إربل، ولد سنة ٥٤٩) [(٣)].

وەکوو ئیمامی (السيوطي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَأَوَّلُ مَنْ أَحْدَثَ فِعْلَ ذَلِكَ صَاحِبُ إِرْبِلَ الْمَلِكُ الْمُظَفَّرُ أَبُو سَعِيدٍ كُوكْبُرِي بْنُ زَيْنِ الدِّينِ عَلِيِّ بْنِ بَكْتَكِينَ»[(٤)].

---

(١) "الخطط المقريزي" (١/ ٤٩٠).

(٢) "الإبداع في مضار الابتداع" لعلي محفوظ ص٢٥٠، و "تأريخ الإحتفال بالمولود النبوي" لحسن السندوبي ص٦٢، و "القول الفصل" للأنصاري ص٦٤.

(٣) "البدع الحولية" لعبدالله بن عبدالعزيز التويجري ص١٤٨.

(٤) "الحاوي للفتاوي" للسيوطي (١/ ٢٢٢).

(أبو شامة) رحمه الله **دەڵێت: «أول من احتفل بذلك بالموصل الشيخ عمر بن محمد الملا أحد الصالحين المشهورين وبه اقتدى في ذلك صاحب إربل»**(١).

**بەم دوو قسەیە دەردەکەوێت یەکەم کەس کە مەولوودی لەدایکبوونی پێغەمبەری ﷺ داهێنابێت ناوداری بەڕێوەبەری هەولێر بووە مەلیك** (مظفرالدين) **بووە، ئەویش بە چاولێکردنی زانایەکی ناوداری بەناوبانگ بووە لە عیبادەتدا ناوی** (شيخ عمر بن محمد الملا) **بووە لە موسڵ، کە ساڵانە مەولودی دەگێڕاو ناوداران و خەڵکی بانگهێشت دەکرد، وە بۆیە مەلیك** (مظفرالدين) **زۆر ئەم بۆنەیە دەخرێتە پاڵی ساڵانە هەڵدەستا بە سازدانی مەولوود بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر لە سەرفکردنی پارە و ماڵ و خواردن دروستکردندا لە هەولێر، ساڵێك لە هەشتی** (ربيع الأول) **و ساڵێکیش لە دوانزەی** (ربيع الأول) **بۆ ئەوەی بەر ئەو دوو مێژووە بکەوێت کە زانایان باسیان کردووە.**

**وە** (أبو الخطاب بن دحية) **کتێبێکی نووسی لەسەر مەولوود بەناوی** "التنوير في مولد البشير النذير" **یەکەم کەس بووە لەم بارەیەوە بینوسێت، پێشکەشی کرد بە شا** (مظفرالدين) **ئەویش هەزار دیناری ئاڵتونی پێشکەش کرد**(٢).

**ئیمامی** (السيوطي) رحمه الله **دەڵێت: «هەزار سەر مەڕی برژاو و دە هەزار مریشك و سەد ئەسپ و سی هەزار قاپ حەلوا و ... دروست دەکرد ... خۆشی گوێی لە شیعر و قەسیدەکان دەگرت، لە نیوەڕۆوە بۆ بەیانی لەگەڵ سۆفییەکاندا** (الرقص الصوفي) **دەکرد ...»**(٣).

(عبد الله التويجري) **دەڵێت: «فلا شك ان العبيديين هم أول من احتفل بالمولد النبوي حسب ما ورد في كتب التأريخ والسير، دخل خليفة العبيديين المعز معد بن اسماعيل ٣٦٢هـ وكان ذلك بداية حكمهم في مصر، وكان آخر خليفة فيهم هو العاصد توفي سنة ٥٦٧هـ، وأما**

---

(١) "الباعث على انكار البدع" لأبو شامة ص٣١.

(٢) "الإنصاف فيما قيل في المولد من الغلو والإجحاف" لشيخ أبو بكر الجزائري ص٥٠.

(٣) "الحاوي للفتاوي" (١/ ١٩٢)، "البداية والنهاية" لابن كثير (١٣/ ١٣١)، "وفيات" لابن خلكان (٤/ ١١٧).

مظفرالدين صاحب إربل فولادته سنة ٥٤٩هـ وتوفي سنة ٦٣٠هـ، فهذا دليل قاطع على أن العبيديين سبقوا صاحب إربل بالاحتفال بالمولد النبوي ... سبقه إلى ذلك العبيديون بحوالي قرنين من الزمان»[1].

واته: گومان نییە دەوڵەتی عوبیدییەکان یەکەم کەس بوون مەولوودیان گێڕا بە گوێرەی نوسینە مێژووییەکان بێت، لەبەر ئەوەی یەکەم خەلیفەیان لە ساڵی (٣٦٢ك)دا بوو، وە کۆتا خەلیفەیان ساڵی (٥٦٧ك) بووە، وە شا (مظفر)ی هەولێر لە ساڵی (٥٤٩ك) لەدایك بووە، وە لە ساڵی (٦٣٠ك) کۆچی دوایی کردووە، ئەمە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە لەسەر ئەوەی فاتمییەکان بە نزیکەی دوو قەرن پێش شای هەولێر مەولوودیان گێڕاوە.

یەکێك لە چاکەو خێرە گەورەکانی (صلاح الدين الأيوبي) ﷬ لەناوبردن و کۆتاییهێنان بووە بە دەوڵەتی عوبەیدیەی فاتمییەکان لە میسر و ڕزگارکردنی قودس لە گاوورەکان.

**٩.** ئەم یادە بە درێژایی شەش سەدەی پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هیچ باسێکی نەبووە، وە زانایان بە گشتی کۆکن لەسەر بێبنەمایی ئەم یادە هەر لە کۆنەوە:

ئیمامی (تاج الدينى الفاكهاني المتوفي ٧٣٤هـ) دەڵێت: «لا أعلم لهذا المولد أصلا في كتاب ولا سنة، ولا ينقل عمله عن أحد من علماء الأمة، الذين هم القدوة في الدين، المتمسكون بآثار المتقدمين؛ بل هو بدعة أحدثها البطالون، وشهوة نفس اغتنى بها الأكالون»[2].

واته: ئەوەی بزانم هیچ بنەمایەك نییە بۆ مەولوود، نە لە قورئان نە لە سوننەتدا، وە کارپێکردنی نییە لەلای هیچ زانایەکی موسوڵمانانەوە شوێنی شوێنکەوتن و پەیوەستبوون بێت بە پێشووانەوە، بەڵکوو داهێنراوێکە بەتاڵەکان و خاوەن حەز و بخۆرەکان دایان هێناوە.

(ابن تيمية) ﷬ دەڵێت: «وَأَمَّا اتِّخَاذُ مَوْسِمٍ غَيْرِ الْمَوَاسِمِ الشَّرْعِيَّةِ كَبَعْضِ لَيَالِي شَهْرِ رَبِيعٍ الْأَوَّلِ الَّتِي يُقَالُ إنَّهَا لَيْلَةُ الْمَوْلِدِ، أَوْ بَعْضُ لَيَالِي رَجَبٍ، ... فَإِنَّهَا مِنْ الْبِدَعِ الَّتِي لَمْ يَسْتَحِبَّهَا السَّلَفُ وَلَمْ يَفْعَلُوهَا وَاَللَّهُ سُبْحَانَهُ، وَتَعَالَى أَعْلَمُ»[3].

---

(١) "البدع الحولية" للتويجري ص١٥١.

(٢) "المورد في عمل المولد" للفاكهاني ص٨، ٩.

(٣) "الفتاوى الكبرى" (٤/ ٤١٤)،"مجموع الفتاوى" (٢٥/ ٢٩٨).

واته: بەکارهێنانی بۆنەیەك لەو بۆنانە و بەشەرعیکردنی وەکوو مانگی (ربيع الأول) پێی کە دەڵێن شەوی مەولوود، یان شەوانی مانگی (ڕەجەب) ... ئەوا بیدعەیە و پێشووە صاڵحەکان نەیانکردووە و بە چاکیان نەزانیوە.

(أبو زرعة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت «**لا نعلم - أي عمل المولد - ولو بإطعام الطعام عن السلف**»[1].

واته: بوونی هیچ بەڵگەیەك نییە لە پێشووە سالحەکان کە بۆنەی مەولوودیان گێڕابێت، گەر بە خواردنیش بێت.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ لە پێناسەی بیدعەدا دەڵێت: «**تُشَابِهُ الطَّرِيقَةَ الشَّرْعِيَّةَ ... وَمِنْهَا: الْتِزَامُ الْكَيْفِيَّاتِ وَالْهَيْئَاتِ الْمُعَيَّنَةِ، كَالذِّكْرِ بِهَيْئَةِ الِاجْتِمَاعِ عَلَى صَوْتٍ وَاحِدٍ، وَاتِّخَاذُ يَوْمِ وِلَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِيدًا**»[2].

واته: بیدعەیەك لە شێوازی شەرعی بچێت لە گرتنەبەری چۆنیەتییەکی دیاریکراو، وەکوو زیکر بە کۆمەڵ و دەنگ بەرزکردنەوە و لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ کردنە جەژن.

وە (محمد بن الحاج المالكي المتوفي سنة ٧٣٧هـ) دەڵێت «**فَصْلٌ فِي مَوْلِدِ النَّبِيِّ والبدع المحدثة فِيهِ: وَمِنْ جُمْلَةِ مَا أَحْدَثُوهُ مِنْ الْبِدَعِ مَعَ اعْتِقَادِهِمْ أَنَّ ذَلِكَ مِنْ أَكْبَرِ الْعِبَادَاتِ وَإِظْهَارِ الشَّعَائِرِ مَا يَفْعَلُونَهُ فِي شَهْرِ رَبِيعٍ الْأَوَّلِ مِنْ مَوْلِدٍ وَقَدْ احْتَوَى عَلَى بِدَعٍ وَمُحَرَّمَاتٍ جُمْلَةٍ**»[3].

واته: لە باسی مەولوودا یەکێك لەوانەی دایان هێناوە کە بە باوەڕی خۆیان گەورەترین عیبادەتە و باشترین کارە دینییەکانە دەیکەن لە مانگی (ربيع الأول)دا؛ مەولوودە، کە چەندەها داهێنراو و حەرامەکان لەخۆ دەگرێت.

وە تەنانەت ئەو زانایانەی بە بیدعەی چاکی دادەنێن دان دەنێن بەوەدا هیچ بنەمایەکی دینی نییە، وەکوو ئیمامی (السيوطي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «**فَقَدْ وَقَعَ السُّؤَالُ عَنْ عَمَلِ الْمَوْلِدِ النَّبَوِيِّ فِي**

---

(١) "تشنيف الآذان" لأبو زرعة ص١٣٦.

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٥٣).

(٣) "المدخل" لابن الحاج (٢/ ١، ٢)،قال فيه ابن حجر:كثير الفوائد كشف فيه عن مصايب وبدع يفعلها الناس.

شَهْرِ رَبِيعٍ الْأَوَّلِ، ... الْجُوَابُ: عِنْدِي أَنَّ أَصْلَ عَمَلِ الْمُوْلِدِ الَّذِي هُوَ اجْتِمَاعُ النَّاسِ وَقِرَاءَةُ مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ ... وَأَوَّلُ مَنْ أَحْدَثَ فِعْلَ ذَلِكَ صَاحِبُ إِرْبِلَ الْمَلِكُ الْمُظَفَّرُ أَبُو سَعِيدٍ كُوكْبُرِي ... وَقَدْ صَنَّفَ لَهُ الشَّيْخُ أَبُو الْخَطَّابِ ابْنُ دِحْيَةَ مُجَلَّدًا فِي الْمَوْلِدِ النَّبَوِيِّ سَمَّاهُ "التَّنْوِيرُ فِي مَوْلِدِ الْبَشِيرِ النَّذِيرِ" ، فَأَجَازَهُ عَلَى ذَلِكَ بِأَلْفِ دِينَارٍ»[١].

واتە: پرسیاری مەولوودی لێ دەکەن لە کۆبوونەوەی خەڵك و قورئانخوێندن، دەڵێت: یەکەم کەس مەلیکی هەولێر دایهێناوە و تەنانەت بۆ یەکەم جار زانایەك بەناوی (ابن دحية) کتێبێکی لەسەر مەولوود بۆ دەنوسێت بەناوی "التنوير في مولد البشير النذير" بۆی دەخوێنێتەوە و ئەویش پاداشتی دەکات بە هەزار دیناری ئاڵتوونی.

گەرچی دوای ئەم قسەیە چەند بەڵگەیەك دەهێنێتەوە بۆی، ئەوە لە ڕەتکردنەوەی بەڵگەکانی مەولووددا باسی دەکەین.

وە (ابن حجر العسقلاني) رَحِمَهُ اللَّهُ یەکێکی ترە لەوانەی کە ڕێگە بە مەولوود دەدات، بەڵام دەڵێت: «أَصْلُ عَمَلِ الْمُوْلِدِ بِدْعَةٌ لَمْ تُنْقَلْ عَنْ أَحَدٍ مِنَ السَّلَفِ الصَّالِحِ مِنَ الْقُرُونِ الثَّلَاثَةِ»[٢].

واتە: بنەمای مەولوود بیدعەیە، لە هیچ کەسێکی هاوەڵان و شوێنکەوتووانی ئەو سێ سەردەمە پڕ خێرە نەکراوە.

الشَّيْخ (العثيمين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «ولهذا نقول: إن ما يفعله أكثر المسلمين اليوم من الاحتفال بمولد الرسول صلى الله عليه وسلم في اليوم الثاني عشر من شهر ربيع الأول بدعة ليس له أصل من السنة»[٣].

واتە: ئەوەی زۆری موسوڵمانان دەیکەن لە ئاهەنگگێڕانی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ بیدعەیە و هیچ بنەمایەکی نییە لە سوننەتدا.

---

(١) "الحاوي للفتاوي" للسيوطي (١/ ٢٢١ – ٢٢٢).

(٢) "الحاوي للفتاوي" للسيوطي (١/ ٢٢٩).

(٣) "لقاء الباب المفتوح" لمحمد بن صالح العثيمين (٣٥/ ٦)، و "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٦/ ١٦٨)، (٧/ ٣٦٤).

الشَّيْخ (ابن باز) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «**الاحتفال بالموالد من البدع التي حدثت في الناس ... الاحتفال به من البدع التي حدثت في المسلمين ولم يفعله النبي صلى الله عليه وسلم ولا أصحابه لا الخلفاء الراشدون ولا غيرهم، وهكذا لم يفعله المسلمون في القرون المفضلة الثلاثة، وقد قال عليه الصلاة والسلام في الحديث الصحيح: «من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد» ... فالواجب على المسلم ترك ذلك**»[(١)].

**واتە: مەولود دروست کراوەو بیدعەیە ئاهەنگ گێڕان پێی، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی و لە سێ سەدەی ئیسلام دا نەکراوە.**

**وە هەروەها** الشَّيْخ (محمد عبدالسلام الشقيري) **لە کتێبی** "السنة والمبتدعات" ص١٣٨، الشَّيْخ (محمد بن ابراهيم) **لە** "الفتاوى" (٣/ ٥٤)، الشَّيْخ (محمد عبداللطيف) **لە** "الدار السنية" (٨/ ٢٨٥)، الشَّيْخ (حمود التويجري) "الرد القوي" ص٢٢٣، و "فتاوى اللجنة الدائمة" (٣/ ٤١) رقم (٩١٢٦). **هەموویان بڕیار لەسەر بیدعەیەتی مەولوود دەدەن.**

الشَّيْخ (صالح الفوزان) **دەڵێت**: «**إقامة الاحتفال بالمولد النبوي صلى الله عليه وسلم هذا ممنوع من ناحية أخرى، لأنه تشبه بالنصارى الذين يحتفلون بمولد المسيح عليه السلام ... الاحتفال بالمولد النبوي من البدع المحدثات المنكرات التي جاءت بعد انقضاء القرون المفضلة**»[(٢)].

الشَّيْخ (محمد بن صالح المنجد) **دەڵێت**: «**مولد الرسول ﷺ ممنوع من عدة وجوه:**

**١. أنه لم يكن من سنة الرسول ﷺ.**

**٢. تشبه بالنصارى.**

**٣. وسيلة إلى الغلو والمبالغة في تعظيمة ﷺ.**

---

(١) "فتاوى نور على الدرب" لابن باز (٣/ ٥٢).

(٢) "مجموع الفتاوى" لشيخ صالح الفوزان (٢/ ٦٩١).

**٤. يفتح باب للبدع الأخرى والاشتغال بها عن السنن ...»**[(١)].

و الشَّيخ (الألباني) رحمه الله في "قاموس البدع" ص٧٢٠، و "الثمر المستطاب" (١/ ٥٧٧).
**ئاماژە بۆ ئەم بابەتە دەکات.**

**١٠. بەڵگە گومانaوییەکان لەسەر بوونی مەولوود:**

الشَّيخ (أبو بكر الجزائري) رحمه الله **دەڵێت: «عندما أحدثت بدعة المولد في مطلع القرن السابع وفشت وانتشرت بين الناس لوجود فراغ روحي ... وتأصلت هذه البدعة في النفوس وأصبحت جزء من عقيدة كثير من أهل الجهل لم يجد بدا بعض أهل العلم كالسيوطي رحمه الله تعالى من محاولة تبريرها بالبحث عن شبه يستشهر بها على جواز بدعة المولد هذه وذلك إرضاء للعامة والخاصته أيضاً من جهة وتبريراً لرضى العلماء بها وسكوتهم عنها لخوفهم من الحاكم والعوام من جهة ...»**[(٢)].

**واته: کاتێك بیدعەی مەولـوود لـه سەدەی حەوتی کۆچیدا دروست بوو، لەناو خەڵکدا بڵاو بووەوە، بە هۆکاری بۆشایی ڕۆحی دینی ئەم داهێنراوە داکوترا لـه ناخیاندا و بووە بەشێك لـه باوەڕی زۆری نەزانەکان، هیچ چاریان نەما هەندێك لـه خاوەن زانست وەکوو ئیمامی** (السيوطي) رحمه الله**، بێجگە لـه پاساو نەبێت بیهێنێتەوە بۆ ڕازیکردنی زانایان بێدەنگن لـه ئاستی، لەبەر ترسی دەسەڵات و خەڵکی نەزان لەلایەك.**

**بە تایبەت ئەو زانایانەی کە بەم جۆرەوە گیرۆدە بوون نیشتەجێی ئەو شوێنانە بوون کە ئەم بیدعەیەی تێدا بڵاوە لـه میسر و شام و عێراق، وەکوو:** (السيوطي، أبو شامة المقدسي وابن حجر العسقلاني ...) **لـه ناودارەکان، وە ئەمانەی دوای ئەوانیش بە هەمان شێوەی گیرۆدە و تووشبوون و هەمان بەڵگە و گومانەکانی ئەوان دووبارە دەکەنەوە.**

---

(١) "موقع الإسلام سؤال وجواب" لمحمد بن صالح المنجد (١٢/ ٧).

(٢) "الإنصاف فيما قيل في المولد من الغلو والإجحاف" ص٥٧، و "البدع الحولية" لعبد الله التويجري ص١٥٩.

بۆ پەرچدانەوەی بەڵگە گوماناوییەکانی ئەم بابەتە، پێویست دەکات بچینەوە سەر بەڵگەی پێشووان:

**بەڵگەی یەکەم:** ئیمامی (السيوطي) رحمه الله دەڵێت: «وَقَدِ اسْتَخْرَجَ لَهُ إِمَامُ الْحُفَّاظِ أبو الفضل ابن حجر أَصْلًا مِنَ السُّنَّةِ، وَاسْتَخْرَجْتُ لَهُ أَنَا أَصْلًا ثَانِيًا، ... قَالَ: أَصْلُ عَمَلِ الْمَوْلِدِ بِدْعَةٌ لَمْ تُنْقَلْ عَنْ أَحَدٍ مِنَ السَّلَفِ الصَّالِحِ مِنَ الْقُرُونِ الثَّلَاثَةِ، وَلَكِنَّهَا مَعَ ذَلِكَ قَدِ اشْتَمَلَتْ عَلَى مَحَاسِنَ وَضِدِّهَا، فَمَنْ تَحَرَّى فِي عَمَلِهَا الْمَحَاسِنَ وَتَجَنَّبَ ضِدَّهَا كَانَ بِدْعَةً حَسَنَةً وَإِلَّا فَلَا، ... قَالَ: وَقَدْ ظَهَرَ لِي تَخْرِيجُهَا عَلَى أَصْلٍ ثَابِتٍ وَهُوَ مَا ثَبَتَ فِي الصَّحِيحَيْنِ مِنْ «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَوَجَدَ الْيَهُودَ يَصُومُونَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَسَأَلَهُمْ فَقَالُوا: هُوَ يَوْمٌ أَغْرَقَ اللهُ فِيهِ فرعون وَنَجَّى مُوسَى فَنَحْنُ نَصُومُهُ شُكْرًا للهِ تَعَالَى»، فَيُسْتَفَادُ مِنْهُ فِعْلُ الشُّكْرِ للهِ عَلَى مَا مَنَّ بِهِ فِي يَوْمٍ مُعَيَّنٍ مِنْ إِسْدَاءِ نِعْمَةٍ أَوْ دَفْعِ نِقْمَةٍ، ... وَأَيُّ نِعْمَةٍ أَعْظَمُ مِنَ النِّعْمَةِ بِبُرُوزِ هَذَا النَّبِيِّ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ؟ وَعَلَى هَذَا فَيَنْبَغِي أَنْ يُتَحَرَّى الْيَوْمُ بِعَيْنِهِ حَتَّى يُطَابِقَ قِصَّةَ مُوسَى فِي يَوْمِ عَاشُورَاءَ»[1].

واتە: (ابن حجر العسقلاني) رحمه الله بنەمایەکی بۆ ئەم بۆنەیە دۆزیوەتەوە، وە منیش بنەمای دووەمم بۆ دۆزیوەتەوە، (ابن حجر) دەڵێت: مەولوود بیدعەیە و کەسێك لە پێشینە صاڵحەکان نەیان کردووە، ئەم بۆنەیە چاکە و خراپە لەخۆ دەگرێت، ئەوەی چاکەکانی بکات لە خراپەکانی بەدوور بێت ئەوا بیدعەی حەسەنەیە، وە ئەگەر نا ... وە بنەمایەکم بۆ ڕوون بووەتەوە لە سەری، ئەویش ئەو فەرموودەیەیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەچێتە مەدینە دەبینێ جوولەکەکان بەڕۆژوون، پرسیاریان لێ دەکات، دەڵێن: ئەم ڕۆژە خوای گەورە فیرعەونی لەناو برد و (موسا)ی ڕزگار

(١) "الحاوي للفتاوي" للسيوطي (١/ ٢٢٤ - ٢٢٩)، والحديث رواه البخاري (٢٠٠٤)، ومسلم (١١٣٠)، وأبو داود (٢٤٤٤)، والنسائي في "الكبرى" (٢٨٤٧)، وأحمد (٣١١٢)، والدارمي في "السنن" (١٨٠٠)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٩٣٥٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٦٢٥)، والطبراني في "الكبير" (١٢٤٤٢)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٧٨٤٣)، والبزار في "المسند" (٥١٣٣)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٠٨٤)، والبغوي في "شرح السنة" (١٧٨٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٨٤١٥)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٢٧١).

کرد، ئێمەیش بۆ سوپاسگوزاری خوا بەڕۆژووین ... ئەمەی لێ وەردەگیرێت (سوپاسگوزاری لەسەر نیعمەتێك لە ڕۆژێکی دیاریکراودا)، وە چ نیعمەتێك لە دەرکەوتنی پێغەمبەر ﷺ گەورەترە لەو ڕۆژەدا؟ وا پێویست دەکات ئەو ڕۆژە بەتەواوی دیاری بکەین، تاوەکوو بگونجێت لەگەڵ بەسەرهاتەکەی (موسا)دا عليه السلام لە عاشورا.

**زانایان بەم شێوەیە بەرپەرچی دەدەنەوە:**

**١.** ئەگەر وەکوو (عاشورا) بێت ئەوا دەبێت بەڕۆژوو بین نەك ئاهەنگ بگێڕین، «المفروض أننا نصوم كما صام النبي ﷺ لا أننا نقيم المآدب والأفراح بالطبول والمزامير، ... فما أعجب هذا الفهم المعكوس، ... فهل الله تعالى يشكر بالطرب والأكل والشرب؟ اللهم لا، لا»[(١)].

واتە: زۆر سەیرە پێچەوانەی ئەم فەتوایە دەبوایە بەڕۆژوو بین، وە ئایا شوکرانەی خودا بە ئاهەنگ و تەپڵ و خواردن و خواردنەوە دەکرێت؟.

**٢.** پێچەوانەی بڕیاری یەکەمیەتی، (ابن حجر) رحمه الله کە وتی کەسێك لە هاوەڵان و تابعین و شوێنکەوتووانی ئەو سێ سەردەمە پڕ خێرە بە ئیقراری پێغەمبەر ﷺ نەیان کردووە، گەر وایە چۆن بوو بە بیدعەی چاکە؟ بۆ چاکە ماوەتەوە ئەوان نەیکەن؟!

**٣.** گەر ئەم بۆنەی (عاشورا)یە ببوایە بە بەڵگە ئەوا (صەحابە و تابعین) دەیانکردە بەڵگە لەڕووی تێگەیشتن و کارپێکردنی و لێیان ون نەدەبوو تا ئەم بۆیان بدۆزێتەوە، کاتێك (ابن حجر) رحمه الله لە ساڵی (٨٥٢)ی کۆچی لە (قاهیرە) وەفاتی کردووە؛ هیچ زانایەك بە درێژایی هەشت سەدە و نیو ئەم بەڵگەیەی نەدۆزیوەتەوە بێجگە لەم، نەك سێ سەدەی پڕ لە خێری هاوەڵان و شوێنکەوتووانی.

ئیمام (مالك) رحمه الله دەڵێت: «كل أحد يؤخذ من قوله، ويُترك إلا صاحب هذا القبر، صلى الله عليه وسلم»[(٢)].

---

(١) "الإنصاف فيما قيل في المولد من الغلو والإجحاف" لشيخ: أبي بكر الجزائري ص٣٣.

(٢) "الموطأ" للإمام مالك (١/ ٢٥١)، "سلسلة الأحاديث الصحيحة" للألباني (١/ ٢٥٨)، و "أصل صفة صلاة النبي ﷺ" (٣/ ٨٢١)، و "أحكام الجنائز" ص١٧٥، وفي "الإرواء" (٢/ ٢٦٥).

واته: هەموو کەس قسەی لیٚ وەردەگیرێت و ڕەت دەکرێتەوە بێجگە لـە خاوەنی ئەم قەبرە نەبێت (واتە پێغەمبەر ﷺ ).

**٤.** عیبادات وەستاوە (توقيفية) و بنەمایە لـەسەر شەرع و بەڵگە، نەك ڕا و بەچاکزانین و داهێنراوی چاك(١).

پاشان داوا دەکات بگەڕێین بەدوای دیاریکراوی تەواوی ڕۆژی مەولوددا وەکوو ڕۆژی عاشورا با بیپێکن، ئەمە بۆخۆی هەوڵێکی بیٚ ئەنجامە لـەبەر نەبوونی بەڵگەی تەواو لـەسەر ڕۆژەکە.

**٥.** پێغەمبەری خوا ﷺ باسی عاشورای کردووە و هانی خەڵکی بۆ داوە، بە پێچەوانەی مەولودەوە نە باسی کردووە وە نە خێریشی لـەسەر بڕیار داوە، گەر ببوایە لـێی نەدەشاردینەوە، وەکوو خۆی دەفەرموێت: «إِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٍ يُقَرِّبُكُمْ إِلَى الْجَنَّةِ إِلَّا قَدْ أَمَرْتُكُمْ بِهِ وَلَيْسَ شَيْءٌ يُقَرِّبُكُمْ إِلَى النَّارِ إِلَّا قَدْ نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ»(٢).

واته: کارێك نەماوە نزیکتان بخاتەوە لـە بەهەشت فەرمانم پیٚ کردوون و هیچ کارێکیش نەماوە نزیکتان بخاتەوە لـە ئاگر ئیلا ڕێگریم لیٚ کردوون.

**٦.** ئەی ئەوەی بۆ لـەبیر دەچێت کە پێغەمبەری خواش ﷺ هەر لـەم ڕۆژەدا وەفاتی کردووە؟ بۆنەیەك بخوێنرێتەوە تیایدا و بۆنەیەك پەراوێز بکرێت کە پێچەوانەی یەکن!

**٧.** (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «قول كثير من العلماء أو العباد أو أكثرهم، ونحو ذلك، فليس مما يصلح أن يكون معارضا لكلام الرسول صلى الله عليه وسلم حتى يعارض به، ... إذا فعلها قوم ذوو فضل ودين فقد تركها في زمان هؤلاء، ... إن لم يكونوا أفضل ممن فعلها، فليسوا دونهم. ولو كانوا دونهم في الفضل ... ثم عامة المتقدمين الذين هم أفضل من المتأخرين»(٣).

---

(١) "البدع الحولية" لعبد الله بن عبدالعزيز بن أحمد التويجري ص١٦١، و "الرد القوي على الرفاعي والمجهول وابن علوي وبيان أخطائهم في المولد النبوي" لحمود بن عبد الله التويجري ص٣٢.

(٢) "سلسلة الأحاديث الصحيحة" للألباني (٢٨٦٦)، وسبق تخريجه ص٤٠.

(٣) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" لابن تيمية (٢/ ٨٩)، (٢/ ١١٨).

ِواتە: قسەی زۆری زانایان و خواناسان ناشیێت ببێتە پێچەوانەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و بەرامبەری بووەستیێت، وە ئەگەر کەسانێکی باش و زانا بیستیان کردیان لە سەردەمێکدا ئەوا هەر لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك زانا و خواناسان نەیان کردووە، خۆ ئەگەر لە ئاستیاندا نەبێت لە خوار ئەوانەوە نین، خۆ پێشووەکان بە گشتی باشتڕن تاکوو ئەم دواییانە.

بە ڕوونی دیارە کاردانەوەی شوێن لەسەر ئەم جۆرە زانایانە بووە، وە گەر وا نەبێت بۆچی زانایانی حیجاز ئەم باسەیان نییە؟!

**٨.** هۆکار چییە یاد و بۆنە لەوە گرنگترەکانی تری دین پشتگوێ دەخرێت؟ وەکوو بۆنەی یەکەم هاتنە خوارەوەی وەحی لە ئەشکەوتی (حراء)، یاخود چوون بۆ ئیسرا و میعراج، یاخود سەرکەوتنی جەنگی بەدر، یان کۆچکردن بۆ مەدینە ... بەڵام بۆنەی لەدایکبوون بەو ڕێژەیە زەق دیاری دەکرێت و پشتیوانی و پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە.

ئەگەر ئەمە هۆکاری چاولێکردنی گاوورەکان بۆ لەدایکبوونی (مەسیح) نەبێت و خوو و عادەتی بەربڵاوی خەڵکی نەبێت و گونجاو نەبێت لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانی خەڵکیدا بۆ ئەم هەموو پشتیوانییە و پێ لەسەر داگرتنەی بۆ دەکرێت؟

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ: «وَلَكِنْ قَدْ حَدَثَ أُمُورٌ لَمْ تَكُنْ مِنْ قَبْلُ، ابْتُلِيَ بِهَا الْعَالَمُ الْغَرْبِيُّ، وَغَزَا بِهَا الْعَالَمَ الشَّرْقِيَّ، وَلُبِّسَ بِهَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ، وَهِيَ تِلْكَ الْمَبَادِئُ الْهَدَّامَةُ ... وَإِبْرَازُ شَخْصِيَّاتٍ ... وَصَارُوا يُقِيمُونَ لَهُمُ الذِّكْرَيَاتِ، ... فَقَامَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مَنْ يَقُولُ: نَعْلَمُ أَنَّ الْمَوْلِدَ لَيْسَ سُنَّةً نَبَوِيَّةً، وَلَا طَرِيقًا سَلَفِيًّا، وَلَا عَمَلَ الْقُرُونِ الْمَشْهُودِ لَهَا بِالْخَيْرِ، وَإِنَّمَا نُرِيدُ مُقَابَلَةَ الْفِكْرَةِ بِالْفِكْرَةِ، وَالذِّكْرَيَاتِ بِالذِّكْرَى، لِنَجْمَعَ شَبَابَ الْمُسْلِمِينَ»[١].

واتە: ئێستا ڕووداوێك ڕویان داوە لەوەوپێش نەبووە، ئەویش جیهانی ڕۆژئاوا تووشی کۆمەڵێك شت بووە و جیهانی ڕۆژهەڵاتی پێ داگیر کردووە، ئەو بیروبۆچوونە ڕوخێنەرانەیە ... بە دەرکەوتنی کۆمەڵێك کەسانی ناودار، بەم هۆکارەوە بۆنە و یادیان بۆ کراوە، موسڵمانانیش تیایاندا دەڵێت: دەزانین مەولود لە سوننەتدا نییە و ڕێگای پێشووان و کاری سێ سەدە خێرەکە نییە، بەڵام دەمانەوێت لە ئاستی ئەواندا بەربەرەکانی بکەین و یاد و بۆنە بەرامبەر یاد و بۆنە بکەین

(١) "أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن" للشنقيطي (٨/ ٣٨٦) في تفسير سورة [الإنسان].

تاوەکوو گەنجانی موسوڵمان کۆ بکەینەوە.

گەر وابێ ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ دەخەینە ڕیزی ئەو ناودار و سەرۆکانەوە کە ناویان هەیە لە دونیا، ئەمەش شایستە نییە و عەقڵ ڕێگەی پێ نادات، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ ۝٤﴾ [الشرح: ٤] ناوی پێغەمبەر ﷺ بەرز بووەتەوە پێنج جار لە ڕۆژێکدا، لە بانگدا، لە قامەتدا، لە تەحیاتدا، لە سلاّواتدا[1].

**بەڵگەی دووەم:** ئیمامی (السیوطي) رحمه الله لە دوای بەڵگەکەی (ابن حجر) رحمه الله دەڵێت: «وَقَدْ ظَهَرَ لِي تَخْرِيجُهُ عَلَى أَصْلٍ آخَرَ، وَهُوَ مَا أَخْرَجَهُ الْبَيْهَقِيُّ عَنْ أَنَسٍ «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَقَّ عَنْ نَفْسِهِ بَعْدَ النُّبُوَّةِ» ... أَنَّ الَّذِي فَعَلَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِظْهَارٌ لِلشُّكْرِ عَلَى إِيجَادِ اللهِ إِيَّاهُ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ وَتَشْرِيعٌ لِأُمَّتِهِ كَمَا كَانَ يُصَلِّي عَلَى نَفْسِهِ لِذَلِكَ، فَيُسْتَحَبُّ لَنَا أَيْضًا إِظْهَارُ الشُّكْرِ بِمَوْلِدِهِ بِالِاجْتِمَاعِ وَإِطْعَامِ الطَّعَامِ وَنَحْوِ ذَلِكَ مِنْ وُجُوهِ الْقُرُبَاتِ وَإِظْهَارِ الْمَسَرَّاتِ»[2].

واتە: بنەمایەکی ترم بۆ ڕوون بووەتەوە لەم بارەیەوە، ئەویش ئەو ڕیوایەتەیە کە (ئەنەس) رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ حەوتی بۆ خۆی کردووە لە دوای پێغەمبەرایەتی، ئەمە ئەوە دەردەخات پێغەمبەر ﷺ ئەمەی کردووە وەك سوپاسگوزارییەکی خوایی لەسەر بوونی بە ڕەحمەتێکی خوایی و هۆکاری شەریعەت بۆ گەلەکەی، وەك چۆن سلاّواتی لەسەر خۆی دەدا، وا باشە ئێمەیش دەربڕینی شوکرانەی خوا بکەین بە لەدایکبوونی، بە کۆبوونەوە و خواردن بەخشینەوە و جۆرەکانی نزیکبوونەوەی خوایی و دەرخستنی خۆشییەکان.

---

(١) "المولد النبوي هل نحتفل" لشحاتة محمد صقر ص٨٧.

(٢) "الحاوي للفتاوي" للسيوطي (١/ ٢٣٠)، والحديث في "السنن الكبرى" للبيهقي (٩/ ٣٠٠) وقال: هو حديث منكر، وفي "كشف الأستار" للهيثمي (١٢٣٧)، و "مصنف عبدالرزاق" (٧٩٦)، قال ابن حجر في "الفتح" (٩/ ٥٩٥): لا يثبت، وقال الألباني في "الصحيحة" (٦/ ٥٠٤): وهو كذلك، وقال النووي في "المجموع" (٨/ ٤١٢): هذا حديث باطل، وقال ابن القيم في "تحفة المودود" ص٥٧: قال أحمد: منكر، وقال البزار في "فتح الباري" (٩/ ٥٩٥)" ضعيف.

**وەڵام:**

**یەکەم:** فەرموودەکە لاواز (ضعیف)ە و کاری پێ ناکرێت، ئیمام (مالك وأحمد بن حنبل والبزار، والبيهقي والنووي والحافظ المزي والحافظ الذهبي وابن حجر والألباني) ڕەحمەتی خوایان لێبێت هەموویان بە (ضعیف)یان داناوە و کاری پێ ناکرێت.

**دووەم:** وە ئایا ئەگەر مەڕی سەربڕیبێت بۆ شوکرانەی خوا؛ دەبێتە بەڵگە بۆ کردنە جەژنی ڕۆژی لەدایکبوونی؟!

**بەڵگەی سێیەم:** ئیمامی (السيوطي) ﷺ دەڵێت: «ثُمَّ رَأَيْتُ إِمَامَ الْقُرَّاءِ الْحَافِظَ شمس الدين ابن الجزري قَالَ فِي كِتَابِهِ الْمُسَمَّى "عَرْفُ التَّعْرِيفِ بِالْمَوْلِدِ الشَّرِيفِ" مَا نَصُّهُ: قَدْ رُؤِيَ أبو لهب بَعْدَ مَوْتِهِ فِي النَّوْمِ، فَقِيلَ لَهُ: مَا حَالُكَ، فَقَالَ: فِي النَّارِ، إِلَّا أَنَّهُ يُخَفَّفُ عَنِّي كُلَّ لَيْلَةِ اثْنَيْنِ وَأَمُصُّ مِنْ بَيْنِ أُصْبُعَيَّ مَاءً بِقَدْرِ هَذَا - وَأَشَارَ لِرَأْسِ أُصْبُعِهِ - وَأَنَّ ذَلِكَ بِإِعْتَاقِي لثويبة عِنْدَمَا بَشَّرَتْنِي بِوِلَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبِإِرْضَاعِهَا لَهُ. فَإِذَا كَانَ أبو لهب الْكَافِرُ الَّذِي نَزَلَ الْقُرْآنُ بِذَمِّهِ جُوزِيَ فِي النَّارِ بِفَرَحِهِ لَيْلَةَ مَوْلِدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهِ، فَمَا حَالُ الْمُسْلِمِ الْمُوَحِّدِ مِنْ أُمَّةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَرُّ بِمَوْلِدِهِ وَيَبْذُلُ مَا تَصِلُ إِلَيْهِ قُدْرَتُهُ فِي مَحَبَّتِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؛ لَعَمْرِي إِنَّمَا يَكُونُ جَزَاؤُهُ مِنَ اللهِ الْكَرِيمِ أَنْ يُدْخِلَهُ بِفَضْلِهِ جَنَّاتِ النَّعِيمِ»[1].

واتە: (ابن الجزري) بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ مەولوود: (ئەبو لەهەب) لەپاش مردنی لە خەودا بینرا، پێیان وت: حاڵت چۆنە؟ وتی: لە ئاگردام، بەڵام لەسەرم سووك کراوە لە هەموو شەوێکی دوو شەممەدا بەقەد نێوان دوو پەنجە ئاو دەخۆمەوە، بە بۆنەی ئازادکردنی (سۆیبە)ی کەنیزەك، کاتێك مژدەی لەدایکبوونی پێغەمبەری پێدام و شیری پێدا، (ئەبو لەهەب)ی کافر پاداشتی بدرێتەوە لە ئاگردا بە بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبێت حاڵی موسڵمانی ئەم گەلە چۆن بێت کاتێك دەبەخشێت بە خۆشی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە ﷺ.

---

(١) "الحاوي للفتاوي" للسيوطي (١/ ٢٣٠)، و"فتح الباري" لابن حجر (٩/ ١٤٥).

(ابن حجر العسقلاني) رَحِمَهُ اللَّهُ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت:

١. «وَفِي الْحَدِيثِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْكَافِرَ قَدْ يَنْفَعُهُ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِي الْآخِرَةِ لَكِنَّهُ مُخَالِفٌ لِظَاهِرِ الْقُرْآنِ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ۝٢٣﴾ [الفرقان: ٢٣]»[١].

واتە: بەم ڕیوایەتە دەبێتە بەڵگە کە بێباوەڕ کردەوەی چاك سوودی لێ دەبینێت لە قیامەتدا، ئەمەش پێچەوانەی قورئانە کە دەفەرموێت: هەر کارێکتان هێنابێت؛ ئێمە پەرت و بڵاوی دەکەینەوە (واتە بێباوەڕان).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ۝٦٥﴾ [الزمر: ٦٥].

واتە: گەر هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدەیت؛ ئەوا کردەوەکانت دەسڕینەوە و زەرەرۆمەند دەبیت.

٢. ئەم ڕیوایەتە (مرسل)ە لە (عروة)وە، ئەمەش بەشێکە لە فەرموودەی لاواز (ضعيف).

٣. ئەم گێڕانەوەیە خەوە و خەویش نابێت بە بەڵگە، وە ڕەنگە ئەوەیش بینیبێتی لەو کاتەدا بێبڕوا بووە.

٤. لەم گێڕانەوەیەدا دەڵێت: ئازادکردنی (سوێبە) لەگەڵ لەدایکبوونی پێغەمبەردا ﷺ بووە، یان پێش شیرخواردنی، ئەمەش بۆ خۆی پێچەوانەی گێڕانەوەکانی ژیانی پێغەمبەرە ﷺ.

(ابن سعد) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ قَالُوا: وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصِلُهَا وَهُوَ بِمَكَّةَ. وَكَانَتْ خَدِيجَةُ تُكْرِمُهَا. وَهِيَ يَوْمَئِذٍ مَمْلُوكَةٌ. وَطَلَبَتْ إِلَى أَبِي لَهَبٍ أَنْ تَبْتَاعَهَا مِنْهُ لِتُعْتِقَهَا. فَأَبَى أَبُو لَهَبٍ. فَلَمَّا هَاجَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمَدِينَةِ أَعْتَقَهَا أَبُو لَهَبٍ. وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبْعَثُ إِلَيْهَا بِصِلَةٍ وَكِسْوَةٍ. حَتَّى جَاءَهُ خَبَرُهَا أَنَّهَا قَدْ تُوُفِّيَتْ سَنَةَ سَبْعٍ. مَرْجِعَهُ مِنْ خَيْبَرَ»[٢].

واتە: لە زۆرێك لە ئەهلی عیلمەوە دەڵێن پێغەمبەر ﷺ هاتوچۆی دەکرد لە مەککە، وە (خەدیجە) ڕێزی لێ دەگرت لەو کاتەدا هێشتا بەندە بووە، پێغەمبەر ﷺ داوای کرد لە (ئەبو

---

(١) "فتح الباري" لابن حجر (٩/ ١٤٥).

(٢) "الطبقات الكبرى" لابن سعد (١/ ٨٧).

لەهەب) پێی بفرۆشێت بۆ ئەوەی ئازادی بکات، (ئەبو لەهەب) نەیکرد، کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە (ئەبو لەهەب) ئازادی کرد و پێغەمبەر ﷺ جل و بەرگی بۆ دەنارد، تاوەکوو هەواڵی مردنی بیست لە ساڵی حەوتی کۆچی هاتنەوەی لە خەیبەر.

(ابن عبد البر) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وأعتقها أبو لهب بعد ما هاجر رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ إلى المدينة»[1].

واتە: (ئەبو لەهەب) کاتێك ئازادی کرد، پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە.

**٥.** هیچ بەڵگەیەك نییە بۆ خۆشحاڵی (ئەبو لەهەب) بە لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ و مژدە پێدانی و ئازادکردنی (سوەیبە)[2].

بە کورتی (عومەری کوڕی خەتاب) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: «عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: قَالَ لِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: «هَلْ تَعْرِفُ مَا يَهْدِمُ الإِسْلامَ؟» قُلْتُ: لَا، قَالَ: «يَهْدِمُهُ زَلَّةُ الْعَالِمِ، ...»[3].

واتە: دەزانیت چی ئیسلام دەڕوخێنێت؟ فەرمووی: هەڵەی زانا دەیڕوخێنێت.

وە (معاذ بن جبل) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: «أُحَذِّرُكُمْ زَيْغَةَ الْحَكِيمِ»[4].

---

(١) "الاستيعاب في معرفة الأصحاب" لابن عبدالبر (١/ ١٢)، "الوفاء بأحوال المصطفى" لابن الجوزى (١/ ١٧٨).

(٢) "الرد القوي على الرفاعي والمجهول وابن علوي وبيان أخطائهم في المولد النبوي" لحمود بن عبدالله التويجري ص٥٧، "المولد النبوي هل نحتفل" لشحاتة محمد صقر ص٦٨.

(٣) رواه الدارمي في "السنن" (٢٢٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٣١٧)، وفي "مسند الفاروق" لابن كثير (٢/ ٥٣٦)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (٤/ ٢٢٨)، وفي "أخبار الشيوخ وأخلاقهم" لأبو بكر المروذي (٣٤٥)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٢٦٩).

(٤) رواه أبو داود (٤٦١١)، وقال الألباني: صحيح الإسناد موقوف، وقال شعيب الأرنؤوط: أثر إسناده صحيح، ورواه الطبراني في "الكبير" (٢٢٨)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٢٠٧٥٠)، والحاكم في "المستدرك" (٤/ ٥١٣) وقال: هذا حديث صحيح على شرط مسلم، ولم يخرجاه، ورواه ابن عساكر في "تاريخ دمشق" (٦٥/ ٣٣٧ ، ٣٣٨)، والمزي في "تهذيب الكمال" في ترجمة يزيد بن عَميرة (٣٢/ ٢١٨ – ٢١٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٩١٦)، وفي "المدخل" (٨٣٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١١٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٢٣٢)، وابن عبدالبر في "الجامع" (١٨٧١)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (٥/ ٣١).

واتە: ئاگاداری هەڵەی زانا بن.

**بەڵگەی چوارەم:** قسەیەکی (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەکەن بە بەڵگە کە دەڵێت: «ما يحدثه بعض الناس، إما مضاهاة للنصارى في ميلاد عيسى عليه السلام، وإما محبة للنبي صلى الله عليه وسلم، وتعظيمًا. والله قد يثيبهم على هذه المحبة والاجتهاد، لا على البدع من اتخاذ مولد النبي صلى الله عليه وسلم عيدًا. مع اختلاف الناس في مولده. فإن هذا لم يفعله السلف، مع قيام المقتضي له وعدم المانع منه ... وأكثر هؤلاء الذين تجدهم حراصًا على أمثال هذه البدع، مع ما لهم من حسن القصد، والاجتهاد الذين يرجى لهم بهما المثوبة»[1].

واتە: ئەوەی هەندێك لە خەڵکی دایانهێناوە (مەولوود) یان چاولێکردنی گاوورەکانە لە لەدایکبوونی مەسیح عَلَيْهِ السَّلَامُ یان خۆشەویستی پێغەمبەر و ﷺ بە بەرز ڕاگرتنیەتی، ڕەنگە خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە لەسەر ئەو خۆشەویستی و هەوڵدانەیان، نەك لەسەر بیدعەکەیان بە بەجەژنگرتنی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ، ئەمە پێشووانی صالح نەیان کردووە، لەگەڵ بوونی پێویست و نەبوونی ڕێگریدا، زۆری ئەوانە هەوڵ دەدەن لەسەر ئەم بیدعەیە، لەگەڵ ئەوەشدا نیەتی پاکیان هەیە و کار دەکەن، ئومێدی پاداشت دەکرێن لەسەری.

مەبەستیان لەو لەتە قسەیەتی کە دەڵێت: «وإما محبة للنبي صلى الله عليه وسلم، وتعظيمًا. والله قد يثيبهم على هذه المحبة والاجتهاد»، «مع ما لهم من حسن القصد، والاجتهاد الذين يرجى لهم بهما المثوبة»، واتە: لەگەڵ ئەوەشدا نیەت و مەبەستی چاکیان هەیە، ئومێدی ئەوە هەیە پاداشت بدرێنەوە لەسەر خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەر ﷺ و نیەت چاکییان.

ئەم قسەیە دان پیادانان نییە لەسەر مەولوود، وە ئەگەر بە تەواوی قسەی پێش و پاشی بخوێنیتەوە دەزانیت کە دەڵێت بیدعەیە و هیچ بنەمایەکی نییە.

هەروەها دەڵێت: «وهذان الأصلان جماع الدين: أن لا نعبد إلا الله، وأن نعبده بما شرع، لا نعبده بالبدع»[2].

---

(١) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" لابن تيمية (٢/ ١٢٣، ١٢٤).

(٢) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" لابن تيمية (٢/ ٣٧٣).

وه دەڵێت: «الْعِبَادَاتُ مَبْنَاهَا عَلَى الشَّرْعِ وَالِاتِّبَاعِ لَا عَلَى الْهَوَى وَالِابْتِدَاعِ»[1].

واته: دوو بنەما بناغەی دینە: هیچ خوایەك نەپەرستین بێجگە لە (الله) و پەرستنەکانیشمان دەبێت بە شەرع بێت نەك بە بیدعە، عیبادات بنەمای لەسەر شەرع و شوێن کەوتەییە، نەك ئارەزوو و داهێنراو، پاشان بەرنامە و کاری (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ کۆی نوسراوەکانی شاهیدن لەسەر بنەبڕکردنی بیدعە بە هەموو جۆرەکانی و دژایەتیکردنی لادان لە قورئان و فەرموودە، تەنانەت لەم پێناوەدا لە بەندینخانەی قەڵای دیمەشق وەفاتی کرد ڕەحمەتی خوای لێبێت.

**١١. چەند یاسایەکی فیقهی و بنەمایی (القواعد الأصولية الفقهية):**

ئەم بنەمایانە دەبنە شاهیدحاڵ بۆ ڕەتدانەوەی مەولوود و شەرعی نەبوونی.

**أ-** «لَا يَجُوزُ تَأْخِيرُ الْبَيَانِ عَنْ وَقْتِ الْحَاجَةِ»[2].

واته: دروست نییە دواکەوتنی ڕوونکردنەوە لەکاتی پێویستیدا، واته ئەگەر بۆنەی لەدایکبوون دین و عیبادەت بوایە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نەدەخست و ڕوونی دەکردەوە.

**ب-** (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «الأَصلُ في العِبَاداتِ التَّوقِيف»[3].

واته: بنەما لە عیبادەتەکاندا وەستانو لە ئاست بەڵگە و دەرنەچوونە لێی.

ئەگەر مەولوود عیبادەت و کاری خێر و نزیکبوونەوە بوایە لە خوا؛ ئەوا لە عیبادەتەکاندا باس دەکرا و بوونی دەبوو.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١/ ٨٠).

(٢) "قواطع الأدلة في الأصول" للمروزي (٢/ ٢٩٥)، "أصول السرخسي" (٢/ ٢٨)، "روضة الناظر" لابن قدامة (١/ ٥٣٤)، و "الموافقات" للشاطبي (٤/ ١٤٠)، و "إرشاد الفحول" للشوكاني (١/ ١٥٤)، و "المذكرة" للشنقيطي (١/ ١٠)، و "الفقيه والمتفقه" لخطيب البغدادي (١/ ٣٢٨)، و "قواعد الفقه" لمحمد البركتي (٧٢).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٩/ ١٧)، "شرح منظومة القواعد الفقهية" للسعدي (٣/ ١٠) حمد بن عبدالله الحمد، "القواعد الفقهية وتطبيقاتها في المذاهب الأربعة" لدكتور محمد مصطفى الزحيلي (٢/ ٧٦٩)، "قواعد ومعرفة البدع" للجيزاني ص٦٧.

**ت-** «الأعياد توقيفية»[١]، «إنما العيد شريعة، فما شرعه الله اتبع. وإلا لم يحدث في الدين ما ليس منه»[٢].

واتە: جەژنەکان بە گوێرەی بەڵگەیە، وە جەژن بەشێکە لە شەرعی خوا، ئەوەی دایڕشتووە شوێنی دەکەوین، وە ئەگەر نا هیچ کارێك لە دیندا دروست ناکرێت، ئەگەر مەولوود جەژن بوایە ئەوا باس دەکرا.

**ث-** «العادات المجردة لا بدعة فيها»[٣]، «الْعَادِيَّاتِ مِنْ حَيْثُ هِيَ عَادِيَّةٌ لَا بِدْعَةَ فِيهَا، وَمِنْ حَيْثُ يَتَعَبَّدُ بِهَا أَوْ تُوضَعُ وَضْعَ التَّعَبُّدِ تَدْخُلُهَا الْبِدْعَةُ»[٤].

واتە: کارە دونیاییە ئاساییەکان نابێتە بیدعە، وە کارە ئاساییەکان وەکوو خۆیان ئاساین و نابنە بیدعە، بەڵام گەر بەنیەتی عیبادەت یان لە شوێنی عیبادەت دابنرێت ئەوا بیدعە دەیگرێتەوە، واتە ئەگەر مەولوود بە عادەت سەیر بکرێت و بکرێت، بەڵام نیەتی خێر و عیبادەت و لە شوێنی عیبادەت دانەنرێت و وەکوو کارێکی دینی سەیر نەکرێت ئەوا نابێتە بیدعە، بەڵام گومان نییە و ئەستەمە ئەو کار و نیەتانەی لێ دابڕدرێت، لەبەرئەوەی هۆکار و خاوەنییەتی دینی بناغەی بونیەتی، ئەویش پێغەمبەرە ﷺ و هەوڵدان و مەسرەفی خەڵك بە نیەتی خێر و چاکەیە، کەواتە بێگومان مەولوود بیدعەیە.

## ١٢. زیانەکانی:

**أ-** بوارێکە بۆ فێربوونی موسڵمان بە ڕۆتینیات و ڕووکەشەوە و لادان لە کاری بنەمایی، لە جیاتی بیر لە زیندووکردنەوەی سوننەت و شوێنکەوتنی ڕێگاکەی بکەین سەرقاڵ دەبین بە یاد و گەرم وگوڕییەکی کاتی و لەبیرکردنێکی بەردەوام.

**ب-** فێرکردنی کۆمەڵگا بە دووڕوویی و ڕیابازی، کاتێ مانگی بەناو مەولوود دێت هەرچی کەسانی ئیمان لاواز و کەسانی نوقم بوو لە کارە حەرامەکاندا هەن بیر لەوە دەکەنەوە خۆیان حەشار دەن و سومعەی کەسایەتییان جوان پیشان بدەن لە کۆمەڵگایەکدا، بە تایبەت ڕوو لەدین بن، ئەویش مەولود باشترین هەلە کە شیرینی و لافیتە و ... بە دووکان و کۆگاکانیدا بڕازێنێتەوە

(١) "معيار البدعة" للجيزاني ص٢٦١.

(٢) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٦١٤).

(٣) "معيار البدعة" للجيزاني ص٢٠٣.

(٤) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٩٤).

و ڕوویەکی تازە پیشانی خەڵکی بدات، بۆ ئەوەی شوێنی متمانەی زیاتری خەڵکی بێت.

**ت-** تەنانەت دەسەڵاتدارانی جیهانی ئیسلامی ئەم جۆرە بۆنە و قەبر هەڵبەستن و گومەز دروستکردنە دەکەنە بەڵگە بۆ موسڵمانیەتی دەسەڵاتداران و ئیسلام جێبەجێکاریەتی، داگیرکەرانیش ئەم هەلەیان قۆستۆتەوە، وەك (نابليون بونابرت)، مێژوونووسی میسری (الجبرتي) دەڵێت: ناپلیۆن فەرمانی دا بە پشتیوانیکردنی ناوداریکی سۆفی کە ئەم بۆنەیەی دەگێڕا، بە ناوی (الشيخ البكري) و سێ سەد ڕیاڵی فەرەنسی پێدا و ڕازاندنەوەی ئاهەنگەکەی و خۆیشی لە سەرەتایەوە تا کۆتایی ئامادە بوو، وە دەڵێت: ناپلیۆن دەیزانی ئەمە لە دینیاندا نییە و پیاو و ژن تێکەڵ دەبێت و هەوا و ئارەزووە حەرامەکانی تێدا دەکرێت[١].

وە سەفیری ئەمریکی بەشداری ئاهەنگی مەولوودی کرد لە (١٣ إبريل ٢٠٠٦) کاتێك تەریقەتی قادری کردی، وە سەفیری ئەمریکی بەشداری ئەم بۆنەیەی کرد لە میسر (فرانسيس ريتشارد) لە شاری (طنطا) بۆ ئاهەنگی (سيد بدوي)[٢].

**ث-** تێکەڵبوونی پیاو و ژن و تەپڵ لێدان و شیعر وتن و خەڵك هەراسان کردن و وەسف و باسێکی پێغەمبەر و ﷺ زیادەڕەوی تیایدا و وتنی چەندەها فەرموودەی هەڵبەستراو و درۆ بەناوی پێغەمبەری خواوە ﷺ، بە تایبەت ئەو شیعرە پڕ (شیرکییانە) کە هەمووی هاوار و سوێند خواردنە بە پێغەمبەر و ﷺ خستنە ڕیزی خواوەیە.

وەکوو خاوەنی (قصيدة البردة) بە پێغەمبەر ﷺ دەڵێت:

يـا أكـرمَ الخـلقِ مَا لي مَن ألـوذُ بِه　　سواكَ عندَ حُلولِ الحادثِ العمِمِ

فـإنّ مِن جـودِكَ الدُنيـا وضُـرتُـها　　ومِن علـومِك عِـلْمُ اللوحِ والقلمِ[٣]

---

(١) "المولد النبوي هل نحتفل" لشحاتة محمد صقر ص٣٩، "تأريخ عجائب الآثار في التراجم والأخبار" لعبدالرحمن بن حسن الجبرتي المؤرخ (٢/ ٢٠١)، و "مظهر التقديس" للجبرتي ص٤٧.

(٢) "المولد النبوي هل نحتفل" لشحاتة محمد صقر ص٤٠.

(٣) "ديوان البوصيري" ص٢٣٨، "البردة شرحاً واعراباً" لمحمد يحى (١/ ٢٠٧)، "ثلاثية البردة" لحسن حسين (١/ ٨٢)، "دليل الواعظ إلى أدلة المواعظ" لشحاتة محمد صقر (٢/ ٧٤٤).

واتە: ئەی بەخشندەترین دروستکراو هیچ کەسم نییە پەنای پێبگرم، بێجگە لە تۆ لە کاتی هاتنی بەڵاکاندا، یەکێك لە بەخشندەیی تۆ دونیا و قیامەتە، وە یەکێك لەعیلمەکانت عیلمی (اللوح وقلم)ە.

هاوار لە غەیری خوا دەکات (مَا لِي مَن ألوذُ بِه سواكَ) و (جودِكَ الدُنيا وضُرتُها) و (عِلْمُ اللوحِ والقلمِ) ئەمانە هەمووی موڵکی خودایە، هەر ئەو پەنای موسوڵمانانە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾﴾ [النمل: ٦١].

واتە: کێ بە فریای خاوەن پێویستییەوە دێت کاتێك دوعا دەکات بێجگە لە پەروەردگار؟

عیلم و زانستی غەیب کە عیلمی (اللوح والقلم)ە بەس خودا دەیزانێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٦٥﴾﴾ [النمل: ٦٥].

واتە: بڵێ زانستی غەیب هیچ بوونێك لە ئاسمان و زەوی نایزانێت، وە هەستیش ناکەن بە ڕۆژی زیندووبوونەوە.

بە هەدەردانی سەروەت و سامانی موسوڵمانان لە پێناوی کارێکدا کە بە زەرەر و زیان دەشکێتەوە بەسەر موسوڵماناندا، وە زیادەڕەویشە لە دیندا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ»[1].

واتە: زیادەڕەوی مەکەن لە دیندا.

---

(١) رواه ابن ماجه (٣٠٢٩)، وأحمد (١٨٥١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٣٩٠٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٨٧١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩٨)، وأبو يعلى في "المسند" (٢٤٧٢)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٨٦٧)، والحاكم في "المستدرك" (١٧١١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/٢٢٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢١٤٤)، وفي "حجة النبي ﷺ" ص٨٠، و"صحيح الجامع الصغير" (٢٦٨٠).

وە دەفەرموێت: «لَا تُطْرُونِي، كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ»[(١)].

واتە: زیادەڕەوی مەكەن لە مندا وەكوو زیادەڕەوی گاوورەكان لە (عیسا)دا عليه السلام.

ناونانی بە جەژن، دووبارە بوونەوەی لە هەموو ساڵێكدا، بە قەدر و بەها ڕاگرتنی ئەمە بۆ خۆی بابەتێكی بیروباوەڕ (اعتقادي)ە، چاوەڕێبوونی پاداشت لەسەری، پەیوەندیبوونی بە ڕووداوێكی دینی، پاڵنەری ئەم هەموو كارە دین بێت؛ ئەوا ئەستەمە (مستحيل) ناو بنرێت بە كاری دونیایی و عادەتییە كە ئێمە دەیكەین، وە ئەگەر ئەم بۆنەیە بەم هەموو بنەما و ڕەگ و ڕیشاڵە بگۆڕێت بۆ دەرس و وانەی سیرە و ژیاننامەی پێغەمبەر و ﷺ بیرخستنەوەی پلەوپایەی؛ هەر نا توانرێت ناو بنرێت دروستە و بیدعە نییە لەبەرئەوەی:

١. مێژووی لەدایكبوونی پێغەمبەر ﷺ ونە و دیار نییە.

٢. دەرگایەك دەكرێتەوە بۆ كاری ناشەرعی و داهێنراوی تر و ڕۆژانی گرنگتری ژیانی پێغەمبەر ﷺ.

٣. خەڵكی وا گومان دەبەن كارێكی بنەمایی دینییە، لەگەڵ ئەوەشدا وانییە.

٤. لێكچوونە لەگەڵ كاری گاوورەكان بۆ لەدایكبوونی (مسيح) عليه السلام و ناودارە بێبڕواكانی دونیا[(٢)].

(١) رواه البخاري (٣٤٤٥)، وأحمد (١٥٤)، والدارمي في "السنن" (٢٨٢٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٥٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٢/١٤٧)، والطبراني في "الأوسط" (١٩٣٧)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٩٧٥٨)، والحميدي في "مسنده" (٢٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٦٨١)، والبيهقي في "الشعب" (١٤١١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٦٧٤).

(٢) "المولد النبوي هل نحتفل" لشحاتة محمد صقر ص٢٢.

## چوارەم : داهێنراو لەژێر ناونیشانی سوودمەندییە ڕەچاوکراوەکانی شەرع (المصالح المرسلة)

بەرنامە و شەریعەتی ئیسلام گشتگیری هەموو لایەنەکانی ئادەمیزادە بۆ ژیانی و دوای مردنی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾ [الأنعام : ٣٨].

واتە: هیچمان لە قورئاندا بەجێ نەهێشتووە لە باس و پێویستییەکان.

وە دەفەرموێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ [المائدة : ٣].

پێویستییەکانی تەشریع تەواو بووە، نەوەی یەکەم لەسەر قورئان دەڕۆشتن، وە ئەگەر لە دەقێك تێنەگەیشتنایە یاخود کارێکی تازە بوایە ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا بوو، هەموو ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنێك دەردەکەوت، پاش ئەو سەردەمە و دوو نەوەی دوای ئەوانیش زانایانی (صەحابە) و هەڵگری فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هۆکاری تێگەیاندن و شیکردنەوەی دین بوون.

بەڵام کاتێك پانتایی دەوڵەتی ئیسلامی زیادی کرد؛ زانایانی ئیسلام تاکە سەرچاوەیەکن بۆ وەرگرتن و هۆکاری چارەسەر کردنن بۆ هەموو تازەگەرییەکان و پێویستییەکانی ژیان بە ئیجتیهاد لە دەقەکان و ئاماژەی باسەکان، یاخود مەبەست و ناوەڕۆکە شەرعییەکان دەکەنە مەبەستی بابەتەکان.

وەکوو دوای باسی ڕۆژوو دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ [البقرة : ١٨٥].

واتە: خوای گەورە کارئاسانی دەوێت و کارگرانی ناوێت.

وە لە دوای دەستنوێژ دەفەرموێت: ﴿مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٦﴾﴾ [المائدة : ٦].

واتە: خوای گەورە نایەوێت قورساییتان لەسەر دروست بێت، بەڵکوو دەیەوێت پاکبوونەوە و نیعمەتەکانی خۆی تەواو بکات بەسەرتاندا.

وە لە دوای نوێژ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾ [العنكبوت : ٤٥].

واتە: نوێژ هۆكاری لابردنی هەموو تاوان و خراپەكانە.

وە لە دوای گۆڕینی قیبلە دەفەرموێت: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ﴾ [البقرة : ١٥٠].

واتە: بۆ ئەوەی خەڵكی هیچ بەڵگەكارییەكی بەسەرتانەوە نەمێنێت، وەكوو گاوور و جوولەكەكان ڕوو دەكەنە ڕووگەی ئێمە، دەبێت بێنە سەر دینی ئێمەش.

لە یاسای تۆڵەسەندنەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ [البقرة : ١٧٩].

واتە: لە تۆڵە سەندنەوەدا ژیان دروست دەبێت.

بەم شێوەیە دەبینین شەرعی خوا ﷻ ئاماژە بۆ هەموو بابەت و مەبەستە ناوەڕۆكییەكان دەكات، لێرەدا زانایان بۆ ئەو كار و ڕووداوانەی بەڵگەیان لەسەر نییە بۆ بوون و نەبونی بەڵام گونجاوێك دەیانگرێتەوە شەرع ڕەچاوی كردووە لە یاساكانیدا، وەكوو ئەو نموونانەی پێشوو باسمان كرد، ئەم شێوە دەرككردن بە ڕەچاوكردنە شەرعییانە زانایان ناویان ناوە سوودمەندییە ڕەچاوكراوەكانی شەرع (المصالح المرسلة).

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دە نموونەی لەسەر دەهێنێتەوە كە هاوەڵان كاریان پێ كردووە، هەندێك لەوانە[1]:

١. كۆكردنەوەی قورئان لە یەك (مصحف)دا لە سەردەمی (أبو بكر) رضي الله عنه، وە كۆكردنەوەی خەڵك لەسەر یەك خوێندنەوە لە سەردەمی (عثمان بن عفان) رضي الله عنه، هەردووكیان بە كۆدەنگی هاوەڵان.

٢. سزای عەرەق خۆر بۆ هەشتا دار دانرا لە سەردەمی (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ١٢ - ٤٦).

٣. کوشتنی کۆمەڵێك لە تۆڵەی یەك کەسدا لە سەردەمی ئیمامی (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه.

٤. گەر ماڵی دەوڵەت نەما و کاری دەوڵەت نەدەچوو بەڕێوە؛ بۆ دەوڵەت هەیە لە دەوڵەمەندان وەربگرێت بۆ بەڕێوەبردن.

٥. دروستکردنی بەندینخانە و لێدانی تاوانباران بۆ دەرکەوتنی حەقەکان.

٦. دروستە ئیمامی دەوڵەت سزاکان بکات بە ماڵ گەر سوودمەندی تیابوو.

٧. بۆ سەرۆکی دەوڵەت گەر کەسی شیاوتریش هەبوو لا نابرێت، بە مەرجێك کارەکان بە باشی دەچوون بەڕێوە ... .

ئەمانە چەند نموونەیەکن لە خوێندنەوەی ڕەچاوکردنە شەرعییەکان بۆ کارە پێویستیەکانی ژیان.

لەسەر ئەمانە و خوێندنەوەی زیاتری شەرعی؛ زانایان بڕیاریان داوە ناوبنرێت (المصالح المرسلة) و کاری پێ بکرێت، وەکوو ئیمامی (مالیك) رحمه الله بە ناونیشانی (المصلحة المرسلة) لە هەموویان زیاتر کاری پێ دەکرد، وە ئیمامی (الشافعي)ش رحمه الله لەژێر ناونیشانی (القیاس) کاری پێ دەکرد، وە (أبو حنیفة) رحمه الله لەژێر ناونیشانی (الاستحسان والعرف)دا کاری پێ دەکرد، ئەتوانین بڵێین کۆی زانایان وەکوو بەڵگەیەکی شەرعی کاریان پێ کردووە[١].

**مەرجەکانی کارپێکردن بە (المصلحة المرسلة):**

بەڵام بیدعەکاران ئەم هەلەیان قۆستۆتەوە، لەژێر ئەم ناونیشانانەدا دەرگای ڕەهایان بۆ خۆیان کردووەتەوە بە ناونیشانی (المصلحة المرسلة) چەندەها داهێنراویان ئەنجام داوە بەبێ هیچ مەرج و پابەندبوونێکی زانستی شەرعی ڕەچاوکراو.

لەبەرئەوەی شوێنی ئیجتیهادی زانایانە، بۆ نزیکخستنەوەی لە شەرع چەند ڕێنماییەکی زانستییان بە مەرج گرتووە بۆ ڕەچاوکردنی، لەوانە:

١. لە هیچ دەقێك وکۆدەنگیێکی زانایان نەدات و بگونجێت لەگەڵیاندا.

٢. بۆ هێنانەدی (المصالح الخمس الضروریات) ئەو پێنج پێویستییە سەرەکییانەی کە هەموو یاساکانی ئیسلامی لە پێناودا دابەزیوە کە: (الدین والنفس والمال والعقل والنسل)ن.

---

(١) "المصلحة المرسلة محاولة لبسطها ونظرة فیها" لعلی محمد جریشة ص٤٣ – ٤٥.

٣. دەبێت لەو بابەتانەدا بێت كە دەرك بە ماناكەی دەكرێت، واتە هیچ پەیوەندییەكی لە (عیبادات)دا نەبێت لەبەر دەرك پێنەكردن و نەزانینی ئەو بابەتانە بە عەقڵ، وەك نوێژ و ڕۆژوو و حەج ...[1].

٤. وە دەبێت ڕەچاوكردنی (المصلحة العامة) سوودمەندییە گشتییەكان بێت، نەك سوودمەندییە تایبەتەكان[2].

ئیمامی (الشنقيطي) ﷺ دەڵێت: «ولكن التحقيق أن العمل بالمصلحة المرسلة أمر يجب فيه التحفظ وغاية الحذر حتى يتحقق صحة المصلحة وعدم معارضتها لمصلحة أرجح منها أو مفسدة أرجح منها أو مساوية لها، وعدم تأديتها إلى مفسدة في ثاني حال ... وليس تشريعاً جديداً خالياً عن دليل أصلاً ... يستند إلى عمل الصحابة رضي الله عنهم بها من غير أن ينكر منهم ... ومنها: أنه قد علم من استقراء الشرع الكريم محافظته»[3].

واتە: كاركردن بە (مصالح المرسلة) پێویستی بە ئاگاداربوون و خۆ پاراستنێكی تەواو هەیە، تاوەكوو بگەنە بەدیهێنانێكی سوودمەندی و بوونی هیچ دژایەتییەك لە ئاستی سوودمەندییەكی گەورەتردا، یاخود دروستبوونی خراپەیەكی گەورەتر یان لە ئاستی ئەودا، یاخود سەر نەكێشێت بۆ خراپتڕێكی داهاتوو. ئەمە یاسایەكی تازەی بێ بەڵگە نییە، بەڵكوو پشت و پەنا بۆی كاری هاوەڵان بێ ئینكارییان سوودێكی شەرعی ڕەچاوكراوە.

(عطية سالم) قوتابی الشَّيخ (الشنقيطي) ﷺ دەڵێت: «وهي في الحقيقة أخطر هذه الأصول من حيث دقة البحث وسعة الجوانب وشدة الحاجة المتجددة. ومكمن الخطر في ادعاء المصلحة لأنه ادعاء عام، وكل يدعيه لبحثه فيما يذهب إليه ... ولن يذهب مجتهد فقط إلى حكم في مسألة لا نص فيها إلا وادعى أنه ذهب لتحقيق المصلحة. ولكن، أي المصالح يعنون ... إن المصلحة الإنسانية الخاصة أمر نسبي، ... في عمومه وإطلاقه، لا خاصة ولا نسبية ... فهي التي يشهد لها

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٤٧ – ٥٦).

(٢) "المصلحة المرسلة محاولة لبسطها ونظرة فيها" لعلى محمد جريشة ص٤٥.

(٣) "المصالح المرسلة" للشنقيطي ص٢١.

الشرع الذي جاء لتحقيق مصالح جميع العباد، ومراعاة جميع الوجوه، لأن الشرع لا يقر مصلحة تتضمن مفسدة مساوية لها أو راجحة عليها ظهر أمرها أو خفي على باحثها»[(١)].

واتە: لە ڕاستیدا ئەم (مصالح المرسلة)یە شوێنی مەترسییەکی گەورەیە لە ڕووی ووردەکاری بابەتەکەوە و فراوانی لایەنەکانی وە زۆری پێویستی تازە بۆی، شوێنی مەترسییەکەی ئەوەیە بە گشتی پەنای بۆ دەبەن و دەیخەنە پاڵ کارەکانیان، زانایەك نییە لە حوکمی شتێکدا گەر دەقی بەدەستەوە نەبێت پەنای پێ نەبات و نەڵێت بۆ بەدەستهێنانی سوودمەندییەکەیە، سوودمەندی ئادەمیزاد ڕێژەییە، بەڵکوو لە ڕاستیدا سوودمەندی شەرعی بە شێوە گشتی و ڕەهاکە نەك تایبەت و ڕێژەییەکە، لەبەرئەوەی شەرع سوودمەندییەك ناخوێنێتەوە کە بە هاوشێوەی زەرەرمەندی یان زیاتری تێدا بێت، جا دەرکەوتبێت یان شارەزابێت لەسەر خاوەنی.

ئیمامی (الشاطبي) ﷺ دەڵێت: «فَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ عَدُّوا أَكْثَرَ الْمَصَالِحِ الْمُرْسَلَةِ بِدَعًا، وَنَسَبُوهَا إِلَى الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ، وَجَعَلُوهَا حُجَّةً فِيمَا ذَهَبُوا إِلَيْهِ مِنْ اخْتِرَاعِ الْعِبَادَاتِ ... فَإِنَّ الْمَصَالِحَ الْمُرْسَلَةَ يَرْجِعُ مَعْنَاهَا إِلَى اعْتِبَارِ الْمُنَاسِبِ الَّذِي لَا يَشْهَدُ لَهُ أَصْلٌ مُعَيَّنٌ، فَلَيْسَ لَهُ عَلَى هَذَا شَاهِدٌ شَرْعِيٌّ عَلَى الْخُصُوصِ، وَلَا كَوْنُهُ قِيَاسًا بِحَيْثُ إِذَا عُرِضَ عَلَى الْعُقُولِ تَلَقَّتْهُ بِالْقَبُولِ. وَهَذَا بِعَيْنِهِ مَوْجُودٌ فِي الْبِدَعِ الْمُسْتَحْسَنَةِ ... لِأَنَّهُمَا يَجْرِيَانِ مِنْ وَادٍ وَاحِدٍ»[(٢)].

واتە: زۆری خەڵکی (المصالح المرسلة)یان بە بیدعەی حەسەنە ناو بردووە و خستویەتییە پاڵ هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان، وە کردوویانە بە بەڵگە لەسەر بیدعەکانیان، لەبەرئەوەی (المصالح المرسلة) ماناکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەچاوکردنی سوودێك، دەقێك نییە ببێتە بەڵگە بۆی، وە لەسەر خودی کارەکەش بەڵگە نییە بە تایبەت، وە گەر بدرێتە بەردەم عەقڵ وەری دەگرێت، خودی ئەمەیە بۆ خۆی لە بیدعەی حەسەنەدا لەبەر ئەوەی هەردووکیان یەك سەرچاوەن خوێندنەوەی سوودمەند بانگەوازی هەردووکیانە.

---

(١) "المصالح المرسلة" للشنقيطي ص٤، ٥.

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٠٧).

الشَّيخ (أبو بكر الجزائري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «**المصالح المرسلة كل منفعة داخلة في مقاصد الشرع دون أن يكون لها شاهد بالاعتبار أو الالغاء ... والتي يسميها مروجو البدع بالبدعة الحسنة ... وإنما هو من مقاصده العامة**»[1].

واته: (المصالح المرسلة) هەموو سوودمەندییەکە لەناو مەبەستە شەرعییەکاندا، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی بۆ هەبێت بە بوون و نەبوون ... زۆربەی ئەوانەی پەرە بە بیدعە دەدەن ناوی دەبەن بە بیدعەی حەسەنە، کە خۆی مەبەستە گشتییە شەرعییەکانە.

مادام هۆکاری بیدعە و (المصالح المرسلة) خوێندنەوە و ڕەچاوکردنی سوودمەندییەکانە لێکچوون هەیە، بۆیە ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَلَمَّا كَانَ هَذَا الْمَوْضِعُ مَزَلَّةَ قَدَمٍ، لِأَهْلِ الْبِدَعِ أَنْ يَسْتَدِلُّوا عَلَى بِدْعَتِهِمْ مِنْ جِهَتِهِ؛ كَانَ الْحَقُّ الْمُتَعَيَّنُ النَّظَرَ فِي مَنَاطِ الْغَلَطِ الْوَاقِعِ لِهَؤُلَاءِ، حَتَّى يَتَبَيَّنَ أَنَّ الْمَصَالِحَ الْمُرْسَلَةَ لَيْسَتْ مِنَ الْبِدَعِ فِي وِرْدٍ وَلَا صَدْرٍ، بِحَوْلِ اللَّهِ، وَاللَّهُ الْمُوَفِّقُ.

فَنَقُولُ: الْمَعْنَى الْمُنَاسِبُ الَّذِي يُرْبَطُ بِهِ الْحُكْمُ لَا يَخْلُو مِنْ ثَلَاثَةِ أَقْسَامٍ:

أَحَدُهَا: أَنْ يَشْهَدَ الشَّرْعُ بِقَبُولِهِ، فَلَا إِشْكَالَ فِي صِحَّتِهِ، ... كَشَرِيعَةِ الْقِصَاصِ حِفْظًا لِلنُّفُوسِ وَالْأَطْرَافِ وَغَيْرِهَا.

وَالثَّانِي: مَا شَهِدَ الشَّرْعُ بِرَدِّهِ فَلَا سَبِيلَ إِلَى قَبُولِهِ.

والثَّالِثُ: مَا سَكَتَتْ عَنْهُ الشَّوَاهِدُ الْخَاصَّةُ، فَلَمْ تَشْهَدْ بِاعْتِبَارِهِ وَلَا بِإِلْغَائِهِ. فَهَذَا عَلَى وَجْهَيْنِ:

أَحَدُهُمَا: أَنْ يَرِدَ نَصٌّ عَلَى وَفْقِ ذَلِكَ الْمَعْنَى، كَتَعْلِيلِ مَنْعِ الْقَتْلِ لِلْمِيرَاثِ.

وَالثَّانِي: أَنْ يُلَائِمَ تَصَرُّفَاتِ الشَّرْعِ، وَهُوَ أَنْ يُوجَدَ لِذَلِكَ الْمَعْنَى جِنْسٌ اعْتَبَرَهُ الشَّارِعُ فِي الْجُمْلَةِ بِغَيْرِ دَلِيلٍ مُعَيَّنٍ»[2].

---

(١) "الإنصاف فيما قيل في المولد من الغلو والإجحاف" لشيخ: أبي بكر الجزائري ص٣٧.

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٠٩ - ٦١٢).

واتە: لەبەرئەوەی ئەمە شوێنی پێ هەڵخلیسکاندنە و لەو ڕووەوە دەیکەنە بەڵگە بۆ بیدعەکانیان، بۆیە لێکچوونی بیدعە بە (المصالح المرسلة) شوێنی هەڵەی بیدعەکارانە بۆ بە بەڵگەکردن لەسەر بیدعەکانیان. لێرەدا پێویستمان بە ناوەڕۆکی هەڵەکە هەیە لای ئەمانە تاوەکوو بزانن (المصالح المرسلة) لە بیدعە ناچێت، نە لە هاتن نە لە ڕۆیشتن، ئەو ڕەچاوکردنەی حوکمەکەی پێ دەبەسترێتەوە لە سێ بەش زیاتر نییە:

**یەکەم:** شەرع ئەمەی ڕەچاو کردووە و هیچ گومانێك نییە لە دروستیدا، وەکوو تۆڵە سەندنەوە بۆ پاراستنی گیانی ئادەمیزاد.

**دووەم:** شەرع ڕەچاوی نەکردووە، وەکوو درۆکردن، بەرتیل دان، بۆ پاراستنی سوودمەندییەکانی.

**سێیەم:** شەرع لە ئاستی بێدەنگە نە بە ڕەچاوکردن و نە بە هەڵوەشاندنەوە، ئەمەش دوو ڕووە:

١. دەقێکمان هەیە لەسەر هەمان مەبەست و ڕەچاو، وەکوو میرات نەبردنی کوژەری دایك و باوك.

٢. گونجاو بێت لەگەڵ خوێندنەوەکانی شەرعدا، بۆ ئەو مانایە جۆرێك بەدی بکرێت شەرع ڕەچاوی کردووە بە کۆ بەبێ بەڵگەی دیاری لە سەری.

## جیاوازییەکانی نێوان

## (المصالح المرسلة) و (البدعة)

١. مَوْضُوعَ الْمَصَالِحِ الْمُرْسَلَةِ مَا عُقِلَ مَعْنَاهُ عَلَى التَّفْصِيلِ، وَالتَّعَبُّدَاتُ مِنْ حَقِيقَتِهَا أَنْ لَا يُعْقَلَ مَعْنَاهَا عَلَى التَّفْصِيلِ.

٢. فَإِنَّ الْبِدَعَ فِي عَامَّةِ أَمْرِهَا لَا تُلَائِمُ مَقَاصِدَ الشَّرْعِ. بَلْ إِنَّمَا تُتَصَوَّرُ عَلَى أَحَدِ وَجْهَيْنِ: إِمَّا مُنَاقِضَةً لِمَقْصُودِهِ وَإِمَّا مَسْكُوتًا عَنْهَا فِيهِ.

٣. الْمَصَالِحَ الْمُرْسَلَةَ تَرْجِعُ إِلَى حِفْظِ ضَرُورِيٍّ مِنْ بَابِ الْوَسَائِلِ أَوْ إِلَى التَّخْفِيفِ، فَلَا يُمْكِنُ إِحْدَاثُ الْبِدَعِ مِنْ جِهَتِهَا.

٤. لِأَنَّ الْبِدَعَ مِنْ بَابِ الْوَسَائِلِ؛ لِأَنَّهَا مُتَعَبَّدٌ بِهَا بِالْفَرْضِ. وَلِأَنَّهَا زِيَادَةٌ فِي التَّكْلِيفِ وَهُوَ مُضَادَّةٌ لِلتَّخْفِيفِ ... الشَّارِعِ أَنَّهُ لَمْ يَكِلْ شَيْئًا مِنَ التَّعَبُّدَاتِ إِلَى... آرَاءِ الْعِبَادِ فَلَمْ يَبْقَ إِلَّا الْوُقُوفُ عِنْدَ مَا حَدَّهُ. وَالزِّيَادَةُ عَلَيْهِ بِدْعَةٌ، كَمَا أَنَّ النُّقْصَانَ مِنْهُ بِدْعَةٌ ... فَحَصَلَ مِنْ هَذَا كُلِّهِ أَنْ لَا تَعَلُّقَ لِلْمُبْتَدِعِ بِبَابِ الْمَصَالِحِ الْمُرْسَلَةِ»[1].

واته:

١. (المصالح المرسلة) سوود وەرگیراوەکانی شەرع مانا و هۆکار و مەبەست تیایاندا دەرك پێ دەکرێت، بەڵام (بدعة) پەیوەندی بە (عبادات)ەوە هەیە و هیچ تێگەیشتنێکی مانایی و سوودمەندی تێدا نییە.

٢. بیدعە بە گشتی گونجاو نییە لەگەڵ مەبەستە شەرعییەکاندا، دوو ڕووی تیادا بەدی دەکرێت:
یان پێچەوانەیەتی لەگەڵ مەبەستە شەرعییەکاندا.
یان بێدەنگی تێدایە لەو بابەتە ... .

٣. (المصالح المرسلة) هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ پاراستنی (ضروريات وحاجيات وتحسينيات)، وەکوو هۆکارێك (وسيلة) بۆ پاراستن یا کەمکردنەوەی پێویستییەکان، لەم ڕێیەوە بیدعە دروست نابێت، لەبەرئەوەی لە سنووری عیباداتدا نییە.

٤. داهێنراو لە بابەتی هۆکارەکانە، کە دەبێت وەکوو (واجب) جێبەجێ بکرێت، وە دەبێتە زیادە لە کارە داواکراوییەکاندا، کە پێچەوانەی کەمکردنەوە و ئاسانکارییە، وە شەرعیش هیچ کارێکی عیبادەتی نەداوەتە دەست بیروڕای خەڵکی، لەبەرئەوە هیچ نەماوە بێجگە لە وەستان لە سنووری شەرعدا، زیادەکردن و کەمکردن لەسەری بیدعەیە، بەم شێوەیە دەرکەوت کە بیدعە هیچ پەیوەندیەکی بە سوودمەندییە ڕەچاوکراوە شەرعییەکان (المصالح المرسلة)ەوە نییە.

بەم شێوەیە ڕوون بووەوە بە هیچ پێوەرێك (المصالح المرسلة والبدعة) کۆ نابێتەوە و لێکچوون لە نێوانیاندا نییە و هەڵسەنگاندن بە یەکتری ناکرێت، ئەو کارکردنی لە بوارەکانی بێجگە لە عیباداتدا کار دەکات و بیدعەش ئەم لە عیباداتدا کارکردنیەتی، ئەو دەق نییە لەسەری

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٦٣٣ - ٦٣٥).

**بە بوون و ڕێگری، ئەم دەق هەیە لەسەر ڕێگری «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»، ئەو بۆ کامڵبوونی دین و گرتنەوەی هەموو سوودمەندی و لایەنەکانە لە بازنەی دیندا، ئەم بۆ شێواندن و کەم و زیادکردنی دینە، وە سنوور بەزاندنە، ئەو بۆ بەندەکان و سوودمەندییەکانیانە ئەم بۆ زاتی پەروەردگارە و خۆیەتی، ئەو** (المصالح المرسلة) **حەقی ئادەمیزادە ئەم** (البدعة) **حەقی خوایە** ﷻ[1].



---

(١) **بڕوانە** "الإنصاف فيما قيل في المولد من الغلو والإجحاف" لشيخ: أبي بكر الجزائري ص٣٠ – ٣٨، "المصلحة المرسلة" لعلي محمد جريشة ص٤٩، "ذم البدع وخطر الابتداع" لجمع من العلماء ص٢٨، البدع صالح آل الشيخ.




# بەشی سێیەم

# یاسا زانستییە بنەماییە شەرعییەکان لە ڕێگرتنی بیدعەکاری

## ( القواعد الأصولية والفقهية على منع الإبتداع )

ڕێگەی زانستی کورتترین ڕێگەیە بۆ تێگەیشتنی ناوەڕۆکی هەر بابەتێك، بۆیە پێویستە ئەم ڕێگایەش بخەینە ڕوو بۆ کەسانی خاوەن زانست، بۆ دڵنیابوونی زانستی تۆکمە لەسەر سنووری سوور لە دیندا لەمافی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش داهێنراوە، کە بەزاندن و شکاندنی سنووری شەریعەتی ئیسلام و پێغەمبەرەکەیەتی، وە گەورەترین تۆمەتی زانستییە لە (علوم الحديث) لەسەر هەر ڕاوییەکی فەرمووده، زانایانی بنەماییەکان و فیقهییەکان (الأصولية والفقهية) کۆمەڵێك سەردێری زانستی کورتیان هەیە بۆ ناسین و ناوەڕۆك خوێندنەوەی هەر بابەتێك، وەکوو یاسایەکی قانونی یەکلابووەوە مایەی قسە بڕینەوە و ڕێگە کورتییە بۆ کەسانی پسپۆڕ لە زانستە شەرعییەکاندا.

بۆ ئەم بابەتە ئێمەش کۆمەڵێك یاسای زانستی هەیە بیکەینە پشتیوان بۆ گومڕایی داهێنراو و قەدەغەیی لە دیندا، وەکوو:

١. «الأَصْلُ فِي الْعِبَادَاتِ الْمَنْعُ»[1].

واتە: بنەما لە عیبادەتەکاندا ڕێگرییە، بە بێ بەڵگە نەبێت، ئەم یاسایەش لەسەر ئەم فەرموودەیە داڕێژراوە: «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ». بەم یاسایە هیچ داهێنراوێك ڕێی پێ نادرێت، لەبەرئەوەی داهێنراو لە عیبادەتدایە، وە ئەمەش دەرچوونە لە بەڵگە.

---

(١) "مجموعة الفوائد البهية" للقحطاني ص٧٧، "القواعد النورانية" لابن تيمية ص١٦٤، "القواعد الفقهية" لعبدالرحمن بن ناصر السعدي ١٢٨، "علم أصول البدع" لعلي الحلبي ص٦٩، "الشرح الكبير لمختصر الأصول من علم الأصول" لأبو منذر المنياوي ص١٧، "قواعد معرفة البدع" للجيزاني ص٤٦، "شرح نظم الورقات" للحازمي (١٨/٤٤).

٢. «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ وَإِنْ رَآهَا النَّاس حَسَنَة»(١).

واته: هەموو داهێنراوێك گومڕاییه، گەر خەڵكیش به باشی بزانن، ئەم یاسایه لەسەر ئەمانه داڕێژراوه:

أ- یەكێك لە دوو مەرجەكەی كاری وەرگیراو شوێنكەوتەیی و بەڵگەیه (الإخلاص والمتابعة)، داهێنراویش بێ بەڵگەیه.

ب- قسەی (ابن مسعود) ﷺ دەڵێت: «وَكَمْ مِنْ مُرِيدٍ لِلْخَيْرِ لَنْ يُصِيبَهُ»(٢).

واته: چەندەها كەس نیەتی خێره و ناپێكێت.

٣. «الحَسنُ ما حَسَّنهُ الشَّرعُ»(٣).

واته: چاكه ئەو چاكەیەیه كه شەرع بڕیاری لەسەر دەدات، نەك دەرەوەی شەرع.

﴿عَمَلًا صَٰلِحًا﴾ [الكهف: ١١٠]، و كاری چاكیش ئەوەیه كه لە قورئان و سوننەتدا بێت.

فەرموودەكەی ئیمامی عەلی ﷺ كه دەفەرمویت: «لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلُ الخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ أَعْلَاهُ»(٤).

واته: گەر (دین) به ڕا و بۆچوون بێت ئەوا ژێر (خوف) لەپێشتره مەسح بكرێت تا سەرەوەی.

به باش زانین و چاكه ئەوەیه گونجاو بێت لەگەڵ شەرعدا و دانی پیادا بنێت، كەواته داهێنراوی چاك نییه، لەبەر ئەوەی لە شەرعدا به ناوی داهێنراوی چاكەوه هیچمان نییه، (البدعة الحسنة) به

---

(١) قول ابن عمر رضي الله عنهما، رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢٠٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨/ ٤)، وفي "ذم الكلام وأهله" للهروي (٢٧٦)، وفي "المدخل إلى السنن الكبرى" للبيهقي (١٩١)، وفي "شرح الأربعين النووية" لعبدالمحسن العباد (٢٦/ ١٣)، وفي "شرح سنن أبي داود" لعبدالمحسن العباد (٥١٥/ ١٣)، وفي "أحكام الجنائز" للألباني ص٢٠٠، و "الصحيحة" (٦/ ٥٢٧)، وفي "طبقات الحنابلة" لأبي يعلى (١/ ٦٩)، و "علم أصول البدع" للحلبي ص٩١.

(٢) رواه الدارمي في "السنن" (٢١٠)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٥/ ١٢).

(٣) "علم أصول البدع" للحلبي ص١١٩.

(٤) رواه أبو داود (١٦٢)، والدارقطني في "السنن" (٧٨٣)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٨٩٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٣٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٣٨٦)، وفي "الصغرى" (١٢٩)، وفي المدخل (٢١٩)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٥٢٥)، وفي "الإرواء" (١٠٣)، وفي "صحيح أبي داود – الأم" (١٥٣).

تێگەیشتنی ئەم سەردەمەیە.

٤. «الِاقْتِصَادُ فِي السُّنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الِاجْتِهَادِ فِي الْبِدْعَةِ»[١].

واتە: مانەوە لەسەر سوننەت خێرترە تاوەکوو هەوڵدان لە بیدعەدا.

ئەم یاسایە وەرگیراوە لەسەر فەرموودەی: «إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ»[٢]، «إِنَّ لِكُلِّ عَمَلٍ شِرَّةً»[٣]، «خَيْرُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[٤]، وە قسەکەی (عمر بن عبدالعزيز) رَحِمَهُ اللهُ «وَقِفْ حَيْثُ وَقَفَ الْقَوْمُ»[٥].

مانەوە لەسەر سوننەت و بەکەم نەزانینی خێرترە تاوەکوو بکەویتە زیادە و زۆرەکانی داهێنراو کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردبێت.

٥. «فِي الْبِدَعِ رَفْعٌ لِلسُّنَنِ»[٦].

واتە: داهێنراو هۆکاری هەڵگرتنی سوننەتە.

وەرگیــراوە لە فەرموودەی (ابن عباس) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا کە دەفەرموێت: «مَا يَأْتِي عَلَى النَّاسِ عَامٌ إِلَّا

---

(١) قول ابن مسعود رضي الله عنهما، رواه الحاكم في "المستدرك" (٣٥٢) وقال: صحيح على شرطهما. ووافقه الذهبي، والدارمي في "السنن" (١/ ٧٢)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤)، وفي "ذم الكلام وأهله" للهروي (٣/ ٧٢)، وابن وضاح في "البدع" ص١١، وابن عبدالبر في "جامع بيان العلم وفضله" (٢٣٣٤)، وقال الهيثمي في "مجمع الزوائد" (١/ ١٨٨): رجاله ثقات، وأبو فرج في "تلبيس إبليس" (٨)، وابن نصر في "السنة" ص٢٧، وابن بطة في "الإبانة" (١/ ١٢٨)، وفي "علم أصول البدع" للحلبي ص٥٥.

(٢) رواه ابن ماجه (٣٠٢٩)، وأحمد (١٨٥١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٣٩٠٩)، وسبق تخريجه ص٤٢٣.

(٣) رواه أحمد (٦٧٦٤)، وفي الزهد والرقائق لابن المبارك والذهد لنعيم بن حماد (١١٠٢)، وابن حبان في "صحيحه" (١١)، والطبراني في "الكبير" (٧٨٨٣)، والبزار في "المسند" (٢٣٤٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٣/ ٢٩٣)، والبيهقي في "الشعب" (٣٥٩٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٥١)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٢٣٦)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٥٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢١٥٢).

(٤) رواه مسلم (٨٦٧)، والنسائي (١/ ٢٣٤)، والبيهقي (٣/ ٢١٤)، وسبق تخريجه ص٧.

(٥) رواه ابن بطة في "الإبانة" (١٢١٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٣١٥)، والآجري في "الشريعة" (٢٩٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ١٤٣)، والأصبهاني في "الحجة في بيان المحجة" (١/ ١١٢)، وابن قدامة في "ذم التأويل" (٧٠).

(٦) "علم أصول البدع" للحلبي ص٢٨٧.

أَحْدَثُوا فِيهِ بِدْعَةً، وَأَمَاتُوا فِيهِ سُنَّةً، حَتَّى تَحْيَا الْبِدَعُ، وَتَمُوتَ السُّنَنُ»[(١)].

**واته: ساڵێك نایەت بەسەر خەڵكدا هەر بیدعەیەكی تێدا دروست دەكەن و سوننەتێك دەمرێنن، تا بیدعەكان زیندوو دەبن و سوننەتەكان دەمرن.**

**وە (حسان بن عطية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «مَا ابْتَدَعَ قَوْمٌ بِدْعَةً فِي دِينِهِمْ إِلَّا نَزَعَ اللهُ مِنْ سُنَّتِهِمْ مِثْلَهَا ثُمَّ لَا يُعِيدُهَا إِلَيْهِمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[(٢)].**

**واته: هەر كۆمەڵێك بیدعەیەك بكەن لە دینەكەیاندا ئیلا خوای پەروەردگار سوننەتێكی هاوشێوەیان تێدا هەڵدەگرێت، پاشان ناگەڕێتەوە بۆیان تا ڕۆژی دوایی.**

قال السلف: «لَيْسَ فِي الدُّنْيَا مُبْتَدِعٌ إِلَا وَقَدْ نُزِعَ حَلَاوَةُ الْحَدِيثِ مِنْ قَلْبِهِ»[(٣)].

**واته: بیدعەكارێك نییە لە دونیادا ئیلا خۆشەویستی سوننەت لە دڵێدا هەڵگیراوە، وەكوو سزایەك لەسەر تەرككردنی سوننەت.**

(ابن سيرين) رَحِمَهُ اللهُ **دەڵێت:** «مَا أَخَذَ رَجُلٌ بِبِدْعَةٍ فَرَاجَعَ سُنَّةً»[(٤)].

---

(١) رواه الطبراني في "الكبير" (١٠٦١٠)، وقال الهيثمي في "المجمع" (١/ ١٨٨): ورجاله موثقون، انظر "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١١٠)، و "الحوادث والبدع" للطرطوشي ص٤٤، ورواه ابن بطة في "الإبانة" (١١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٢٥)، وابن وضاح في "البدع" (٨٧).

(٢) رواه الدارمي في "السنن" (٩٩)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٢٨)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٢٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٧٣)، وابن وضاح في "البدع" (٩٠)، وانظر "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٤)، و "الحوادث والبدع" للطرطوشي ص١٤٦، و"حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (١/ ٧٥)، و "الرد على اللمع" لشحاتة محمد صقر ص٣٥، و "المولد النبوي هل نحتفل" ص٤، و "رأس السنة هل نحتفل" لشحاتة محمد صقر ص١٠، وصححه الألباني في "المشكاة" (١٨٨)، وفي "كتاب التوسل" ص٤٦، و "هداية الرواة" (١٨٦).

(٣) "الحجة في بيان المحجة" (٢/ ٥٤٠)، "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/ ١٦٢)، "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٢٢١)، "الصواتق المرسلة" لابن القيم (٣/ ١٠٣٨)، "ذم الكلام وأهله" للهروي (٢٢٩)، "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٢/ ٢٤٥)، "معرفة علوم الحديث" للحاكم ص٤، "عقيدة السلف للصابوني" ص٢٩٩، "تذكرة الحفاظ" للنووي (٢/ ٥٢١)، "شرف أصحاب الحديث" للخطيب البغدادي (٧٣)، "اعتقاد أئمة السلف أهل الحديث لمحمد عبدالرحمن الخميس ص١٤٢.

(٤) "سنن الدارمي" (١/ ٦٩)، "حقيقة السنة والبدعة" للسيوطي ص٧٨، "الباعث على إنكار البدع والحوادث" لأبو شامة ص١٦، "الوجيز في عقيدة السلف الصالح" لعبد الله بن عبد الحميد الأثري ص١٨٣.

واتە: هیچ کەسێك نییە لە بیدعەکار بتوانێت بگەڕێتەوە سەر سوننەت.

یان خۆشەویستی فەرموودەی لە دڵ هەڵدەگیرێت، یان هۆکارە بۆ نەمانی سوننەت، کەواتە داهێنراو لەناوبەری سوننەتە و دوژمنیەتی، بۆیە پێیان دەوترێت بیدعەکاران و خاوەن ئارەزووان (أهل البدع والأهواء) نەك خاوەن سوننەتکاران و شوێنکەوتووان.

٦. «النَّكِرَةَ فِي سِيَاقِ النَّفْيِ يُفِيدُ الْعُمُومَ»(١).

واتە: داواکاری نەکردن بەشێوەی نادیار مەبەست پێی گشتییە.

واتە: وشەی (كل) بە نادیار هاتووە، (ال)ی ناسراو (معرفة)ی بە سەرەوە نییە، گەر نادیار بە شێوەی نەکردن بوو مەبەستی پێی گشتییە، کەواتە مەبەستی پێی هەموو جۆرە بیدعەیەکە، وە دووبارەبوونەوەشی مەبەست پێی (تأكيد) و دڵنیابوونە.

٧. «لَا يَجُوزُ تَأْخِيرُ الْبَيَانِ عَنْ وَقْتِ الْحَاجَةِ»(٢).

واتە: دروست نییە ڕوونکردنەوە دوا بکەوێت لە کاتی پێویستدا.

وەرگیراوە لە: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ [النحل : ٤٤]، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾ [القيامة : ١٩]، ﴿فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾﴾ [هود : ١].

بەم یاسایە گەر داهێنراوی چاك هەبوایە ئەوا پێغەمبەر ﷺ لەکاتی فەرموودەی: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» باسی دەکرد، یان سەربەخۆ، لەبەر پێویستی تەواوی ڕوونبوونەوەی بابەتەکە.

(١) "المسودة في أصول الفقه عند الإسلام" لابن تيمية (١/ ١٠٣)، "مجموع فتاوى ورسائل" للعثيمين (٣/ ١٨٩)، "روضة الناظر" لابن قدامة (٢/ ١٣)، القواعد لابن رجب ص٢٤٤، "مجموعة الفوائد البهية على منظومة القواعد الفقهية" للقحطاني ص١٠٤، "الْمُهَذَّبُ فِي عِلْمِ أُصُولِ الفِقْهِ الْمُقَارَنِ" لعبدالكريم النملة (٤/ ١٤٩٩).

(٢) "تلقيح الافهام" لوليد بن راشد السعيدان (٣/ ١)، "العدة في أصول الفقه" لابن الفراء (٣/ ٧٢٤)، "اللمع" للشيرازي (١/ ٥٣)، "المستصفى" للغزالي (١/ ١٩٢)، "الرد على اللمع" لشحاتة محمد صقر ص٧٥، "قواطع الأدلة في الأصول" للمروزي (١/ ٢٩٥)، "روضة الناظر" لابن قدامة (١/ ٥٣٤)، "الإبهاج في شرح المنهاج" للسبكي (٢/ ٢١٥)، "البحر المحيط في أصول الفقه" للزركشي (٤/ ٥٤١)، "الْمُهَذَّبُ فِي عِلْمِ أُصُولِ الفِقْهِ الْمُقَارَنِ" لعبدالكريم النملة (٣/ ١٢٦٤)، "مجموع فتاوى ورسائل" للعثيمين (١١/ ٣٠٥).

٨. «الْأَصْلَ فِي الْكَلَامِ الْحَقِيقَةُ»[(١)].

واتە: بنەما لە هەموو وشەیەکدا دانانی مانای ڕاستەوخۆی بەکارهێنراوی خۆیەتی.

بەم بنەمایە: وشەی (بدعة) لە «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»دا واتە داهێنراوی دینی نەك دونیایی، لەبەرئەوەی وشەیەکی دینییە و بە خراپ ناو براوە، بواری چاك دروستبوونی تێدا نییە.

وەرگیراوە لە: (خطاب) قورئان و فەرموودە بۆ تێگەیشتنی ئادەمیزادە، بەو شێوەیەی بەکاری دەهێنێت و لێی تێدەگات، نەك بە شێوەیەی کە شاراوە وە تایبەت و پێچ و پەنا بێت، گەر وابێت ئەوە بەڵگەی خوایی تەواو نەبووە و نییە بەسەر ئەو خەڵکەوە: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ﴾ [النِّسَاءِ : ١٦٥].

٩. «التقرب إلى الله بما لم يشرع بدعة»[(٢)].

واتە: هەر کارێك بکەیت بۆ نزیکبوونەوە لە خوا وەکوو عیبادات؛ گەر لە شەرعدا نەبێت بیدعەیە.

**ئەم یاسا گشتییە زۆرێك لە یاسا لقەکان لەخۆ دەگرێت، وەکوو:**

**أ- عیبادەتێك کاری پێ بکرێت لەسەر بنەمای فەرموودەیەکی درۆ (حدیث موضوع)؛ بیدعەیە: «العبادة المستندة إلى حديث مكذوب».**

**ب- عیبادەتێك لەسەر حەز و ئارەزوو و خەوبینینی ساڵحان بکرێت؛ بیدعەیە: «العبادة المستندة إلى الهوى والرأى المجرد والرؤيا والكشف».**

---

(١) "الوجيز في شرح قواعد الفقهية" لعبدالكريم زيدان ص١٦، "الاشباه والنظائر" للسيوطي ص٨٦، "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/٤٧٣)، "الفروق "للقرافي (٣/١١٤)، "المحصول" للرازي (١/٣٤١)، "البحر المحيط في أصول الفقه" للسبكي (١/٢٦)، "الاشباه والنظائر" لابن نجيم ص٥٩، "الْمُهَذَّبُ فِي عِلْمِ أُصُولِ الفِقْهِ الْمُقَارَنِ" لعبدالكريم النملة (٣/ ١١٧٥).

(٢) "قواعد معرفة البدع" للجيزاني ص٦٦ - ١٢٢، بۆ وردەکاری لەسەر یاساکانی ژێر ئەم ژمارەیە بڕوانە "الوجيز" ص٦٧- ١٢٢.

**ت- هەر کارێك پێغەمبەر ﷺ نەیکردبێت و هاوەڵان و پێشووە صاڵحەکان نەیان کردبێت لەگەڵ بوونی پێویستی و هیچ ڕێگرییەکدا؛ بیدعەیە و پێی دەوترێت (الترك): «إذا تَرَكَ الرسول ﷺ فعل عبادة من العبادات مع كون موجبها وسببها المقتضي لها قائمًا ثابتًا، والمانع منها منتفيًا، فإن فعلها بدعة»[(١)].**

**ث- هەر عیبادەتێك پێچەوانەی یاسا شەرعییەکان و مەبەستەکانی بکات؛ بیدعەیە: «كل عبادة مخالفة لقواعد هذه الشريعة ومقاصدها فهي بدعة»[(٢)].**

**ج- هەر عیبادەتێك بگۆڕێت لەسەر شێوەی تایبەت بەکات و شوێن و ژمارە و چۆنیەتیدا؛ بیدعەیە، (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «كل عبادة وردت في الشرع على صفة مقَّيدة، فتغيير هذه الصفة بدعة»[(٣)].**

**واتە: گۆڕانکاری هەر عیبادەتێکی شەرعی بە شێوەی تایبەتی خۆی بیدعەیە.**

**ح- تایبەتکردن لەگشتیدا و گشتیکردن لەتایبەتدا لە عیبادەتەکاندا بیدعە دەبێت: «تقييد العبادة المطلقة واطلاق العبادة المقيدة بدعة».**

**خ- زیادەڕۆییکردن لە جۆرەکانی عیبادەتدا بیدعەیە، (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «الغلو في العبادة بالزيادة فيها على القدر المشروع والتشدد والتنطع في الإتيان بها بدعة»[(٤)].**

---

(١) "قواعد معرفة البدع" للجيزاني ص٧٥، "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (٢/ ٥٩١ - ٥٩٧)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٦/ ١٧٢)، و "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٦١)، و "الإبداع" للشيخ علي محفوظ (٣٤ - ٤٥).

(٢) "قواعد معرفة البدع" للجيزاني ص١٠٢، و "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ١٩ - ٢٠).

(٣) "قواعد معرفة البدع" للجيزاني ص١١٠، "الباعث" (٢٨ - ٢٩)، و "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٢٦)، و "الأمر بالإتباع" (١٥٣).

(٤) "قواعد معرفة البدع" للجيزاني ص١١٩، "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٣٩٢)، و "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ١٣٥)، و "أحكام الجنائز" للألباني (٢٤٢).

## هەڵوێستی ئەهلی سوننەت لە بەرپەرچدانەوەی بیدعەکاران

## (موقف أهل السنة في الرّد على أهل البدع)

سوننەتی کەونی خوایە دەبێت لە بەرامبەر حەقدا بەتاڵ هەبێت، ئەمە هەر لە دوای کێشەکەی نێوان ئادەم و ئیبلیسەوە حەق و بەتاڵ لەم ململانێیەدان، زۆرجار شەڕ توانیویەتی دەستوەرداتە ناو خێر و گومان و گومڕایی، بە لایەنی کەم ترازاندن لە ڕێڕەوی بەرنامە و تێگەیشتنی خۆی دروست بکات.

بۆیە پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێت ناچار بوون ڕووبەڕوو بە وتوویژو و بەڵگە بەرامبەر بەتاڵان ببنەوە، بۆیە زۆرجار بەڵگە و وشەیەك بۆ سەرکەوتنی حەق لە شمشێر و بروسکەی هەور و مەنجەنیق بەهێزتر دەبێت لەسەر گومڕایان، زانایان تەنانەت ناوی کتێبەکانیان لە بواری بەرپەرچدانەوەدا ناوناوە: "الصواعق المرسلة" لابن القيم (هەورە بروسکەی نێردراو)، "الصواعق المحرقة" لابن حجر الهيتمي (هەورە بروسکەی سوتێنەر)، "الصارم المسلول" لابن تيمية (شمشێری ئامادەکراو)، "نصب المجانيق" للألباني (تێگرتنی مەنجەنیق) ... .

بە پێغەمبەرانیش فەرمان دەدرێت، بە (محمد) ﷺ: ﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾ [النحل: ١٢٥]، وە بە (إبراهيم) عليه السلام: ﴿وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ﴾ [الأنعام: ٨٣]، وە بە (نوح) عليه السلام: ﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدۡ جَٰدَلۡتَنَا﴾ [هود: ٣٢].

هەموویان پێشەکی ڕێگەی وتوویژ و بەڵگەکارییان گرتووەتە بەر، بەڵام دەربارەی دووبەرەکایەتی و جیاوازییەکانی ناو بازنەی دین وەکوو فیرەق و گرووپەکان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا زانایان ڕا و بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەسەر بوارکردنەوە لەگەڵیاندا، ڕای هەندێك وایە بواریان بۆ نەکرێتەوە، تاوەکوو نەتوانن ئەوەی دەیانەوێ لە گومڕاییەکانیان بیگەیەنن، لەبەر نەبوونی ئاستی هۆشیاری و زانیاری دینی لای گشت خەڵکی لەسەر هیچ لایەك نە گومڕاییەکان و نە بەرنامەی حەقی ئەهلی سوننەت، ئەمە سەلامەتترین ڕێگەیە کە بۆ خەڵکی دادەنێن، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم بابەتە بۆچوونی زانایان دەخەینە ڕوو:

**بۆچوونی یەکەم:** وتووێژ و بەرانبەریێتی و ڕەتدانەوە بە گشتی؛ ڕێپێدراو نییە.

هەندێك لە زانایان ڕایان وایە بواردان بەم جۆرە کارانە ڕێگەیەکە بۆ دەرکەوتنی بیرورِا و بۆچوونە دارِێژراوەکانیان، لەبەرئەوە بە گشتی لە قورئاندا بە خراپ باسی ئەمە کراوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ [غافر: ٣].

واتە: دەمەقاڵێکردن لە ئایەتەکانی خوادا کەسێك نایکات بێجگە لە بێبڕوایان نەبێت.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «أَبْغَضُ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الأَلَدُّ الخَصِمُ»[(١)].

واتە: خراپترین پیاوان لای خوا دوژمنێکی دەمەقاڵێکارە.

وە دەفەرموێت: ««مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلَّا أُوتُوا الْجَدَلَ» ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ۝٥٨﴾ [الزخرف: ٥٨]»[(٢)].

واتە: هیچ گەلێکی هیدایەتدراو گومرِا نابێت مەگەر ڕوو بکەنە دەمەقاڵێ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: بەس بۆ دەمەقاڵێ نموونە دێننەوە.

ئیمامی (البربهاري) ﷺ دەڵێت: «الكلام والخصومة والجدال والمراء محدث يقدح الشك في القلب»[(٣)].

واتە: قسە و دووبەرەکایەتی و دەمەقاڵێ بیدعەیە و گومان لە دڵدا دروست دەکات.

وە لە زۆر لە کتێبەکانی ئەهلی سوننەتدا بابەتێکی سەربەخۆ هەیە بەناوی: «بَابُ ذَمِّ الْجِدَالِ

---

(١) رواه البخاري (٤٥٢٣)، ومسلم (٢٦٦٨)، والترمذي (٢٩٧٦)، والنسائي في "الكبرى" (٥٩٤٤)، وأحمد (٢٤٢٧٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٦٩٧)، والبزار في "المسند" (٢١٣)، وابن بطة في "الإبانة" (٥٢٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٤٩٩)، والبيهقي في "الشعب" (٨٠٧١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٠٩)، والحميدي في المسند (٢٧٥).

(٢) رواه ابن ماجه (٤٨)، والترمذي (٣٢٥٣)، وأحمد (٢٢١٦٤)، والحاكم في "المستدرك" (٣٦٧٤) وقال: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه، وابن بطة في "الإبانة" (٥٢٧)، والبيهقي في "الشعب" (٨٠٨٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٧٧)، والآجري في "الشريعة" (١٠٩)، وصححه الألباني في "المشكاة" (١٨٠)، وفي "صحيح الترغيب والترهيب" (١٤١)، و "صحيح الجامع الصغير" (٥٦٣٣).

(٣) "شرح السنة" ص٣٩.

وَالْخُصُومَاتِ فِي الدِّينِ»[(١)] واته: بابەتی بە خراپ باسکردنی دەمەقاڵێ لە دیندا، و «فَصلٌ فِي النَّهْي عَن مُناضرةِ أَهلِ البِدَعِ»[(٢)] واته: ڕێگەپێنەدانی بەرامبەرێتی لەگەڵ بیدعەکاراندا.

دەیەها ڕیوایەت لە قسەی هاوەڵان و شوێنکەوتووانی لەژێردا نووسراوەتەوە.

(ابن بطة) رَحِمَهُ الله دەڵێت: «فَاعْلَمْ يَا أَخِي أَنِّي لَمْ أَرَ الْجِدَالَ وَالْمُنَاقَضَةَ ... وَالْآرَاءَ الْمُخْتَرَعَةَ مِنْ شَرَائِعِ النُّبَلَاءِ، وَلَا مِنْ أَخْلَاقِ الْعُقَلَاءِ، وَلَا مِنْ مَذَاهِبِ أَهْلِ الْمُرُوءَةِ، وَلَا مِمَّا حُكِيَ لَنَا عَنْ صَالِحِي هَذِهِ الْأُمَّةِ ، وَلَا مِنْ سِيَرِ السَّلَفِ، وَلَا مِنْ شِيمَةِ الْمَرْضِيِّينَ مِنَ الْخَلَفِ»[(٣)].

واته: بزانە براکەم؛ نەم بینیوە دەمەقاڵێ و بیروڕا داهێنراوەکان لە بەرنامەی کامڵەکان بێت، وە لە ڕەوشتی بەرێزەکان بێت، وە لە ڕێڕەوی خاوەن ڕەوشتە بەرزەکان بێت، وە لە ساڵحانی ئەم ئوممەتە نەگێڕدراوەتەوە، وە کاری پێشینە ساڵحەکانیش نییە، وە لە سیمای زانایانی خاوەن متمانەی ئەم دواییانە نییە، ئەمە بە شێوەیەکی گشتی شوێنی قبوڵی زانایان نییە.

**بۆچوونی دووەم:** ڕێگری دەکەن لە قسە و بەرانبەریەتی بە تایبەت لەگەڵ بیدعەکاران (أهل البدع). نەکردنی وتووێژ لەگەڵ بیدعەکاران بە یەکێك لە خاڵە سەرەکییەکانی بەرنامەی ئەهلی سوننەتی دەزانن، بەم بەڵگانە:

١. ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ﴾ [آل عمران: ٧]، وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «فَأُولَئِكِ الَّذِينَ سَمَّى اللهُ فَاحْذَرُوهُمْ»[(٤)]. ئەوانەی شوێنی مانا لێکچووەکان دەکەون مەبەستیان فیتنەگێڕی و گۆڕینی ماناکەیەتی، وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا ناویانی بردوون، ئاگاداریان بن.

ئیمامی (النووي) رَحِمَهُ الله دەڵێت: «وَفِي هَذَا الْحَدِيثِ التَّحْذِيرُ مِنْ مُخَالَطَةِ أَهْلِ الزَّيْغِ وَأَهْلِ الْبِدَعِ ... بَلْ يُزْجَرُ وَيُعَزَّرُ كَمَا عَزَّرَ عُمَرُ بنُ الخَطَّاب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ صبيغ بن عسل حِينَ كَانَ يَتَبَعُ الْمُتَشَابِهَ»[(٥)].

---

(١) "الشريعة" للآجري (١/ ٤٢٩).

(٢) "الحجة فى البيان المحجة" للأصبهاني (١/ ٣٣٨).

(٣) "الإبانة" (٢/ ٥٣١) برقم (٦٥٧).

(٤) رواه البخاري (٤٥٤٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٢١)، وسبق تخريجه ص٢٨.

(٥) "شرح النووي على مسلم" (١٦/ ٢١٨).

واتە: لەم فەرموودەیەدا ئاگادارکردنەوەیە لەسەر تێکەڵنەبوون لەگەڵ بیدعەکاران، بەڵکوو دەبێت تەمێ بکرێن، وەکوو ئیمامی عومەر ﷺ (صبيغ)ی عیراقی تەمێ کرد، کاتێك بینی شوێن لێکچووەکانی قورئان دەکەوێت.

(أيوب السختياني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لَا أَعْلَمُ الْيَوْمَ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ يُخَاصِمُ إِلَّا بِالْمُتَشَابِهِ»[1].

واتە: ئەمڕۆ کەسێك نابینم لە خاوەن هەوا و بیدعەکاران گوفتار و بەڵگەکانیان (متشابە) نەبێت.

٢. (الحسن البصري وابن سيرين) ڕەحمەتی خوایان لێبێت دەڵێن: «لَا تُجَالِسُوا أَصْحَابَ الْأَهْوَاءِ، وَلَا تُجَادِلُوهُمْ، وَلَا تَسْمَعُوا مِنْهُمْ»[2].

واتە: لەگەڵ بیدعەکاراندا دامەنیشن و بەرپەرچیان مەدەنەوە و گوێیان لێ مەگرن.

٣. (عبد الله بن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «إِنَّ التَّكْذِيبَ بِالْقَدَرِ شِرْكٌ فُتِحَ عَلَى أَهْلِ ضَلَالَةٍ، فَلَا تُجَادِلُوهُمْ فَيَجْرِيَ شِرْكُهُمْ عَلَى أَيْدِيكُمْ»[3].

واتە: باوەڕنەبوون بە قەدەر هاوبەشی بڕیاردانە، ڕووی تێکردوون، وتووێژیان لەگەڵ مەکەن تاوەکوو شیرکەکەیان لەسەر دەستتان بڵاو نەبێتەوە.

٤. (أيوب السختياني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لَسْتُ بِرَادٍّ عَلَيْهِمْ، أَشَدُّ مِنَ السُّكُوتِ»[4].

واتە: هیچ ڕەددێکم نییە بە هێندەی بێدەنگی قورس بێت لەسەریان.

---

(١) "الإبانة" لابن بطة (٢/ ٥٠١) رقم (٥٦٠).

(٢) "سنن الدارمي" (٤١٥)، و "الابانة" لابن بطة (٣٩٥)، و "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢٤٠)، و "شعب الإيمان" للبيهقي (٩٠٢١)، و "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (١٨٠٣)، و "ذم الكلام وأهله" للهروي (٧٥٤).

(٣) رواه الدارمي في "السنن" (٢/ ٥٢٤)، وابن بطة في "الإبانة" (٦٢٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١١٢٦)، والآجري في "الشريعة" (٢/ ٨٧٧).

(٤) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٤٧٩)، والآجري في "الشريعة" (١٣٢).

**٥.** ئیمام (أحمد بن حنبل) رَحِمَهُ اللَّهُ لە وەڵامی نامەیەکدا پرسی پێ دەکەن لە ڕەتدانەوەی بیدعەکاراندا، دەڵێت: «... الَّذِي كُنَّا نَسْمَعُ، وَأَدْرَكْنَا عَلَيْهِ مِنْ أَدْرَكْنَا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّهُمْ كَانُوا يَكْرَهُونَ الْكَلَامَ، وَالْجُلُوسَ مَعَ أَهْلِ الزَّيْغِ ... فَإِنَّهُمْ يُلَبِّسُونَ عَلَيْكَ، وَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ»[(١)].

واتە: ئەوەی بیستومانە و پێی گەیشتووین لەسەری لای زانایان پێیان باش نەبووە قسەکردن و دانیشتن لەگەڵ گومڕایاندا، ئەوان لێتی دەشارنەوە و تێکی دەدەن و ناگەڕێنەوە.

**٦.** ئیمامی (اللالكائي) رَحِمَهُ اللَّهُ باسی پاشکۆی خراپی و وتوویژکردن و دانیشتن لەگەڵ بیدعەکاراندا دەکات و دەڵێت: «فَمَا جُنِيَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ جِنَايَةٌ أَعْظَمُ مِنْ مُنَاظَرَةِ الْمُبْتَدِعَةِ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ قَهْرٌ وَلَا ذُلٌّ أَعْظَمَ مِمَّا تَرَكَهُمُ السَّلَفُ عَلَى تِلْكَ الْجُمْلَةِ يَمُوتُونَ مِنَ الْغَيْظِ كَمَدًا وَدَرَدًا، وَلَا يَجِدُونَ إِلَى إِظْهَارِ بِدْعَتِهِمْ سَبِيلًا، حَتَّى جَاءَ الْمَغْرُورُونَ فَفَتَحُوا لَهُمْ إِلَيْهَا طَرِيقًا، وَصَارُوا لَهُمْ إِلَى هَلَاكِ الْإِسْلَامِ دَلِيلًا، حَتَّى كَثُرَتْ بَيْنَهُمُ الْمُشَاجَرَةُ، وَظَهَرَتْ دَعْوَتُهُمْ بِالْمُنَاظَرَةِ، وَطَرَقَتْ أَسْمَاعَ مَنْ لَمْ يَكُنْ عَرَفَهَا مِنَ الْخَاصَّةِ وَالْعَامَّةِ، حَتَّى تَقَابَلَتِ الشُّبَهُ فِي الْحُجَجِ، وَبَلَغُوا مِنَ التَّدْقِيقِ فِي اللُّجَجِ، فَصَارُوا أَقْرَانًا وَأَخْدَانًا، وَعَلَى الْمُدَاهَنَةِ خِلَّانًا وَإِخْوَانًا، بَعْدَ أَنْ كَانُوا فِي اللهِ أَعْدَاءً وَأَضْدَادًا، وَفِي الْهِجْرَةِ فِي اللهِ أَعْوَانًا، يُكَفِّرُونَهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ عِيَانًا، وَيَلْعَنُونَهُمْ جِهَارًا، وَشَتَّانَ مَا بَيْنَ الْمَنْزِلَتَيْنِ، وَهَيْهَاتَ مَا بَيْنَ الْمَقَامَيْنِ»[(٢)].

واتە: هیچ تاوانێك بەسەر موسوڵماناندا نەهاتووە بە هێندەی وتوویژ و دانیشتن لەگەڵ بیدعەکاراندا، ئەوەندەی زەلیل و بچوك بوونەتەوە بەوەی پێشووە صاڵحەکان ڕوویان لێ وەرچەرخاندوون؛ بە قسەکانیانەوە دەمردن بە داخ و دەردەوە نەیان دەتوانی ئەوەی دەیانەوێت دەری ببڕن، تاوەکوو لەخۆبایی بووەکان هاتن دەرگای دەربڕینیان بۆ کردنەوە و بوونە چاوڕۆشن بۆ لەناوبردنی ئیسلام، تاوەکوو زۆر بوو لە نێوانیاندا، قسەوتن گەیشتە ئەوەی بەرنامە و بۆچوونەکانیان دەرکەوت، گەیشتە گوێی ئەوانەی نەیاندەزانی لە کەسی تایبەتی و گشتی و

---

(١) رواه أحمد في "مسنده" (١/ ٩٥)، وابن بطة في "الإبانة" (٤٨١).

(٢) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" (١/ ١٩).

گومانەکانیان توانی بەرامبەر بەڵگە بوەستێت، گەیشتە ئەوەی بنە هاوەڵ و خۆشەویست لەسەر چەوروەییکردنی یەکتر و دۆست و برا بن، لەپاش ئەوەی لە پێناوی خوادا دوژمن و دژ بوون، وە لەسەر ڕوو وەرچەرخان لە پێناوی خوادا پشتیوان بوون، لە ڕووی خۆیاندا قسەیان پێ دەوترا بە ئاشکرا و نەفرەتیان لێ دەکرا، بەڵام چەندە جیاوازە ئەو دوو ئاستە، وە هاوار بۆ ئەو دوو بوارە.

هۆکارەکەشی وەکوو دەڵێن: «القُلُوْبَ ضَعِيْفَةٌ، وَالشُّبَهُ خَطَّافَةٌ»[١].

واتە: دڵ لاوازە و گومانەکانیش فڕێنەرن.

**بۆچوونی سێیەم:** ڕێگەی وتوویژ و بەرانبەریەتی و دانیشتن لەگەڵ بیدعەکاراندا ڕێی لێ ناگیرێت، بۆ دەربڕینی حەق و لەناوبردنی بەتاڵ و دەرکەوتنی گومڕایان و پاساو بڕینیان و بەڵگە دروستکردن بەسەریانەوە (إقامة الحجة)، بۆیە پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێبێت ئەم ڕێگایەیان گرتۆتە بەر.

فەرمان دەدرێت بە (محمد) ﷺ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾ [النحل: ١٢٥].

واتە: بانگەواز بکە بۆ ڕێگەی خوا بە دانایی و ئامۆژگاری چاك، وتوویژیان بە جوانترین شێوە لەگەڵ بکە.

وە (إبراهيم) ﵇ وتوویژی لەگەڵ باوکی کردووە: ﴿ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ ٥٢ ﴾ [الأنبياء: ٥٢].

واتە: بە باوك و گەلەکەی وت: ئەم بتانە چییە ئێوە دەیان پەرستن.

وە بە پاشاکەی وت: ﴿رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ﴾ [البقرة: ٢٥٨].

واتە: خوای من زیندوو دەکاتەوە و دەمرێنێت، ئەویش وتی: منیش خەڵك زیندوو دەکەمەوە و دەمرێنم، وتی: خوای من ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت تۆ لە ڕۆژئاواوە بیهێنە، قسە بڕا و

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٦/ ٦٤١).

سەرشۆڕ بووه بێبڕواكه.

وه (موسى) ﵇ لەگەڵ فيرعەوندا: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ [الشعراء: ٢٣، ٢٤].

واته: فيرعەون وتی: خوای دروستكراوەكان كێيه؟ (موسا) فەرمووی: خوای ئاسمان و زەوییه.

وه (نوح) ﵇ لەگەڵ گەلەكەیدا: ﴿قَالُوا۟ يَـٰنُوحُ قَدْ جَـٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾﴾ [هود: ٣٢].

واته: ئەی (نوح) بەڕاستی وتووێژت زۆر لەگەڵ كردين، هەروەكوو پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موشريكەكاندا كردوويەتی، بەتايبەت هۆكاری هاتنه خوارەوەی: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾.

وه هاوەڵانيش وەكوو (علي بن أبي طالب) ﵁ و (عبدالله بن عباس) ﵄ قسه و وتووێژيان لەگەڵ خەواريجەكاندا كردووه و تەنانەت ژمارەيەكی زۆريان بەو هۆكارەوه لێ هەڵگەڕاوەتەوه[(١)].

وه (عمر بن عبد العزيز) ﵀ قسەو ڕەتی (غيلان دمشقي) داوەتەوه كه گومڕا بووه له بواری (القضاء والقدر)دا، تاوەكوو قسەی بڕی و تەوبەی ئاشكرای كرد[(٢)].

وه ئيمامی (الأوزاعي) و (الشافعي) ﵏ قسەيان لەگەڵ بيدعەكاردا كردووه كاتێك ڕووبەڕوو بوونەتەوه، يان داوايان كردووه (ئەوزاعی) لەگەڵ (قەدەرییەك)و (شافعی)ش لەگەڵ (حفص الفرد)[(٣)].

وه ئيمام (أحمد) ﵀ لەگەڵ جەهمييەكاندا، كه باوەڕيان به سيفاتەكانی خوا نەبوو[(٤)].

---

(١) بڕوانه "الفرق بين الفرق" للبغدادي ص٧٨ - ٨٠، و "جامع البيان" لابن عبدالبر ص٤٢٨.

(٢) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (١/ ٧١٤).

(٣) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢/ ٧١٨)، "حلية الأولياء" لأبونعيم (٩/ ١١٥)، "مختصر الحجة" للمقدسي ص٥٠٦.

(٤) "الرد على الزنادقة" للإمام أحمد بن حنبل ص٤١، "البداية والنهاية" لابن كثير (١٠/ ٢٩٩).

وە وتووێژەکەی ئیمام (عبد العزيز بن يحي الكتاني المكي) رَحِمَهُ اللَّهُ لەگەڵ (بوشرى مريسي) بە ئامادەبوونی (مأمون)ی خەلیفە و سەرکەوتنی لەو وتووێژەدا و بەخشکردنی ... نووسینەوەی ئەم ڕووداوە بەناوی (الحيدة) زۆر بەناوبانگە.

وە دانیشتن و ڕەددانەوەی (ابن تيمية وابن القيم) رَحِمَهُمَا اللَّهُ لەگەڵ بیدعەکاراندا، لەگەڵ فەیلەسووف و عەقلانییەکان و سۆفی و ئەشعەرییەکاندا زۆر ناوداره، وەك لە پێشەکی "عقيدة الوسطية"، "الرد على البكرى" و لە فەتاوادا بە گشتی هاتووە.

وە تەنانەت ئیمام (أحمد بن حنبل) رَحِمَهُ اللَّهُ ڕەتدانەوەی بیدعەکارانی لە نوێژ و ڕۆژووی سوننەت بە باشتر زانیوە، پرسیاریان لێ کردووە وتوویەتی: «إِذَا قَامَ وَصَلَّى وَاعْتَكَفَ فَإِنَّمَا هُوَ لِنَفْسِهِ وَإِذَا تَكَلَّمَ فِي أَهْلِ الْبِدَعِ فَإِنَّمَا هُوَ لِلْمُسْلِمِينَ هَذَا أَفْضَلُ»[(١)].

واتە: گەر نوێژ بکات و ئیعتیکاف بکات بۆ خۆیەتی، بەڵام گەر قسە بە بیدعەکاران بڵێت بۆ موسوڵمانانە، ئەم چاکترە.

## یەکلا بوونەوەی ئەم بۆچوونانە

دوای تێڕوانین لە قسەی زانایان و بەڵگەکان، دەرکەوت قسەکردن و وتوویژ دەبێت بە دوو بەشەوە: وتووێژی چاك و خراپ (المجادلة المحمودة والمجادلة المذمومة).

**المجادلة المحمودة:** هي ما كانت لإثبات أو دفع باطل أو للتعليم والاستيضاح.

**المجادلة المذمومة:** هي ما كانت لرد الحق أو لنصرة الباطل أو مما نهى الله عنه كالمتشابه وفي الحق بعد ما تبين أو لحظ النفس[(٢)].

وتووێژی چاك كاتێك دەكرێت: بۆ بنەماکردنی حەق، یان ڕەتدانەوەی بەتاڵ، یاخود فێربوون، یان ڕوونکردنەوە.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٨/ ٢٣١).

(٢) "موقف أهل السنة والجماعة من أهل الأهواء والبدع" لدكتور: ابراهيم بن عامر الرحيلي (٢/ ٦٠٣).

وتووێژی خراپ: دەکرێت بۆ بەرپەرچدانەوەی حەق و سەرکەوتنی بەتاڵ یان ئەوانەی ڕێگری لێ کراوە، وەکوو (متشابه)، یان دوای ڕوونبوونەوەی حەق، یان لەبەر هەوا و ئارەزووی نەفس.

خوای گەورە سێ جۆر قسە و وتووێژ باس دەکات لە خراپەکان[١]:

١. وتووێژکردن بۆ بەرپەرچدانەوەی حەق: ﴿وَجَٰدَلُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ﴾ [غافر: ٥].

٢. وتووێژکردن لەدوای ڕوونبوونەوەی حەق: ﴿يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ﴾ [الأنفال: ٦].

٣. وتووێژکردن لەسەر شتێك نایزانن: ﴿فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٌ﴾ [آل عمران: ٦٦].

## پابەندییەکانی وتووێژی چاك
## (ضوابط المجادلة المحمودة)

لەسەر ئەم جیاوازیانەی کە زانایان باسیان کردووە لە نێوان وتووێژی چاك و خراپدا، لە سێ کار بەدەر نییە، کە وتووێژی بەسوود و چاك لە خراپ و زەرەرۆمەند جیابکرێتەوە:

«إما متعلقة بأصل النية،واما متعلقة بموضوع المجادلة واما متعلقة بالمتجادلين»[٢].

**یەکەم: پەیوەندی بە نیەتەوە هەبێت:**

هەموو کارێك نیەت و مەبەستەکان هۆکاری جیاکردنەوەیان دەبێت لە یەکتر، ئیتر گەر باش بێت یان خراپ و بگرە هۆکاری سەرەکیشە بۆ ئەنجامەکانی، وەکوو ئیمام (أحمد بن حنبل) رحمه الله لە (حاتم الأصم)ی پرسی: «قيل له: أنت رجل أعجمي لا تفصح وما ناظرك أحد إلا قطعته فبأي شيء تغلب خصمك؟ فقال بثلاث: أفرح إذا أصاب خصمي وأحزن إذا أخطأ وأحفظ لساني عنه أن أقول له ما يسوؤه أو معنى هذا فقال أحمد: (ما أعقله من رجل)»[٣].

---

(١) بڕوانە "درء التعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٧/ ١٦٩)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣٠٩).

(٢) "موقف أهل السنة والجماعة من أهل الأهواء والبدع" لدكتور: ابراهيم بن عامر الرحيلي (٢/ ٦٠٣)، و "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لدكتور: محمد يسرى ص١٧٩.

(٣) "الفرق بين النصيحة والتعبير" لابن رجب ص٣٢.

واتە: تۆ پیاوێکی عەرەب نیت، زمانت پاراو نییە، بە چی لەگەڵ هەر بەرامبەرێکتا قسە دەکەیت زاڵ دەبیت بەسەریدا؟ وتی: بە سێ شت: خۆشحاڵ ئەبم ئەگەر بیپێکێت، وە خەفەتبار ئەبم گەر نەیپێکێت، وە زمانیشم ئەپارێزم لەوەی شتێك بلێم پێی ناخۆشبێت، ئیمام (ئەحمەد) وتی: چ عەقڵێکی کامڵ هەیە لای ئەم پیاوە!

وە ئیمامی (الشافعي) ﵀ دەڵێت: «مَا نَاظَرْتُ أَحَدًا قَطُّ إِلَّا أَحْبَبْتُ أَنْ يُوَفَّقَ وَيُسَدَّدَ وَيُعَانَ، وَيَكُونَ عَلَيْهِ رِعَايَةٌ مِنَ اللهِ وَحِفْظٌ. وَمَا نَاظَرْتُ أَحَدًا إِلَّا وَلَمْ أُبَالِ بَيَّنَ اللهُ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِي أَوْ لِسَانِهِ»[(١)].

واتە: وتووێژم لەگەڵ هەرکەسێك کردبێت پێم خۆش بووە یارمەتی بدرێت و بیپێکێت، وە پاراستنی خوایشی لەسەر بێت، وە لەگەڵ هەرکەسێکدا وتووێژم کردبێت گوێم نەدەدا حەق ڕوون بێتەوە لەسەر زمانی من بێت یان ئەو.

نیەت خراپی لە وتووێژدا؛ وەکوو: ناشیرینکردنی حەق یاخود عینادی یان دەربڕینی زانست و زیرەکی یان پێداگری لەسەر مانەوە گەر هەڵەش بێت؛ ئەمانە هەمووی هۆکارن بۆ تێکچوونی ئەنجامی وتووێژەکان و بێ سوودی و کات بەفیڕۆدان و سووککردنی یەکتری ... ئەمانە لە قورئاندا بە گەلێکی کەللە ڕەق و دەمەقاڵێکار و موجادەلەچی ناوبراون، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًاۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ۝٥٨﴾ [الزخرف: ٥٨]، ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ۝٥٤﴾ [الكهف: ٥٤]، ﴿أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ﴾ [البقرة: ٢٠٦].

**دووەم: پەیوەندی بە بابەتی قسە لەسەر کراوەکەوە بێت (المتعلقة بموضوع المجادلة):**

مەرج نییە هەموو بابەتێك قسەی لەسەر بکرێت، یاخود قسەکردن هەڵگرێت لەسەری، دەبێت بابەتێك بێت بگەیتە یەکلاکردنەوە و ئەنجام دەست بکەوێت لەسەری بە گەیشتن بە حەقەکە لەسەری ... هەموو ئەو بابەتانەی کە خوای پەروەردگار ڕێگری کردووە لە قسەکردن لەسەری و داوای باوەڕپێکردن و وەستان دەکات لە ئاستی پێویستە، ئەو سنوورە نەبەزێنرێت، لەبەرئەوەی سروشتی ئادەمیزادە ناگاتە زانین لە هەموو شتێکدا، بە هۆکاری کەم توانایی و لاوازی لە ئاستیدا.

---

(١) رواه أبو نعيم في "حلية الأولياء" (٩/ ١١٨).

وەکوو ئەو بابەتانەی چەند مانایەك لەخۆ دەگرن، پێیان دەوترێت (المتشابە) شوێنکەوتەی ئەم بابەتانە بەبێ بوونی هۆکارە زانستییەکان و گومان و دوورکەوتنەوە نەبێت؛ هیچ بەرهەمێکی نییە، ئەو هۆکارانەش لای زانا کاملە ناودارەکانە، وە بگرە هەندێکیشی لای ئەوانیش هەر تەسلیم بوونە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا﴾ [آل عمران: ٧].

واتە: ئەوانەی گومان لە دڵیاندا هەیە شوێنکەوتەی مانا لێکچووەکانن، مەبەستیان دووبەرەکایەتی و مانا گۆڕینەوەیە، کەسێك مانای ڕاستەقینەی نازانێت بێجگە لە خودا ﷻ و زانایانیش دەڵێن باوەڕمان پێیەتی و هەمووی لای خواوەیە.

بێگومان ئیمانی دروست و تێگەیشتنی تەواو و ناخی پاك شوێنکەوتەی گوماناوییەکان نابێت، وە بە واقیع حاڵی تاقیکردنەوەی زانایان و نووسینەکانیان بیدعەکاران هەموو کات بەڵگەکانیان (متشابهات) بووە، ئەوانەی هەڵگری هەموو ماناکانە و پاك نابێتەوە لە گومان.

بۆیە (أيوب السختياني) رحمه الله دەڵێت: «لَا أَعْلَمُ الْيَوْمَ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ يُخَاصِمُ إِلَّا بِالْمُتَشَابِهِ»[1].

واتە: نەمبینیوە یەکێك لە بیدعەکاران بەڵگەکاری و قسەکردنەکانی بە (متشابە) نەبێت.

یەکێکی تر لەو بابەتانەی قسەی لەسەر ناکرێت بابەتە غەیبییەکانە، کە عەقڵ بواری کارکردنی تیادا نییە، وەك: سیفاتەکانی خوا ﷻ و قەزا و قەدەر ... ڕێگایەکە ناگەیتە ئامانج، بۆیە وەسفی ئیماندار کراوە بە: ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ [البقرة: ٣]، یاخود بابەتێك ڕوون و ئاشکرایە، زیاد قسەکردن لەسەری دروست نییە: ﴿يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ﴾ [الأنفال: ٦]. قسە لەسەر شتێك دەکەن پاش ڕوونبوونەوەی، ئەمە هۆکارە ناخییەکانە لە دژایەتی و سووکایەتیکردنە.

کورتەی باسەکە: هەر شتێك ڕوونبوونەوەی هەڵگرت و پێویستی پێ دەکرد و داواکاری لەسەر هەبوو کە بە دڵنیاییەوە وەردەگیرا، ئەمە گومان لە چاکی و ڕێگەپێدراوییان نییە.

---

(١) رواه ابن بطة في "الإبانة" (٢/ ٥٠١) برقم (٥٦٠).

لەگەڵ ئەوەشدا مەرجی زۆر قسەکردن نییە لەسەر بابەتەکە، ئەوەتا وەکوو (ابن رجب) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «فظنوا أن من كثر كلامه وجداله وخصامه في مسائل الدين فهو أعلم ممن ليس كذلك. وهذا جهل محض. وانظر إلى أكابر الصحابة وعلمائهم كأبي بكر وعمر وعلي ومعاذ وابن مسعود وزيد بن ثابت كيف كانوا. كلامهم أقل من كلام ابن عباس وهم أعلم منه وكذلك كلام التابعين أكثر من كلام الصحابة والصحابة أعلم منهم وكذلك تابعوا التابعين كلامهم أكثر من كلام التابعين والتابعون أعلم منهم. فليس العلم بكثرة الرواية ولا بكثرة المقال»[1].

واتە: وا گومان دەبرێت زۆر قسەکردن عیلمە! لەگەڵ ئەوەشدا قسەی گەورە و ناوداران و زانایانی (صەحابە) چەندە کەمترە، وەکوو (ئەبو بەکر و عومەر ...) تا (عبد الله ی کوڕی عەباس) لەمیش زاناترن، وە هەروەها (تابعين) قسەیان چەند زۆرترە لە (صەحابە)، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانیش زاناترن لە (تابعی تابعين)، کە ئەمانیش قسەیان زیاترە لە (تابعين)، زانست بە زۆر گێڕانەوە و قسەکردن نییە، بەڵکوو بەپێزی و کاملی قسەکەیە.

**سێیەم:** ئەو پەیوەستبوونانەی پەیوەندی بە دوو لای قسەکەرەکەوە هەیە: (الضوابط المتعلقة بالمتجادلين):

قسەکردن و بەرپەرچدانەوە کارێکی قورسە لەگەڵ بەرامبەرێکی دژدا، بۆیە کۆدەنگی زانایان نییە لەسەری، لە لایەکەوە ڕێی پێدەدەن و لە لایەکەوە ڕێی لێ دەگرن، لەبەر مەترسی کارەکە لەسەر حەقەکە لەکەدار نەبێت و سووك نەبێت لای خەڵکی و بەتایبەت بیدعەکار، تاوەکوو نەبێتە هۆکاری پێداگری لەسەر بیدعەکەی و پاڵنەر بێ بۆ بڵاوبوونەوەی و لە لایەکی تریشەوە بۆ سەر خاوەن حەق هەیبەت و متمانەی نەمێنێت بە هۆکاری نەتوانینی وەڵامدانەوە و پێویستییەکانی، لەبەرئەوە بەرپەرچدانەوە ئاداب و مەرجی تایبەتی خۆی هەیە و هەندێك لەو مەرج و پەیوەستییانە بۆ بەپەرچدانەوە و دانیشتن لەگەڵیاندا دەخەینە ڕوو[2]:

١. تۆکمەیی زانست و هێزی تێگەیشتن و زمان پاراویی و متمانە بەو حەقەی پشتیوانی لێ دەکەیت.

---

(١) "بيان فضل علم السلف على علم الخلف" لابن رجب ص٣٨.

(٢) "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لدكتور: محمد يسرى ص ١٨٦ – ١٩٠.

ئیمامی (مالك بن أنس) ﷺ پرسی پێ دەکەن لە وەڵامدانەوەی بیدعەکاران، ئەویش دەڵێت: «إِنْ ظَنَنْتَ ذَلِكَ بِنَفْسِكَ خِفْتُ أَنْ تَزِلَّ فَتَهْلِكَ، لَا يَرُدُّ عَلَيْهِمْ إِلَّا مَنْ كَانَ ضَابِطًا عَارِفًا بِمَا يَقُولُ لَهُمْ لَا يَقْدِرُونَ أَنْ يُعَرِّجُوا عَلَيْهِ، فَهَذَا لَا بَأْسَ بِهِ وَأَمَّا غَيْرُ ذَلِكَ فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَلِّمَهُمْ فَيُخْطِئَ فَيَمْضُوا عَلَى خَطَئِهِ أَوْ يَظْفَرُوا مِنْهُ بِشَيْءٍ، فَيَطْغَوْا وَيَزْدَادُوا تَمَادِيًا عَلَى ذَلِكَ»[١].

واتە: ئەگەر گومانت هەیە بە سەرکەوتنی خۆت، وە گەر نا دەترسم هەڵە بکەیت تیا بچیت، نابێت بەرپەرچ بدرێنەوە، مەگەر بە توانایەکی شارەزا کە بتوانێت چی دەڵێت، بە شێوەیەك توانایان نەبێت بیچەمێننەوە ئەمەیان قەیناکا، بێجگە لەمانە دەترسم بکەویتە قسە لەگەڵیان و هەڵە بکەیت و بەم هۆکارەوە ئەوانیش بەردەوام بن لەسەر هەڵەکەیان، یاخود لە شتێکدا بیگرن و زاڵ بن بەسەریدا و ببێتە هۆکاری درێژەپێدانی ئەوان.

**٢.** دەبێت تا ڕێژەیەکی زۆر دڵنیا بن لەسەر بەرامبەر کە حەق وەربگرێت و لووت بەرزی و نکووڵی نەکات.

(ابن بطة) ﷺ دەڵێت: «لَا يَحْمِلَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ حُسْنُ ظَنِّهِ بِنَفْسِهِ ، وَمَا عَهِدَهُ مِنْ مَعْرِفَتِهِ بِصِحَّةِ مَذْهَبِهِ عَلَى الْمُخَاطَرَةِ بِدِينِهِ فِي مُجَالَسَةِ بَعْضِ أَهْلِ هَذِهِ الْأَهْوَاءِ»[٢].

واتە: کەس گومانی باشی بە خۆی نەبێت و بەوەی کە دەزانێت لە ڕاست و دروستی بۆچوونەکەی؛ ببێتە هۆکاری خۆخستنە ترسناکی بە دینەکەیەوە بە ڕێگەی دانیشتن لەگەڵ هەندێ لە بیدعەکاراندا.

(وهب بن بقية) ﷺ دەڵێت: «دَعِ الْمِرَاءَ وَالْجِدَالَ عَنْ أَمْرِكَ، فَإِنَّكَ لَا تُعْجِزُ أَحَدَ رَجُلَيْنِ: رَجُلٍ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ، فَكَيْفَ تُمَارِي وَتُجَادِلُ مَنْ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ؟ وَرَجُلٍ أَنْتَ أَعْلَمُ مِنْهُ، فَكَيْفَ تُمَارِي وَتُجَادِلُ مَنْ أَنْتَ أَعْلَمُ مِنْهُ، وَلَا يُطِيعُكَ، فَاقْطَعْ ذَلِكَ عَلَيْكَ»[٣].

واتە: واز لە مەرایی و بەرپەرچدانەوە بێنە لە دینەکەدا، تۆ لە دوو کەس بەدەر نیت: کەسێك لە تۆ شارەزاترە چۆن بەرامبەری لەگەڵ دەکەیت ؟ یاخود کەسێك تۆ لەو زاناتری چۆن بەرامبەری

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٤٤).

(٢) "الإبانة الكبرى" لابن بطة (٢/ ٤٦٩) برقم (٤٧٥).

(٣) "الشريعة" للآجري ص٦٤ رقم (١٣١).

لەگەڵ دەکەیت؟ بەگوێت ناکات و قسەشت دەشکێنێت.

**٣.** توانای سەرکەوتنی حەقت هەبێت بەسەر بەتاڵدا و گومانەکانیان هەڵوەشێنیتەوە:

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت بەتاڵ بە بەتاڵ ڕەت نەدەیتەوە و بیدعە بە بیدعە ڕەت نەدەیتەوە، بەڵکوو بە حەق و سوننەت ڕەتی بدەیتەوە.

وەکوو ڕافیزە لە دژی خەوارج کە (علي بن أبي طالب) یان ﷺ کافر کرد کەوتنە تەکفیر و فاسقکردنی هەموو هاوەڵان.

وەکوو (معتزلة)کان لە دژی شوبهاندنی سیفاتەکانی خوا بە مرۆڤەوە کەوتنە بێبڕوایی لە سیفەتەکاندا (التعطيل).

وە (مرجئة)کان لە دژی (معتزلة وخوارج) لە ئیماندا کە دەیانوت: (گەر هەندێك لە ئیمان بڕوات هەمووی دەڕوات)، (مرجئة) وتیان: (هیچ بەشێکی ئیمان ناڕوات هەرچی بکات)، تەنانەت لە (شرك وكبائر)یشدا گەیشتە ئەوەی وتیان کار و کردەوە داخلی ئیمان نییە.

(قدري)کان لەدژی (مجبرة)کان کە دەیان وت هیچ توانا (إختيار) بەدەست ئادەمیزاد نییە و هەمووی قەدەرە، ئەوانیش وتیان هەموو شتێك بە توانای ئادەمیزادە و قەدەر توانای نییە.

بە کورتی گەر ئەم سێ خاڵە ڕەچاو بکرێت ڕێگەی پێ دەدرێت لای زانایان بەرپەرچدانەوە لەگەڵ بیدعەکاران بکرێت، لەبەرئەوەی متمانە لە سەرکەوتنی حەقدا دەبێت إن شاء الله.

## یاسا بەرنامەییەکان لەکاتی بەرپەرچدانەوەی بیدعەکاراندا
## (القواعد المنهجية في الرد أهل البدع)

کۆمەڵێك زانستی وورد و تێگەیشتن هەیە بۆ بەکارهێنان لە کاتی ڕەتدانەوەی بیدعەکاراندا پێویستە ڕەچاو بکرێت، وەکوو[1]:

**١.** ناسینی بارودۆخی بەرامبەر، وەکوو بۆچوون وقسە و بەڵگە و نوسراو و سەرچاوە.

(١) "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لدكتور: محمد يسرى ص ١٩١ - ٢١١.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦﴾ [الحجرات: ٦].

واته: گەر تاوانبارێك هەواڵێکی هێنا بۆتان ڕوونکردنەوەی لەسەر بکەن، با خەڵکێك بە نەزانین تووش نەبێت و مایەی پەشیمانی بێت.

پێویستە ئەوەی بەرامبەرکێ دەکات لەگەڵ بیدعەکاراندا شارەزاییەکی باشی هەبێت لە بیر و بۆچوونیان و هۆکارەکانی دروستبوونی فیرەقەکان و ڕابردووی مێژووی ئەو بیروڕایانە بزانێت، بەتایبەت سەرچاوە و ناوداره‌کانیان و شێوازی بەڵگەهێنانەوەیان، ئەمانە پێش چارەسەر.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «أَنَا أَعْلَمُ كُلَّ بِدْعَةٍ حَدَثَتْ فِي الْإِسْلَامِ وَأَوَّلُ مَنْ ابْتَدَعَهَا وَمَا كَانَ سَبَبَ ابْتِدَاعِهَا»[1].

وە دەڵێت: «وَكُلُّ مَنْ خَالَفَنِي فِي شَيْءٍ مِمَّا كَتَبْته فَأَنَا أَعْلَمُ بِمَذْهَبِهِ مِنْهُ»[2].

وە دەڵێت: «وَلِهَذَا لَمَّا بَيَّنْت لِطَوَائِفَ مِنْ أَتْبَاعِهِمْ وَرُؤَسَائِهِمْ حَقِيقَةَ قَوْلِهِمْ وَسِرَّ مَذْهَبِهِمْ صَارُوا يُعَظِّمُونَ ذَلِكَ وَلَوْلَا مَا أَقْرَنَهُ بِذَلِكَ مِنْ الذَّمِّ وَالرَّدِّ لَجَعَلُونِي مِنْ أَئِمَّتِهِمْ»[3].

واته: من زانیاریم هەیە بەسەر هەموو ئەو بیدعانەی لە ئیسلامدا دروست بووە، وە یەکەم کەس کێ بووە دروستی کردووە، وە هۆکارەکانی دروستبوون چی بووە، وە هەرکەسێك بە پێچەوانەی منەوە بێت من شارەزاتر بووم بە بیروباوەڕ و مەزهەبەکەی تا خۆی، لەبەرئەوە کاتێك ڕوونکردنەوەم داوە بە کەسانێکی شوێنکەوتەیان و ناودارەکانیان ڕاستی و دروستی قسەکانیان و نهێنی مەزهەبەکەیان؛ زۆر بەلایانەوە گەورە و بەقەدر بووە، وە گەر من کەسی بەرامبەر و بەرپەرچدەرەوە نەبوومایە دەیانکردم بە یەکێك لە ئیمامەکانیان.

**٢.** دیاریکردنی خاڵی قسەکردن و بنەماکانی بەبێ درێژکردنەوە و پەل لێکردنەوە.

پێویستە ڕێککەوتن بکرێت لەسەر خاڵی قسە لەسەر کردن بە شێوەی ڕێکخستن و پێشخستنی

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ١٨٤).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ١٦٣).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢/ ١٣٨).

گرنگەکان و سەرەکییەکان خاڵ بەدوای خاڵدا و دوورکەوتنەوە لە درێژکردنەوەی باسەکە و پەل دروستکردن و نموونەی کۆکەرەوە و کورت و قۆناغ بڕین بە بابەتەکە تا دەگاتە ئەنجام.

وەکوو ئیمامی (الشافعي) رَحِمَهُ اللَّهُ کاتێك لەگەڵ یەکێکدا وتوویژی بکردایە دەیوت: «نفرغ في هذه المسألة ثم نصير إلى ما تريد»[(١)].

واتە: ئەم بابەتە با لێبینەوە پاشان دەچینە سەر ئەوەی تۆ دەتەوێت.

(الخطيب البغدادي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَيَكُونُ كَلَامُهُ يَسِيرًا جَامِعًا بَلِيغًا، فَإِنَّ التَّحَفُّظَ مِنَ الزَّلَلِ مَعَ الْإِقْلَالِ دُونَ الْإِكْثَارِ، وَفِي الْإِكْثَارِ أَيْضًا مَا يُخْفِي الْفَائِدَةَ، وَيُضَيِّعُ الْمَقْصُودَ، وَيُورِثُ الْحَاضِرِينَ الْمَلَلَ»[(٢)].

واتە: دەبێت قسەی کورت و ئاسان و کۆکەرەوە و زمانی پاراو و پاراستن لە هەڵە بێت لەگەڵ کورتیدا، بەبێ درێژکردنەوە، لەبەرئەوەی درێژکردنەوە سوودەکان دەشارێتەوە و مەبەستەکان ون دەکات و گوێگران بێزار دەکات.

٣. شارەزایی بوون لە ڕەتدانەوەکانی فیرەقەکان بەرامبەر یەکتری.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «والمناظرة تارة تكون بين الحق والباطل، وتارة بين القولين الباطلين لتبين بطلانهما، أو بطلان أحدهما او كون أحدهما أشد بطلانا من الآخر»[(٣)].

واتە: وتوویژ هەندێك جار لە نێوان حەق و بەتاڵدایە، وە هەندێك جار لە نێوان دوو بەتاڵدایە بۆ دەرکەوتنی بەتاڵەکانیان، یان یەکێکیان زۆر بەتاڵە لەوی تر.

وە دەڵێت: «وَهَذَا أَعْظَمُ مَا يُسْتَفَادُ مِنْ أَقْوَالِ الْمُخْتَلِفِينَ الَّذِينَ أَقْوَالُهُمْ بَاطِلَةٌ فَإِنَّهُ يُسْتَفَادُ مِنْ قَوْلِ كُلِّ طَائِفَةٍ بَيَانُ فَسَادِ قَوْلِ الطَّائِفَةِ الْأُخْرَى فَيَعْرِفُ الطَّالِبُ فَسَادَ تِلْكَ الْأَقْوَالِ وَيَكُونُ ذَلِكَ دَاعِيًا لَهُ إلَى طَلَبِ الْحَقِّ»[(٤)].

واتە: ئەمە ڕێگایەکە بە زۆری سوود لە قسە جۆراوجۆرەکان دەکرێت کە بەتاڵ لەخۆ دەگرێت، لە قسەی لایەك هەڵەی قسەی لایەکی تر دەردەخات، بەمە قوتابی زانست قسە

(١) "تذكرة السامع" لابن جماعة ص٤٠.

(٢) "الفقيه والمتفقه" للخطيب البغدادي (٢/ ٥٣).

(٣) "درء التعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٤/ ٢٠٦).

(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ٣١٤).

هەڵەکان دەناسێت و دەبێتە هۆکاری بەدواداچوونی حەق.

**٤.** ناسینی جۆری دارشتنە بەرنامەییەکانی فیرەق و گرووپە بیدعەکارەکان.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «إذا لم يخاطبوا بلغتهم واصطلاحهم فقد يقولون: إنا لا نفهم ما قيل لنا، أو أن المخاطب لنا والراد علينا لم يفهم قولنا، ويلبسون على الناس بأن الذي عنيناه بكلامنا حق معلوم بالعقل أو بالذوق»[(١)].

واتە: گەر بە زمان و بەکارهێنانی خۆیان قسەیان لەگەڵ نەکرێت دەڵێن ئێمە تێناگەین، یا ئەوەی قسەمان بەرامبەر دەکات و بەرپەرچمان دەداتەوە لە قسەکانمان تێناگات، بەم شێوەیە دەیگۆڕن لای خەڵکی و خۆیان بە حەق دەناسێنن.

وەکوو: وشەی (التوحيد) لای ئەهلی سوننەت مانایەکی تایبەتی هەیە، وە لای فەلاسیفە ئیسلامییەکان مانای بوونی ڕەهایی هەیە بەبێ ناو و سیفات، وە لای (وحدة الوجود) سۆفییەکان مانای خوایەکی تێکەڵ بە هەموو بوونە، وە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) لای ئەهلی سوننەت مانایەکی تایبەتی هەیە، بەڵام لای (معتزلة وخوارج ورافضة) واتە شۆڕش و دەرچوون لە دەسەڵات، وە وشەی (العدل) لای ئەهلی سوننەت واتە دادپەروەری و ستەم نەکردن، بەڵام لای (معتزلة وقدرية)کان باوەڕنەبوون بە قەدەر دەگەیەنێت.

**٥.** هێنانەوەی ئەو بەڵگانەی هەردوولا کۆدەنگن لەسەری.

بۆیە زۆرتر گەڕانەوە و بەکارهێنانی قورئان و فەرموودە (صحيح)ە ناودارەکان ڕێگاکە کورتتر دەکاتەوە و کۆکردنەوەیە لە بازنەی بەڵگەکان.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ [الشورى: ١٠]. جیاوازییەکان بگێڕنەوە بۆ لای خودا جَلَّ جَلَالُهُ.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «مقصود المناظرة رَدُّ الْخَصْمِ إِلَى الصَّوَابِ بِطَرِيقٍ يَعْرِفُهُ؛ لِأَنَّ رَدَّهُ بِغَيْرِ مَا يَعْرِفُهُ مِنْ بَابِ تَكْلِيفِ مَا لَا يُطَاقُ»[(٢)].

---

(١) "درء التعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٢٢٣).

(٢) "الموافقات" للشاطبي (٥/ ٤١٥).

واتە: مەبەست لە ڕەتدانەوە گەڕانەوەی ڕەتکارە بۆ حەقەکە بە ڕێگەیەك بزانیت، وە گەر نا وەکوو داواکاری بەدەر لە توانایە.

**٦.** ڕەچاوکردنی دارشتنی بەڵگەکان و خوێندنەوەی پێش و پاشیان، وە خوێندنەوەی هەموو جۆرە بەکارهێنانەکانی بەشەکانی بەڵگەکان، ڕەچاونەکردنی هەموو جۆرە دارشتنەکانی ئەو بەڵگانە و نەخوێندنەوەی پێشەکی و دواینی دەقەکان و بێئاگایی لە هەموو جۆرە بەکارهێنانەکانی لە دەقەکاندا؛ هۆکارە بۆ دەستنەکەوتنی مانای تەواو و نەگەیشتن بەحەقەکە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿بَلۡ كَذَّبُواْ بِمَا لَمۡ يُحِيطُواْ بِعِلۡمِهِۦ﴾ [يونس: ٣٩].

ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوانەی زانیاری تەواویان نییە دەکەونە بەدرۆخستنەوەوە.

**٧.** زانست بەسەر چۆنێتی هێنانەوەی بەڵگە، پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

**أ–** هەر باسێك بێبنەما بێت لە بەڵگەدا وەرناگیرێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١﴾ [البقرة: ١١١].

**ب–** دڵنیابوون لە دروستی نەقڵکراوەکاندا: «إن كنت ناقلاً فالصحة أو مدعياً فالدليل»[1].

واتە: ئەگەر نەقڵکاری؛ ڕاستی و دروستییەکەی، وە گەر بنەماکاری؛ بەڵگە.

**ت–** دڵنیابوون و ووردەکاری بەسەر قسەکاندا بۆ خاوەنەکانیان، وە دیاریکردنی مەبەستیان.

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَالْكَلِمَةُ الْوَاحِدَةُ يَقُولُهَا اثْنَانِ، يُرِيدُ بِهَا أَحَدُهُمَا أَعْظَمَ الْبَاطِلِ، وَيُرِيدُ بِهَا الْآخَرُ مَحْضَ الْحَقِّ، وَالِاعْتِبَارُ بِطَرِيقَةِ الْقَائِلِ وَسِيرَتِهِ وَمَذْهَبِهِ، وَمَا يَدْعُو إِلَيْهِ وَيُنَاظِرُ عَلَيْهِ»[2].

واتە: یەك وشە دوو کەس دەیڵێت، یەکێکیان مەبەستی پێی گەورەترین بەتاڵە، ئەویتریان مەبەستی پێی حەقە، ڕەچاوکردن بە گوێرەی ڕێگای خاوەن قسە و ژیانی و مەزهەبەکەیدایە، لەگەڵ

---

(١) "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لدكتور: محمد يسرى ص ١٩٣.

(٢) "مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين" (٣/ ٤٨١).

ئەوەی مەبەستی پێیەتی لەپێناویدا قسه دەکات.

ث- کۆکردنەوەی هاوشێوەکان و جیاکردنەوەی جیاوازەکان، خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ﴾ [النساء: ١٥٠].

وەکوو جوولەکه و گاوورەکان باوەڕیان به تەورات و ئینجیل و (موسا) و (عیسا) عليهما السلام هەیه، بەڵام باوەڕیان به قورئان و (محمد) ﷺ نییه، منداڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن دەڵێن (مسیح و عوزێر) کوڕی خوان، بەڵام نابێت قەشه و ڕاهیبەکان ژن و منداڵیان هەبێت، وەکوو ڕافیزەکان هەندێك لە هاوەڵان به (ئەولیاء) دەزانن و هاوەڵانی تر (تکفیر) دەکەن، وەکوو خەواریجەکان باوەڕیان به هەڕەشەکان (وعید) هەیه بەڵام باوەڕیان به مژده (وعد)کان نییه، موسوڵمانانیان کافر دەکرد، (معتزلة وجهمية)کان باوەڕیان به ناوەکانی خوا هەبوو، بەڵام باوەڕیان به سیفاتەکانی نەبوو، وەکوو قورئانییەکان باوەڕیان به قورئان هەیه، بەڵام باوەڕیان به فەرموودە نییه.

زانیاری لەسەر ئەم ووردەکاریانه کاملبوون دەبەخشێت بەسەر جیاکردنەوە و دۆزینەوەی هەڵ و دیاریکردنی خاڵه گومڕاییەکان.

ج- گەر بەڵگەکان دژایەتی یەکێکیان کرد و ئەنجام و لەخۆگرتنی مانای باسەکان یەکیان نەگرت؛ نیشانەی بەتاڵی هێنانەوەی بەڵگەکانه.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «وقد يستدل على بطلان القول ببيان المفاسد المترتبة عليه أو اظهار مناقضته لما جاء به النبي ﷺ»[1].

واته: دەکرێته بەتاڵی قسەیەك به ڕوونبوونەوەی خراپه و هەڵەکان که لەسەری بنیاد نراوە، یا دەرکەوتنی دژایەتی ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە.

ح- نەبوونی زانیاری بەسەر بەڵگەدا مانای نەبوونی بەڵگه نییه، نەبینینی جنۆکەکان مانای نەبوونیان نییه، وە هەروەها فریشتەکانیش.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «أنه يلزم من وجوده الوجود ولا يلزم من عدمه العدم ﴿بَلْ كَذَّبُوا

---

(١) "اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم" لابن تيمية ص٢٩١.

بِمَا لَمۡ يُحِيطُواْ بِعِلۡمِهِۦ﴾ [يُونُس: ٣٩]»[1].

واتە: مەرجە لە بوونی زانستدا؛ بوونە، بەڵام مەرج نییە لە نەبوونیدا زانست بەسەریدا نەبوون بێت.

٨. بانگەوازی و خۆدانە پاڵ قسە و مەزهەبێك مانای هەڵگرتنی هەموو پەیوەستییەکانی ئەو قسە و مەزهەبە نییە، ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە، مەرج نییە هەموو باس و بیروڕا و قسەیەك بشکێنرێتەوە بەسەر کەسان و بانگەوازکارانی فیرەق و مەزاهیب و گرووپەکاندا.

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «لَازِمُ الْمَذْهَبِ لَيْسَ بِمَذْهَبٍ، وَلَيْسَ كُلُّ مَنْ قَالَ قَوْلاً الْتَزَمَ لَوَازِمَهُ»[2]، «وَلَوْ كَانَ لَازِمُ الْمُذْهَبِ مَذْهَبًا لَلَزِمَ تَكْفِيرُ كُلِّ مَنْ قَالَ عَنْ الِاسْتِوَاءِ أَوْ غَيْرِهِ مِنْ الصِّفَاتِ أَنَّهُ مَجَازٌ لَيْسَ بِحَقِيقَةٍ؛ فَإِنَّ لَازِمَ هَذَا الْقَوْلِ يَقْتَضِي أَنْ لَا يَكُونَ شَيْءٌ مِنْ أَسْمَائِهِ أَوْ صِفَاتِهِ حَقِيقَةً»[3].

واتە: خۆدانە پاڵ هەر مەزهەب و فیرەقێك مانای هەڵگر و ڕای هەموو ئەو مەزهەب و فیرەقە نییە.

واتە هەموو بیروڕاکانی مەزهەب نادرێتە پاڵ بانگخواز بۆ ئەو مەزهەبە، گەر وابێت هەر کەسێك بڵێت ناو و سیفاتەکان (مجاز)ن ئەوا دەبێت باوەڕی بە هیچ ناو و سیفاتێکی خوا نەبێت، کەواتە مەرج نییە هەموو هەڵگری ناوێك هەڵگری کۆی بەرنامەکەی بێت، وەکوو کەسێك دەڵێت: من (أهل السنة) یا (شيعة) یا (تصوف) یا (أشعري)م ... هەڵگری تەواوی یەکێك لەوانە بێت، گەرچی بەسەریەوە ماڵە.



(١) "الرد على المنطقين" لابن تيمية ص١٠٠.
(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/ ٢١٧).
(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/ ٢١٧).

# بەشی چوارەم

## ١. حوکمی داهێنراو (حکم البدعة).

## ٢. حوکمی بیدعەکار (حکم المبتدع).

## یەکەم : حوکمی داهێنراو
## (حکم البدعة)

داهێنراو تاوانە بەرامبەر بە دین، بەرامبەرکێیەتییە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و مافخواردنی ئەوە، سنووربەزاندنی یاساکانی ئیسلامە بە حەقدان بە بەشداربوون تیایدا، تۆمەتبارکردنی ئیسلامە بە کامڵ نەبوون و تەواو نەبوون، دەرگاکردنەوەی زیاد و کەمییە لە بوارەکانی دیندا، گومان دروستکردنە لەسەر وادەکانی خوا ﷻ لەسەر پاراستنی دین، لەناوبردنی کرۆکی عیبادەتە کە پەیوەستبوونە، وە هۆکاری نەمانە بەدوای بەڵگەدا، ڕەخساندنی بواری کردنەوەی دەرگای هەوا و ئارەزوو و حەزەکانی خەڵکە ... ئەمانە و چەندەهای تر هۆکاری شکاندنی شورای پۆڵایینی پاراستنی دینە، چۆن وشەی (التوحید) بۆ پاراستنی مافی خوایە و بە وشەی (الشرك) شکاندنی ئەم مافەیە، وەهاش وشەی (السنة) مافی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ و بە وشەی (البدعة) شکاندنی ئەم مافەیە، وە وشەی (الطاعة) پاراستنی مافی خەڵکییە و بە وشەی (المعصیة) شکاندنی ئەم مافەیە.

ئێمە ئێستا لە مافی پێغەمبەرەکەی داین ﷺ، دەبێت بزانین ڕێژەی تاوانی شکاندنی ئەم مافە چەندە، پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەکی گشتی ئاگاداری موسوڵمانانی کردووەتەوە: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» وەکوو یاسایەکی گشتی بنەمادار کە (کل) هەموو نەك هەندێك، (بدعة) وشەیەکی دینی بێزراو و بە خراپ ناوبەرە، واتە هەرچی بکەن بە هەر ناوێك (حسنة، خیر، چاکە) هەر بیدعەیە، بۆیە ئەنجامەکەی زۆرتر دیاری دەکات و دەفەرموێت، (ضلالة) گومراییە، واتە مایەی هیدایەت و پلەی دینی نییە، وە لەوە زیاتر بۆ دڵنیابوون فەرموویەتی: «كُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ» هەموو گومراییەك

لە ئاگردایە، ئەم ڕێگا چنراوە بە هەڕەشە زۆر ئەستەمە (مستحيلات يان معدودات، يان ممتنعات) ئەستەمە، نەبووە، ڕێگرە، لە بووندا، گەر کارێك بکرێت و بەڵگەی لەسەر نەبێت پێی بوترێت (البدعة الحسنة)، ڕێگای چاك یان خێر یا عیبادەت بێت. لەگەڵ ئەمەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەبەزەیی و سۆزە بۆ ئیمانداران، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ [التوبة: ١٢٨]. وە ئەمەیشی لە هەڕەشەکەدا دەردەکەوێت فەرموویەتی: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» هەموو داهێنراوێك گومڕاییە، نەیفەرمووە (کفر یان شرك یان مرتد) گومڕاییش ڕێژەییە، دەشێت خاوەنەکەی هیدایەت وەربگرێت و بیدۆزێتەوە.

* داهێنراو تاوانە وەکوو هەموو تاوانەکان چەندەها پلە و جۆراوجۆر و لەخۆگری هەیە، چۆن تاوان گەورە و بچووك (کبائر، صغائر)ی هەیە ئاواش داهێنراو بچوك و گەورەی هەیە، چۆن تاوان پەیوەندی هەر جارەی بە جۆرێکەوە هەیە لە (ضرورات، حاجيات، تحسينات) بە هەمان شێوە داهێنراویش، بەدەر لەوەی داهێنراو لە چەند ڕوویەکەوە تاوانی زیاترە لە حەرامەکان، وەکوو وەسفکردنی بە گومڕایی، حەرامکار وەسف ناکرێت بە گومڕا، وە بە هیچ شێوەیەك لە پلەی حەرام نایەتە خوارەوە بۆ (مکروه) بە شێوەی بەکارهێنانی زانایانی ئەم دواییە، بەڵام حەرام دێتە خوارەوە بۆ (مکروه)، وە بە هەندێك لە داهێنراوی گەورە لە (عقيدة)دا دەرچوونە لە دین، گەرچی بە هیچ حەرامێك دەرچوون نییە لە دین، داهێنراو سنوور بەزاندنی مافی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، بەڵام حەرامەکان مافی خۆی و خەڵکییە، بەمانە لە سەرو حەرامەکانەوەیە.

بۆ زیاتر ڕوون بوونەوە و بەرزبوونەوەی ئاستی تێگەیشتن لە حوکمی داهێنراوەکان زانایان داهێنراویان لە چەند ڕوو پەیوەندی یەکەوە بە دین کردووە بە چەند بەشێکەوە[1]:

**یەکەم:** لە ڕووی ڕێژەی پەیوەندیبوون بە بەڵگە شەرعییەکانەوە دوو بەشە:

---

(١) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ١٩٢، ٢١٠)، "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لمحمد يسرى ص٤٧ – ٦٨.

١. البدعة الحقيقة.

٢. البدعة الاضافية.

**داهێنراوی ( حەقیقی ):** هیچ بنەمایەکی نییە لە دیندا.

بەڵام (**الإضافية**): دوو ڕووە، لە ڕووی بنەماوە بەڵگەی هەیە لەسەری، بەڵام لەڕووی چۆنیەتی و بارودۆخی چەندیەتی و کات و شوێن بەڵگەی لەسەر نییە، بۆیە حوکمی ئەم ئاسانترە تا ئەو، گەرچی هەردووکیان لە وەسفی بیدعە و گومڕایی و بنەبڕکردندا جیا ناکرێتەوە.

**دووەم:** لە ڕووی پەیوەندیبوونی بە بیروباوەڕە دڵی و کردارییەکانەوە دوو بەشە:

١. البدعة الاعتقادية.

٢. البدعة العملية.

**داهێنراوە (عەقیدەییەکان)**: ئەوانەن کە پێچەوانەی داواکاری و شێوازی بەڵگەکان باوەڕ و ئیمان لەسەری دروست دەکەن، وەکوو: (معتزلة وجهمية وقدرية والخوارج والروافض)ەکان لە بوارەکانی ناووسیفاتەکانی خواو جۆراو جۆری باوەڕ بە (القضاء والقدر)، یان قسەکردن لە قورئان و هاوەڵان و ئیمان و کوفر ... ئەمانە گۆڕانکاری گەورەیە لە ڕێڕەوی بیروباوەڕی داواکراوی ئیسلام، ئەم فیرەقانە لەسەر (کبائر) لە لێورای دەرچوون و تیاچووندان، گەرچی بەناوی (اجتهاد) و جۆرێك لە (تأويل) مانا بۆ دروستکردن خۆیان پەنا داوە ... گومانیش نییە لەوانەی داهێنەری بنەمای ئەم بیرانە و بانگخوازیانن: «فَأَهْلُ الْبِدَعِ فِيهِمْ الْمُنَافِقُ الزِّنْدِيقُ فَهَذَا كَافِرٌ وَيَكْثُرُ مِثْلُ هَذَا فِي الرَّافِضَةِ وَالْجَهْمِيَّةِ فَإِنَّ رُؤَسَاءَهُمْ كَانُوا مُنَافِقِينَ زَنَادِقَةً. وَأَوَّلُ مَنْ ابْتَدَعَ الرَّفْضَ كَانَ مُنَافِقًا. وَكَذَلِكَ التَّجَهُّمُ فَإِنَّ أَصْلَهُ زَنْدَقَةٌ وَنِفَاقٌ ... وَمِنْ أَهْلِ الْبِدَعِ مَنْ يَكُونُ فِيهِ إيمَانٌ بَاطِنًا وَظَاهِرًا لَكِنْ فِيهِ جَهْلٌ وَظُلْمٌ حَتَّى أَخْطَأَ مَا أَخْطَأَ مِنْ السُّنَّةِ؛ فَهَذَا لَيْسَ بِكَافِرِ وَلَا مُنَافِقٍ ثُمَّ قَدْ يَكُونُ مِنْهُ عُدْوَانٌ وَظُلْمٌ يَكُونُ بِهِ فَاسِقًا أَوْ عَاصِيًا؛ وَقَدْ يَكُونُ مُخْطِئًا مُتَأَوِّلًا مَغْفُورًا لَهُ خَطَؤُهُ؛ وَقَدْ يَكُونُ مَعَ ذَلِكَ مَعَهُ مِنْ الْإِيمَانِ وَالتَّقْوَى»[1].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣٥٣، ٣٥٤).

واتە: لە بیدعەکاراندا کەسانی دوورِوو و دەرچوو لە دین هەیە، زۆریش ئەمانە لە رِافیزە و جەهمییەکاندا هەبوو، بە تایبەت سەرکردەکانیان یەکەم کەس کە رِافیزەی دروست کرد دوو رِوو بووە، هەروەها جەهمییەکان لە ناو و سیفاتەکانی خوادا دەرچوو لە دین و دوورِوو بوون، هەر لە بیدعەکارانیشدا خاوەن ئیمان و باوەرِی دڵی و رِووکەش هەیە، بەڵام ئەمانە نەزانین و ستەمکارییان تێدایە، بۆیە هۆکاری هەڵە بوون لە سوننەتدا، هەندێکیان لەمانە کافر و دوورِوو نین، گەرچی تاوان و ستەم لەخۆ دەگرن، دەشێت خاوەن هەڵە و ئیجتیهادی لێخۆشبوو بن، وە خاوەنی خواناسی و ئیمان بن.

وە (الاتحاد والحلول) تێکەڵ بوون لەگەڵ خوادا، یان (رفع الأوامر الشرعية) گەیشتن بە قۆناغێك کە فەرمانە شەرعییەکان لەسەر قۆناغ برِ لە دین لاچێت، واتە هیچ فەرز و حەرامێکی لەسەر نەمێنێت، یان باوەرِنەبوون بە (شفاعة)، یان دەرنەچوونی کەسانی ناو دۆزەخ لە دۆزەخ گەر ئیمانداریش بن.

**داهێنراوە (کردارییەکان):** عیبادەتکردنی خوایە بەو شێوەیەی کە داواکاری لەسەر نییە، بە گۆرِانکاری یەکێك لەمانەی خوارەوە:

١. هۆکار (السبب): وەکوو: زیندووکردنەوەی شەوی (**٢٧**)ی (رجب) بە بۆنە و هۆکاری (الإسراء والمعراج)ەوە.

ئەم هۆکارە لە شەرعدا رِەچاو نەکراوە، بەو بۆنەیەوە بەمە دەبێتە داهێنراو.

٢. جۆر (الجنس): وەکوو: قوربانیکردن بە ئەسپ.

٣. رِێژە (القدر): وەکوو: زیادکردنی فەرزێك کە نییە، یاخود رِکاتێك لە فەرزەکان، وەکوو نیوەرِۆ پێنج رِکات بکات.

٤. چۆنیەتی (الكيفية): وەکوو: چۆنیەتی دەستنوێژگرتن کە لە قاچەوە دەست پێبکات.

٥. کات (الزمان): وەکوو: قوربانیکردن پێش نوێژی جەژنی قوربان.

٦. شوێن (المكان): وەکوو: (اعتكاف) کردن لەماڵەوە.

**سێیەم:** لە ڕووی ڕێژەییەوە:

١. البدعة الكلية.

٢. البدعة الجزئية[(١)].

**داهێنراوی (گشتگیری):** ئەو داهێنراوانەن کە هۆکارە بۆ گرتنەوەی ڕێژەیەکی زۆر بواری دینی، وەك: (التحسين والتقبيح العقليين) عەقڵ کردنە بەڵگە بۆ بەچاك زانین و خراپ دیاریکردنی دینی یان کارکردن بە قورئان بەبێ فەرموودە، یاخود کارنەکردن بە فەرموودەی (آحاد) ژمارە ڕاوییە کەمەکان، یاخود (كشف الإلهامات والمنامات) کردنە بەڵگە بۆ بوارەکانی دینی.

**داهێنراوی (هەندیەتی):** هۆکاری داهێنراویەتییەکە لە هەندێکیدا ڕوو دەدات ڕێژەی زۆری تەواوە، وەکوو: دەنگ بەرزکردنەوە بە زیکرەکانی دوای نوێژ بە کۆمەڵ یان بە شێوازی لاواندنەوە، یان گۆرانی قورئان بخوێنن.

**چوارەم:** لە ڕووی پەیوەندیداری بە حوکمەوە دوو جۆرە:

١. البدعة المكفرة.

٢. البدعة غير المكفرة[(٢)].

**داهێنراوی (بێبڕواییە):** هۆکارە بۆ بێبڕوابوون و دەرچوون لە دین، وەکوو: باوەڕنەبوون بە ناو و سیفاتەکانی خوا و بابەتە غەیبییەکان لە سزای گۆڕ و بەهەشت و دۆزەخ و زیندووبونەوە، وە کارێك دژایەتی بکات بنەمایەکی دینی بێت لە فەرزەکان و باوەڕە غەیبییەکان، وەکوو باوەڕنەبوون بە فریشتەکان.

**داهێنراوی (بێبڕوایی بچووك):** کارەکە گەورەیە بەڵام لە کێشانەی دینیدا بچوکترە لە ڕابردوو، ئەم پێی بێبڕوا نابێت، وەکوو: قسە وتن بە هاوەڵان و تۆمەتبارکردنیان و شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانانداا.

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٧٨).

(٢) أنظر "معارج القبول" للحافظ أحمد الحكمي (٢/ ٥٠٣).

**پێنجەم:** لە ڕووی پەیوەستبوونی بە کاری خەڵکەوە دوو جۆرە:

١. البدعة التعبدية.

٢. البدعة العادية.

**داهێنراوی (عیبادەتی):** ئەو داهێنراوانەیە کە پەیوەستی بە جۆرێك لە عیبادەتەکانەوە هەیە، وەکوو: پێشخستنی وتاری جەژن بەسەر نوێژدا و بانگدان بۆ نوێژی جەژن و ڕۆژگیران و نوێژەبارانە ... .

**داهێنراوی (عادەتی):** واتە کارە ئاساییەکانی ڕۆژانەی ئادەمیزاد، وەکوو: خواردن و خەوتن و قسەکردن و هەوڵدان بۆ ژیان، ئەو بابەتانەی کە بە عیبادەت ناو نەبراون، ئەمانە دەبنە داهێنراو بەسەر خاوەنەکانیانەوە، بە مەرجێك بە نیەتی عیبادەت و خواپەرستی ئەنجامی بدەن، وەکوو (التبتل) ژن نەهێنان، خۆ بادان و سووڕانەوە (الرقص مع العبادات) لە کاتی زیکرکردندا، لەبەر گەرمای ڕۆژ وەستان و نەخواردنی گۆشت و نەخەوتن و قسە نەکردن ... وەکوو ئەو کۆمەڵەی چوون بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری عیبادەتەکانی پێغەمبەریان ﷺ کرد، پاشان بڕیاریان دا وەکوو عیبادەت نەخۆن و بەردەوام بەڕۆژوو بن و ژن نەهێنن: «أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا»، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[(١)].

واتە: ئەوەی واز لە ڕێگەی من بهێنێت لە من نییە.

وە ئەو پیاوەی نەزری کردبوو لەبەر ڕۆژ وەستا، ناوی (أبو اسرائيل) بوو: «نَذَرَ أَنْ لاَ يَتَكَلَّمَ، وَلاَ يَسْتَظِلَّ، وَلاَ يَجْلِسَ، وَيَصُومَ»[(٢)]. کە قسە نەکات و نەچێتە ژێر سێبەر و دانەنیشێت و بەڕۆژوو بێت.

یان ئافرەتەکە: «دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى امْرَأَةٍ مِنْ أَحْمَسَ مُصْمِتَةٍ فِي حَجَّتِهَا، فَجَعَلَتْ تُشِيرُ إِلَيْهِ وَلَا تُكَلِّمُهُ، فَقَالَ: «مَا لَهَا لَا تَتَكَلَّمُ؟» فَقَالُوا: إِنَّهَا نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ مُصْمِتَةً». واتە: (ئەبو بەکر) رضي الله عنه

---

(١) رواه البخاري (٥٠٦٣)، ومسلم (١٤٠١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٣٠٥)، وسبق تخريجه ص٥٠.

(٢) رواه البخاري (٦٧٠٤)، وابن ماجه (٢١٣٦)، وأبو داود (٣٣٠٠)، وسبق تخريجه ص٢٨٥.

ئافرەتێکی بینی بە هێما قسەی دەکرد، وتی: بۆ قسە ناکات؟ وتیان: دەیەوێت حەج بکات و قسە نەکات، پێی وت: «تَكَلَّمِي، فَإِنَّ هَذَا لَا يَحِلُّ لَكَ، إِنَّمَا هَذَا مِنْ عَمَلِ الْجَاهِلِيَّةِ»»(١).

واتە: قسە بکە، ئەمە دروست نییە بۆت، ئەمە کاری سەردەمی نەفامییە.

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «وَأَنَّ الْعَادِيَّاتِ مِنْ حَيْثُ هِيَ عَادِيَّةٌ لَا بِدْعَةَ فِيهَا، وَمِنْ حَيْثُ يَتَعَبَّدُ بِهَا أَوْ تُوضَعُ وَضْعَ التَّعَبُّدِ تَدْخُلُهَا الْبِدْعَةُ»(٢).

واتە: کارە عادەتییەکان وەکوو خۆیان بیدعەیان تێدا نییە، بەڵام کردنە عیبادەت یان بارودۆخێکی عیبادەتی پێوە بلکێنن بیدعەی تیادا دروست دەبێت.

وە دەڵێت: «فَالْأُمُورُ الْمَشْرُوعَةُ تَارَةً تَكُونُ عِبَادِيَّةً وَتَارَةً عَادِيَّةً، فَكِلَاهُمَا مَشْرُوعٌ مِنْ قِبَلِ الشَّارِعِ، فَكَمَا تَقَعُ الْمُخَالَفَةُ بِالِابْتِدَاعِ فِي أَحَدِهِمَا تَقَعُ فِي الْآخَرِ»(٣).

واتە: شەریعەت هەردووکیانە و لە هەردووکیاندا قابیلی بیدعەبوون هەیە.

**شەشەم:** لە ڕووی لەخۆگرتنی پلەی حوکمییەوە دوو جۆرە:

١. البدعة المحرمة.

٢. البدعة المكروهة.

**داهێنراوە (حەرامەکان):** مەبەست پێی داهێنراوە گەورەکانە، گەر پێی دەرچێت لە ئیسلام یا دەرنەچێت، وەکوو: حەڵاڵکردنی ڕیبا و زینا بە ناوێکی ترەوە، باوەڕنەبوون بە حوکمی (مرتد) و ڕەجم و (إتحاد الأديان) ... .

**داهێنراوی (مکروه):** وەکوو شەونوێژکردنی بەردەوام بە جەماعەت بێجگە لە تەراویح، قنووتی بەیانیان بەردەوام بەبێ هۆکار، زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان خستنە پێش نوێژ ... .

(١) رواه البخاري (٣٨٣٤)، والدارمي في "السنن" (٢١٨)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٢١٥٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٠٩٦).

(٢) "الاعتصام" (٢/ ٥٩٤).

(٣) "الاعتصام" (٢/ ٥٦٢).

(مکروه) لە بیدعەدا مەبەست پێی ئەو (مکروه)ە نییە کە لە پێناسەی زانایانی (فقه)دا هاتووە، «وَالْمَكْرُوه مَا يُثَاب على تَركه وَلَا يُعَاقب على فعله»(١). پاداشت لەسەر نەکردنیەتی و سزا لەسەر کردنی نییە.

ئەم پێناسەیە داهێنراو ناگرێتەوە(٢)، لەبەرئەوەی:

١. کەمترین بیدعە هەڕەشەی قورسی لەسەرە: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»، «وَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»، «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ».

٢. داهێنراو یاسا دانانی دینییە (التشريع)، گەر بە زیادکردن بێت یان کەمکردن یان گۆڕین یان پێوەلکاندن.

٣. داهێنراو تاوانە بەرامبەر دین، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ [الشورى : ٢١].

٤. بیدعەکار خۆی و کارەکەی بە حەق و عیبادەت دەزانێت و بانگەوازی بۆ دەکات و بەرگری لێ دەکات.

٥. «وَجَدْنَا بَيْنَ الطَّاعَةِ وَالْمَعْصِيَةِ وَاسِطَةً يَصِحُّ أَنْ يُنْسَبَ إِلَيْهَا الْمَكْرُوهُ ... بِخِلَافِ الْهُدَى وَالْضَلَال؛ فَإِنَّهُ لَا وَاسِطَةَ بَيْنَهِمَا فِي الشَّرْعِ»(٣).

واتە: لە نێوانی عیبادات و تاواندا پەیوەندییەك هەیە پێی دەوترێت (مکروه)، بە پێچەوانەی بیدعەوە کە هیدایەت و گومڕاییە، پەیوەندی لە نێوانیاندا نییە لە شەرعدا.

ئەمانە هەمووی خاڵی پێچەوانەی کارە مەکروهەکانی (فقهي)یە، وە (مکروه) پێشەکی تاوانەکانە بۆیە دانراوە وەکوو بەربەستێك نەکەویتە حەرامەوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ﴾ [الإسراء : ٣٢]، ﴿وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ﴾ [الأنعام : ١٥١]، ﴿وَلَا

(١) "الورقات" للجويني ص٨.

(٢) بڕوانە "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٣٧٣).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٣٢).

نَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ﴾ [الأنعام : ١٥٢]. نزیکی کاری خراپه و ماڵی هه‌تیو مه‌به، نزیکبوونه‌وه‌کان (مکروه)کانه.

وه‌کوو چۆن سوننه‌ت پێشه‌کی (واجب)ه بۆ زیاتر هاندان و هۆکاری حه‌قپێدانی واجبه‌کان دانراوه، ئه‌وه‌ی سوننه‌ت بکات به دڵنیاییه‌وه حه‌ق به واجبه‌کان ده‌دات.

وه ئه‌و (مکروه)ه‌ی که زانایان به‌کاریان هێناوه به‌گوێره‌ی به‌کارهێنانی قورئانه، که مه‌به‌ستی پێی حه‌رامه‌کانه: ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ٣٨﴾ [الإسراء : ٣٨].

وه له به‌کارهێنانی زانایانی پێشووشدا به مانای (حرام) به‌کار هاتووه و پێی وتراوه (كراهة التحريم) مه‌کروهی حه‌رام، به‌ڵام له زانایانی ئه‌م دواییه‌دا به (كراهة التنزيه) ناو براوه.

له قسه‌که‌ی (الطرطوشي) دا: «بدعة محدثة وإما محرمة وإما مكروهة»[1] یان (الشاطبي): «فَلَا بِدْعَةَ يُتَصَوَّرُ فِيهَا ذَلِكَ التَّقْسِيمُ أَلْبَتَّةَ، إِلَّا الْكَرَاهِيَةَ وَالتَّحْرِيمَ»[2]، وه (عز بن عبد السلام) کاتێك بیدعه ده‌کاته پێنج به‌شه‌وه و به‌شی چواره‌م و پێنجه‌م به (مكروه وحرام) ناو ده‌بات.

مه‌به‌ست له‌م جۆره به‌کارهێنانه‌ی زانایاندا بۆ دابه‌شکردنی بیدعه بۆ حه‌رام و مه‌کروه، دیاریکردنی پله‌وپایه‌ی بیدعه‌که‌یه له‌ڕووی حوکمه‌وه.

«بل المراد أن البدع ليست على مرتبة واحدة في الذم والذنب»[3].

واته: مه‌به‌ست پێی ئه‌وه‌یه بیدعه‌کان یه‌ك پله‌وپایه‌یان نییه له حوکم و هه‌ڕه‌شه‌دا.

**حه‌وته‌م:** داهێنراو له ڕووی پله و تاوانبارییه‌وه له دیندا دوو به‌شه:

١. بدعة الكبائر.

٢. بدعة الصغائر.

---

(١) "الحوادث والبدع" للطرطوشي ص١٩.

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢٤٦).

(٣) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٢٠٦).

**داهێنراوە (گەورەکان):** داهێنراوە قورس و گەورە گومڕاکانە کە بنەماکانی دین دەشێوێنێت، وەکوو: داهێنراوی فیرەقە ئیسلامییەکان لە (معتزلة وخوارج ورافضة وقدرية وتصوف الفلسفي ...)، نازناوی ئەمانە لای زانایان بیدعەکاران (أهل البدع)ە، یان حەڵاڵکردنی حەرامە گەورەکانە یان دەرچوونە لە فەرمانە گەورەکان (نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات ...) لەبەر گەیشتن بە قۆناغی (القطبية أو الغوثية) بەڕێوەبردنی کەونی و فریاکەوتن، وەکوو چوار قوتبە ناودارەکان (أقطاب الأربعة) ... یان گۆڕانکاری لە بەشی (ضروريات)دا کە هەموو بنەما قورسەکانی دین (أصول الدين)ی لەسەرە.

ئیمامی (الشاطبي) ﷀ دەڵێت: «مَا أَخَلَّ مِنْهَا بِأَصْلٍ مِنْ هَذِهِ الضَّرُورِيَّاتِ فَهُوَ كَبِيرَةٌ، وَمَا لَا، فَهُوَ صَغِيرَةٌ»(١).

واتە: ئەوەی گۆڕانکاری لە بنەماکانی (ضروريات) دا بکات گەورەیە، وە ئەگەرنا بچوکە.

ئەمەش هەیە پێی دەردەچێت لە دین و هەیە پێی دەرناچێت(٢).

**داهێنراوی (بچووک):** ئەو داهێنراوانەن کە لە ئاستی گەورەکان دا بچووکن لە ڕووی پەیوەندیبوونی بە بنەما و داواکارییە گەورەکانی دین و زەرەر و زیانەکانی لەسەر دین و موسڵمانان، وەکوو: خەتمکردن بۆ مردوو، شەوی (١٥)ی شەعبان کردنە عیبادەت و قورئانخوێندنی پێش نوێژی هەینی و هەڵسانی خەڵك بۆ دوو ڕکات نوێژی بەناو سوننەتی پێش جومعە ... .

بەڵام بچوك کردنەوەی بیدعەکەو بەکەم سەیرکردنی و دەرکردنی لە هەڕەشەکان و چاوپۆشیکردنی لێی مەبەست نیە لە وشەی (صغائر) بچوکەکان.

ئیمامی (الشاطبي) ﷀ دەڵێت: «اعْتِقَادُ الصَّغَائِرِ فِيهَا يَكَادُ يَكُونُ مِنَ الْمُتَشَابِهَاتِ، كَمَا صَارَ اعْتِقَادُ نَفْيِ الْكَرَاهِيَةِ التَّنْزِيهُ عَنْهَا مِنَ الْوَاضِحَاتِ»(٣).

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٤٠).

(٢) "حقيقة البدعة وأحكامها" لسعيد بن ناصر الغامدي (٢/ ٢١٠).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٤٦).

واتە: باوەڕبوون بەوەی بچووك لـە بیدعەدا هەیە جۆرێکە لـە هەڵە تێگەیشتن و (متشابهات)، لـەبەرئەوەی تۆمەتی بیدعە بچووك نابێتەوە، بەڵکوو پلـەکەیەتی، وەکوو باوەڕمان بەوە بوو (مکروە تنزیە)ی باش وایە نەکرێت لـە بیدعەدا ئاشکرایە نییە، واتە گومان دروست دەبێت لـە ناوبردنی بیدعە بە بچووك، وەکوو چۆن گومانمان نییە (مکروە) نییە لـە بیدعەدا.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «إِنَّ ذَلِكَ التَّفَاوُتَ لَا دَلِيلَ فِيهِ عَلَى إِثْبَاتِ الصَّغِيرَةِ مُطْلَقًا، وَإِنَّمَا يَدُلُّ ذَلِكَ عَلَى أَنَّهَا تَتَفَاضَلُ، فَمِنْهَا ثَقِيلٌ وَأَثْقَلُ وَمِنْهَا خَفِيفٌ وَأَخَفُّ، وَالْخِفَّةُ هَلْ تَنْتَهِي إِلَى حَدٍّ تُعَدَّ الْبِدْعَةُ فِيهِ مِنْ قَبِيلِ اللَّمَمِ؟ هَذَا فِيهِ نَظَرٌ»[١].

واتە: ئەو جیاوازییە بۆ (حرام ومکروە) بەڵگە نییە لـەسەر دانانی بچووك بە ڕەها لـە بیدعەدا، بەڵکوو ئەمە باس لـەوە دەکات جیاوازی هەیە لـەنێوان بیدعەکاندا، تیایەتی قورس و قورستر، وە سووك و سووکتر، ئاسان و ئاسانتر وە سووك و ئاسانەکەی ئایا دەگاتە ئاستی ئەوەی وەك تاوانە بچووکەکان پێی بوترێت بەس قابیلی لۆمەیە (اللمم)! ئەمە شوێنی تیڕوانینە کە بەو شێوەیە نابێت.

لـەبەرئەوەی لـە کەمترین بیدعەدا ئەو هەموو بۆنی تاوانانە بەدی دەکرێت لـە خاوەنەکەی و بیدعەکەیدا.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَلَا يَنْظُرْ إِلَى خِفَّةِ الْأَمْرِ فِي الْبِدْعَةِ بِالنِّسْبَةِ إِلَى صُورَتِهَا وَإِنْ دَقَّتْ، بَلْ يَنْظُرُ إِلَى مُصَادَمَتِهَا لِلشَّرِيعَةِ وَرَمْيِهَا لَهَا بِالنَّقْصِ وَالِاسْتِدْرَاكِ، وَأَنَّهَا لَمْ تُكَمَّلْ ... بِخِلَافِ سَائِرِ الْمَعَاصِي»[٢].

واتە: سەیری بچووکی بیدعەکە ناکرێت لـە ڕووی شێواز و ووردییەوە، بەڵکوو لـە ڕووی دژایەتیکردنی و بەکەمزانینی و ناتەواوی بۆ شەریعەت سەیری دەکرێت بە پێچەوانەی تاوانەکانەوە.

وە ئەگەر بیدعە بە بچووکیش ناوببرێت: «وَإِذَا قُلْنَا: إِنَّ مِنَ الْبِدَعِ مَا يَكُونُ صَغِيرَةً، فَذَلِكَ بِشُرُوطٍ:

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٤٤).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٤٦).

١. أَنْ لَا يُدَاوِمَ عَلَيْهَا، ... وَلِذَلِكَ قَالُوا: "لَا صَغِيرَةَ مَعَ إِصْرَارٍ، وَلَا كَبِيرَةَ مَعَ اسْتِغْفَارٍ"[١].

٢. أَنْ لَا يَدْعُوَ إِلَيْهَا ... .

٣. أَنْ لَا تَفْعَلُ فِي الْمَوَاضِعِ الَّتِي هِيَ مُجْتَمَعَاتُ النَّاسِ، أَوِ الْمَوَاضِعُ الَّتِي تُقَامُ فِيهَا السُّنَنُ، وَتُظْهَرُ فِيهَا أَعْلَامُ الشَّرِيعَةِ ... .

٤. أَنْ لَا يَسْتَصْغِرَهَا وَلَا يَسْتَحْقِرُهَا ... وَالِاسْتِهَانَةُ بِالذَّنْبِ أَعْظَمُ مِنَ الذَّنْبِ»[٢].

واتە: ئەگەر بیدعە بە بچوكیش ناو ببرێت ئەوا دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت ئەوكاتە بچوكە:

١. بەردەوام نەبێت لەسەری.

٢. بانگەوازی بۆ نەكات.

٣. لە شوێنە گشتییە بەتایبەت دینییەكان دا نەیكات.

٤. بەلایەوە بچووك نەبێت و بەكەم سەیری نەكات، بە سووك سەیركردنی تاوان گەورەترە لە تاوان.

وە دەڵێن: بچوك نییە لەگەڵ بەردەوامی و گەورەبوونیش نییە لەگەڵ داوای لێخۆشبوون.

ئەم هەموو جۆرە دابەشكردنە لە لایەنی زانایانەوە لەسەر داهێنراو بۆ زیاتر بەزانستیبوونی بابەتەكە و حەقپێدانی و چاورِۆشنی لەسەر قەبارەی هەڵە و تاوان تیایدا و رِێژەی ترسناكی لەسەر دین و خەڵكی و پارێزراوی لە زیادەرِەوی و كەمرِەوی لە حوكمدان بەسەر داهێنراوەكەدا هەیە، هەروەك چەند ترسناكی لەسەر بیدعە هەیە ئەوەندەش بەرپرسیارێتی لە ئاستی دژایەتی و حوكمدان بەسەر بیدعەكەدا هەیە، ئەمانە سیمای ئەهلی سوننەتن.

وەكو (ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «أَهْلُ السُّنَّةِ يَتَّبِعُونَ الْحَقَّ ... وَلَا يُكَفِّرُونَ مَنْ خَالَفَهُمْ فِيهِ، بَلْ هُمْ أَعْلَمُ بِالْحَقِّ وَأَرْحَمُ بِالْخَلْقِ، كَمَا وَصَفَ اللهُ بِهِ الْمُسْلِمِينَ بِقَوْلِهِ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ [آل عمران: ١١٠]»[٣].

---

(١) قول ابن عباس في "تفسير الطبري" رقم (٩٢٠٧)، وابن أبي حاتم في "تفسيره" رقم (٥٢١٧)، والبيهقي في "الشعب" رقم (٦٨٨٢) اسناده صحيح كما قال مشهورحسن، انظر هامشي "الاعتصام" (١/ ٣٩٠).

(٢) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥٥١ - ٥٥٧).

(٣) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٥/ ١٥٨).

واته: ئەهلی سوننەت شوێنکەوتەی حەقن، بەرانبەرەکانیان کافر ناکەن، بەڵکوو زاناترن بە حەق و بە بەزەییترن بەسەر خەڵکیدا، وەکوو خودا وەسفیان دەکات بە چاکترین کەسانێك بۆ خەڵکی.

## هۆکارەکانی جیاوازی پلەکانی بیدعە

**١.** داهێنراوەکان دەچنە ژێر باری جۆرەکانی حەرام و (منهیات) قەدەغەکراوەکانەوە، ئەوانیش بۆ خۆیان پلە و ئاستی جیاواز لەخۆ دەگرن.

**٢.** جیاوازی پەیوەندییەکانی داهێنراوەکان بە هەموو لایەکی دینەوە: هەیانە پەیوەندی بە (ضروريات)ەوەیە، ئەو پێنج پاراستنە دینییە: (الدين والنفس والنسل والعقل والمال) ئەمانەش لەناو خۆیاندا: «فَإِنَّ مِنَ الضَّرُورِيَّاتِ إِذَا تُؤُمِّلَتْ وُجِدَتْ عَلَى مَرَاتِبَ فِي التَّأْكِيدِ وَعَدَمِهِ: فَلَيْسَتْ مَرْتَبَةُ النَّفْسِ كَمَرْتَبَةِ الدِّينِ، ... وَمَرْتَبَةُ الْعَقْلِ وَالْمَالِ لَيْسَتْ كَمَرْتَبَةِ النَّفْسِ»[١].

واته: گەر سەرنج بدەین ئەمانەش لە یەك ئاستدا نین، لەبەرئەوە پاراستنی دین لەپێش نەفسەوەیە، نەفسیش لەپێش عەقڵ و ماڵەوەیە ... .

لە (حاجيات)یشدا هەیە ئەوانەی پێویستییەکانی ئەو پێنجەی پێشوو تەواو دەکات، وە لە (تحسينات)یشدا دەبێت، ئەو ووردەکارییانەی (حاجيات)ی پێ ڕازاوە و کامڵتر دەبێت، واتە داهێنراو هەموو لایەنەکان دەگرێتەوە.

**٣.** داهێنراوەکان لە باسە (عقيدة)ییە گەورەکاندا دروست دەبێت، وەکوو لە بوارە کردارییەکاندا کە دروست دەبێت، وەکوو فیرەقەکان، دەشێت لەسەر دەستی دوژمنێکی بێبڕوای تێکدەردا بە بەرگی دین دروست بکرێت، وەکوو (عبدالله ی کوڕی سبأ) دروستکاری ڕافیزەکانە، وەکوو (بابی و بەهائی) قادیانییەکان[٢] لەسەر دەستی بەکرێگیراوەکانی داگیرکەری ئینگلیزدا دروستکراوە، وەکوو (الباب حسين وميرزا حسين علي وغلام أحمد قادياني)، وەکوو (الإتحاد والحلول) لەسەر دەستی گومڕاکان دروستکراوە، وەکوو (الحلاج، ابن سبعين وفارابي ...).

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٥١٧).

(٢) "البهائية" لعبدالقادر شيبة ص١٩، "البهائية" لإحسان إلهي ظهير ص٢٦، "البابية" لإحسان إلهي ظهير ص٤٧.

وه جۆری قسه و بیرورِا داهێنراوه‌كان جۆراوجۆرن: (معتزلة)كان باشترن له ڕافیزه و خه‌واریج: «وَلَا ريب أَن الْمُعْتَزلَة خير من الرافضة وَمن الْخَوَارِج»[1].

وه (خه‌واریجه‌كان) دیندارترن تا ڕافیزه‌كان، وه (موعته‌زیله‌كان) عاقڵترن تا خه‌واریج و ڕافیزه و سوٚفییه‌كان.

كورته‌ی باسه‌كه: هه‌موو داهێنراوه‌كانی جۆری یه‌كه‌م له‌م دابه‌شكردنه‌دا (البدعة الحقيقية، الاعتقادية، الكلية، المكفرة، التعبدية، المحرمة، الكبائر) گه‌وره و ترسناك و قورسن له ئاستی دیندا، به‌شه دووه‌مه‌كانیان له‌چاو ئه‌مانه‌دا پله دوون و جۆرێكی تر مامه‌ڵه‌كاری ده‌وێت، ئه‌مه هۆكاری بینینی دوو هه‌ڵوێستی جیاوازن له فه‌رمووده‌ی هاوه‌ڵان و شوێنكه‌وتووان و زانایاندا، جارێك بۆ هه‌ندێك زۆر توندن و بۆ هه‌ندێك نه‌رمییه‌ك ده‌بینیت، به‌ڵام كه‌سی تێنه‌گه‌یشتوو له‌م بواره‌دا به هۆكاری نه‌بوونی ئه‌م ورده‌كارییه‌ی ده‌بێته هۆی تێنه‌گه‌یشتنی و هه‌ڵه‌كردن تیایدا.

  

---

(١) "دقائق التفسير" لابن تيمية (٢/ ١٤٤)، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ٩٧).

# دووەم : حوكمی بیدعەكار
# (حكم المبتدع)

ئەم بابەتە یەكێكە لە هەرە بابەتە ئاڵۆزەكانی حوكمدان لە نێوان زانایاندا، هۆكارەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی بابەتەكە لە نێوان مافی خوا وە مافی خەڵكیدا، هەروەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەكانیدا ئاماژەی بۆ دەكات دەفەرمووێت: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» لە ڕووی بیدعەكەوە هەموو بیدعەیەك گومڕاییەرو چاكەی تێدا نییە، وە دەفەرمووێت: «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»، وە «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»، وە هەر كارێك لە دیندا نەبوو ڕەت دەكرێتەوە، كارەكە لە ڕووی كار و داهێنراوەكەوە قابیلی وەرگرتن و قبوڵ نییە، ئەمە لە مافی دینی خوادا هیچ كارێك وەرناگیرێت، وە لە مافی خەڵكیشدا پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە (كل مبتدع ضال) هەموو بیدعەكارێك گومڕایە، یان كەسەكە ڕەت دەكرێتەوە، لەبەر هۆكاری بوونی عوزر و پاساوی زۆر بۆ خاوەنەكەی، وە دڵنیابوونی دینداریيەكەی ناسڕێتەوە بە گومان: (الْيَقِينَ لَا يَزُولُ بِالشَّكِّ)[1].

١. وە لە لایەكی ترەوە هەڕەشەكانی قورئان و فەرموودە لە بەرنامەی ئەهلی سوننەتدا پێی دەوترێت (الوعيد)، مەرج نییە وەكوو خۆی دابەزێتە سەر خاوەنەكەی: (فِي مَشِيئَةِ اللهِ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ) لە ویستی خوادایە یان لێخۆشبوونە بە هۆكارەكانەوە یان سزادان.

٢. وە لە حوكمیشدا بەسەر خەڵكیدا باشترە لایەنی لێبوردن و بەریبوون بگیرێتە بەر، وەكوو (الآمدي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «الْخَطَأَ فِي نَفْيِ الْعُقُوبَةِ أَوْلَى مِنَ الْخَطَإِ فِي تَحْقِيقِهَا»[2].

واتە: حاكمێك گەر هەڵە بكات لە دانەبەزینی سزایەك باشترە لەوەی سزایەك بە هەڵە بدات.

٣. وە بنەماش لە دیندا پاراستنی دینە و شوێنكەوتەیەتی بەبێ لادان ، وە بنەماش لە موسوڵماندا

---

(١) "الفقيه والمتفقه" للخطيب البغدادي (١/ ٥٢٧)، "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٦/ ٣٠٥)، "الأشباه والنظائر" لابن نجيم ص٤٧، "شرح القواعد الفقهية" لأحمد بن الشيخ محمد الزرقا ص٧٩.

(٢) "الإحكام في أصول الأحكام" للآمدي (٤/ ٢٦٣).

سەلامەتی و لانەدانیەتی: «الأَصْلُ فِي الْمُسْلِمِ الْعَدَالَة»[١]. تا بەڵگەی لەسەر دەبێت.

٤. وە بنەمای «الجرحُ لا يقبل إلا مفسراً»[٢]. ڕەخنە و تۆمەت وەرناگیرێت بێجگە لە ڕێی سەلماندن نەبێت، واتە هیچ تۆمەتێك قابیلی قبوڵ نییە لە دیندا بۆ كەسی موسڵمان، بەدەر لە ڕێگەی بەڵگەداری بوون نەبێت لەسەری.

٥. وە لەبواری (عقيدة)شدا خوێندنەوەی (الخوف والرجاء) بۆ كەسی دینداری بێ تۆمەت پێویستە، واتە ڕەچاوكردنی دوو لایەن لە كەسێكی دیاریكراودا لەڕووی چاكە و خراپەوە[٣].

ئەمانە و چەندەها خوێندنەوەی تر بەرپرسیاریەتییەكی گەورەی دینە لەسەر شانی خاوەن زانست، بۆ یەكلاكەرەوەی ناسین و حوكمی شەرعی كەسێكی موسڵمان لە بوارێك لە بوارەكانی دیندا، وەكوو ئەم بوارە هەستیارە كە بوارێكی تۆمەتباری دینییە كۆمەڵێك بابەتی گەورە بەدوای خۆیدا دەهێنێت وەكوو لەمەودوا باسی دەكەین.

## هۆكاری گرتنەبەری هەڵوێستی جیاواز بەرامبەر بیدعەكاران

گەر پێداچوونەوەیەك بكەین بەسەر هەڵوێستی زانایاندا سەبارەت بە بیدعەكاران، جیاوازییەكی زۆر دەبینین لە نێوانیاندا، لە ڕووە تێڕوانینەكان و كردارییەكانەوە، هەر لە بانگەوازییان و نەرمی نواندن و بەرپەرچدانەوەیان تا دەگاتە دژایەتیكردنیان و پچڕاندنی هەموو پەیوەندیەك و گەیشتنە هەموو ئاڵۆزییەك لەگەڵیاندا.

هۆكاری ئەمانە دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆكاری تایبەت:

**یەكەم:** جیاوازی پلە و ئاستی داهێنراوەكان.

**دووەم:** جیاوازی پلە و ئاستی بیدعەكاران.

**سێیەم:** ڕەچاو كردنی هێنانەدی سوودمەندییەكان.

---

(١) "التبصرة في أصول الفقه" للشيرازي ص٣٣٧، "فتاوى اللجنة الدائمة" (٢/ ٤٩)، "موقع الإسلام سؤال وجواب" للمنجد (٥/ ٢٧٨٣)، "فتاوى الرملي" لشهاب الدين الأنصاري (٤/ ١٥٠).

(٢) "مقدمة ابن صلاح" ص١٠٦.

(٣) ئەمە بۆ كەسی حوكومدەرە، بەڵام لە كاتی ئاگاداركردنەوەی خەڵكی گشتی دا بەسەریانەوە بە هیچ شێوەیەك باسی چاكەی بیدعەكاران ناكرێت، تا نەبێتە هۆكاری چاوپۆشی و دوورنەكەوتنەوە لە هەڵەكانیان.

**یەکەم: جیاوازی پلە و ئاستی داهێنراوەکان:**

لە بەشی حوکمی داهێنراوەکاندا ڕوونکردنەوەیەکی زۆر لەم بارەیەوە درا لەسەر جۆرەکانی داهێنراو، ئەمە هۆکاری سەرەکییە بۆ جیاوازی پلەکان، وە لە لایەکی تریشەوە بەرنامەی ئەهلی سوننەت خاوەنی خوێندنەوەی وورد و زانستی دینییە لەم بوارەدا، بە یەکێك لە کاملێەتی و لەخۆگری هەموو دین دادەنرێت.

(ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «أئمة السنة والجماعة وأهل العلم والإيمان فيهم العلم والعدل والرحمة فيعلمون الحق الذي يكونون به موافقين للسنة سالمين من البدعة، ويعدلون على من خرج منها ولو ظلمهم ... ويرحمون الخلق فيريدون لهم الخير والهدي والعلم لا يقصدون الشر لهم ابتداءً ... ولهذا كان أهل العلم والسنة لايكفرون من خالفهم وإن كان ذلك المخالف يكفرهم ... وكذلك التكفير حق الله تعالى فلا يكفر إلا من كفره الله ورسوله»[1].

واتە: زانایانی ئەهلی سوننەت خاوەنی زانست و دادپەروەری و بەزەیین، بەو حەقە ئاشنان سوننەت بپێکن و نەکەونە بیدعەوە، وە دادپەروەرن لە ئاستی کەسێك کە دەرچووە لەو بەرنامەیە ئەگەر ستەمیشیان لێ بکات، وە خاوەنی بەزەیین لە ئاستی خەڵکیدا، ویستی خێر و هیدایەت و زانستیان دەوێت بۆیان، مەبەستیان سەرەتا شەڕ نییە بۆیان، بۆیە زانایانی ئەهلی سوننەت دژەکانیان کافر ناکەن گەر ئەوان ئەمانیش کافر کەن ... بۆیە کافرکردن بە مافی خوا دەزانن، کەسێك خوا و پێغەمبەر ﷺ کافریان نەکەن ئەمان نایانکەن.

بەرنامەی کارنەکردن بە قورئان و فەرموودە گەر لەگەڵ عەقڵدا نەگونجێت، وەکوو ئەو بەرنامەیە نییە کارنەکردن بە قورئان بەبێ فەرموودە، ئەمەش وەکوو کارنەکردن بە فەرموودەی (الآحاد) لە (عقیدة) دا نییە، باوەڕنەبوون بە ناو و سیفاتەکانی خوا وەکوو (تأویل) مانا گۆڕین نییە لە هەندێکیدا، باوەڕنەبوون بە (القضاء والقدر) وەکوو قسەوتن بە هەندێك لە هاوەڵان نییە، کافرکردن و بە هەڵگەڕاوە دانانی هەموو هاوەڵان بێجگە لە هەندێکی کەم نەبێت وەکوو ڕەخنەگرتن نییە لە هەندێك هاوەڵان، گۆڕانکاری لە بنەماکانی دیندا وەکوو گۆڕانکاری نییە لە هەندێك شێوازی عیباداتدا ... .

---

(١) "الرد على البكري" لابن تيمية (٢/ ٤٩٠).

بەم شێوەیە هەموو جۆرەکانی داهێنراوو لادان وەکوو یەك نین، بۆیە حوکمەکانیشیان جیاوازە.

ئیمامی (النووي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَاعْلَمْ أَنَّ مَذْهَبَ أَهْلِ الْحَقِّ أَنَّهُ لَا يُكَفَّرُ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ بِذَنْبٍ وَلَا يُكَفَّرُ أَهْلُ الْأَهْوَاءِ وَالْبِدَعِ»(١).

واتە: بزانە بۆچوونی ئەهلی حەق کەس بێبڕوا ناکات لە موسڵمانان بە تاوانێك، وە کەس بێبڕوا ناکات لە بیدعەکاران.

الشَّيْخ (العثيمين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وبهذا علم أن المقالة أو الفعلة قد تكون كفراً أو فسقاً ولا يلزم من ذلك أن يكون القائم بها كافراً أو فاسقاً إما لانتفاء شرط التكفير أو التفسيق أو وجود مانع شرعي يمنع منه»(٢).

واتە: دەزانین هەر بۆچوونێك یان کارێك دەشێت کوفر و فاسقی بێت، بێبڕوایی و تاوانباری، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت خاوەنەکەی (کافر و فاسق) بێت، لەبەر نەبوونی هۆکاری مەرجەکانی تەکفیر و فاسقکردن تیایدا، یاخود بوونی هۆکاری ڕێگرییەکی شەرعی لە دابەزینی ئەو حوکمانە، وە هەروەها بیدعەش حوکمە و بە هەمان شێوەیە.

**دووەم: جیاوازی پلە و ئاستی بیدعەکاران:**

ئەمە شوێنی باس و خواسی زانایانی ووردبینە لە (فقه)دا، (علماء التحقيق) لە (علوم الحديث)دا (علماء الجرح والتعديل)یان پێ دەوترێت.

ئەمە کار لەسەر ناسینی کەسەکان دەکات، چەند جۆر و شێوە و سروشت و کار و چۆنیەتی ... ئادەمیزاد هەیە لەگەڵ ووردبینی تەواو بەسەریاندا، بە ڕوانگەی بەڵگە و بەرنامەی شەرعی ئەهلی سوننەت.

بۆیە زانایان هەندێکیان پێداگری دەکەن لەسەر سەلامەتی و هێشتنەوەی موسڵمان لە بازنەی دیندا، وە هەندێکیشیان پێداگری دەکەن لە پاراستنی دین و هێشتنەوەی وەکوو خۆی و نەهاتنە ناوەوەی هیچ زیاد و کەمییەك.

---

(١) "شرح النووي على مسلم" (١/ ١٥٠).

(٢) "المجلى في شرح القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنى" لابن العثيمين ص٣١٤.

لە ڕوانگەی ئەم دوو جۆرە خوێندنەوەیەدا (ابن القيم) رحمه الله بیدعەکاران دەکات بە چەند بەشێکەوە:

أَحَدُهَا: الْجَاهِلُ الْمُقَلِّدُ الَّذِي لَا بَصِيرَةَ لَهُ، فَهَذَا لَا يُكَفَّرُ وَلَا يُفَسَّقُ، وَلَا تُرَدُّ شَهَادَتُهُ، إِذَا لَمْ يَكُنْ قَادِرًا عَلَى تَعَلُّمِ الْهُدَى.

الْقِسْمُ الثَّانِي: الْمُتَمَكِّنُ مِنْ السُّؤَالِ وَطَلَبِ الْهِدَايَةِ، وَمَعْرِفَةِ الْحَقِّ، وَلَكِنْ يَتْرُكُ ذَلِكَ اشْتِغَالًا بِدُنْيَاهُ وَرِيَاسَتِهِ، وَلَذَّتِهِ وَمَعَاشِهِ وَغَيْرِ ذَلِكَ، فَهَذَا مُفَرِّطٌ مُسْتَحِقٌّ لِلْوَعِيدِ، آثِمٌ بِتَرْكِ مَا وَجَبَ عَلَيْهِ.

الْقِسْمُ الثَّالِثُ: أَنْ يَسْأَلَ وَيَطْلُبَ، وَيَتَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى، وَيَتْرُكَهُ تَقْلِيدًا وَتَعَصُّبًا، أَوْ بُغْضًا أَوْ مُعَادَاةً لِأَصْحَابِهِ، فَهَذَا أَقَلُّ دَرَجَاتِهِ: أَنْ يَكُونَ فَاسِقًا، وَتَكْفِيرُهُ مَحَلُّ اجْتِهَادٍ وَتَفْصِيلٍ، فَإِنْ كَانَ مُعْلِنًا دَاعِيَةً: رُدَّتْ شَهَادَتُهُ وَفَتَاوِيهِ[١].

١. نەزانێکی شوێنکەوتە هیچ چاوکراوەییەکی نییە، ئەمە حوکمی کوفر و فاسقی نادرێت بەسەریدا و شایەتیشی لیٚ وەردەگیرێت گەر توانای فێربوونی ڕێگەی هیدایەتەکەی نەبێت.

٢. کەسی دووەم توانای شارەزابوون و هیدایەت وەرگرتنی هەیە، بەڵام سەرقاڵە بە دونیا و خۆشییەکانییەوە، ئەمە کەمتەرخەمە و شایستەی هەڕەشەیە و تاوانبارە.

٣. دەگەڕێت پرسیار دەکات و بۆیشی ڕوون دەبێتەوە ڕێگاکە، بەڵام نایەوێت و وازی لیٚ دەهێنێت، لەبەر کوێرانە دواکەوتنی مەزهەبەکەی، یاخود لە ڕق و دژایەتی خاوەنەکانیدا، ئەم کەمترین پلەی فاسقە و تاوانبارە، بەڵام بێبڕواکردنی شوێنی تێڕوانین و ووردەکارییە، گەر بانگەوازکاری بوو بە ئاشکرا ئەوە شایەتی و قسەی لیٚ وەرناگیرێت.

لە ڕوانگەی ئەم دابەشکردنەوە پێشووە صاڵحەکان چەندین ڕێوشوێنیان گرتووەتە بەر لەگەڵیاندا، وەکوو[٢]:

---

(١) "الطرق الحكمية" ص١٤٦، ١٤٧.

(٢) بڕوانە "المبتدعة وموقف أهل السنة والجماعة منهم" لمحمد يسرى ص٢١٩، و "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٧/ ١٧٢).

**١.** جارێك بە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك و نەرم و نیانی لەگەڵیاندا، وەکوو ئیمام (أحمد) رحمه الله لەگەڵ ڕافیزە و مورجیئەکاندا کردوویەتی[١].

**٢.** بەرپەرچدانەوە و بەڵگە هێنانەوە لەسەریان، وەکوو (عبد الله ی کوڕی عەباس) رضي الله عنهما لەگەڵ خەواریجەکاندا بە فەرمانی (عەلی کوڕی ئەبو طالب) رضي الله عنه[٢].

**٣.** ڕێگری لە وتووێژکردن و دانیشتن لەگەڵیاندا ئەگەر سوودمەندی تێدا نەبوو، وە زیانی هەبوو، ئەمە قسەی ئەو زانایانە دەگرێتەوە کە دژایەتی بیدعەکارانیان کردووە بە پەراوێزکردنیان.

**٤.** بنەبڕکردنی شەڕیان و نەهێشتنی خراپەیان بە هەموو جۆرەکانی بەندکردن و لێدان و دوورخستنەوە، وەکوو (عومەری کوڕی خەتتاب) رضي الله عنه لەگەڵ (صبیغ بن عسل)ی عێراقیدا کردی[٣].

**٥.** شەڕکردن لەگەڵیان، ئەگەر کۆمەڵێکی گەورە بوون و خاوەن هێز بوون، وەکوو (عەلی کوڕی ئەبوطالب) رضي الله عنه لەگەڵ خەواریجەکان کردی[٤].

ئیمامی (الشاطبي) رحمه الله دەڵێت: «إِذَا ثَبَتَ أَنَّ الْمُبْتَدِعَ آثِمٌ؛ فَلَيْسَ الْوَاقِعُ عَلَيْهِ عَلَى رُتْبَةٍ وَاحِدَةٍ، بَلْ هُوَ عَلَى مَرَاتِبَ مُخْتَلِفَةٍ، وَاخْتِلَافُهَا يَقَعُ مِنْ جِهَاتٍ بِحَسَبِ النَّظَرِ الْفِقْهِيِّ، فَيَخْتَلِفُ مِنْ جِهَةِ كَوْنِ صَاحِبِهَا مُدَّعِيًا لِلاجْتِهَادِ أَوْ مُقَلِّدًا، وَمِنْ جِهَةِ وُقُوعِهَا فِي الضَّرُورِيَّاتِ أَوْ غَيْرِهَا، وَمِنْ جِهَةِ كَوْنِ صَاحِبِهَا مُسْتَتِرًا بِهَا أَوْ مُعْلِنًا، وَمِنْ جِهَةِ كَوْنِهِ مَعَ الدُّعَاءِ إِلَيْهَا خَارِجًا عَلَى غَيْرِهِ أَوْ غَيْرَ خَارِجٍ، وَمِنْ جِهَةِ كَوْنِ الْبِدْعَةِ حَقِيقِيَّةً أَوْ إِضَافِيَّةً، وَمِنْ جِهَةِ كَوْنِهَا بَيِّنَةً أَوْ مُشْكِلَةً، وَمِنْ جِهَةِ كَوْنِهَا كُفْرًا أَوْ غَيْرَ كُفْرٍ، وَمِنْ جِهَةِ الْإِصْرَارِ عَلَيْهَا أَوْ عَدَمِهِ، إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ»[٥].

واتە: کاتێ سەلماندمان بیدعەکار تاوانبارە، مانای ئەوە نییە تاوانەکە بە یەك پلە دائەبەزێتە سەری، چەند پلەیەکی جیاوازە:

(١) "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٦/ ١٩٧)، (١٠/ ٣٤١).

(٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (٧/ ٢٧٩).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٧/ ١٧٢)، و "الإصابة في تميز الصحابة" لابن حجر (٥/ ١٦٩).

(٤) "البداية والنهاية" لابن كثير (٧/ ٢٧٧).

(٥) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢١٦).

١. لـه ڕووی: خاوەنەکەی به پاساوی ئیجتیهاد دەیکات یا کوێرانه شوێنکەوتەیه.

٢. لـه ڕووی: ڕوودانی بیدعەکه لـه یەکێك لـه بوارەکانی (الضروريات والحاجيات، والتحسينات)وه بێت.

٣. لـه ڕووی: خاوەنەکەی به نهێنی دەیکات یا به ئاشکرا.

٤. لـه ڕووی: بانگەوازی بۆ دەکات یاخود نایکات.

٥. لـه ڕووی ئەوەی شۆڕشی لـەپێناوا دەکات یان نا.

٦. لـه ڕووی ئەوەی بیدعەی حەقیقییه یا زیادکراو (إضافي).

٧. لـه ڕووی ئەوەی داهێنراوەکه ئاشکرایه یا شاراوەیه.

٨. لـه ڕووی ئەوەی کوفره یا نا.

٩. لـه ڕووی ئەوەی بەردەوامه لـەسەری یا نا.

ئەمانه هەریەکەی شوێنی بۆچوون و ئیجتیهادی زانایانه لـەسەری، ئاستی بەرپرسیارێتی هەڵسەنگاندنی ئەمانه دەدرێته دەس زانایانی ڕۆچوو و کامڵ لـه بواره زانستییەکان، کەسی ساده و بێ عیلـم و سەرەتا ئەم مافەیان نییه، وەکوو چۆن لـه بواره دونیاییەکاندا به بڕوانامەی زانکۆکان نەبێت مافی کاره دونیاییەکانیان نییه لـەو بوارەدا، دین لـەپێشتره ئەم مافەی بۆ پارێزراو بێت، وه گەر بوونی دەسەڵاتی دینی هەبێت و قازی و زانا گەورەکان دەسەڵات دروستیان بکات لـه بواره شەرعییەکاندا به بەرنامەی پاکی قورئان و سوننەت؛ ئەوا کاری بەڕێوەچوونی دینی مسۆگەر دەبێت لـه ڕێڕەوی خۆیدا، وه گەر نا وەکو ئەمڕۆ ئەوا هەر «الرُّوَيْبِضَةُ»[1] یەك و «حُدَثَاءُ الأَسْنَانِ»[2] بێ قەدرێك و دان تازەیەك «يَتَكَلَّمُ فِي أَمْرِ الْعَامَّةِ»[3] قسه لـه کاری گشتیدا دەکەن و ماف به خۆیان

(١) رواه ابن ماجه (٤٠٣٦) وحسنه شعيب الأرنؤوط، وأحمد (٧٩١٢)، والبزار في "المسند" (٢٧٤٠)، وأبو يعلى في "المسند" (٣٧١٥)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٤٦٦)، والحاكم في "المستدرك" (٨٤٣٩)، وفي "ترتيب الأمالي الخميسية" للشجري برقم (٢٧٧٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٨٨٧)، و"صحيح الجامع الصغير" (٣٦٥٠).

(٢) رواه البخاري (٣٦١١)، وأبو داود (٤٧٦٧)، وأحمد (٣٨٣١)، وأبو يعلى في "المسند" (٥٤٠٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٦٧٨١).

(٣) رواه أحمد (٧٩١٢)، والبزار في "المسند" (٢٧٤٠)، وأبو يعلى في المسند (٣٧١٥)، والطحاوي في شرح مشكل الآثار (٤٦٦)، والحاكم في المستدرك (٨٤٣٩)، وفي "ترتيب الأمالي الخميسية" للشجري برقم (٢٧٧٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة"=

دەدەن لە دین و خەڵکدا ئەم مافە قسەی لەسەر بکەن و بەرهەمەکەی دووبەرەکایەتی و ستەم و ناشیرینکردنی سیمای دین و موسڵمانان و مایەی سوودمەندی دوژمنان و گومڕایانە.

ئەمانە و چەندەهای تر بەرهەمی تاڵی پەرتەوازەیی و بێ سەرەوبەرەیی موسڵمانانە، گەر (علماء الجرح والتعديل) مافی یەکلاکەرەوەیان هەبێت لەسەر پلەی فەرموودەیەك، وە (علماء المحقق) توانای یەکلاکردنەوەی حوکمێکی شەرعییان هەبێت، دەبێت زانایانی وردەکار لە بەرنامەی ئەهلی سوننەت خاوەنی ئەم بەرپرسیاریە بن، وە گەر نەبوو ئەوا کاری بانگەواز و بڵاوکردنەوەی و پەروەردەکردنی خەڵك لەسەر (منهج أهل السنة) پەکی نەکەوتووە و کاتی ئەوە نییە حوکمدان پێش بانگەواز بکەوێت.

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «وَمِمَّا يَنْبَغِي أَيْضًا أَنْ يُعْرَفَ أَنَّ الطَّوَائِفَ الْمُنْتَسِبَةَ إلَى مَتْبُوعِينَ فِي أُصُولِ الدِّينِ وَالْكَلَامِ: عَلَى دَرَجَاتٍ مِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ قَدْ خَالَفَ السُّنَّةَ فِي أُصُولٍ عَظِيمَةٍ وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إنَّمَا خَالَفَ السُّنَّةَ فِي أُمُورٍ دَقِيقَةٍ»[1].

واتە: پێویستە ئەوە بزانرێت ئەوانی شوێنکەوتەی ئەو فیرەقانەی قسەیان کردووە لەسەر بنەماکانی دین و خاوەنی قسەن، لەسەر چەن پلەیەکن، هەیانە پێچەوانەی سوننەتن لە بنەما گەورەکاندا، وە هەیانە پێچەوانەی سوننەتن لە کارە وردەکاندا.

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «وَلَا رَيْبَ أَنَّ الْمُعْتَزِلَةَ خَيْرٌ مِنْ الرَّافِضَةِ وَمِنْ الْخَوَارِجِ»[2].

واتە: گومان نییە (موعتەزیلە) عەقڵانیەکان باشترن تا ڕافیزە و خەواریج.

وە دەڵێت: «الرَّافِضَةِ وَنَحْوِهِمْ هُمْ شَرٌّ مِنْ الْخَوَارِجِ»[3].

واتە: (ڕافیزە) شەڕترە تا خەواریج.

وە دەڵێت: «وَالْأَشْعَرِيَّةُ خَيْرٌ مِنَ الْمُعْتَزِلَةِ وَالرَّافِضَةِ عِنْدَ كُلِّ مَنْ يَدْرِي مَا يَقُولُ، وَيَتَّقِي اللهَ

= (١٨٨٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٣٦٥٠).

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣٤٨).

(٢) "مجموع الفتاوى" (١٣/ ٩٧)، "دقائق التفسير" (٢/ ١٤٤).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٨/ ٤٩٤).

فِيمَا يَقُولُ»[(١)].

واته: (ئەشعەرییەکان) باشترن تا (موعتەزیلە)کان، ئەمە هەموو ئەو کەسانە دەیزانن کە دەزانن چی بڵێن.

وە دەڵێت: «سُئِلَ: عَنْ رَجُلٍ يُفَضِّلُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى عَلَى الرَّافِضَةِ؟ الْجَوَابُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ. كُلُّ مَنْ كَانَ مُؤْمِنًا بِمَا جَاءَ بِهِ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهُوَ خَيْرٌ مِنْ كُلِّ مَنْ كَفَرَ بِهِ؛ وَإِنْ كَانَ فِي الْمُؤْمِنِ بِذَلِكَ نَوْعٌ مِنْ الْبِدْعَةِ، سَوَاءٌ كَانَتْ بِدْعَةُ الْخَوَارِجِ وَالشِّيعَةِ وَالْمُرْجِئَةِ وَالْقَدَرِيَّةِ أَوْ غَيْرِهِمْ؛ فَإِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى كُفَّارٌ، كُفْرًا مَعْلُومًا بِالِاضْطِرَارِ مِنْ دِينِ الْإِسْلَامِ»[(٢)].

واته: پرسیار کرا: گاوور و جوولەکە باشترن یا ڕافیزەکان؟ وتی: هەرکەسێك موسوڵمان بێت باشترە لە بێبڕوا، گەر لە هەندێك بیدعەوە گلابێت.

وە دەڵێت: «ومن المعلوم في دين الإسلام أن اليهود والنصارى خير من الفلاسفة الخارجين عن الملل، وأصح عقلاً وديناً»[(٣)].

واته: ئاشکرایە لە ئیسلامدا گاوور و جوولەکە لە فەلسەفی و ئەستێرە پەرستەکان باشترن، خاوەن عەقڵێك و دینێکی پاکترن.

هەموو ئەم قسانەی ئیمام مەبەست پێی دوور و نزیکییە لە حەقەکەوە، گەرچی ڕەنگە هەریەکە لە بوارێکدا نزیکتر بێت لە حەقەکەوە، یا یەکێکی تریان، بە گشتی ئەوەی لایەنداری ئەهلی سوننەت دەکات و دیندارتر بێت لەپێشترە لەوانی تر، هەموو مامەڵەیەك لەگەڵیدا جیاوازتر دەبێت لە وەرگرتنی عیلم و ڕیوایەت و (الولاء والبراء)، وەك دەڵێت: «وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقَ الِاعْتِدَالِ عَظَّمَ مَنْ يَسْتَحِقُّ التَّعْظِيمَ، وَأَحَبَّهُ وَوَالَاهُ، وَأَعْطَى الْحَقَّ حَقَّهُ، فَيُعَظِّمُ الْحَقَّ، وَيَرْحَمُ الْخَلْقَ، وَيَعْلَمُ أَنَّ الرَّجُلَ الْوَاحِدَ تَكُونُ لَهُ حَسَنَاتٌ وَسَيِّئَاتٌ، فَيُحْمَدُ وَيُذَمُّ، وَيُثَابُ وَيُعَاقَبُ، وَيُحَبُّ مِنْ وَجْهٍ وَيُبْغَضُ مِنْ وَجْهٍ. هَذَا هُوَ مَذْهَبُ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ، خِلَافًا لِلْخَوَارِجِ وَالْمُعْتَزِلَةِ

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (١/ ٤٤٤).

(٢) "الفتاوى الكبرى" (٣/ ٥١٦)، "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣٥/ ٢٠١).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٩/ ٢٠٧).

وَمَنْ وَافَقَهُمْ»[(١)].

واتە: ئەوەی ڕێگای دادپەروەری بگرێت لەگەڵیاندا ئەوەی شایستەی ڕێز بێت خۆشی دەوێت و پشتگیری دەبێت، ماف دەدات بە خاوەنەکەی و بە بەزەیی دەبێت لەگەڵ خەڵکدا، وە کەسێك دەشێت چاکە و خراپەی هەبێت بە گوێرەی ئەوانە وەسف و زەم و پاداشت و سزا و خۆشەویستی لە ڕوویەکەوە و ڕقلێبوون لە ڕوویەکەوە دەیگرێتەوە، ئەمە بەرنامەی ئەهلی سوننەتە، بە پێچەوانەی خەوارج و موعتەزیلە و فیرەقەکانەوە.

**سێیەم: ڕەچاوکردنی هێنانەدی سوودمەندییەکان:**

ڕەچاوکردنی سوودمەندییەکان و هێنانەدییان وەکوو خۆیان بە مەرجی دروستنەبوونی خراپەکان و لەناوبردنیان، گرنگی ئەم کێشانە دەرنەچوونە لە بەڵگەکان و متمانەی سەرکەوتنی خێرەکان بەسەر شەڕدا و هێنانەدی سوودمەندییەکان.

بەتایبەت لەم بوارە هەستیارەدا کە مامەڵەیە لەگەڵ موسڵمانانێك بە یەقین لەناو بازنەی ديندان و لەلایەکی ترەوە نوێنەرایەتی حەقی ڕەسەنی دینی ... بەدەر لە بەرپرسیاریەتییەکی دوارۆژی دینی و دنیایی ... بۆیە:

**یەکەم:** دەبێت کەسانێك بەم کارە هەڵسن خاوەنی زانستییەکی تەواوی شەرعی و بەرنامەی ئەهلی سوننەت کامڵ و قووڵبونەوەی تەواویان تێدا هەبێت، لەبەرئەوەی گەر شکستی ببینن تیایدا بەتەواوی ئەم بەرنامە زانستییەی ئەهلی سوننەت زبر و نامۆ دەبێت و دوژمنانی سەرکەوتن بەدەست دێنن، وە ئەمەش هۆکاری وەستاوی و کاریگەری و وەرنەگرتنی تەواویەتی لای خەڵکی ... لەگەڵ وریایی و ئەگەرێکی زۆر بەکارهێنان تێیدا لای کەسانی خۆبەرەوپێش لەم بابەتەدا.

**دووەمیش:** دەبێت تێڕوانینێکی چڕوپڕ و زانستی بەکارهێنان لە هەموو هەڵسەنگاندن و هەڵوێستێك تیایدا، بۆ شارەزابوونی زیاتر لەم بوارەدا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ نوسراوەکانی (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر). بەتایبەت نوسینەکەی (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ کە تێیدا دەڵێت: «الْقَاعِدَةِ الْعَامَّةِ ": فِيمَا إِذَا تَعَارَضَتْ الْمَصَالِحُ وَالْمَفَاسِدُ وَالْحَسَنَاتُ وَالسَّيِّئَاتُ أَوْ تَزَاحَمَتْ؛ فَإِنَّهُ يَجِبُ تَرْجِيحُ الرَّاجِحِ مِنْهَا ... فَإِنَّ الْأَمْرَ وَالنَّهْيَ وَإِنْ كَانَ مُتَضَمِّنًا لِتَحْصِيلِ مَصْلَحَةٍ وَدَفْعِ

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٤/ ٥٤٣، ٥٤٤).

مَفْسَدَةٍ فَيُنْظَرُ فِي الْمُعَارِضِ لَهُ فَإِنْ كَانَ الَّذِي يَفُوتُ مِنْ الْمَصَالِحِ أَوْ يَحْصُلُ مِنْ الْمَفَاسِدِ أَكْثَرَ لَمْ يَكُنْ مَأْمُورًا بِهِ؛ بَلْ يَكُونُ مُحَرَّمًا إذَا كَانَتْ مَفْسَدَتُهُ أَكْثَرَ مِنْ مَصْلَحَتِهِ؛ لَكِنَّ اعْتِبَارَ مَقَادِيرِ الْمَصَالِحِ وَالْمَفَاسِدِ هُوَ بِمِيزَانِ الشَّرِيعَةِ ... فَإِنْ كَانَ الْمَعْرُوفُ أَكْثَرَ أَمَرَ بِهِ؛ وَإِنْ اسْتَلْزَمَ مَا هُوَ دُونَهُ مِنْ الْمُنْكَرِ. وَلَمْ يَنْهَ عَنْ مُنْكَرٍ يَسْتَلْزِمُ تَفْوِيتَ مَعْرُوفٍ أَعْظَمَ مِنْهُ ... وَإِنْ كَانَ الْمُنْكَرُ أَغْلَبَ نَهَى عَنْهُ؛ وَإِنْ اسْتَلْزَمَ فَوَاتَ مَا هُوَ دُونَهُ مِنْ الْمَعْرُوفِ. وَيَكُونُ الْأَمْرُ بِذَلِكَ الْمَعْرُوفِ الْمُسْتَلْزِمِ لِلْمُنْكَرِ الزَّائِدِ عَلَيْهِ أَمْرًا بِمُنْكَرِ وَسَعْيًا فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ. وَإِنْ تَكَافَأَ الْمَعْرُوفُ وَالْمُنْكَرُ الْمُتَلَازِمَانِ لَمْ يُؤْمَرْ بِهِمَا وَلَمْ يُنْهَ عَنْهُمَا. فَتَارَةً يَصْلُحُ الْأَمْرُ؛ وَتَارَةً يَصْلُحُ النَّهْيُ؛ وَتَارَةً لَا يَصْلُحُ لَا أَمْرٌ وَلَا نَهْيٌ حَيْثُ كَانَ الْمَعْرُوفُ وَالْمُنْكَرُ مُتَلَازِمَيْنِ؛ وَذَلِكَ فِي الْأُمُورِ الْمُعَيَّنَةِ الْوَاقِعَةِ.

وَأَمَّا مِنْ جِهَةِ النَّوْعِ فَيُؤْمَرُ بِالْمَعْرُوفِ مُطْلَقًا وَيَنْهَى عَنْ الْمُنْكَرِ مُطْلَقًا ... وَإِذَا اشْتَبَهَ الْأَمْرُ اسْتَبَانَ الْمُؤْمِنُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ الْحَقُّ؛ فَلَا يَقْدُمُ عَلَى الطَّاعَةِ إلَّا بِعِلْمِ وَنِيَّةٍ؛ وَإِذَا تَرَكَهَا كَانَ عَاصِيًا فَتَرْكُ الْأَمْرِ الْوَاجِبِ مَعْصِيَةٌ؛ وَفِعْلُ مَا نُهِيَ عَنْهُ مِنْ الْأَمْرِ مَعْصِيَةٌ. وَهَذَا بَابٌ وَاسِعٌ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إلَّا بِاَللَّهِ. وَمِنْ هَذَا الْبَابِ إقْرَارُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أبي ... فِي قِصَّةِ الْإِفْكِ»[١].

واتە: یاسای گشتی گەر سوودمەندییەکان و زەرەرۆمەندییەکان بەرانبەر یەك بوون؛ پێویستە لایەنی زۆرینە ڕەچاو بکرێت:

١. ئەگەر فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە سوودمەندی بەدەست هێنا و زەرەرۆمەندی ڕەواندەوە؛ سەیری دژەکەی بەرامبەری دەکەیت، گەر بە هۆکاریەوە سوودمەندی لە دەستچێت یاخود زەرەرمەندی زۆرتر دروست بێت، فەرمانی پێ ناکرێت، بەڵکوو حەرامە گەر خراپەی زۆرتر بوو لە چاکە.

٢. گەر چاکەی زۆر بوو فەرمانی پێ دەکرێت، ئەگەر کەمترین خراپەشی بەدوای خۆیدا هێنا.

٣. فەرمان بە لابردنی خراپەیەك نادرێت کە چاکەیەکی زۆری پێ لە دەست بچێت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" (٢٨/ ١٢٩ - ١٣٢)، رسالة "الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر" ص١٢ - ١٧.

**٤.** وە گەر خراپەکە زۆر بوو دژایەتی دەکرێت گەر چاکەیەکی کەمتری پێ لەدەست بچێت، گەر فەرمان بە چاکەیەك بدرێت خراپەیەکی زۆرتر بەدوای خۆیدا بهێنێت ئەوا فەرمان بە خراپەیە لە فەرمان شکاندنی خوا و پێغەمبەرەکەیدا کار دەکات.

**٤.** وە گەر چاکە و خراپە وەکوو یەك وەستان؛ ئەوا فەرمان بە چاکە ناکرێت و دژایەتی خراپەش ناکرێت.

هەندێك جار چاکە کاری تێدا دەکرێت، وە هەندێك جار لابردنی خراپە، وە هەندێك جار کار لە هیچیانا ناکرێت، گەر چاکە و خراپە پەیوەست بوون بە یەکەوە، بەڵام بەگوێرەی جۆر فەرمان بە چاکە دەکرێت بە گشتی و دژایەتی خراپە دەکرێت بە گشتی، وە گەر تێکەڵ بوو ئیماندار ڕادەوەستێت تاوەکوو بۆی یەکلا دەبێتەوە، نەکردنی واجب تاوانە و کردنی قەدەغەکراوەکان تاوانە، ئەمە دەرگایەکی فراوانە، هیچ توانا و گۆڕانکارییەك نییە بێجگە لای خوا، لەم ڕووەوە پێغەمبەر ﷺ لە درۆکەی بۆ خێزانەکەیان هەڵبەست مامەڵەی لەگەڵ (ابن سلول)دا کرد.

(عبدالمحسن العباد) دەڵێت: «ومن العلماء الذين مَضوا وعندهم خلل في مسائل من العقيدة، ولا يستغني العلماء وطلبة العلم عن علمهم، بل إنَّ مؤلَّفاتهم من المراجع المهمَّة للمشتغلين في العلم، الأئمة: البيهقي والنووي وابن حجر العسقلاني»[(١)].

واتە: ئەو زانایانەی ڕۆیشتوون هەڵە و لادانیان هەیە لە بواری (عەقیدە)دا، لەگەڵ ئەوەشدا زانایان و قوتابیانی عیلم ناتوانن دەستبەرداری عیلمەکانیان بن، بەڵکوو نووسراوەکانیان سەرچاوەی گرنگی سەرقاڵانی زانستن، وەکوو: (البیهقی والنووی وابن حجر وابن حزم والشاطبي وعز بن عبدالسلام والقرافي والقرطبي ... وە لە ڕوانگەی ڕیوایەتی فەرموودەکاندا ژمارەیەکی زۆر لەو ڕاویانەی لایەنگری بیروبۆچونی فیرەقەکان بوون لە (خوارج وقدرية ومرجئة والشيعة وأهل الزهد والأشاعرة...) زانایان نەیان هێشتووە ئەو ڕیوایەتانە لەدەست بچێت لە کەسانی کامڵ و دینداریانەوە، بە مەرجێك ئەو ڕیوایەتە پەیوەندی بە بیروبۆچوونە هەڵەکەیەوە نەبێت و بانگخوازی نەبێت.

---

(١) "رفقا أهل السنة بأهل السنة" لعبد المحسن العباد ص٢٠.

ئیمامی (الذهبي) ﷀ دەڵێت: «البدعة على ضربين: فبدعة صغرى كغلو التشيع، أو كالتشيع بلا غلو ولا تحرف، فهذا كثير في التابعين وتابعيهم مع الدين والورع والصدق. فلو رد حديث هؤلاء لذهب جملة من الآثار النبوية، وهذه مفسدة بينة»[(١)].

واتە: بیدعە دوو جۆرە: بیدعەی بچووك، وەکوو: زیادەڕەوی لە شیعەگەرێتیدا، یا بێ زیادەڕەوی و لادان، ئەمانە زۆر بوون لە تابیعییەکاندا کەسانی خاوەن وەرع و دین و ڕاستگۆ بوون ئەگەر ڕیوایەتەکانی ئەمانە ڕەت بکرێتەوە؛ ئەوا زۆرێك لە فەرموودەکان لەدەست دەردەچێت، ئەمە زەرەرۆمەندییەکی زۆرە.

(ابن تيمية) ﷀ دەڵێت: «كَانَ الْإِمَامُ أَحْمَد وَأَكْثَرُ مَنْ قَبْلَهُ وَبَعْدَهُ مِنْ الْأَئِمَّةِ: كَمَالِكٍ وَغَيْرِهِ لَا يَقْبَلُونَ رِوَايَةَ الدَّاعِي إلَى بِدْعَةٍ وَلَا يُجَالِسُونَهُ بِخِلَافِ السَّاكِتِ وَقَدْ أَخْرَجَ أَصْحَابُ الصَّحِيحِ عَنْ جَمَاعَاتٍ مِمَّنْ رُمِيَ بِبِدْعَةٍ مِنْ السَّاكِتِينَ»[(٢)].

واتە: ئیمام (ئەحمەد)و زۆری پێشووەکانی و ئەوانەی لە دوای ئەوەوە بوون وەکوو ئیمام (مالیك)؛ ڕیوایەتی بانگخوازیان بۆ بیدعەکەی وەرنەگرتووە، بە پێچەوانەی بێدەنگەکانەوە کە خاوەن (صحيح)ەن لە فەرموودەدا زۆر فەرموودەیان لەوانە گێڕاوەتەوە بیدعەیان خراوەتە پاڵ، بەڵام بێدەنگ بوون.

(ابن كثير) ﷀ دەڵێت: «المبتدع إن كفر ببدعته، فلا إشكال في رد روايته. وإذا لم يكفر، فإن استحل الكذب رُدت أيضاً»[(٣)].

واتە: بیدعەکار گەر بێبڕوا بوو بە بیدعەکەی گومان نیە لە وەرنەگرتنی ڕیوایەتەکانی دا، وە گەر پێی بێبڕوا نەبوو وە درۆی بە حەڵاڵ نەزانی وەردەگیرێت، وە بە پێچەوانەوە وەرناگیرێت.

(ابن تيمية) ﷀ دەڵێت: «فَإِذَا تَعَذَّرَ إقَامَةُ الْوَاجِبَاتِ مِنْ الْعِلْمِ وَالْجِهَادِ وَغَيْرِ ذَلِكَ إلَّا بِمَنْ فِيهِ بِدْعَةٌ مَضَرَّتُهَا دُونَ مَضَرَّةِ تَرْكِ ذَلِكَ الْوَاجِبِ: كَانَ تَحْصِيلُ مَصْلَحَةِ الْوَاجِبِ مَعَ مَفْسَدَةٍ

---

(١) "ميزان الاعتدال" للذهبي (١/ ٥)، "فتح المغيث بشرح ألفية الحديث للعراقي" للسخاوي (١/ ١٥).

(٢) "مجموع الفتاوى" (٢٤/ ١٧٥)، "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٤/ ٦٠٢).

(٣) "الباعث الحثيث إلى اختصار علوم الحديث" ص٩٩.

مَرْجُوحَةٍ مَعَهُ خَيْرًا مِنْ الْعَكْسِ»[١].

واتە: ئەگەر زانستێك یا جیهادێك بە دەست نەهات بێجگە لەسەر دەستی کەسێك نەبێت کە بیدعەی تێدا بەدی دەکرا زیانەکەی کەمتر بوو لە چاو لە دەستچوونی ئەوا واجبە، ئەوا بەدەست هێنانی ئەو واجبە لەگەڵ بوونی زەرەرێکی کەمدا خێر و چاکترە تا پێچەوانەکەی. لەگەڵ ئەمانەشدا ڕەچاوی سوودمەندە دینییەکان کراوە، ڕەچاوی لایەنی بەرامبەریش کراوە لە دژایەتیکردنیان و ناوبردنیان و ئاگادارکردنەوەی موسڵمانان لێیان، بە دوورکەوتنەوە و پەراوێزکردنیان، وەکوو هۆکارێکی کاریگەر بۆ گەڕاندنەوەیان و هۆش هێنانەوەیان لەسەر بۆچوونە هەڵەکانیان.

## پەراوێزکردنی بیدعەکار
## (هجر المبتدع)

یەکێك لە ڕێگە چارەسەرەکان بۆ بنەبڕکردن و بەربەستێك لە بەردەم بیدعە و بیدعەکاراندا لە بڵاوبوونەوە و گەشەکردن؛ پەراوێزکردنیانە، بۆ (ئاگادارکردنەوەی موسڵمانان لە ترسناکی بیدعە و سنووردارکردنی و بچووکبوونەوەی بیدعەکار، تاوەکوو شەڕی کەمتر بێت و پیاچوونەوەی خۆی بکات، وە زیندووکردنەوە و بەکارخستنی بنەمای (الولاء والبراء)، سیمایەکی عەقیدەیی دیارە بۆ پاراستنی کرۆکی ئیسلام و گەڕاندنەوە سەر سوننەت و پەیوەستبوون پێوەی، ئەمە ئەو سنوورەیە کە دوژمنان دەیانەوێت بیشکێنن بەناوی (الحاجز النفسي، التسامح، نبذ الشذوذ، التطرف، الإنسانية)، تاوەکوو موسڵمانی خاوەن بەرنامە و دینی تایبەتمەندی دەرکەوتوو بتوێننەوە لەگەڵ چواردەوری بەتاڵ و گومڕاییدا، وە جارێکی تریش ونی بکەن لەگەڵ گومڕاییە ناوخۆییەکانیشدا لە فیرقە دەستکرد و داهێنراوەکاندا[٢].

مەرجەکانی هەڵسان بەم کارەش (الإخلاص والمتابعة) نیەت پاکی بۆ خوا مەبەستی خۆیەتی و هەوا و حەزی خۆی تێدا نەبێت، شتە دەرەکییەکانی تێکەڵ نەکات و بەڵگەداری و پەیوەستبوون بە بنەما و یاسا شەرعییەکانەوە مەرجی دووەمە، بێگومان ئەم دوو مەرجە بوونی نییە بێجگە لەناو

---

(١) "مجموع الفتاوى" (٢٨/ ٢١٢).

(٢) بڕوانە "هجر المبتدع" لبكر أبو زيد ص٢ - ٦.

کەسانی خاوەن زانستی قوڵی شەرعی و بەتەمەن و تێگەیشتوو لە مەبەستە شەرعییەکاندا نەبێت، تاوەکوو لە ڕووکەشی بەناو زانستی و هەواوئارەزووی گەنجانە و بێ ئەزموونی کە هۆکار و مایەی شکستییە دووربێت.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَإِنَّ أَقْوَامًا جَعَلُوا ذَلِكَ عَامًّا فَاسْتَعْمَلُوا مِنْ الْهَجْرِ وَالْإِنْكَارِ مَا لَمْ يُؤْمَرُوا بِهِ فَلَا يَجِبُ وَلَا يُسْتَحَبُّ وَرُبَّمَا تَرَكُوا بِهِ وَاجِبَاتٍ أَوْ مُسْتَحَبَّاتٍ وَفَعَلُوا بِهِ مُحَرَّمَاتٍ. وَآخَرُونَ أَعْرَضُوا عَنْ ذَلِكَ بِالْكُلِّيَّةِ»[(١)].

واتە: کەسانێك بە شێوەیەکی ڕەها ئەنجامیاندا بووە هۆکاری پەراوێزکردن و دژایەتیکردنی ئەوەی کە فەرمانی لەسەر نییە، نە بە شێوەی واجب نە بەشێوەی سوننەت، بووە هۆکاری نەمانی هەندێك لە واجب و سوننەتەکان و کەوتنە حەرامەکانەوە، وە هەندێکیشیان ئەنجامیان نەدا. ئەم کارە کاری هەموو کەسێك نییە دوو سوننەت جێبەجێ بکات، یا لای مامۆستا و مزگەوتێك بێت بانگەوازی بەرنامەی سوننەت بکات ئیتر وابزانێت خۆیان خاوەن حەقن و بێجگە لەوان لەسەر بەتاڵە، دەشێت ئەمان هەندێك لادانی ئاشکرا یا نهێنییان هەبێت لەسەر بەرنامەکە شایستەی پەراوێز و ئاگادارکردنەوە بن، سەنگی مەحەك تەرازووی بەڵگە و بنەما شەرعییەکانە، مەبەستیش لەم کارە (ابن عبد البر) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لَا هِجْرَةَ إِلَّا لِمَنْ تَرْجُو تَأْدِيبَهُ بِهَا أَوْ تَخَافُ مِنْ شَرِّهِ فِي بِدْعَةٍ أَوْ غَيْرِهَا»[(٢)].

واتە: پەراوێزکردن بۆ دوو کەسە: یەکێك هیوای تەمێکردنی تێدا بەدی بکرێت، یاخود لە ترسی تووشبونی خراپەی بیدعەکەی لە ئەنجامی تێکەڵیدا، وە دەبێت بە گوێرەی پێویست و قەبارە و ڕێژەی کارەکە و کەسەکە بێت، وەکوو دەرمان وایە.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَيَكُونُ هِجْرَانُهُ دَوَاءً لَهُ بِحَيْثُ لَا يَضْعُفُ عَنْ حُصُولِ الشِّفَاءِ بِهِ، وَلَا يَزِيدُ فِي الْكَمِّيَّةِ وَالْكَيْفِيَّةِ عَلَيْهِ فَيُهْلِكَهُ، إِذِ الْمُرَادُ تَأْدِيبُهُ لَا إِتْلَافُهُ»[(٣)].

واتە: دەبێت پەراوێزکردن دەرمان بێت، بە شێوەیەك شیفا بەدەستهێنەر بێت و زیاد نەبێت لە ڕێژە و چۆنێتی پێویست بۆی تا ببێتە هۆکاری تیاچوونی، مەبەست پێی تەمێکردنیەتی نەك تیابردنی.

---

(١) "مجموع الفتاوى" (٢٨/ ٢١٣).

(٢) "التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد" (٦/ ١١٩).

(٣) "زاد المعاد في هدي خير العباد" (٣/ ٥٠٦).

وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ (کەعبی کوڕی مالیك) و دوو هاوەڵەکەی بۆ ماوەی پەنجا ڕۆژ پەراوێز کرد، وە (عومەری کوڕی خەتاب) ﷺ (صبیغ)ی سالێك پەراوێز کرد.

وە ئەبێت کێ بێت ئەوەی پەراوێز دەکرێت؟! دەبێت کەسی دیار و بانگخوازیان و ئاشکراکاریان دژایەتی و پەراوێز بخرێت، بەڵام کەسی نەزان و بێ عیلم و شوێنکەوتەی کوێرانە ناچێتە ژێر ئەو بارەوە، لەبەرئەوەی زیانی زیاتر دەبێت بۆی.

(ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «رَأَى الْمُسْلِمُونَ أَنْ يَهْجُرُوا مَنْ ظَهَرَتْ عَلَيْهِ عَلَامَاتُ الزَّيْغِ مِنْ الْمُظْهِرِينَ لِلْبِدَعِ الدَّاعِينَ إلَيْهَا وَالْمُظْهِرِينَ لِلْكَبَائِرِ فَأَمَّا مَنْ كَانَ مُسْتَتِرًا بِمَعْصِيَةٍ أَوْ مُسِرًّا لِبِدْعَةٍ غَيْرِ مُكَفِّرَةٍ فَإِنَّ هَذَا لَا يُهْجَرُ وَإِنَّمَا يُهْجَرُ الدَّاعِي إلَى الْبِدْعَةِ؛ إذْ الْهَجْرُ نَوْعٌ مِنْ الْعُقُوبَةِ وَإِنَّمَا يُعَاقَبُ مَنْ أَظْهَرَ الْمَعْصِيَةَ قَوْلًا أَوْ عَمَلًا»[(١)].

واتە: ڕای موسڵمانان وایە کەسێك پەراوێز دەخرێت کە نیشانەکانی گومڕایی و ئاشکراکاری بیدعە و تاوانە گەورەکان کاری بێت، بەڵام ئەوەی بە نهێنی تاوان و بیدعەی بچووك بکات ئەمانە پەراوێز ناخرێن، کەسێك دەیگرێتەوە بانگخوازی بیدعەکە بێت، لەبەر ئەوەی پەراوێز سزایە، وە سزاش بۆ کەسێکە بە ئاشکرا تاوانی قسە و کردار بکات.

وە ئەگەر کاریگەری نەبوو لەسەر بیدعەکارەکە (ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «وَإِنْ كَانَ لَا الْمَهْجُورُ وَلَا غَيْرُهُ يَرْتَدِعُ بِذَلِكَ بَلْ يُزِيدُ الشَّرَّ وَالْهَاجِرُ ضَعِيفٌ بِحَيْثُ يَكُونُ مَفْسَدَةُ ذَلِكَ رَاجِحَةً عَلَى مَصْلَحَتِهِ لَمْ يَشْرَعْ الْهَجْرُ؛ بَلْ يَكُونُ التَّأْلِيفُ لِبَعْضِ النَّاسِ أَنْفَعَ مِنْ الْهَجْرِ. وَالْهَجْرُ لِبَعْضِ النَّاسِ أَنْفَعُ مِنْ التَّأْلِيفِ؛ وَلِهَذَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَأَلَّفُ قَوْمًا وَيَهْجُرُ آخَرِينَ»[(٢)].

واتە: ئەگەر پەراوێزکرا و تەمێ نەبوو بەڵکوو شەڕی زۆرتر بوو، وە ئەوەی هەڵدەستێت بەم کارە لاواز بوو، زەرەری زیاتر بوو بەرامبەر سوودی؛ ئەوا ئەم کارە ناکرێت، بەڵکوو دڵڕاگرتنیان سوودی زیاترە تا پەراوێزکردنیان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دڵی هەندێکی ڕادەگرت و هەندێکی پەراوێز دەکرد.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٤/ ١٧٥).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٨/٢٠٦).

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «وَهَذَا الْهَجْرُ يَخْتَلِفُ بِاخْتِلَافِ الْهَاجِرِينَ فِي قُوَّتِهِمْ وَضَعْفِهِمْ وَقِلَّتِهِمْ وَكَثْرَتِهِمْ»[(١)].

وە دەڵێت: «وَلِهَذَا كَانَ يُفَرِّقُ بَيْنَ الْأَمَاكِنِ الَّتِي كَثُرَتْ فِيهَا الْبِدَعُ كَمَا كَثُرَ الْقَدَرُ فِي الْبَصْرَةِ وَالتَّنْجِيمُ بِخُرَاسَانَ وَالتَّشَيُّعُ بِالْكُوفَةِ وَبَيْنَ مَا لَيْسَ كَذَلِكَ وَيُفَرِّقُ بَيْنَ الْأَئِمَّةِ الْمُطَاعِينَ وَغَيْرِهِمْ»[(٢)].

واتە: ئەم پەراوێزکردنە دەگۆڕێت بەگوێرەی کەسەکان، لە ڕووی توانا و لاوازییان و کەم و زۆریانەوە، وە جیاوازی دەبێت لە نێوان شوێنەکاندا، وەکوو (بەسرە) زۆری قەدەرییەکان بوو، وە (خوراسان) ئەستێرەناس بوون، وە (کووفە) زۆری شیعە بوون، وە ئەو شوێنانەی جیاوازن لەمەوە، جیاوازی دەکرێت لەنێوان ئەو ئیمانەیان، گوێیان لێ دەگیرێت و ئەوانەی لەمانەوە جیاوازن.

## وتە و ئاگادارکردنەوەی زانایان و خواناسان لەسەر بیدعەکاران

ئیمامی (فضيل بن عياض وإبراهيم بن ميسرة) رَحِمَهُمَاٱللَّهُ دەڵێن: «**من عظم صاحب بدعة فقد أعان على هدم الإسلام**»[(٣)].

واتە: ئەوەی ڕێز لە بیدعەکار بگرێت ئەوە یارمەتی دەرە بۆ ڕووخاندنی ئیسلام.

ئیمامی (مُسْلِمُ بْنُ يَسَارٍ) ﷺ دەڵێت: «**لَا تُمَكِّنْ صَاحِبَ بِدْعَةٍ مِنْ سَمْعِكَ فَيَصُبُّ، فِيهَا مَا لَا تَقْدِرُ أَنْ تُخْرِجَهُ مِنْ قَلْبِكَ**»[(٤)].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٨/ ٢٠٦).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٨/ ٢٠٦، ٢٠٧).

(٣) "الابانة الصغرى" لابن بطة ص١١٣ – ١٥٩، و "شرح السنة" للبربهاري ص١٣٧، و "تحريم النظر في كتب الكلام" لابن قدامة ص٣٤، وهذا قول النبي ﷺ الذي رواه ابن عدي (٢/ ٣٢٤)، وابن عساكر (١٤/ ٤)، والهروي في "ذم الكلام" ص٢١٩، وابن حبان في "المجروحين" (١/ ٢٣٥ – ٢٣٦)، وابن الجوزي في "الموضوعات" (١/ ١٩٩) من حديث عائشة رضي الله عنها.

(٤) "الابانة" لابن بطة (٤٣٦).

واتە: گوێ مەگرە لـە بیدعەکارێك کە کارێك بخاتە دڵتەوە بۆت دەرنەیەتەوە.

(يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «إِذَا لَقِيتَ صَاحِبَ بِدْعَةٍ فِي طَرِيقٍ فَخُذْ فِي طَرِيقٍ غَيْرِهِ»[1].

واتە: گەر بیدعەکارێك ڕێگەیەکی گرتەبەر بۆ ڕۆیشتن؛ تۆ ڕێگەیەکی تر بگرە.

(حَسن البَصْري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لَا تُجَالِسُوا أَصْحَابَ الْأَهْوَاءِ، وَلَا تُجَادِلُوهُمْ، وَلَا تَسْمَعُوا مِنْهُمْ»[2].

واتە: لـەگەڵ بیدعەکاراندا دامەنیشن و بەرپەرچیان مەدەنەوە و گوێیان لـێ مەگرن.

(قتادة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا ابْتَدَعَ بِدْعَةً يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُذْكَرَ حَتَّى تُحْذَرَ»[3].

واتە: پێویستە هەرکەسێك کە بیدعەیەك دەکات باس بکرێت، تاکوو خۆیانی لـێ بپارێزن.

(عبدالله بن مبارك) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَإِيَّاكَ أَنْ تَجْلِسَ مَعَ صَاحِبِ بِدْعَةٍ»[4].

واتە: ئاگادار بە دانەنیشیت لـەگەڵ خاوەن بیدعەدا.

(بشر بن الحارث) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لَا تُجَالِسُوهُمْ وَلَا تُكَلِّمُوهُمْ وَإِنْ مَرِضُوا فَلَا تَعُودُوهُمْ، وَإِنْ مَاتُوا فَلَا تَشْهَدُوهُمْ»[5].

واتە: لـەگەڵیان دامەنیشن و قسەیان لـەگەڵدا مەکەن و نەخۆش بوون مەڕۆن بۆ سەردانیان و لـەگەڵیان مەڕۆن بۆ گۆڕستان.

---

(١) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢٥٩)، و "الشريعة" للآجري (١/ ٦٤).

(٢) "سنن الدارمي" (٤١٥)، و "الابانة" لابن بطة (٣٩٥)، و "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢٤٠)، و "شعب الإيمان" للبيهقي (٩٠٢١)، و "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (١٨٠٣)، و "ذم الكلام وأهله" للهروي (٧٥٤).

(٣) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢٥٦)، و "الكفاية في علم الرواية" لخطيب البغدادي ص٤٤.

(٤) "حلية الأولياء وطبقات الأصفياء" لأبو نعيم (٨/ ١٦٨)، و "الشريعة" للآجري (١/ ٦٤)، و "الابانة" لابن بطة (٤٥٢)، و "شعب الإيمان" للبيهقي (٩٠٣٦).

(٥) "السنة" لعبدالله بن أحمد (٦١)، و "معارج القبول بشرح سلم الوصول" للحافظ الحكمي (١/ ٢٧٥).

ئەمانە چمکێکە لە قسە و ئامۆژگارییەکانی زانایان و خواناسانی ئەهلی سوننەت، بەڵام پێویستە وەکوو لەمەوپێش باسکرا کێ فەرمان بە چاکە دەدا و ڕێگری لە خراپە دەکات (آمر وناهي) هەڵسێت بەم کارە، وە چەندە بکرێت، وە چۆن لەگەڵ گۆڕانکارییەکانیان مامەڵە بکرێت، وە ئەو بیدعانەی دژایەتییان دەکرێت کامانەن، هەموو ئەمانە ئاماژەی پێ دراوە لەمەوپێش، بەڵام ئەوەی ماوەتەوە و شوێنی سەرنجە لەم قسانە ئەوەیە کە:

خاوەنی ئەم قسانە ناوی خاوەنەکانیانی لەگەڵدا بوو، وە بەوانەیان وتووە کە دیار و ناسراو و دەرکەوتوو و بانگخوازان بوون، وە لە سەردەمێکدا ئەم کەسانە ژیاون هەزار ساڵ لەمەوپێش دەبێت، وە ئەم فەتوایانەیان بە ئیجتیهادی خۆیان داوە بۆ سەردەمی خۆیان، کە زیاتر لە هەزار ساڵ لەمەوپێش دەبێت، وە ئەو کاتەش ئاستی دینداری خەڵك پاك بوون و بەرنامەی ئەهلی سوننەت باڵادەست بووە و بیدعە و گومڕاییەکان سەرەتای بوونیان بووە و بیدعەکانیش بیدعەی گەورەن لە (عەقیدە) و بنەماکاندا، بیدعەکاران نامۆ بوون و دەسەڵاتی دەوڵەت دەسەڵاتێکی دینی بووە، هەموو کۆمەڵگە و دەسەڵات لە پشتی ئەمان بوون، دینداری و ناخی موسوڵمانان پاك بووە، ناوی باڵادەست لای خەڵکی ناوی زانایان و ناودارانی ئەهلی سوننەت بووە، بۆیە سەرانی بیدعەکارانیش کەسانی نامۆ و بێ قەدر بوون، بۆیە خۆیان دەخستە پاڵ ناوی زانایانی ئەهلی سوننەت.

(سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ) ﷬ دەڵێت: «أَنَّ عَمْرَو بْنَ عُبَيْدٍ سُئِلَ عَنْ مَسْأَلَةٍ، فَأَجَابَ فِيهَا، وَقَالَ: هُوَ مِنْ رَأْيِ الْحَسَنِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: إِنَّهُمْ يَرْوُونَ عَنِ الْحَسَنِ خِلَافَ هَذَا. فَقَالَ: إِنَّمَا قُلْتُ لَكَ هَذَا مِنْ رَأْيِي الْحَسَنِ؛ يُرِيدُ نَفْسَهُ»[1].

واتە: پرسیار لە (عەمری کوڕی عوبەید) ناوداری (موعتەزیلە)کان دەکرا، بەم شێوەیە وەڵامی دەدایەوە: ئەمە ڕای (الحسن)ە، وتیان: خۆ بە پێچەوانەوە لە (حەسەنی بەصری) دەگێڕنەوە! بۆ ڕاستکردنەوەی خۆی دەیوت: من دەڵێم ئەم ڕایەم پێ باشە (الحسن)ە.

بۆیە (حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ) دەیوت: «لَا تَأْخُذْ عَنْ هَذَا شَيْئًا فَإِنَّهُ يَكْذِبُ عَلَى الْحَسَنِ»[2].

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢١٩)، "تاريخ الإسلام ووفيات المشاهير والأعلام" للذهبي (٩/ ٢٣٩)، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (٦/ ١٧٥)، و "ميزان الاعتدال في نقد الرجال" للذهبي (٣/ ٢٧٣).

(٢) "السنة" لعبدالله بن أحمد (٩٦٨)، "معارج القبول بشرح سلم الوصول" للحافظ الحكمي (٣/ ٩٤٤)، "الابانة" لابن بطة =

واتە: (عەمر) عیلمی لیّ وەرناگیریّت، درۆ دەكات بەناوی (حەسەنی بەصری)ەوە.

بە كرداریش زانایان ئەوەی دەیگێڕنەوە ئەوەیە كە سەرانی ناودارانی بیدعەیان پەراوێز كردووە و دژایەتییان كردوون بە ئاشكرا.

(حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «كُنْتُ مَعَ أَيُّوبَ وَيُونُسَ وَابْنِ عَوْنٍ وَغَيْرِهِمْ، فَمَرَّ بِهِمْ عَمْرُو بْنُ عُبَيْدٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ وَوَقَفَ وَقْفَةً، فَمَا رَدُّوا عَلَيْهِ السَّلَامَ، ثُمَّ جَازَ فَمَا ذَكَرُوهُ»[1].

واتە: من لەگەڵ زانایانی ئەو سەردەمە (أيوب السختياني) و (يونس بن عبيد) و (عبد الله بن عون) وەستا بووین، سەركردەی موعتەزیلە (عمرو بن عبيد) تێپەڕ بوو بەلاماندا سەلامی لیّ كردین و وەستانێكی كەم وەستا، وەلامّمان نەدایەوە، پاشان تێپەڕ بوو، تەنانەت ناویشیان نەبرد.

(الحسن البصري) بە (مَعْبَد الْجُهَنِيِّ) دەوت: «لَا تُجَالِسُوهُ فَإِنَّهُ ضَالٌّ مُضِلٌّ»[2].

واتە: بە یەكێك لە سەرەكانی فیرقەی (قەدەرییە)كانی دەوت: لەگەڵی دامەنیشن، ئەو گومڕا و گومڕاكارە.

هەر مەبەستی ئەمانەیە ئیمام (حسن البصري) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «لَا تُجَالِسْ صَاحِبَ بِدْعَةٍ فَإِنَّهُ يُمْرِضُ قَلْبَكَ»[3].

---

= (١٩٧٤)، "العلل ومعرفة الرجال" لأحمد بن حنبل (٩) مسَائِل صَالح بن الإِمَام أَحْمد، "البداية والنهاية" لابن كثير (١٠/ ٨٥)، "الجرح والتعديل" لابن أبي حاتم (٦/ ٢٤٦)، "المجروحين" لابن حبان (٢/ ٧٠)، "تأريخ بغداد" لخطيب البغدادي (١٤/ ٧٧)، "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٧٧)، "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٨/ ٧٠).

(١) "السنة" لعبدالله بن أحمد (٩٦٥)، "الابانة" لابن بطة (١٩٦٤)، "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (٦/ ١٧٩)، "تأريخ بغداد" لخطيب البغدادي (١٤/ ٦٣).

(٢) "السنة" لعبدالله بن أحمد (٨٤٩)، "القدر" للفريابي (٢٠٥)، "ذم الكلام وأهله" للهروي (٧٨٣)، "معارج القبول بشرح سلم الوصول" للحافظ الحكمي (٣/ ٩٧٨)، "الشريعة" للآجري (٥٥٨)، "الابانة" لابن بطة (٢٠٠٣)، "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (١١٤٢)، "العلل الصغير" للترمذي ص٧٥٤، "الضعفاء الكبير" للعقيلي (٤/ ٢١٧)، "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (١/ ١٣١)، "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ١٠٤)، "ميزان الاعتدال" للذهبي (٤/ ١٤١)، "تهذيب التهذيب" لابن حجر (١٠/ ٢٢٦).

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١١٣)، "البدع" لابن وضاح (١١٥)، "الابانة" لابن بطة (٢/ ٤٣٨).

واته: لەگەڵ بیدعەکاراندا دامەنیشن، دڵتان نەخۆش دەکەوێت.

(محمد بن سيرين) رَحِمَهُ اللَّهُ: «دَخَلَ رَجُلَانِ مِنْ أَصْحَابِ الْأَهْوَاءِ عَلَى مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ فَقَالَا: يَا أَبَا بَكْرٍ نُحَدِّثُكَ بِحَدِيثٍ قَالَ: لَا، قَالَا: فَنَقْرَأُ عَلَيْكَ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، قَالَ: «لَا، لَتَقُومَانِ عَنِّي أَوْ لَأَقُومَنَّ»»[١].

واته: دوو پیاو لە (أهل الأهواء)[٢] چوونە لای (محمدی کوڕی سیرین) وتیان: فەرموودەیەکت بۆ دەخوێنینەوە، وتی: نەخێر، وتیان: ئایەتێك دەخوێنینەوە، وتی: نەخێر، یان هەڵدەستن لێرە یان من هەڵدەستم.

(أيوب السختياني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «كُنْتُ يَوْمًا عِنْدَ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ إِذْ جَاءَ عَمْرُو بْنُ عُبَيْدٍ فَدَخَلَ، فَلَمَّا جَلَسَ وَضَعَ مُحَمَّدٌ يَدَهُ فِي بَطْنِهِ، ثُمَّ أَنْ قَالَ وَقَامَ، فَقُلْتُ لِعَمْرٍو: انْطَلِقْ بِنَا، قَالَ: فَخَرَجْنَا، فَلَمَّا مَضَى عَمْرٌو رَجَعْتُ فَقُلْتُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، قَدْ فَطِنْتُ إِلَى مَا صَنَعْتَ، قَالَ: وَمَا فَطِنْتَ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «أَمَا إِنَّهُ لَمْ يُظِلُّنِي وَإِيَّاهُ سَقْفُ بَيْتٍ»»[٣].

واته: کاتێك (عەمر) دانیشت (محمدی کوڕی سیرین) هەستایە سەر پێ، دەڵێت: منیش تێگەیشتم، منیش وتم بە (عەمر): با بڕۆین، پاشان گەڕامەوە وتم: زانیم مەبەستت چی بوو، وتی: ئەوەیە (لەژێر سێبەری ماڵێکدا کۆنابینەوە).

ئەمانە هەمووی مانای ئەوەن ئەو حوکمە قورسانە بۆ سەرانی بیدعەکارانی فیرەقە ئیسلامییەکان بووە کە گومڕاییان لە بنەماکانی ناو و سیفات و قەدەر و غەیبییەکاندا لە سەرەتای دروستبوونیاندا کردووە، لەگەڵ ئەو کەسانەی هەڵگری هەر ڕایەکی بیدعەکاران بوون و لەناو خەڵکدا پشتگیرییان کردووە و کاریگەرییان هەبوو.

---

(١) "السنة" لعبدالله بن أحمد (١٠٠)، "سنن الدارمي" (٤١١)، "القدر" للفريابي (٣٧٣)، "الشريعة" للآجري (١٢١)، "الابانة" لابن بطة (٣٩٨)، "الانتصار لأصحاب الحديث" لأبو المظفر ص٢٢، "الحجة في بيان المحجة" للأصبهاني (٢/ ٥٧٧).

(٢) باسی دەکەین مەبەست بە (أهل الأهواء) کێیە.

(٣) "الاعتصام" للشاطبي (٢/ ٧٩١)، "البدع" لابن وضاح (١٣٠).

نەك ئەم سەردەمە کە موسوڵمان زۆر نامۆ و غەریبە، بە شێوەیەکی گشتی دەسەڵاتی ئەم بەرنامەی ئەهلی سوننەتە بوونی لاوازە، وە گەر بە شێوەیەکی زانستی خۆی بڵێین یەکجار لاوازە و فیرەق و ئەحزاب و گرووپە جیاجیاکانی ناو ئەهلی سوننەت زۆرن و موسڵمانان شەکەتن بەدەست واقیع حاڵی خۆیانەوە، زانایان و قوتابخانە زانستە شەرعییەکان (علماء، العلوم الشرعية) هەر بوونی نییە لە زۆربەی شوێنان، دوژمنانیش شەو و ڕۆژ لە پەکخستن و لاوازکردن و بەربەستدان.

## بە کێ دەوترێت (أهل الأهواء، أهل البدع)؟

ئەم دوو وشەیە (أهل الأهواء، أهل البدع) زۆر بەکارهێنراوە لەناو پێشینی ساڵح و زانایاندا بەرامبەر بیدعەکاران وەکوو ئاستێکی تاوانباری دینی، لەبەرئەوە پێویستییەکی زانستییە ڕوونکردنەوەی ئەم دوو وشەیە، تاوەکوو بەکارهێنانی لە ئاستی مانا و مەبەستی زانستی خۆیدا بێت و بە هەڵە بەکار نەهێنرێت، وەکوو وتراوە: «الْحُكْمُ عَلَى الشَّيْءِ فَرْعٌ عَنْ تَصَوُّرِهِ»[(١)].

واتە: حوکمدان بەسەر شتێکدا بەشێکە لە تێگەیشتنی.

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «الْبِدْعَةُ الَّتِي يُعَدُّ بِهَا الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ مَا اشْتَهَرَ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالسُّنَّةِ مُخَالَفَتُهَا لِلْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ: كَبِدْعَةِ الْخَوَارِجِ، وَالرَّوَافِضِ، وَالْقَدَرِيَّةِ، وَالْمُرْجِئَةِ»[(٢)].

واتە: ئەو بیدعەیەی کە کەسەکەی پێ ناو دەبرێت بە (أهل الأهواء) ئەو بیدعانەیە کە لای زانایان ناسراوە بە دژایەتیکردنی قورئان و فەرموودە، وەکوو بیدعەی (خەوارج، ڕافیزە و قەدەرییە و مورجیئە).

بیدعەی ئەم فیرەقانەش لە بیدعە گەورەکانی بنەماکانی دینە، نەك لە بیدعەی بچوك و دژایەتی نەکردنی بابەتێکی سەرەکی بێت، یاخود هۆکاری لانەدان لە یەکێك لە (أصول القواعد ومنهج)ی ئەهلی سوننەتدا بێت، لەبەرئەوەی وشەی (أهل الأهواء، أهل البدع) حوکمێکی قورس لەخۆ

(١) "الأصول من علم الأصول" للعثيمين ص٨٣، "شرح الكوكب المنير" لابن النجار (١/ ٥٠) بتحقيق: محمد الزحيلي ونزيه حماد، "غمز عيون البصائر في شرح الأشباه والنظائر" لأحمد بن محمد مكي (٢/ ٣١٤).

(٢) "مجموع الفتاوى" (٣٥/ ٤١٤)،"الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٤/ ١٩٤).

دەگرێت، پێویسته بچێته ژێر باری یاسا حوکمییەکانەوە، بەڵام بەکارهێنانی ئەو دوو وشەیە لە زۆرێك لە فەتواکانی زانایانی ئەهلی سوننەتی ئەم سەردەمەدا دەردەکەوێت لە کاتی باسکردنی گرووپە ئیسلامییەکانی ئەم سەردەمەدا. ئەگەرچی بە شێوەیەکی گشتی ئەو گرووپانە لەناو بازنەی پەیوەستبوونی بەرنامەی ئەهلی سوننەتدان، بەڵام وەکوو ووردەکارییەکانی لە دژایەتیکردنی (شرك وبدعة) لایەنگری بۆ ووردەکاری ئەو بەرنامە زانستییە زۆر بەکەمی تیایاندا دەردەکەوێت و ڕەنگدانەوەی هەیە.

وەکوو الشَّيْخ (الألباني) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «سياسة الولاء والبراء لا تستلزم معاداة أي فئة من الفئات الإسلامية أو أي طائفة من الطوائف الإسلامية، ولكن يجب أن تعامل كل واحدة منها في حدود قربها أو بعد من العقيدة الصحيحة أو من التمسك بالإسلام الصحيح ككل والمعاداة لا تأتي إلا في حالة اليأس من صلاحها وهدايتها»[١].

واته: پەیڕەوکردنی (الولاء والبراء) خۆشەویستی و لایەنگری و دژایەتیکردنی موسڵمان ئەوە ناگەیەنێت کە دژایەتی بکرێن بە هۆکاری ئەوەی لەناو جۆرێکی دیاریکراو لە کۆمەڵ و گرووپە ئیسلامییەکانن، بەڵکوو دەبێت مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت لە سنووری دوور و نزیکییان لە (عقيدة)ی دروست و پەیوەستبوون بە ئیسلامێکی ڕاست و پاکەوە بەگشتی، وە دژایەتی ناکرێن بێجگە لەکاتی بێ هیوا بوون نەبێت لە چاکبوونیان و هیدایەتییان.

ئیمامی (الشاطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «إِنَّ لَفْظَ: "أَهْلِ الْأَهْوَاءِ"، وَعِبَارَةَ: "أَهْلِ الْبِدَعِ" ؛ إِنَّمَا تُطْلَقُ حَقِيقَةً عَلَى الَّذِينَ ابْتَدَعُوهَا، وَقَدَّمُوا فِيهَا شَرِيعَةَ الْهَوَى؛ بِالِاسْتِنْبَاطِ، وَالنَّصْرِ لَهَا، وَالِاسْتِدْلَالِ عَلَى صِحَّتِهَا فِي زَعْمِهِمْ، حَتَّى عُدَّ خِلَافُهُمْ خِلَافًا، ... كَمَا نَقُولُ فِي أَلْقَابِ الْفِرَقِ مِنَ الْمُعْتَزِلَةِ وَالْقَدَرِيَّةِ وَالْمُرْجِئَةِ وَالْخَوَارِجِ ... أَلْقَابٌ لِمَنْ قَامَ بِتِلْكَ النِّحَلِ مَا بَيْنَ مُسْتَنْبِطٍ لَهَا وَنَاصِرٍ لَهَا وَذَابٍّ عَنْهَا؛ كَلَفْظِ: "أَهْلِ السُّنَّةِ" ؛ إِنَّمَا يُطْلَقُ عَلَى نَاصِرِيهَا، وَعَلَى مَنِ اسْتَنْبَطَ عَلَى وَفْقِهَا، وَالْحَامِينَ لِذِمَارِهَا ... ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا﴾ [الأنعام: ١٥٩]؛ يُشْعِرُ بِإِطْلَاقِ

(١) "دعوة أهل البدع" لخالد الزهراني ص٩٠ عن شريط رقم (٧) فتاوى مكة.

اللَّفْظِ عَلَى مَنْ جَعَلَ ذَلِكَ الْفِعْلَ الَّذِي هُوَ التَّفْرِيقُ، وَلَيْسَ إِلَّا الْمُخْتَرِعُ أَوْ مَنْ قَامَ مَقَامَهُ، ... ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ﴾ [آل عمران: ٧]، فَإِنَّ اتِّبَاعَ الْمُتَشَابِهِ مُخْتَصٌّ بِمَنِ انْتَصَبَ مَنْصِبَ الْمُجْتَهِدِ لَا بِغَيْرِهِمْ ... بِخِلَافِ الْعَوَامِّ، فَإِنَّهُمْ مُتَّبِعُونَ لِمَا تَقَرَّرَ عِنْدَ عُلَمَائِهِمْ لِأَنَّهُ فَرْضُهُمْ، فَلَيْسُوا بِمُتَّبِعِينَ لِلْمُتَشَابِهِ حَقِيقَةً، وَلَا هُمْ مُتَّبِعُونَ لِلْهَوَى، وَإِنَّمَا يَتَّبِعُونَ مَا يُقَالُ لَهُمْ كَائِنًا مَا كَانَ، فَلَا يُطْلَقُ عَلَى الْعَوَامِّ لَفْظُ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ حَتَّى يَخُوضُوا بِأَنْظَارِهِمْ فِيهَا وَيُحَسِّنُوا بِنَظَرِهِمْ وَيُقَبِّحُوا. وَعِنْدَ ذَلِكَ يَتَعَيَّنُ لِلَفْظِ "أَهْلِ الْأَهْوَاءِ" وَ "أَهْلِ الْبِدَعِ" مَدْلُولٌ وَاحِدٌ، وَهُوَ: أَنَّهُ مَنِ انْتَصَبَ لِلِابْتِدَاعِ وَلِتَرْجِيحِهِ عَلَى غَيْرِهِ، وَأَمَّا أَهْلُ الْغَفْلَةِ عَنْ ذَلِكَ، وَالسَّالِكُونَ سُبُلَ رُؤَسَائِهِمْ بِمُجَرَّدِ التَّقْلِيدِ مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ؛ فَلَا»[1].

واتە: وشەی (أهل الأهواء) و (أهل البدع) لە ڕاستیدا بە کەسانێك دەوترێت کە داهێنەری بیدعەکە بن و بەڵگەکاری و سەرخستنیان بۆ ئەنجام دابێت و پێچەوانەکەیان بە دەرچوو لە حەق دابنێن، وەکوو چۆن (خەوارج و موعتەزیلە ...) بەوانە دەوترێ کە هەڵگری ئەو بەرنامەیە بن و سەرخەری بن، وەکوو چۆن وشەی (أهل السنة) بە سەرخەری و پشتیوانی و بەڵگەکاری دەڵێن، خوای گەورە ﴿فَرَّقُواْ دِينَهُمْ﴾ بە کەسانێك دەڵێت کە داهێنەری جیایی کارەکە بن، وە بە ﴿فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ﴾، وە شوێنکەوتەی (تَشَابَهَ)یش کەسانی تایبەتمەندی ئیجتیهادکار بۆیان، بە پێچەوانەی کەسانی نەزانەوە کە شوێنکەوتەی زاناکانیانن و ئەمانە شوێنکەوتەی (متَشَابَهَ)و هەوا و ئارەزوو نین لە ڕاستیدا، شوێنکەوتەی ئەوانەن کە قسەیان بۆ دەکەن هەر کەسێك بن، بەمانە ناوترێت (أهل الأهواء) تا نەچنە ڕیزی ئەوان و وەکوو ئەوان تێڕوانین نەکەن لەسەر بەچاکزانین و بەخراپە زانین، ئەوکاتە وشەی (أهل الأهواء) یا (أهل البدع) جێگیر دەبێت لەسەر مانای ئەوەی کەسێك خۆی داناوە بە سەرچاوە و یەکلاکەرەوە و برەوپێدانی بیدعەکە، نەك کەسانی بێ ئاگا و دواکەوتەی کوێرانەی بێ هیچ زانینێك ... دوای ئەمانە (الشاطبي) ﵀ پێداگری

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ٢١٣).

دەکات لەسەر کەمی پاساوی خەڵکی لە چوونە ناو بیدعەدا و پشتگیریکردنیان. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت سەران و ناوداران و بناغەدارِێژی بیدعەکاران تا ڕادەیەکی زۆر هیچ پاساو و بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە بۆ ڕزگاربوون، بەڵام شوێنکەوتووانیان بە گشتی شوێنی پاساو و نەزانین و بێئاگایین، ئەم هەڵسەنگاندنە بۆ هەموو بیروڕا و گرووپێکە، وەکوو چۆن خوای پەروەردگار باسی بێ پاساوی و باوەڕی سەرانی بێبڕوایان دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ﴾ [التوبة : ١٢]، وە تەنانەت گەورەی دووڕووان و تاوانباران سزای گەورەیان بۆ هەیە: ﴿وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١﴾ [النور : ١١]، وە ئەگەرچی بە گشتیش شوێنکەوتووان و هەڵگرانی بیروڕای بیدعەکاران نیەت و هەڵسوکەوت و کاریان بە سوننەت گۆش نەکراوە و نایناسن و بگرە نایانەوێت.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «وَأَهْلُ الْبِدَعِ لَا يَجْعَلُونَ اعْتِمَادَهُمْ فِي الْبَاطِنِ وَنَفْسِ الْأَمْرِ عَلَى مَا تَلَقَّوْهُ عَنْ الرَّسُولِ؛ بَلْ عَلَى مَا رَأَوْهُ أَوْ ذَاقُوهُ ثُمَّ إنْ وَجَدُوا السُّنَّةَ تُوَافِقُهُ وَإِلَّا لَمْ يُبَالُوا بِذَلِكَ فَإِذَا وَجَدُوهَا تُخَالِفُهُ أَعْرَضُوا عَنْهَا تَفْوِيضًا أَوْ حَرَّفُوهَا تَأْوِيلًا. فَهَذَا هُوَ الْفُرْقَانُ بَيْنَ أَهْلِ الْإِيمَانِ وَالسُّنَّةِ وَأَهْلِ النِّفَاقِ وَالْبِدْعَةِ»(١).

واتە: بیدعەکاران نیەت و ناوەڕۆك و کاریان پشتبەستن نییە بە شوێنکەوتەی سوننەت لە پێغەمبەرەوە ﷺ، بەڵکوو لەسەر بیروڕا و حەزی خۆیانە، پاش ئەوە گەر بینییان سوننەت دەگونجێت لەگەڵیان وەری دەگرن، وە گەر نەگونجا پشتی تێ دەکەن، بەرگی (تأويل وتفويض) مانا گۆڕین و بەتاڵکردنەوە لە مانادا دەخەنە پاڵی، ئەمە جیاوازی نێوان ئەهلی ئیمان و سوننەتە لەگەڵ دووڕوو و بیدعەکاراندا.

(ابن القيم) رحمه الله دەڵێت: «الفرق بين مقلد تمكن من العلم ومعرفة الحق فأعرض عنه، ومقلد لم يتمكن من ذلك بوجه، والقسمان واقعان في الوجود، فالمتمكن المعرض مفرط تارك للواجب عليه لا عذر له عند الله»(٢).

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ٦٣).

(٢) "طريق الهجرتين وباب السعادتين" لابن القيم ص٤١٢.

واتە: جیاوازی ناو بیدعەكاران ئەوان دوو جۆرن: شوێنكەوتەیەكی كوێرانە و توانای بەدەستهێنانی زانست و هیدایەتی هەیە بەڵام پشتی لێ دەكات، وە كەسێك هیچ توانایەكی نییە لە هیچ ڕوویەكەوە، یەكەمیان كەمتەرخەمە لە ئاستی ئەوەی واجبە لەسەری و پاساوی نییە لای خوا ﷻ.

(ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «وَأَمَّا الْجُهَّالُ الَّذِينَ يُحْسِنُونَ الظَّنَّ بِقَوْلِ هَؤُلَاءِ وَلَا يُفْهِمُونَهُ وَيَعْتَقِدُونَ أَنَّهُ مِنْ جِنْسِ كَلَامِ الْمَشَايِخِ الْعَارِفِينَ الَّذِينَ يَتَكَلَّمُونَ بِكَلَامٍ صَحِيحٍ لَا يَفْهَمُهُ كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ فَهَؤُلَاءِ تَجِدُ فِيهِمْ إسْلَامًا وَإِيمَانًا وَمُتَابَعَةً لِلْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ»[1].

واتە: بەڵام نەزانەكان ئەوانەی گومانی باشیان بە كەسە دیارەكانی بیدعەكاران هەیە هیچ تێناگەن، ئەوانە تیایانا بەدی دەكرێت ئیسلام و ئیمان و شوێنكەوتەیی بۆ قورئان و فەرموودە.

## هەڕەشەی گشتی دانابەزێتە سەر تایبەت

## (الوعيد المطلق لا يلزم منه الوعيد المعين)

یەكێك لە بنەما گرنگەكانی ئیسلام لە حوكمداندا جیاوازیكردنە لە نێوان (الفعل والفاعل) كار و خاوەنكاردا، مەرج نییە هەموو كارێك خاوەنەكەی بگرێتەوە، یاساكەی (التكفير واللعن والتفسيق والتبديع: العام لايستلزم المعين إلا بثبوت الشروط وانتفاء الموانع)[2].

هیچ هەڕەشەیەك و حوكمەكەی نادرێت بەسەر كەسی دیاریكراودا بێجگە لەدوای دڵنیابوونی مەرجەكانی و نەمانی ڕێگرییەكانی نەبێت.

یەكێك لەمانە بیدعەیە، مەرج نییە هەركەسێك كەوتە بیدعەوە گومڕا و بیدعەكار بێت.

بەگشتی دەوترێت ئەو كارە بیدعە و گومڕاییە، بەڵام خاوەنەكەی ناگرێتەوە.

(ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «لَعْنُ الْمُطْلَقِ لَا يَسْتَلْزِمُ لَعْنَ الْمُعَيَّنِ ... وَكَذَلِكَ "التَّكْفِيرُ الْمُطْلَقُ" "وَالْوَعِيدُ الْمُطْلَقُ". وَلِهَذَا كَانَ الْوَعِيدُ الْمُطْلَقُ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ مَشْرُوطًا بِثُبُوتِ

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢/ ٣٦٧).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٣٢٩)، "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٥/ ٢٨٢).

شُرُوطٍ وَانْتِفَاءِ مَوَانِعَ»[(١)].

(ابن العربي المالكي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «الطاعات كما تسمى إيمانا، كذلك المعاصي تسمى كفرا. لكن حيث يطلق عليها الكفر لا يراد عليه الكفر المخرج عن الملة»[(٢)].

واتە: عیبادەتەکان چۆن ناو ئەنرێن بە ئیمان ئاواش تاوانەکان ناو ئەبرێن بە کوفر، بەڵام بە شێوەی گشتی مەبەست پێی ئەو کوفرانە نییە کە لە دین پێی دەردەچێت.

تەنانەت قسەی زانایانیش کاتێك بە گشتی باسی فیرقەیەکی گومڕا ئەکەن یا بەرنامەکانیان و پاشان دەڵێن خەوارج و ڕافیزە و مورجیئەکان بیدعەکار و گومڕا و سەرلێشێواون، مانای ئەوە نییە کە هەرچی هەڵگری و لایەنگری بۆ ئەوان دەربڕی ئەو حوکمەی بەسەردا جێبەجێ بکرێت.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «إِنَّ نُصُوصَ "الْوَعِيدِ" الَّتِي فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَنُصُوصَ الْأَئِمَّةِ بِالتَّكْفِيرِ وَالتَّفْسِيقِ وَنَحْوِ ذَلِكَ لَا يُسْتَلْزَمُ ثُبُوتُ مُوجَبِهَا فِي حَقِّ الْمُعَيَّنِ إلَّا إذَا وُجِدَتْ الشُّرُوطُ وَانْتَفَتْ الْمَوَانِعُ لَا فَرْقَ فِي ذَلِكَ بَيْنَ الْأُصُولِ وَالْفُرُوعِ»[(٣)].

واتە: دەقە هەڕەشەکان لە قورئان و فەرموودە و دەقی زانایان لە کافرکردن و تاوانباریدا، کەسی تێکەوتوو ناگرێتەوە، بێجگە لە هێنانەدی مەرجەکان بەسەریدا و نەمانی ڕێگرییەکانی بەبێ جیاوازی لە نێوان بنەما و لقەکانی دیندا، وەکوو وتمان (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «الصَّوَابُ: أَنَّ لَازِمَ مَذْهَبَ الْإِنْسَانِ لَيْسَ بِمَذْهَبِ لَهُ إذَا لَمْ يَلْتَزِمْهُ»[(٤)].

واتە: خۆدانە پاڵ بەرنامە و مەزهەبێك نابێتە هەڵگری ئەو مەزهەبە، ئەگەر پەیوەستبوونی تەواوی پێوە نەبێت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" (١٠/ ٣٢٩)، و "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٥/ ٢٨٢).

(٢) "موقف أهل السنة والجماعة من أهل الأهواء والبدع" لدكتور إبراهيم بن عامر الرحيلي (١/ ١٩٦)، "تفسير القاسمي" (٣/ ١٦١).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٣٧٢).

(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/ ٢١٧).

وە دەڵێت: «وَالْخَوَارِجُ كَانُوا مِنْ أَظْهَرِ النَّاسِ بِدْعَةً وَقِتَالًا لِلْأُمَّةِ وَتَكْفِيرًا لَهَا وَلَمْ يَكُنْ فِي الصَّحَابَةِ مَنْ يُكَفِّرُهُمْ لَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ وَلَا غَيْرُهُ بَلْ حَكَمُوا فِيهِمْ بِحُكْمِهِمْ فِي الْمُسْلِمِينَ الظَّالِمِينَ الْمُعْتَدِينَ»[١].

واتە: خەواریجەكان لە هەموو كەس دیارتر بیدعەكاربوون و شەڕیان لەگەڵ موسڵمانناندا دەكرد و كافریان دەكردن، یەكێك نەبوو لە هاوەڵاندا كافریان بكات، نە ئیمامی (عەلی) نە كەسی تریش، بەڵكوو حوكمی موسڵمانی ستەمكاری هێرشكاریان دەدایە پاڵ، وەكوو باسمان كرد پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ» هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، نەیفەرمووە (كل مبتدع ضال) هەموو بیدعەكارێك گومڕایە.

لەبەرئەوە كەسێك لە زانایانی ئەهلی سوننەت حوكمی نەداوە بەسەر سەرانی فیرقە گەورە گومڕاكاندا بە كوفر و دەریان بكات لە دین، بەڵكوو بە گشتی بڕیاریان داوە بەسەر بەرنامە و كاریاندا كە گومڕایی و بیدعە و كوفری تێدایە، بەسەر تاكە كەسیاندا هیچ بڕیارێك نەدراوە، (ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وَالتَّحْقِيقُ فِي هَذَا: أَنَّ الْقَوْلَ قَدْ يَكُونُ كُفْرًا كَمَقَالَاتِ الْجَهْمِيَّةِ ... وَلَكِنْ قَدْ يَخْفَى عَلَى بَعْضِ النَّاسِ أَنَّهُ كُفْرٌ فَيُطْلِقُ الْقَوْلَ بِتَكْفِيرِ الْقَائِلِ؛ كَمَا قَالَ السَّلَفُ مَنْ قَالَ: الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ فَهُوَ كَافِرٌ ... وَلَا يَكْفُرُ الشَّخْصُ الْمُعَيَّنُ حَتَّى تَقُومَ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ»[٢].

واتە: ڕەنگە قسەیەك كوفر بێت وەكوو قسەی جەهمییەكان، بەڵام دەشێت شاراوە بێت لەسەر هەندێ كەس كە كوفرە، بەڵام بە گشتی دەڵێین خاوەنی ئەو قسەیە كافرە، وەكوو سالحان وتوویانە ئەوەی بڵێت قورئا (مخلوق)ە ئەوە كافرە، وە كەسی دیاریكراویش كافر ناكرێت تاوەكوو بەڵگەكانی لەسەر جێبەجێ نەكرێت.

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وَبَعْضُ الْمُبْتَدِعَةِ يَكُونُ فِيهِ مِنْ الْإِيمَانِ مَا لَيْسَ فِي بَعْضٍ فَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يُكَفِّرَ أَحَدًا مِنْ الْمُسْلِمِينَ وَإِنْ أَخْطَأَ وَغَلِطَ حَتَّى تُقَامَ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ وَتُبَيَّنَ لَهُ الْمَحَجَّةُ. وَمَنْ ثَبَتَ إِيمَانُهُ بِيَقِينٍ لَمْ يَزُلْ ذَلِكَ عَنْهُ بِالشَّكِّ؛ بَلْ لَا يَزُولُ إِلَّا بَعْدَ إِقَامَةِ الْحُجَّةِ وَإِزَالَةِ الشُّبْهَةِ»[٣].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ٢١٧، ٢١٨).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ٦١٩).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ٥٠١).

واته: هەندێك لە بیدعەكاران ئیمانیان باشترە لە هەندێكیان، كەسێك بۆی نییه كەسێك لە موسڵمانان كافر بكات ئەگەر هەڵە و لێتێكچوونیشی هەبێت، (وە بیدعەكاریش هەمان حوكمی هەیە) تا بەڵگەكانی بەسەردا ساغ نەبێتەوە و ڕێگاشی بۆ ڕوون نەبێتەوە ئەوەی ئیمانی هەبوو بە دڵنیایی لێی ناسەنرێتەوە بە گومان، وە لەسەریشی لاناچێت پاش بەڵگە و نەمانی گومانەكان نەبێت.

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «هَذَا مَعَ أَنِّي دَائِمًا وَمَنْ جَالَسَنِي يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنِّي: أَنِّي مِنْ أَعْظَمِ النَّاسِ نَهْيًا عَنْ أَنْ يُنْسَبَ مُعَيَّنٌ إِلَى تَكْفِيرٍ وَتَفْسِيقٍ وَمَعْصِيَةٍ، إِلَّا إِذَا عُلِمَ أَنَّهُ قَدْ قَامَتْ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ الرسالية الَّتِي مَنْ خَالَفَهَا كَانَ كَافِرًا تَارَةً وَفَاسِقًا أُخْرَى وَعَاصِيًا أُخْرَى وَإِنِّي أُقَرِّرُ أَنَّ اللهَّ قَدْ غَفَرَ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ خَطَأَهَا: وَذَلِكَ يَعُمُّ الْخَطَأَ فِي الْمَسَائِلِ الْخَبَرِيَّةِ الْقَوْلِيَّةِ وَالْمَسَائِلِ الْعَمَلِيَّةِ»[١].

واته: لەگەڵ ئەوەشدا من بەردەوام وە ئەوەیشی لەگەڵمدا دانیشێت دەزانێت من لە هەموو كەس زیاتر ڕێگریم كردووە كە كەسێكی دیاریكراو (كوفر و فاسق و تاوان) بخرێتە پاڵی، مەگەر دوای ئەوەی بەڵگەكاری لەسەر كرابێت بە شێوەیەك پاساوی نەمابێت، گەر وا بێت ئەوا بێبڕوایە یا فاسقە یا تاوانبارە، من بڕیار دەدەم خوای پەروەردگار لە هەڵەی موسڵمانان خۆش بووە، ئەوەش بە گشتی كە هەڵەكان لە بابەتە هەواڵییەكاندا بێت (واتە غەیبییەكان) كە پەیوەندی بە گوفتارەوەیە، وە ئەو بابەتانەی كە پەیوەندییان بە كار و كردەوەی موسڵمانانەوە هەیە.

## چەند بنەمایەك لەسەر حوكمدان بۆ ڕوونبوونەوەی زیاتری ئەم بابەتە دەخەینە ڕوو (القواعد الأصولية في الحكم على الغير):

١. «نَحْنُ نَحْكُمُ بِالظَّاهِرِ، وَاللهَّ يَتَوَلَّى السَّرَائِرَ»[٢]. بەسەر ڕووكەشدا حوكم دەدرێت لە ئیسلامدا، ناوەڕۆك لای خوایە، وەكوو ئیمامی (الطحاوي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «ولا نشهد عليهم بكفر ولا بشرك ولا بنفاق، ما لم يظهر منهم شيء من ذلك، ونذر سرائرهم إلى الله تعالى»[٣].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٢٢٩).

(٢) "الإحكام في أصول الأحكام" للآمدي (٢/ ١١٧)، قال الألباني في "الصحيحة" : جزم بنسبته إلى النبي صلى الله عليه وسلم، مع أنه مما لا أصل له عنه بهذا اللفظ.

(٣) "العقيدة الطحاوية" ص٣٧٨.

واتە: شاهێدی مەدەن بەسەر کەسێکدا بە کوفر و نیفاق و شیرك بە مەرجێك ئاشکرا نەبێت لێیان، نیەت و ناوەڕۆکیان دەگێرینەوە بۆ لای خوا.

وەکوو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی لەگەڵ (منافق) دوو ڕووەکانی مەدینەدا دەکرد و فەرمووی: «إِنِّي لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاسِ وَلاَ أَشُقَّ بُطُونَهُمْ»[(١)].

واتە: من فەرمانم پێ نەدراوە دڵ و سکی خەڵکی لەت بکەم.

«فمن أظهر البدعة حكمنا عليه بأنه مبتدع وهذا بالنسبه لأحكام الدنيا أما في الآخرة فالمبتدع عند الله من كان مبتدعاً في الباطن، بأن تعمد الابتداع، أما من لم يتعمده فإنه معذور»[(٢)].

واتە: ئەوەی بیدعەی لێ دەرکەوت بە ئاشکرا پێی دەوترێت بیدعەکار، بەڵام سەبارەت بە ڕۆژی دوایی بیدعەکار کەسێکە لە ناوەڕۆکدا بیدعەکار بێت و وە بەبێ هیچ پاساوێك داهێنەری بیدعە بێت، ئەوەی وا نەبێت پاساوی هەیە.

٢. «لا تقوم الحجة على المعين إلا بالبلوغ ومطلق الفهم»[(٣)]. ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ۝١٥﴾ [الإسراء: ١٥].

واتە: خوای پەروەردگار هیچ کەس سزا نادات تا پێغەمبەرانیان بۆ دەنێرێت.

وە مەرجیش لە تێگەیشتنی گشتییە لە بەڵگەی ئەو بابەتە کە حوکمی بەبۆنەیەوە دەدرێت بەسەریدا، تێگەیشتنی وردەکاری وەکوو زانایان «والعبرة بقيام الحجة بأن يفهمها ذلك الشخص المعين فهماً يدرك به مخالفته للحجة التي يكثر بها ولا يشترط فهمه لها فهماً دقيقاً كما يفهمها أهل العلم والإيمان»[(٤)].

---

(١) رواه البخاري (٤٣٥١)، ومسلم (١٠٦٤)، وأبو يعلى في "المسند" (١١٦٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٥).

(٢) "موفق أهل السنة" لدكتور إبراهيم الرحيلي (١/ ١٢٢).

(٣) "قواعد في الحكم على الآخرين" لوليد بن راشد السعيدان ص٤٣.

(٤) "موقف أهل السنة من أهل الأهواء والبدع" لدكتور إبراهيم بن عامر الوصلي (١/ ٢٢).

واتە: ڕەچاوکردن لێرەدا تێگەیشتنی بابەتەکەیە لای کەسەکە بە شێوەیەك یەکلای بکاتەوە لە بەرامبەرەکەی، نەك تێگەیشتنێکی وردەکاری وەکوو زانایان و ئیمان بالآکان.

(ابن القیم) رحمه الله دەڵێت: «أن قيام الحجة يختلف باختلاف الأزمنة والأمكنة والأشخاص»[1].

واتە: دروستبوونی بەڵگە بەسەر خەڵکیدا جیاوازە، دەگۆڕێت بەگوێرەی کات و شوێن ... ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البقرة: ٢٨٦] داواکاری خوا بە گوێرەی توانایە.

**٣. «لا يحكم على الغير بمخالفته شيئاً ثبت الخلاف فيه»[2].**

واتە: حوکم نادرێت بەسەر کەسێکدا لەسەر بابەتێك کە شوێنی ڕای جیاوازی زانایانە و یەکلا نەبووەتەوە.

(ابن تیمیة) رحمه الله دەڵێت: «أَنَّ الْمُتَأَوِّلَ الَّذِي قَصْدُهُ مُتَابَعَةُ الرَّسُولِ لَا يَكْفُرُ، بَلْ وَلَا يَفْسُقُ إِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ»[3].

واتە: ئەوەی مانا گۆڕکێ(تأویل) بکات و مەبەستی شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ بێت پێی (کافر و فاسق) ناکرێت گەر ئیجتیهادی تێدا کرد و نەیپێکا و هەڵە بوو.

(ابن حجر) رحمه الله دەڵێت: «قَالَ الْعُلَمَاءُ كُلُّ مُتَأَوِّلٍ مَعْذُورٌ بِتَأْوِيلِهِ لَيْسَ بِآثِمٍ إِذَا كَانَ تَأْوِيلُهُ سَائِغًا فِي لِسَانِ الْعَرَبِ»[4].

واتە: زانایان دەڵێن: هەموو (تأویل) و ئیجتیهاد و کارێك پاساوی هەیە، تاوانبار نابێت ئەگەر ئیجتیهادەکەی وەربگیرێ و شوێنی قبووڵ بێت لە زمانی عەرەبیدا، نموونەی ئەو هەموو فیرەقانەی لە ئیسلامدا دروست بوون یا ئەو جیاوازییانەی لەنا و مەزهەبە فیقهییەکاندا دروست بوون.

---

(١) "طريق الهجرتين وباب السعادتين" لابن القيم ص٤١٤.

(٢) "قواعد في الحكم على الآخرين" لوليد بن راشد السعيدان ص٤٩.

(٣) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٥/ ٢٣٩).

(٤) "فتح الباري" لابن حجر (١٢/ ٣٠٤).

**٤. «يجب في الحكم على الغير النظر في قرائن الأحوال المصاحبة للقول والفعل»[١].**

واتە: پێویستە لە حوكمدان بەسەر خەڵكیدا تێڕوانینی چواردەوری ڕووداوەكە بكرێت لە قسە و كرداردا.

وەكوو نموونەی ئەو كەسەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دەكات لە خۆشیدا دەڵێت: «اللهُمَّ أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّكَ»[٢]. كاتێك حوشتر و بارەكەی دەدۆزێتەوە لە بیابانێكدا، لە خۆشیدا دەڵێت: خوایە تۆ بەندەی منی و من خوای تۆم.

وەكوو نامەكەی (حاطب بن أبي بلتعة) بۆ موشریكەكانی قوڕەیشی نارد و پێغەمبەر ﷺ لێی بوورد و پاساوی وەرگرت[٣].

وە بەسەرهاتی (عمار بن ياسر) كە بێبڕواكان زۆریان بۆ هێنا قسە بە پێغەمبەر ﷺ بلێت و پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ««كَيْفَ تَجِدُ قَلْبَكَ؟» قَالَ: مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ، قَالَ: «إِنْ عَادُوا، فَعُدْ»»[٤].

واتە: دڵت چۆن دەبینێت؟ وتی: دڵنیا بوون لە ئیمان، فەرمووی: ئەگەر گەڕانەوە بیگێڕەرەوە.

**٥. (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «طلب العذر للمخالف إذا أمكن مقدم على الحكم عليه ... و الحكم على الآخرين وقف على العلماء الراسخين ... و من الانصاف أن يغتفر قليل خطأ المرء في كثير صوابه ... و لا تبنى الأحكام على الإشاعات والنقول»[٥].**

واتە: هێنانەوەی پاساو بۆ بەرامبەر لەپێشترە لە حوكمدان بەسەریدا، حوكمدان كاری زانایانی ڕۆچووی عیلمن، بەشێك لە دادپەروەری لێخۆشبوونی هەڵەی كەمە لە چاكەی زۆردا، حوكم

---

(١) "قواعد في الحكم على الآخرين" لوليد بن راشد السعيدان ص٥٧.

(٢) رواه مسلم (٢٧٤٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣٠٣).

(٣) رواه البخاري (٤٢٧٤)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٤٤٣٧).

(٤) رواه الحاكم في "المستدرك" (٣٣٦٢) وقال الذهبي: على شرط البخاري ومسلم، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ١٤٠)، والبيهقي في "الصغرى" (٢٥٣١)، وفي "الكبرى" (١٦٨٩٦)، وفي "معرفة السنن والآثار" (١٦٦٥١).

(٥) "قواعد في الحكم على الآخرين" لوليد بن راشد السعيدان ص٦٣ - ٩١.

لەسەر پڕوپاگەندە و بڵاوکراوەکان نادرێت.

لەگەڵ ئەمانەشدا بیدعە و بیدعەکار مافخۆری پێغەمبەرن ﷺ، دوژمنکاری سوننەتن، لەناوبەری شوێنکەوتەن (المتابعة)، تێکدەری دینن، هۆکاری دووبەرەکایەتی و دوژمنی ناوخۆن.

ئیمامی (أحمد بن حنبل) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «نظرت في المصحف فوجدتُ طاعةَ الرسولِ صلى الله عليه وسلم في ثلاثة وثلاثين موضعاً»[1].

واتە: سەیرم کردووە لە قورئاندا سی و سێ جار داوای گوێڕایەڵی پێغەمبەری ﷺ کردووە.

بگرە پێشی خستووە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ [النِّسَاءِ : ٨٠].

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وَالْأَمْرُ بِالسُّنَّةِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْبِدْعَةِ هُوَ أَمْرٌ بِمَعْرُوفٍ وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ، وَهُوَ مِنْ أَفْضَلِ الْأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ»[2].

واتە: فەرمان بە سوننەت و دژایەتی بیدعە ئەوە فەرمان بە چاکە و لابردنی خراپەیە و باشترین کرداری چاکەیە.

(يَحْيَى بْنُ يَحْيَى) رَحِمَهُ ٱللَّهُ مامۆستای (بوخاری و موسلیم) دەڵێت: «الذَّبُّ عَنْ السُّنَّةِ أَفْضَلُ مِنْ الْجِهَادِ»[3].

واتە: هەوڵدان بۆ پاراستنی سوننەت گەورەترە لە جیهاد.

(أبو عبيد القاسم بن سلام) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «المتّبع للسُّنّة كالقابض على الجُمْر، وهو اليوم عندي أفضل من ضرب السَّيف في سبيل الله»[4].

---

(١) "مسند الإمام أحمد" (١/ ١٨)، "الصارم المسلول على شاتم الرسول" ص٥٦.

(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٥/ ٢٥٣).

(٣) "مجموع الفتاوى" (٤/ ١٣)، "الإخنائية أو الرد على الإخنائي" ص٥.

(٤) "تأريخ بغداد" للخطيب البغدادي (١٤/ ٣٩٢)، طبقات الحنابلة لابن أبي يعلى (١/ ٢٦٢)، تأريخ دمشق لابن عساكر (٤٩/ ٧٩)، تأريخ الإسلام للذهبي (٥/ ٦٥٤)، طبقات المفسرين للداوودي (٢/ ٤١)، سير أعلام النبلاء للذهبي (٨/ ٥٠٥).

واته: شوێنکەوتەی سوننەت وەکوو لـە دەستگرتنی پشکۆ وایە، ئەمڕۆ لای من گەورەترە لـە جیهیاد بە شمشێر لـە پێناوی خوادا.

الشَّيْخ (العثيمين) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «فيه شاهد لما نقل عن السلف أن البدع سبب الكفر»[1].

واته: پێشینی ساڵح وتوویانە: داهێنراوەکان هۆکاری دەرچوون لـە دین.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «البدعة مقرونة بالفرقة كَما أن السّنة مقرونة بِالْجَماعَة»[2].

واته: بیدعە گرێ دراوە بە دووبەرەکایەتی و جیاوازییەوە، وەکوو چۆن سوننەت پەیوەست کراوە بە کۆکردنەوەی موسڵمانانەوە.

ئیمامی (مالك بن أنس) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «السُّنَّةُ سَفِينَةُ نُوحٍ مَنْ رَكِبَهَا نَجَا وَمَنْ تَخَلَّفَ عَنْهَا غَرِقَ»[3].

واته: سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ وەکو پاپۆڕەکەی (نوح) عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ وایە، ئەوەی سەرکەوێت ڕزگاری بووە، ئەوەی دواکەوێت نوقم بووە.

وە ئیمامی (الزهري) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «كَانَ مَنْ مَضَى مِنْ عُلَمَائِنَا يَقُولُونَ: الِاعْتِصَامُ بِالسُّنَّةِ نَجَاةٌ»[4].

واته: زانایانمان دەڵێن: پشتبەستن بە سوننەت ڕزگاربوونە.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «أَهْلُ السُّنَّةِ، وَالْجَمَاعَةِ فِي الْإِسْلَامِ كَأَهْلِ الْإِسْلَامِ فِي أَهْلِ الْمِلَلِ»[5].

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٩/ ٣٧٨).
(٢) "الإستقامة" لابن تيمية (١/ ٤٢).
(٣) "تأريخ بغداد" للخطيب البغدادي (٨/ ٣٠٨)، "تأريخ دمشق" لابن عساكر (١٤/ ٩)، "مجموع الفتاوى" (١١/ ٦٢٣).
(٤) "سنن الدارمي" (٩٧)، "حديث السراج" (١١٣)، "المجالسة وجواهر العلم" للمالكي (٣٦٣)، "الإبانة الكبرى" لابن بطة (١٥٩)، "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (١٣٦)، "حلية الأولياء" لأبي نعيم (٣/ ٣٦٩)، "المدخل إلى السنن الكبرى" للبيهقي (٨٦٠)، "الحجة في بيان المحجة" للأصبهاني (١/ ١٢١)، "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٣٣٧)، "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٦٢٣).
(٥) "الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح" لابن تيمية (١/ ٧١).

واتە: ئەهلی سوننەت لەناو ئیسلامدا وەکوو ئیسلام وایە لەناو دینەکاندا.

هیچ پێغەمبەرێك نییە فەرموودە و کار و کردەوەی نوسرابێتەوە و زیندوو بێت لە دونیادا لەناو ئیماندارا ن و دۆست و دوژمنانیدا لە پێغەمبەری ئیسلام زیاتر نەبێت، وە هەموو دینێك بە وەفاتی پێغەمبەرەکەی کۆتایی بە بوونی هەبووە بێجگە لە پێغەمبەری ئیسلام نەبێت ﷺ هەر زیندووە بە بوونی زۆری وتە و کار و ڕوونی ژیانی لەناو موسڵماناندا.

تەنانەت دوژمنانیشی دەڵێن: (هیچ کەسێك ژیانی ڕوون و ئاشکرا نییە بێجگە لەژیانی محمد ﷺ). ئەمەش یەکێکە لە هەرە پلە و پایەی ئیسلام بەسەر دینەکانی تردا[1].

ئەگەر پێویست و تەواوکار و هۆکاری کاملی دین نەبوایە نە ئەچووە ژێر پاراستنی خوایی بۆ پاراستنی دینەکەی: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ [الحجر: ٩]. زانایان دەڵێن: ئەم وەعدە خواییەش بەس قورئان ناگرێتەوە، بەڵکوو سوننەتیش دەگرێتەوە، خوای پەروەردگار هەر لە سەرەتاوە هۆکارەکانی ڕەخساندووە بۆ کۆکردنەوە و پاراستنی فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ.

بۆیە هەر لە بوون بە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ دژایەتی کەسایەتی پێغەمبەریەتی و پێشەنگی و شوێنکەوتەی کراوە، بگرە هەر لە سەردەمی قورەیشەوە تاوەکوو ئەم سەردەمە و دواییش. بە چەندەها جۆراوجۆر لەسەر دەستی دوژمنانی و دۆستی بێئاگا و نەزانی ... .

هەروەك خۆی هەواڵی داوە بە جۆرێك لە بێباکی و قەدر نەزانین و بێئاگایی لە دین، دەفەرموێت: «يُوشِكُ أَنْ يَقْعُدَ الرَّجُلُ مِنْكُمْ عَلَى أَرِيكَتِهِ يُحَدِّثُ بِحَدِيثِي، فَيَقُولُ: بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ الله»[2].

واتە: ڕەنگە کەسانێك بەمزوانە پاڵ بدەنەوە بە پاڵپشتەکانیانەوە، فەرموودەیەك لە فەرموودەکانی منیان بۆ بگێڕنەوە و ئەوانیش بلێن: لە نێوانماندا قورئان هەیە و بەس، چی حەڵاڵ

---

(١) "حياة محمد" أو "محمد وخلفاؤه" لمستشرق الأمريكي واشنطن إيرفنج، وقد صنفه عام ١٨٢٩ م بأسبانيا.

(٢) رواه ابن ماجه (١٢) وصححه (شعيب الأرنؤوط)، وأحمد (١٧١٩٤)، والدارمي في "السنن" (٦٠٦)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٩٢٧)، وابن حبان في "صحيحه" (١٢)، والطبراني في "الكبير" (٢٠/ ٢٧٤)، والدارقطني في "السنن" (٤٧٦٧)، والحاكم في "المستدرك" (٣٧١) وسكت عنه الذهبي، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٣٤٤٢)، والخطيب البغدادي في "الكفاية" ص٨، والمروزي في "السنة" (٢٤٥)، وابن عبدالبر في "الجامع" (٢٣٤٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٨٧٠)، و "صحيح الجامع الصغير" (٨١٨٦)، وفي "المشكاة" (١٦٣).

كردووە حەڵاڵی دەكەین، وە چی حەرام كردووە حەرامی دەكەین.

بەڵێ هەر دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ فیرەقە گومڕاكان هاتن و بڕیاری كۆدەنگییان كارنەكردنە بە فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ.

هەر لە خەواریجەوە كە هاوەڵانیان كافر كردووە هیچ زنجیرەیەكی بەستنەوەیان نەما بە پێغەمبەرەكەیانەوە ﷺ، وە بڕیاریاندا كار بە قورئان بكەن و بەس.

پاش ئەمانە ڕافیزەكان هاتن، ئەوانیش هەمان بڕیاریاندا بەسەر هاوەڵاندا، بێجگە لە كەمێك نەبێت لە پەنجەكانی هەردوو دەست دەرنەدەچوو، بۆیە كۆتایی كاریان بە هەمان شێوە لەكارخستنی فەرموودە بوو، بە ناچاری پەنایان بردە بەر قسەی ئیمام و ناودارەكانیان، وەكوو بەدیلێكی پێغەمبەر و ﷺ پاشان بڕیاریاندا بە ناچاری ئەم ئیمامانەش وەكوو پێغەمبەر (معصوم)ن.

پاش ئەمانە كۆمەڵێ عەقلانی و فەلسەفییەكان هاتن، سەرچاوەیان عەقڵ و قسەی فەیلەسووفە بتپەرستەكانی دونیا بوو لە یۆنان و ڕۆمان و هیندۆس و بوزا و زەردەشتی.

بۆیە گەیشتنە سەر هەمان ڕێچكە، لەكارخستنی فەرموودە بوو، لە سەرەتاوە بەناوی فەرمودە ڕاوییە تاكەكانەوە بوو (خبر الآحاد)، زانیان ڕێژەی ئەم جۆرە فەرموودەیە زۆرە لەو ڕێگەیەوە لێیاندا.

پاشان بە (خبر الآحاد)ەوە نەوەستان، كەوتنە لەناوبردنی (متواتر)، كە بەناو شوێنی متمانەیان بوو، لە كۆتاییدا لەكارخستنی هەموو فەرموودە بوو بەناوی بەڵگەی گوماناوی (ظني الدلالة)، بەدوایدا فیرەقانی تر لە (الأشعرية والماتوريديه والمرجئة والتصوف ...).

كۆدەنگیان چەق بەستوو بوو لە ئاستی فەرموودەدا و بڕیاری نەگۆڕ بوو بۆ لەكارخستنی.

تا ئەم سەردەمەش بانگەوازكارانی قورئانییەكان و بزووتنەوە سیاسییە دینییەكان و سەردێڕی تازەی ئەم كۆتاییەیان بە ناوی (التفسيرالجديد للإسلام، إعادة فهم النص للإسلام والوجه الثاني لرسالة الإسلام ... والتجديد والخلاص من قيود النص الحرفي ...) بەرگی تازەی ئیسلام و پیاچوونەوەی تێگەیشتنی تازە بۆ دەكات و ڕزگاربوون لە كۆتی حەرفی دەقەكان و ... ئەمانە

هەموویان (بیدعە) و گومڕایین لە ئیسلامدا و دیوێکی تازەن بۆ لەکارخستنی سوننەت، لەگەڵ ئەو هەموو متمانە و پێویستییەی قورئان کە بۆ سوننەتی دادەنێت.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ۝٤﴾ [النجم: ٣-٤]، ﴿وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ [النساء: ١١٣].

ئیمامی (الشافعي) رحمه الله دەڵێت: «الحكمة سنة رسول الله»[1].

وە لە ئایەتێکی تردا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ۝٤٤﴾ [النحل: ٤٤].

واتە: کاری پێغەمبەر ﷺ ڕوونکردنەوەی دینە.

بێگومان دوژمنانی کۆن و تازەی پێغەمبەر ﷺ دوابڕاو و بێبەرەکەت و بێ هیدایەتن، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ ۝٣﴾ [الكوثر: ٣].

واتە: دوژمنانی تۆ ئەی (محمد) ﷺ دوابڕاو و کار پچڕاو و کۆتا هاتوون لە هەموو خێرێك.

بۆ لووت شکاندنی دوژمنانیش بەردەوام فەرموودەکانی لە بڵاوبوونەوە و پەرەپێداندان و سوننەتەکانی لە زیندوبوونەوەدان و لە دونیادا شوێنێك نییە پێی نەگەیشتبێت، ئەمەش وادەی خواییە بە پێغەمبەرەکەی، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ۝٤﴾ [الشرح: ٤].

واتە: پلەوپایە و ناومان بەرز ڕاگرتووی ئەی (محمد) ﷺ.

سوننەتەکانیشی دەبێت هەر بەرز و پلەوپایە بڵند بێت و بیدعە و بیدعەکارانیش وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِينَ ۝١٥٢﴾ [الأعراف: ١٥٢].

واتە: ئەو کەسانەی گوێرەکە پەرستییان داهێنا خەشمی خوا و زەلیلی دونیان و سزای درۆزنی وەردەگرن.

---

(١) "الرسالة" للشافعي ص٧٨.

(سفيان بن عيينة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُفْتَرِينَ ١٥٢﴾ [الأعراف : ١٥٢]. كُلُّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ ذَلِيلٌ»(١).

واتە: هەموو خاوەن بیدعەیەك زەلیلە.

وصلى الله وسلم على عبده ورسوله الصادق الأمين وعلى آله وأصحابه وأتباعه بإحسان إلى يوم الدين
سبحانك اللهم وبحمدك لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

❁ ❁ ❁



أحمد ملا فائق سعيد
٥ / شعبان / ١٤٣٧ هـ
١٤ / ٥ / ٢٠١٦ م - الجمعة
سلێمانی

(١) "تفسير الطبري" (١٠/ ٤٦٥)، "تفسير ابن أبي حاتم" (٥/ ١٥٧١)، "تفسير ابن كثير" (٣/ ٤٧٨)، "الدر المنثور في التفسير بالمأثور" للسيوطي (٣/ ٥٦٥).

# دەرەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە

١. بیدعە وشەیەکی شەرعییە، پێناسەی شەرعی هەڵدەگرێت و جیاوازە لە زمانەوانی.

٢. بەڵگە شەرعییەکان دڵنیاکاری تەواون لەسەر گومڕایی هەموو داهێنراوێك.

٣. هۆکارەکانی دروستبوونی داهێنراو ڕوونکەرەوەیەکی تەواون کە داهێنراو نەخۆشییەکی دینییە و لە کۆمەڵگایەکی نەخۆشدا دروست دەبێت و تەشەنە دەکات.

٤. بیدعەکاران خاوەنی بەرنامە و تێڕوانینی سەربەخۆی خۆیانن، وەکوو ڕکابەرێك بەرامبەر بەرنامەی شەرعی، وەکوو دینێکی دەسکردە لەناو دینێکی ئاسمانیدا.

٥. مامەڵەکردنی بیدعەکاران لەگەڵ دەقە شەرعییەکاندا مامەڵەیەکی فێڵاوی و خۆدزەرەوەیە لە چوارچێوەی مانا گۆڕین و بەتاڵکردنەوەی بەڵگە (تأويل وتفويض) دەرناچێت، بە پەنابردنە بەر (متشابه، الآحاد، القطعي، والظني، ...)، بە پشتکردنە دڵنیاییەکان (المحكمات، الثوابت).

٦. مەترسی داهێنراوەکان ترسناکە، لە کۆمەڵگایەکی دینی پاکدا دەردەکەوێت، لە کۆمەڵگا تێکەڵەکاندا دەرناکەوێت، لەبەرئەوەی هاوشێوەی ئەوانن بۆ دین.

٧. بەرگەپۆشکردنی داهێنراو بە ڕێگەی خێر و یاسا دینییەکانەوە دەرگا کردنەوەیەکی گەورەیە بۆ بیدعەکاران و لادانێکی ئاشکرایە لە ڕێڕەوی دروستی خۆی.

٨. بیدعە ناوێکی نەخوازراو و نەخۆشی دینییە، وەکوو (شرك، نفاق، فجور ...)، هیچ سیمایەکی جوان لەخۆ ناگرێت (بدعة + ضلالة = في النار).

٩. بەرنامە و کار و نووسینی زانایانی ئەهلی سوننەت بەرین لە بیدعە و بیدعەکاران کە دەیانکەنە پاڵپشت بۆ ڕەواجی بیدعەکانیان.

١٠. داهێنراو وەکوو هەموو دابەشکردنە دینییەکان لە گەورە و بچووك پێکهاتووە، گەورەکان ڕوون و ئاشکران و بچووکەکانیش تێکەڵن و جیاکردنەوەی ووردی دەوێت.

**١١.** دڵنیابوون لەوەی چۆن کرداری پێغەمبەر ﷺ سوننەتە؛ ئاواش نەکردنەکانی پێغەمبەر ﷺ سوننەتە، وە کردنیان بیدعەیە پێی دەوترێت (البدعة الترکیة)، وە گۆڕانکاری لە ڕێگە شەرعییەکانی عیبادەتەکاندا پێی دەوترێت بیدعەی بۆزیادکراو (البدعة الإضافية).

**١٢.** بە کارە دونیاییەکان ناوترێت بیدعە، مەگەر پەیوەست و بیلکێنن بە چۆنیەتی و جۆر و بەشێکی عیبادەتەکانەوە و لێکجیانەکرێتەوە و پێوەی بناسرێتەوە.

**١٣.** بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ هیچ بنەمایەکی شەرعی نییە، وە ئەم بۆنەیە چادرێکە هەموو بیدعەکارانی لەژێردا کۆ دەبێتەوە.

**١٤.** ڕەچاوکراوە شەرعییەکان (المصالح المرسلة) جیاوازی تەواوی هەیە لەگەڵ داهێنراودا، پاساو نییە بۆ بیدعەکاری.

**١٥.** وتووێژکردن لەگەڵ سەرانی بیدعەکاراندا نییە بە گشتی، لەبەر نەبوونی پاساویان لە تێنەگەیشتنی دیندا، بەڵام شوێنکەوتەیان پێویستیان بە هەموو جۆرە ئاگادارکردنەوە و فێرکردنێك هەیە.

**١٦.** بیدعەکاران دۆستانی نەزانی ناو بازنەی دینن، پێویستە هەموو ڕێگایەکی پڕ لە ئەدەبی شەرعی و دڵسۆزانە بگیرێتە بەر بۆ نەمانی پاساویان و ڕزگاربوونیان (إقامة الحجة)، لەسەر دەستی کەسانی خاوەن زانستی تایبەت و سەر لە دیندا.

**١٧.** حوکمی بیدعە حەرامە و لە چوارچێوەی تاوان و زیان تێناپەڕێت، بەڵام هەموو جۆرە موسوڵمانێك (حصانة) و پاراستنێکی دینی هەیە، بە نەمانی هۆکارەکان و ڕێگرییەکان (الأسباب، الموانع) ئەوکات تاوانبار دەکرێت بە تاوانە دینییەکان، یەکێك لەوانە داهێنراوە.

**١٨.** پەراوێزکردن (الهجر) لێپرسراوییەکی دینییە، بەوپەڕی خوێندنەوەی دینییەوە ئەنجام دەدرێت، بۆ هێنانەدی سوودمەندییەکان و ڕەواندنەوەی خراپەکان، کەسی تایبەت (أهل العلم) پێی هەڵدەستێت، ئەمە گەرچی بەدەست هەموو کەس نییە، هەروەهاش بۆ هەموو کەس نییە.

**١٩.** زانایان کۆدەنگن لە خراپی بیدعە و دژایەتیکردنیدا.

**٢٠.** وشەی (أهل البدع، أهل الأهواء) **تۆمەتێکی دینییە، بەس بە سەران و بنەمادانەران و شارەزایان و بانگخوازانی بیدعەکاران دەوترێت، نەك خەڵکی گشتی و بێئاگا، مەگەر کەسانێك وەکوو ئەوان پاساویان نەمێنێت.**

**٢١. هەڕەشە گشتییەکانی قورئان و فەرموودە دانابەزێتە سەر تایبەت، مەگەر لە دوای نەمانی هیچ پاساوێك** (الوعيد المطلق لا يلزم منه الوعيد المعين).

**٢٢. یاسا زانستییە فیقهییەکان و بنەما شەرعییەکان** (القواعد الأصولية والقواعد الفقهية) **ڕێگەی پڕ زانستییە بۆ یەکلابوونەوە، وە دڵنیایی لەسەر گومڕایی داهێنراوەکان.**

  

# ناوەڕۆك

بابەت | لاپەڕە